ناوی کتێب: ناسینی هاوەڵان(ﷺ) - بەرگی دووەم -

ناوی نووسەر: نهاد جلال حبيب الله

بابەت: مێژوویی

دیزاینی بەرگ: ناوەندی ڕێنوێن

دیزاینی تێکست: دانا حەسەن

نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠٢٣

چاپ: ناوەندی ڕێنوێن

تیراژ: (١٠٠٠) دانە

ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (٢٢١٩)ی ساڵی (٢٠١٣)ی پێ دراوە.

لە بڵاوکراوەکانی ڕێکخراوی میعراج بۆ توێژینەوە و گەشەپێدان





ڕێکخراوی میعراج
بۆ توێژینەوە و گەشەپێدان



ناوەندی ڕێنوێن



07511408868 - 07501269689



hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com



سلێمانی - بازاڕی کاسۆمۆڵ - نهۆمی دووەم
دوکانی ژمارە (٤٥)

# ئەو هاوەڵانەی ناویان
# بە پیتی (أ)
# دەست پێ دەکات

## ١. ئابی لەحم(رضي الله عنه):

ئابی لەحم یەکێکە لەو هاوەڵانەی زۆر زوو موسڵمان بوون،[١] سەر بە هۆزی غیفارە،[٢]غیفاریەکانیش لە پێش موسڵمان بوونیاندا لە ناوچەکەدا ناوبانگێکی باشیان نەبوو، چونکە کەسانێکیان تێدا بوون بە چەتەو ڕێگر ناسرابوون،[٣] بەڵام برێ کەسی زۆر مەرد و چاکیشیان تێدا بوو، یەکێک لەوانەش ئابی لەحم بوو.

سەبارەت بە ناوی ئەم هاوەڵە چەند رایەک هاتووە، ئیبن خەیاط دەڵێت: ناوی عەبدوڵای کوڕی عەبدولمەلیکە، هەروەها دەڵێت: دەشوترێت ناوی خەلەفی کوڕی عەبدولمەلیکی کوڕی عەبدوڵای کوڕی غیفارە.[٤]

ئین عەبدولبەر چوار ناوی هێناوە کە سەبارەت بەم هاوەڵە هێنراون (عەبدوڵای کوڕی عەبدولمەلیک، خەلەفی کوری عەبدولمەلیک، حوەیرثی کوڕی عەبدوڵای کوڕی خەلەفی کوری عەبدولمەلیک، عەبدوڵای کوڕی عەبدوڵای کوڕی مالیک).[٥]

ئابی لەحم لە ناو هۆزی غیفاردا کەسێکی ناسراو و بەناوبانگ بوو،[٦] هەرچەندە غیفاریەکان ناوبانگێکی باشیان نەبوو، بەڵام ئابی لەحم کەسێکی ڕێزدار و چاک بوو، هەروەها گۆشتێکی نەدەخوارد کە لەسەر سەکۆی بتەکان سەردەبرا.[٧]

---

[١] الاستيعاب ج١ ص١٣٥, أسد الغابة ج١ص٥٧.

[٢] الطبقات لابن خياط ج١ ص٣٢، أسد الغابة ج١ص٥٧، الإصابة في تمييز الصحابة ج١ص١٥.

[٣] المعجم الكبير للطبراني - باب العين - من اسمه عبد الله - أحاديث عبد الله بن العباس بن عبد المطلب - وما أسند عبد الله بن عباس(رضي الله عنه) - عكرمة عن ابن عباس، الرقم ١١٦٤٥.

[٤] الطبقات لابن خياط ج١ ص٣٢.

[٥] الاستيعاب ج١ ص١٣٥.

[٦] الاستيعاب ج١ ص١٣٥.

[٧] أسد الغابة ج١ص٥٧.

سـەبارەت بـەوەی بۆچـی پێـی وتـراوە ئابی لەحـم دوو را هەیـە، رایەکیـان دەڵێـت: چونکـە گۆشـتی نەخـواردووە،[1] بۆچوونێکیـش دەڵێـت: چونکـە هیـچ کات ئامـادە نەبـووە گۆشـتێ بخـوات کـە لەسـەر سـەکۆی بـەردەم بتـەکان سـەربڕاوە،[2] رای دووەمیـش لـە راسـتتر دەچێـت، واتـە گۆشـتی حەڵاڵـی خـواردووە و تەنها گۆشـتێکی نەخـواردووە کە بۆ بتەکان سـەربڕابێت، چونکە لـە گێڕانەوەیەکـی عومەیـری مەولایدا هاتـووە کە ئابی لەحـم داوای لێکـردووە گۆشـتی بـۆ نیوەبـرژاو بـکات و هەڵیبگـرێ[3]، بـەڵام عومەیـر هەژارێکـی بینـی و بەشـی دا،[4]جـا ئەگـەر ئابی لەحـم گۆشـتی نەخواردایـە چ پێویسـتی ئەکـرد گۆشـت بهێنێـت و ئـەو داوایـەش لـە عومەیـر بـکات.

ئابی لەحـم لـە ناوچـەی غیفـار لـە گونـدی صەفـرا دادەنیشـت،[5] ئـەو گونـدە دەکەوتـە نێـوان دوو شـاخەوە، ئابی لەحـم شـاعیرێکی دیـاری نـاو هۆزەکەشـی بوو.[6]

ئابی لەحـم کۆیلەیەکـی هەبوو کـە نـاوی عومەیـر بـوو،[7] چاکـەی لەگـەڵ ئـەو کۆیلەیـدا زۆر بـوو، لەگـەڵ خۆیـدا کۆیلەکەشـی موسـڵمان بووبوو.

ئابـی لەحـم لەگـەڵ عومەیـرو چەنـد کەسـێکی تـردا پێکـەوە کۆچیانکـرد بـۆ مەدینـە، عومەیـر دەڵێـت: کاتێـک نزیـک بووینـەوە لـە مەدینـە گەورەکـەم و هاوڕێکانـم جێیانهێشـتم، تووشـی برسـێتیەکی زۆر بـووم، چوومـە باخێـک و دوو هێشـوو خورمـام لێکـردەوە، خـاوەن باخەکـە هـات و بردمـی بـۆ لای پێغەمبـەر(ﷺ)، پێغەمبەریـش(ﷺ) پرسـیاری لێکـردم چیـم و چـی ئەکـەم و

---

[1] معرفة الصحابة لإبن منده، ص١٧٥، الإصابة في تمييز الصحابة ج١ص١٥.

[2] أسد الغابة ج١ص٥٧.

[3] کاتی خۆی واکراوە کە گۆشتەکە بە تەنکی پارچە پارچە کراوەو خراوەتە سەر بەردی گەرم ئیتر دواتر هەڵگیراوە، واکراوە بۆ ئەوەی گۆشتەکە هەڵگرن و بیپارێزن لە خراپ بوون.

[4] معجم الصحابة ج٢ص٢٢٨، الإصابة في تمييز الصحابة ج١ص١٥.

[5] الإصابة في تمييز الصحابة ج١ص١٥.

[6] الإصابة في تمييز الصحابة ج١ص١٥.

[7] معجم الصحابة ج٢ص٢٢٨، الاستيعاب ج١ ص١٣٥.

بۆچی وامکرد؟ منیش حاڵ و مەسەلەکەم بۆ باسکرد، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرمووم کام لەو دوو هێشووە خورمایەت لا باشترە؟ منیش وتم: ئەوەیان، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد بە خاوەن باخەکە ئەو هێشووە خورماکەی تریان ببات و دەستبەرداری من بێت.[1]

عومەیری مەولای ئابی لەحم دەڵێت: جارێکیان پێغەمبەرم(ﷺ) لای (أحجار الزيت) لە نزیک زەوراوە بینی بە پێوە وەستابوو، نزای باران بارینی دەکرد و دەستەکانی تا ڕێکی سەری بەرزکردبوویەوەو ناولەپی دەستی ڕووکردبوویە دەموچاوی خۆی و نزای دەکرد.[2]

عومەیر دەڵێت: جارێکیان ئابی لەحم بڕێ گۆشتی هێنایەوە و داوای لێکردم بۆی نیوەبرژاو بکەم و هەڵیبگرم، منیش سەرقاڵی بەجێگەیاندنی داواکەی بووم، لەو کاتەدا هەژارێک هات و منیش دڵم بۆی سووتا و کەمێکم بەش دا، دوایی ئابی لەحم بەوەی زانی لەسەر ئەوەی بێ پرسی ئەو کاری وامکردووە لێیدام، منیش چووم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و مەسەلەکەم بۆ باس کرد، پێغەمبەر(ﷺ) بە ئابی لەحمی فەرموو: بۆچی لێتدا؟ ئەویش وتی: بە بێ مۆڵەتی خۆم خواردنی منی داوە بە خەڵک، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: پاداشتەکەی بۆ هەردووکتانە.[3]

ئابی لەحم لە جەنگی خەیبەردا بەشداری کرد،[4] خەیبەر ئەو قەڵایەی جوولەکەکان بوو کە پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵانی هێرشیان بردەسەر.

ئابی لەحم کە بەشداری جیهادی دەکرد، لەگەڵ خۆیشیدا ڕێی دەدا بە عومەیر تا بەشداری بکات، عومەیر دەڵێت: منیش لەو جەنگەدا بەشداریم کرد، دواتر کە جەنگەکە تەواو بوو و غەنیمەت کۆکرایەوە، چووم بۆ

---

[1] معجم الصحابة ج٢ص٢٢٨.

[2] سنن أبي داود - كتاب الصلاة - باب رفع اليدين في الاستسقاء، الرقم ١١٦٨، صححه الألباني في صحيح أبوداود، الرقم ١٠٥٩، وفي صحيح و ضعيف سنن النسائي، الرقم ١٥١٤.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة ج١ص١٥.

[4] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢ص١١٤.

لای پێغەمبەر(ﷺ) و داوام لێکرد بەشی منیش لەو غەنیمەتە بدات، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) بەشی لەو غەنیمەتە بۆ دانەنام، بەڵکو لەو کەلوپەلەی ناوماڵ کە دەستکەوت بوو بەشی دام.[1]

ئابی لەحم دواتر هەر لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بوو تا فەتحی مەککەش کرا، ئینجا بەشداری غەزای حونەینی کرد، لەگەڵ خۆیشیدا عومەیری برد تا ئەویش بەشدار بێت،[2] ئینجا خۆی لە حونەیندا شەهید بوو.[3]

## ٢. ئەبانی کوری سەعید(رضي الله عنه):

ئەبانی کوڕی سەعید خەڵکی مەککە بوو و لە بنەماڵەی ئومەویەکان بوو،[4] ناوی تەواوی بریتیە لە ئەبانی کوری سەعیدی کوڕی عاصی کوڕی ئومەییە،[5] باوکی یەکێک بوو لە گەورە ناودارەکانی قورەیش،[6] ئەبان حەوت برای هەبوو، سێ لەو برایانەی بە بێباوەڕی مردن، چواریشیان گەیشتنە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)و بە موسڵمانی مردن،[7] برایەکی ناوی ئوحەیحە بوو کە لە جەنگی فیجاردا کوژرا،[8] عاص و عوبەیدەش کە دوو برای تری بوون لە جەنگی بەدر بە بێباوەڕی بە دەستی موسڵمانان کوژران، عەلی کوڕی ئەبوو تالیب عاصی کوشت و عوبەیدەش بە دەستی زوبەیر کوژرا.[9]

خالید و عەمر کە دوو برای تری بوون، هەر زوو لە مەککە موسڵمان بوون،[10] حەکەمی برایشی دواتر موسڵمان بوو، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) ناوەکەی

---

(١) الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢ص١١٤،

(٢) الاستيعاب ج١ ص١٣٥.

(٣) الاستيعاب ج١ ص١٣٥، أسد الغابة ج١ص٥٧، الإصابة في تمييز الصحابة ج١ص١٥.

(٤) الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١ص٦٢، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص١٥،

(٥) الطبقات لابن خياط ج١ص١٠، معجم الصحابة ص٦٦، أسد الغابة، ج١ص٥٨،

(٦) الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص١٦.

(٧) الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١ص٦٢-٦٣.

(٨) أسد الغابة، ج١ص٦٠.

(٩) الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١ص٦٢.

(١٠) الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص١٦.

گۆڕی و ناوی نا عەبدولا.[1]

دایکیشی ناوی هیندی کچی موغیرەی کوڕی عەبدوڵای کوڕی عومەرە، دەشوترێ نەخێر دایکی ناوی صەفیەی کچی موغیرە بووە کە پووری خالیدی کوڕی وەلیدە،[2] بەڵام لە گێڕانەوەکەی ئیبن خەیاطەوە دەردەکەوێ باوکی چەند ژنێکی هێناوە، صەفیە دایکی ئەبان بووە، هیند دایکی هەریەک لە عەمرو حەکەم بووە، لوبەینەی کچی خەببابیش دایکی خالید بووە.[3]

ئیبن حەجەری عەسقەلانی دەڵێت: ژنەکەی ئەبان ناوی فاطیمەی کچی صەفوانی کینانیە،[4] بەڵام هەریەک لە ئیبن عەبدولبەرو ئیبنولئەثیر ئەو ئافرەتە بە ژنی عەمر واتە براژنی ئەبان ناو دەبەن.[5]

ئەبان لە مەککە کەسێکی بەرچاو بوو و سەرقاڵی کاری بازرگانی بوو و بۆ کاری بازرگانی زوو زوو دەچوو بۆ شام.[6]

هەرچەندە هەریەک لە عەمر و خالیدی برای هەر زوو موسڵمان بوون،[7] بەڵام ئەبان بە بێباوەڕی مایەوە، ئەبان بەوە نارەحەت بوو و بێزاری خۆی بەرامبەر موسڵمانبوونیان دەردەبڕی و بە شیعرێک سەرکۆنەی کردن، عەمری برایشی بە نەرمونیانی بە شیعرێک وەڵامی دایەوەو پێی راگەیاند کە کارەکەیان باشە.[8]

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) مۆڵەتی دا بە موسڵمانان کۆچ بکەن بۆ حەبەشە، ئەو دوو برایەی لە گەڵ موسڵمانانی تردا کۆچیان کرد بۆ حەبەشە[9]

---

[1] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١ص٦٣.
[2] أسد الغابة، ج١ص٥٨.
[3] الطبقات لابن خياط ج١ص١١.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص١٦.
[5] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٣ص١١٧٧، أسد الغابة، ج٧ص٢٤٦.
[6] سير أعلام النبلاء، ج١ص٢٦١.
[7] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص١٦.
[8] أسد الغابة، ج١ص٥٨
[9] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص١٦.

و لەوێ مانەوە تا کاتی فەتحی خەیبەر، ئەوکات لەگەڵ جەعفەری مامی پێغەمبەر(ﷺ) چوون بۆ مەدینە.[1]

ئەبان لەسەر بێباوەڕی مایەوە و لە جەنگی بەدردا دژ بە موسڵمانان جەنگی کرد،[2] لەو جەنگەدا دوو برای کوژران، عەلی کوڕی ئەبوو طالیب عاصی کوشت و عوبەیدەش بە دەستی زوبەیر کوژرا.[3]

بەڵام خوا رەحمی کرد بە ئەبان و لەو جەنگەدا بە سەلامەتی دەرچوو و گەڕایەوە بۆ مەککە و لەوێ بەردەوام سەرقاڵی کاری بازرگانی بوو.

سەبارەت بە موسڵمان بوونی دوو رای جیاواز هەیە، رایەکیان پێی وایە لە رێککەوتنی حودەیبیە موسڵمان بووە،[4] بۆچوونێکی تر دەڵێت: لە جەنگی خەیبەردا موسڵمان بووە.[5]

رای یەکەم باس لەوە دەکات لە یەکێک لە سەفەرەکانی ئەبان بۆ شام لەوێ چاوی دەکەوێت بە راهیبێک و لەگەڵی دادەنیشێت، پرسیاری لێدەکات و دەڵێت: لەناو ئێمەدا لە ناو قورەیش کەسێک دەرکەوتووە بانگەشەی ئەوە دەکات گوایە پێغەمبەری خوایەو خوا پەیامێکی وەک پەیامەکەی مووساو عیسای پێدا ناردووە، راهیبەکە وتی: ناوی چیە؟ وتی: ناوی موحەممەدە، راهیبەکە وتی: من وەسفی ئەو پێغەمبەرە و تەمەن و رەچەڵەکیت بۆ ئەکەم، کە راهیبەکە وەسفەکانی کرد، ئەبان وتی: خۆیەتی، راهیبەکە وتی: دەی سوێند بەخوا زاڵ ئەبێت بەسەر هەموو عەرەبداو دواتر بەسەر هەموو زەویشدا زاڵ ئەبێت، بە ئەبانی وت: سەلامی من بگەیەنە پێی، ئەبان کە گەڕایەوە مەککە باسی ئەو مەسەلەی کرد و هەواڵی پێغەمبەر و هاوەڵانی پرسی، دواتر لە کاتی رێککەوتنی حودەیبیە دوای پێغەمبەر کەوت و

---

(1) سير أعلام النبلاء، ج١ ص٢٦١.
(2) الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص١٦.
(3) الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١ص٦٢.
(4) أسد الغابة، ج١ص٥٩.
(5) سير أعلام النبلاء، ج١ص٢٦١.

موسڵمان بوو.[1]

کاتێک موسڵمانان بە هاودەمی پێغەمبەر(ﷺ) بەڕێکەوتن بۆ عومرە و بێباوەڕان بەریان پێگرتن، ئەوەبوو پێغەمبەر(ﷺ) عوثمانی کوڕی عەففانی نارد تا بچێت بۆ مەککە و لەگەڵ بێباوەڕاندا وتوێژ بکات،[2] کاتێک عوثمان چوو بۆ مەککە ئەبان پەنای داو بەرپرسیاریتی پاراستنی عوثمانی گرتە ئەستۆی خۆی، عوثمانی سواری ئەسپەکەی خۆی کرد و وتی: بە بێترس بە کوێی مەککەدا دەگەڕێیت بگەڕێ.[3]

خالید و عەمر کە برای ئەبان بوون، هەواڵیان بۆ نارد و بانگهێشتیان کرد بۆ ئیسلام و داوایان کرد بچێت بۆ مەدینە، ئەویش کۆچی کرد بۆ مەدینە و لەوێوە چوو بۆ خەیبەر و لەوێ موسڵمان بوونی خۆی راگەیاند،[4] ئەمەش رای دووەمە لەسەر موسڵمان بوونی.

لە صەحیحی ئیبن حیباندا گێڕانەوەیەک هاتووە کە ئەبووهورەیرە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) سریەیەکی رووەو نەجد نارد و ئەبانی کوڕی سەعیدی کرد بە ئەمیری سریەکە، کاتێک گەڕایەوە جەنگی خەیبەر تەواو بووبوو، پێغەمبەر(ﷺ) دەستکەوتەکانی دابەش دەکرد، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) خۆ بەشیان بۆ دانانێیت، ئەبان بە قسەکەم تووڕە بوو و هەڵمەتی بۆ هێنام و ویستی بە رمەکەی لێم بدات، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (مهلا يا أبان)، (لەسەرخۆبە ئەی ئەبان) دواتر بەشی بۆ دانەنان.[5]

دواتر ئەبان لای پێغەمبەر(ﷺ) رێزی زۆری لێدەگیراو جێی متمانەی بوو چونکە موسڵمان بوونەکەی راستگۆیانە بوو، پێغەمبەر(ﷺ) ئەوی

---

[1] أسد الغابة، ج١ص٥٩.

[2] البداية والنهاية، ج٤ص١٦٤-١٦٧.

[3] أسد الغابة، ج١ص٥٩، سير أعلام النبلاء، ج١ص٢٦١.

[4] سير أعلام النبلاء، ج١ص٢٦١.

[5] صحيح ابن حبان - كتاب السير - باب الغنائم وقسمتها - ذكر خبر قد يوهم غير المتبحر في صناعة العلم أنه مضاد لخبر أبي موسى الذي ذكرناه، الرقم ٤٨١٤، صححه شعيب الأرناؤوط.

کردە پێشەنگی سریەیەک بەرەو نەجد،[1] هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) کە عەلائی کوری حەضرەمی کردبوو بە والی بەحرەین، عەلائی لەو کارە لابرد و ئەبانی لە شوێنیدا دانا[2]و تا وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) لەو پۆستەدا مایەوە،[3] بەڵام کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد ئەبان زۆر دڵتەنگ بوو، بۆیە کاتێک خەلیفە ئەبووبەکر داوای لێکرد لەسەر ئەو پۆستە بمێنێتەوە، ئەو رازی نەبوو و وتی: دوای پێغەمبەر(ﷺ) کاری والیەتی بۆ هیچ کەس ناکەم.[4]

ئەبان سەرەتا دواکەوت لە بەیعەتدان بە خەلیفە ئەبووبەکر، بەڵام دواتر لەگەڵ موسڵمانان بەیعەتی پێدا[5]و چووە مەیدانی جیهادەوە تا شەهید بوو.

سەبارەت بە شەهیدبوونەکەشی راجیایی هەیە، چوار بۆچوون لەو بارەیەوە هەن، رایەکیان پێی وایە لە سەردەمی خەلیفە ئەبووبەکرو لە جەنگی ئەجنادەین شەهید بووە،[6] رای دووەم دەڵێت: لە جەنگی یەرمووکدا لە پێنجی رەجەبی ساڵی ١٥ی کۆچی شەهید بووە،[7] رایەکی تر پێی وایە لە جەنگی مەرج صوففەردا شەهید بووە،[8] رای چوارەم پێی وایە ئەبان مایەوە تا لە نووسینەوەی قورئانی پیرۆز لە سەردەمی خەلیفە عوثماندا یارمەتی زەیدی دا و دواتر لە ساڵی ٢٩ی کۆچیدا وەفاتی کرد.[9]

حوذەیفەی کوڕی یەمان، کاتێک لە ناوچە فەتحکراوەکاندا ئەو جیاوازیەی بەدیکرد، ترسی لێ نیشت و پێشنیاری کرد بۆ عوثمان هەتا لەو بوارەدا فریای ئوممەت بکەوێت،[10] عوثمانی کوڕی عەففانی

---

[1] أسد الغابة، ج١ص٥٩.
[2] سير أعلام النبلاء، ج١ص٢٦٤.
[3] أسد الغابة، ج١ص٦٠.
[4] أسد الغابة، ج١ص٦٠.
[5] أسد الغابة، ج١ص٦٠.
[6] سير أعلام النبلاء، ج١ص٢٦١.
[7] الطبقات لابن خياط ج١ص١٠.
[8] أسد الغابة، ج١ص٦٠.
[9] أسد الغابة، ج١ص٦٠.
[10] صحيح البخاري - كتاب فضائل القرآن - باب جمع القرآن، الرقم ٤٩٨٧.

پەلکێش کرد بۆ یەکخستنی پەڕاوەکان و دروستکردنی کۆدەنگیەک لەوبارەیەوە،[1]ئیمامی عوسمان زەیدی راسپارد بۆ نووسینەوەی نوسخەی قورئان و پێی وت: (لەگەڵ تۆدا پیاوێکی ژیر و زمانپاراو دادەنێم، ئەو دوانەتان لەسەر هەرچییەک کۆدەنگ بوون بینووسنەوە، لە هەرچییەکیشدا راتان جیاواز بوو، بەرزی بکەنەوە بۆ لای خۆم)، ئەوەبوو کە گەیشتنە ئایەتی (إن آية ملكه أن يأتيكم التابوت..) زەید وتی: (تابوه) ئەبانیش وتی: (تابووت)، ناچار چوونەوە لای خەلیفە و ئەویش نووسی (تابووت).[2]

بۆچوونی دروست ئەوەیە هەریەک لە ئەبان و خالیدی برای پێکەوە لە سەنگەری جیهاد و لە یەک رۆژدا شەهید بون.[3]

## ٣. ئەبانی موحاریبی(رضي الله عنه):

تێکەڵ بوونێک هەیە لەنێوان ئەبانی عەبدی و ئەبانی موحاریبی و لە کتێبی (أسد الغابة)دا ئیبنولئەثیر بە جیا باسکراون، هەرچەندە هەمان ئەو بۆچوونەشی هێناوە کە دەڵێت: هەردووکیان یەک کەسن، سەبارەت بە ئەبانی عەبدی تەنها ئیبن مندە هێناویەتی و دەڵێت: یەکێک بووە لەو کەسانەی وەک وەفد هاتون بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، هەمان ئەم چوونە بە وەفد لە ژیانی ئەبانی موحاریبیشدا هەیە، هەروەها لە (أسد الغابة)شدا هاتووە کە عەبدی هەر موحاربیە، موحاربیش لقێکە سەر بە خێڵی عەبدولقەیس، ئەمەش رەچەڵەکی ئەو لقەیە (موحاریبی کوڕی عەمری کوڕی وەدیعەی کوری لوکەیزی کوڕی ئەفصای کوڕی عەبدولقەیس).[4]

[1] الطبري: جامع البيان، تحقيق: أحمد شاكر، سنة ٢٠٠٠، ج١، ص ٦٢.
[2] مشكل الآثار للطحاوي، الرقم ٢٦٤٥.
[3] سير أعلام النبلاء، ج١ص٢٦١.
[4] أسد الغابة ج١ص٦١.

هەروەها لە (الإصابة) شدا هاتووە ئەبانی موحاریبی پێیشی دەوترێ ئەبانی عەبدی.[1]

ئەم هاوەڵە سەر بە هۆزی عەبدولقەیسە و ناوی لەناو هاوەڵانی دانیشتووی بەصرەدا هاتووە،[2] ئەم هۆزە بە ئاشتی موسڵمان بوون و بە وەفد هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) تا موسڵمانبوونی خۆیان رابگەیەنن،[3] ئەبانیش لەو وەفدەدا بوون،[4] کاتێک ئەو وەفدە هاتن بەرەو مەدینە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەو وەفدە کێن؟ یان ئەو قەومە کێن؟ وتیان: رەبیعە، فەرمووی: (مرحبا بالقوم-أو بالوفد- غير خزايا ولا ندامى) واتە (مەرحەبا لەو قەومە -یان فەرمووی: لەو وەفدە- دووربن لە سەرشۆڕی و پەشیمانی)،[5] مەبەستی ئەوەبوو بە ناچاری موسڵمان نەبوون.

لە گێڕانەوەکەی ئیمامی ئەحمەددا هاتووە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (اللهُم اغْفِرْ لِعَبْدِ الْقيْسِ إِذْ أَسْلمُوا طائِعِين غيْرَ كارِهِين)، (خوایە لە –هۆزی-عەبدولقەیس خۆش بە کە بە ویستی خۆیان بێ زۆر لێکردن موسڵمان بوون...) پاشان بە رووی گەشەوە رووی کردە قیبلە و فەرمووی: (چاکترینی خەڵکی رۆژهەڵات عەبدولقەیسن).[6]

دواتر وەفدەکە هاتنە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و حاڵی خۆیان باسکردو وتیان: ناتوانن جگە لە مانگە حەرامەکان (ئەو مانگانەی جەنگ تیایاندا قەدەغەیە) بێن بۆ خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ)، چونکە بێباوەڕانی موضەری لەسەر رێگەکەیانن و رێیان پێ دەگرن، بۆیە داوایان کرد چی گرنگە پێغەمبەر(ﷺ) پێیان بڵێت تا بیگەیەنن بە هۆزەکەیان و بەو شتانەش بچنە

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة ج١ص١٨.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة ج١ص١٨.

[3] صحيح البخاري – كتاب الإيمان – باب أداء الخمس من الإيمان، الرقم ٥٣.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة ج١ص١٨.

[5] صحيح البخاري – كتاب الإيمان – باب أداء الخمس من الإيمان، الرقم ٥٣.

[6] مسند أحمد بن حنبل – مسند الشاميين(ﷺ) – حديث وفد عبد القيس(ﷺ)، الرقم ١٨١٠٩، صححه الألباني.

بەهەشت، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمانی پێکردن بە چوار شت و ڕێگری لێکردن لە چوار شت، فەرمانی پێکردن (بە بڕوابوون تەنها بە خوا) فەرمووی: ئەزانن بڕوابوون تەنها بە خوا چیە؟ وتیان: خوا و پێغەمبەرەکەی(ﷺ) زاناترن، فەرمووی (شایەتی بدەن هیچ پەرستراوێ نیە جگە لە الله و موحەممەدیش نێردراوی خوایە)، هەروەها فەرمانی پێکردن نوێژ بکەن و زەکات بدەن و ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگرن، لە دەستکەوتیش پێنج یەک بدەن،....)[1]دەقی فەرموودەکە لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە.

ئەبان لەو ماوە کورتەدا کە لە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) بوو، زۆر لە کردارو گوفتاری ئەو پێشەوایە ورد دەبوویەوە تا زۆرترین سوودی لێ وەربگرێت، ئەوەتا باس لەوە دەکات لەو ماوەدا پێغەمبەری(ﷺ) دیوە کە نزای کردووە و سپیایی بن باڵی دەرکەوتووە، واتە هێندە دەستەکانی بەرز ڕاگرتووە.[2]

هەروەها لەو ماوە کورتەدا فەرموودەیەکی پێغەمبەری(ﷺ) لەسەر زیکری بەیانییان وەرگرت و گێڕاویەتیەوە،[3] بەم پێیە ئەبانی موحاریبی دوو فەرموودەی گێڕاوەتەوە، یەکەمیان سەبارەت بە بینینی نزاکردنی پێغەمبەر(ﷺ)، دووەمیشیان سەبارەت بە ویردی بەیانییان.

## ٤. ئەبرەهە(رضي الله عنه):

ئەم هاوەڵە لای هەریەک لە ئیبن حەجەرو ئیبن ئەثیریش ناوی هاتووە، بەڵام ناوی باوک و ڕەچەڵەکی نەهاتووە.

ئیبن ئەثیر سەبارەت بە هاتنی ئەم هاوەڵە گێڕانەوەیەک دێنێت: کاتێک موسڵمانانی حەبەشە زانییان پێغەمبەر(ﷺ)و موسڵمانان لە جەنگی بەدردا

[1] صحيح البخاري - كتاب الإيمان - باب أداء الخمس من الإيمان، الرقم ٥٣.
[2] معرفة الصحابة لأبي نعيم، الرقم ٩٦٤.
[3] الطبقات لابن سعد، الرقم ٨٣٠٧، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٦٣٤.

سەرکەوتن، داوای مۆڵەتیان کرد لە نەجاشی تا بچنەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، ژمارەیەک لەوانەی لای نەجاشی بوون و بڕوایان هێنابوو بە نەجاشییان وت: مۆڵەت بدە بە ئێمەش با بچین بۆ لای ئەو پێغەمبەرەو بزانین ئەو کەسەیە کە لە کتێبەکەماندا باسی کراوە؟ ئەوەبوو چوون بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و لەگەڵیدا بەشداری غەزای ئوحود بوون، ریوایەتێ لە موقاتیل و کەسانی تریشەوە دێنێ کە وتویانە ئەوانە ٤٠ کەس بوون، سێ و دوو کەسیان لە گەڵ جەعفەری طەیاردا هاتن، هەشت کەسیشیان لە شامەوە هاتن (بوحەیراو ئەبرەهەو ئەشرەف و تەمام و ئیدریس و ئەیمەن و نافع و تەمیم)، ئەمە گێڕانەوەی ئەبوو مووسا بوو کە ئیبن ئەثیر هێناویەتی، ئیبن ئەثیر دەڵێت: ئەگەر مەبەستی بە بوحەیرا یەکێکی تری جیا لەو بوحەیرایە بێت کە پێغەمبەر(ﷺ) بە منداڵی بینی، ئەوە ئەگەری هەیە ئەم هاتنی وەفدە راست بێت.[1]

ئیبن حەجەر دەڵێت: وادیارە ئەمە بوحەیرایەکی ترە، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) ئەوی لە خاکی شام دیوە، بەڵام ئەم بوحەیرایەیان لە حەبەشە بووە، باکووری وڵات لەکوێ و باشووری لەکوێ، ئاساییە دوو کەس یەک ناویان هەبێ.[2]

بەڵام بەپێی هەموو سەرچاوەکان جەعفەری طەیار(ﷺ) و موسڵمانان لە فەتحی خەیبەردا هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)،[3] دیاریشە غەزای ئوحود لەپێش فەتحی خەیبەر روویداوە، بۆیە هاتنی ئەو کەسانە لەگەڵ جەعفەری طەیار بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و بەشداری کردنیان لە غەزای ئوحوددا، بەپێی سەرچاوەکان هەڵەیەو راستی تێدا نیە، دەشکرێ ئەو ئەگەرە دابنێین ئەو کەسانەی تر (واتە ئەو ٤٠ کەسە) بەجیا و بەبێ جەعفەر هاتبن، وەک چۆن ئیبن حەجەر باس لەوە ناکات هاتنی ئەو کەسانە لەگەڵ جەعفەردا بووبێت.[4]

[1] أسد الغابة، ج١ص٧١.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٢٢.
[3] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١ص٢٤٢، أسد الغابة، ج١ص٤٢١، سير أعلام النبلاء للذهبي، ج١ص٢٠٦.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٢٢.

## ٥. ئەبرەهەی کوڕی شورەحبیل(ﷺ):

ئەبرەهە لە شام بووو لەوێ دەسەڵاتی هەبوو،[١] ئیبن حەجەر وا ناوی هێناوە: ئەبرەهەی کوڕی شورەحبیلی کوڕی ئەبرەهەی کوڕی صەباحی کوڕی شورەحبیلی کوڕی لوهەیعەی کوڕی زەیدولخەیری حیمیەری،[٢] حیمیەریەکان بەرەچەڵەک یەمەنین، هەندێ لە حیمیەریەکان لە شام بوون، لەوانە کەعبی ئەحبار.[٣]

ئەبرەهە وەک وەفد هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش راخەرێکی بۆ راخست، ئیبن حەجەر وتەی (الرشاطی) دێنێت کە ئەبرەهە فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە.[٤]

## ٦. ئەبرەهەی کوڕی صەباحی حەبەشی(ﷺ):

ئیبن حەجەر لە (الإصابة) دا باسی کردوەو وا ناوی هێناوە: ئەبرەهەی کوڕی صەباحی حەبەشی یان حیمیەری، ئیبن حەجەر دەڵێت: فاکهی لە (کتاب مکة) دا دەڵێت: ئەبرەهەی حەبەشی یەکێک بووە لەو کەسانەی کە لە مەککە بووە، دەوترێ لە حیمیەریەکانە، ئیبن حەجەر دەڵێت: سەرەتا نەمدەزانی ئایا ئەم ئەبرەهەیە باپیری هەمان ئەوەی پێشووە کە باسم کردووە واتە باپیری ئەبرەهەی کوڕی شورەحبیلە یان کەسێکی ترە، دواتر بۆم دەرکەوت کە کەسێکی ترە، هەروەها ئیبن حەجەر قسەی ئیبنولکەلبی دێنێ کە ئەبرەهەی کوڕی صەباح پاشای (تهامە) بووە و دایکیشی کچی ئەبرەهەی ئەشرەم بووە،[٥] ئەبرەهەی ئەشرەم ئەو کەسە بوو کە هێرشی

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٢١.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٢١.

[٣] اللباب في تهذيب الأنساب لأبوالحسن الشيباني الجزري، ج١ص٣٩٣.

[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٢١.

[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٢١.

بردە سەر کەعبە، ئەبرەهەی ئەشرەم دەسەڵاتداریکی دیاری یەمەن بوو کە لە یەمەن کەنیسەیەکی گەورەی دروستکرد، کاتێک زانی کەعبە زیاتر گرنگی پێدەدرێ، سوپای کۆکردەوەو فیلی ئامادەکرد و بڕیاری دا کەعبە بڕووخێنێ، بەسەرهاتەکەی لە کتێبەکانی مێژوودا هاتووە، خوای گەورەش لەو بارەوە سوورەتی الفیل)ی دابەزاند،[1] واتە خوای گەورە لە نەوەی ئەم کەسە یاخیبووە ستەمکارە هاوەڵێکی باوەرداری بەخشی بە ناوی ئەبرەهەی کوڕی صەباح، واتە صەباح زاوای ئەبرەهەی ئەشرەمی ستەمکار بووە.[2]

## ٧. ئەبیەض(ﷺ):

ئەم هاوەڵە سەرەتا ناوی ئەسوەد بوو، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) ناوی گۆڕی و ناوی نا ئەبیەض،[3]ئەبیەض دوای فەتحی میصر چوو بۆ ئەوێ و لەوێ مایەوە.[4]

پێغەمبەر(ﷺ) ناوە ناشیرینەکانی دەگۆڕی بە ناوی جوان، لەو بارەیەوە ئیبن قەیم دەڵێت:(لەبەرئەوەی ناوەکان قاڵب و دەلیلی واتاکانن، بۆیە حیکمەت و دانایی وادەخوازێ گونجان و پەیوەستیەک لەنێوان ئەو دوانەدا هەبێت... بەڵکو ناو کاریگەری هەیە لەسەر ناولێنراوەکە لە رووی چاکی و ناشیرینی و خراپی وسووکی و قورسیەوە... پێغەمبەر(ﷺ) بە چاکی زانیوە ناوی جوان بنرێت لە کەس، ئەگەریش کەسێکیان بە پۆستەو پەیام بەر دابنایە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی دەکرد تا ناوی جوان و روخساری باش بێت،[5]... وەک چۆن لە حودەیبیەدا بە هاتنی سوهەیل بۆ رێککەوتن، پێغەمبەر(ﷺ) گەشبینی نواند.[6]

---

[1] -البداية والنهاية لابن كثير، ج٢ص١٦٩-١٧١.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٢١.

[3] معرفة الصحابة لابن منده، ص١٩٦، أسد الغابة، ج١ص٧٣، الاصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٢٤.

[4] أسد الغابة، ج١ص٧٣، الاصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٢٤.

[5] زاد المعاد في هدي خير العباد لأبن القيم، ج٢ص٣٣٦.

[6] زاد المعاد في هدي خير العباد لأبن القيم، ج٢ص٣٣٨.

لە پەیرەوی ژیانی پێغەمبەریشدا(ﷺ) دەبینین ناوی چەندین هاوەڵی گۆڕیوە، بە نموونە:

کچێکی عومەر پێی دەوترا (عاصیە) پێغەمبەر(ﷺ) ناوی نا (جەمیلە).[1]

سەعیدی کوڕی موسەیب دەگێڕێتەوە حەزەنی باپیری چووە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەر(ﷺ)پێی فەرموو: ناوت چیە؟ وتی: ناوم (حەزەن)ە، فەرمووی: بەڵکو تۆ (سەهل)یت، ئەویش وتی: ناوێک باوکم لێی ناوم نایگۆڕم، ئیبنولموسەیب دەڵێت: لەوە بەدواوە هەر خەمباری لەنێوماندا مایەوە.[2]

دەبینین پێغەمبەر(ﷺ) کاتێک ناوی ئیبراهیمی کوڕی دەنێت رەچاوی واتای ناوەکە دەکات و دەفەرموێت (سميته باسم أبي إبراهيم) (بەناوی ئیبراهیمی باوکمەوە ناوم ناوە).

## ٨. ئەبیەض(رضي الله عنه):

ئەم هاوەڵە لە سەرچاوەکاندا تەنها ناوی خۆی هاتووەو رەچەڵەک و ناوی باوک و کەسوکاری نەهاتووە،[3] هەریەک لە ئیبن ئەثیر و ئیبن حەجەر باسیان کردووە.

ئیبن حەجەر دەڵێت: لەوانەیە ئەو هاوەڵە بێت کە پێغەمبەر(ﷺ) ناوی لە ئەسوەدەوە گۆڕی بۆ ئەبیەض،[4] بەڵام وەک پێشتر باسمان کرد ئەوە هاوەڵێکی تر بووە.

ئیبن ئەثیر و ئین حەجەریش گێڕانەوەیەکی ئەبوموسایان هێناوە کە وەلید دەڵێت: لەگەڵ ئەبیەض کە یەکێک بوو لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) چووین بۆ سەردانی پیاوێک،[5] چووینە مزگەوت، سەیرمان کرد خەڵکی

---

[1] صحيح مسلم – كتاب الآداب – باب استحباب تغيير الاسم القبيح إلى حسن، الرقم ٢١٣٩.

[2] صحيح البخاري – كتاب الأدب – باب اسم الحزن، الرقم ٦١٩٠.

[3] اسد الغابة، ج١، ص٧٤، الاصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٥.

[4] الاصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٥.

[5] الاصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٥.

نوێژ دەکەن، منیش وتم: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە بە ئیسلام سوورو ڕەشی (هەموانی) کۆکردەوە، ئەبیەضیش وتی: سوێند بەوەی گیانمی بەدەستە ڕۆژی دوایی نایەت تا لە چی میللەتێکدا هەیە پشکێ لە ئێوەی تیا دەبێت، وتم: دەستپێشخەری دەکەن و لە ئیسلام دەردەچن؟ وتی: (وەک ئێوە نوێژ دەکەن و لە مەجلیستاندا دادەنیشن و لە باری گشتیدا لەگەڵتانن، هەر میللەتێ لەوانەش بەشێکی دەبێ).[1]

## ٩. ئەبیەضی کوڕی حەممال(ﭬ):

ناوی ئەبیەضی کوڕی حەممالی کوڕی مەرثەدی کوڕی ذی لوحیانی عامری کوڕی ذیلعەنبەری کوڕی موعاذی کوڕی شەرحەبیلی کوڕی مەعدانی کوڕی مالیکی کوڕی زەیدە،[2]ئەوەی پێی وتراوە مەئرەبی لەبەر مەئرەبی یەمەنە.[3]

چووەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و خواست و داوای خۆی لای پێغەمبەر(ﷺ) باسکردووە، هەروەها ئەبیەض فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە.

ئەبیەض لەسەردەمی جاهیلیدا سێ کۆیلەی هەبوو کە هەرسێکیان برا بوون، دوای موسڵمانبوونی ئەو سێ برایە ئینجا ئەبیەض موسڵمان بووە،[4] زانیاری نیە لەسەر ئەوەی ئایا ئەبیەض خۆی ئەو سێ برایەی ئازاد کردووە یان نا.

ئەبیەض باس لەوە دەکات چووەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و لەوێ لە خزمەتیدا داوای ئەو خوێیەی لێکردووە کە لە مەئرەب هەیە تا بیکات بە موڵکی، پێغەمبەریش(ﷺ) داواکەی بەجێگەیاندو کردی بە موڵکی، کاتێک ئەبیەض خەریکبوو دەچوو، پیاوێک وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا

[1] اسد الغابة، ج١، ص٧٤.

[2] أسد الغابة، ج١ص٧٢.

[3] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١ص١٣٨، أسد الغابة، ج١ص٧٣.

[4] الطبقات الكبرى لإبن سعد، ج٥، ص٥٢٣.

دەزانیت چیت بۆ بڕیەوە؟ ئەوەی بۆت بڕیەوە ئاوی لەبەر ڕۆیشتووە، پێغەمبەریش(ﷺ) ئەبیەضی گێڕایەوەو ئەو موڵکیەتەی لێ سەندەوە.[1]

هەروەها ئەبیەض دەڵێت: پرسیارم کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) سەبارەت بەوەی چ بەشێکی داری ئەراک بپارێزرێ؟ فەرمووی: (ما لم تنله أخفاف الإبل)،[2] (ئەوەی سمی وشتری پێ نەگەیشتبێ).

ئەبیەض باس لەوە دەکات دەموچاوی وشکهەڵاتوویەکی پێوەبوو کە لووتیشی دیاری کردبوو، پێغەمبەر(ﷺ) بانگی کرد و دەستی هێنا بەسەر دەموچاویدا ئیتر لەو ڕۆژەوە ئەوەی تووش نەبوویەوە، جێدەستی پێغەمبەریشی(ﷺ) پێوە دیار بوو.[3]

سەبارەت بەوەی ئایا ئەمە ئەو ئەسوەدە بوو کە پێغەمبەر(ﷺ) ناوی گۆڕی بە ئەبیەض، ئیبن عەبدولبەر دەڵێت: نازانم ئایا ئەمە ئەو کەسەیە یان نا،[4] بەڵام ئیبن ئەثیر دەڵێت: ڕاستەکەی ئەوەیە ئەو کەسە ئەم ئەبیەضە نیە، چونکە ئەو کەسەی پێغەمبەر(ﷺ) ناوی گۆڕی و کردی بە ئەبیەض چوو بۆ میصر، بەڵام ئەم ئەبیەضە گەڕاوەتەوە بۆ مەئرەب لە یەمەن.[5]

## ١٠. ئەبیەضی کوڕی عەبدورەحمان(رضي الله عنه):

ناوی ئەبیەضی کوڕی عەبدورەحمانی کوڕی نوعمانی کوڕی حارثی کوڕی عەوفی کوڕی کینانەی کوڕی بارقی بارقیە،[6] کونیەکەی ئەبوو عەزیزە،[7] وەک وەفد چووەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ).[8]

[1] مسند الدارمي - كتاب البيوع - باب في القطائع، الرقم ٢٦٥٠.
[2] السنن الكبرى للنسائي - كتاب إحياء الموات - ما يحمى من الأراك، الرقم ٥٧٣٧، حسنه الألباني.
[3] معرفة الصحابة لأبي نعيم الاصبهاني، الرقم ٩٧٢، الطبقات الكبرى لابن سعد، الرقم ٦٧٢٤.
[4] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١ص١٣٨.
[5] أسد الغابة، ج١ص ٧٣.
[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٢٤.
[7] أسد الغابة، ج١ص٧٤، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٢٤.
[8] أسد الغابة، ج١ص٧٤، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٢٤.

## ١١. ئەبیەضی کوڕی هەنی(رضي الله عنه):

ناوی ئەبیەضی کوڕی هەنی کوڕی موعاویە ئەبوو هوبەیرەیە،[١] چوەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، هەروەها بەشداری فەتحی میصری کردووە،[٢]کوڕێکی هەبوو ناوی هوبەیرە بوو کە فەرموودەی لە ئەبیەضی باوکیەوە گێڕاوەتەوە.[٣]

## ١٢. ئەبیەضی کوڕی ئەسومد(رضي الله عنه):

ئەمە یەکێک بوو لەو کەسانەی کە چوون بۆ کوشتنی ئیبن ئەبولحوقەیق.[٤]

ئیبن ئەبولحوقەیق کە ناوی سەلام بوو و بە ئەبوو رافع ناسرابوو، یەکێک بوو لەوانەی خەڵکی هاندەدا تا دژی پێغەمبەر(ﷺ) کۆببنەوە بۆ جەنگی ئەحزاب، موسڵمانان حەزیان دەکرد لەناوی ببەن، پێشتر ئەوسیەکان بە فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) کەعبی کوڕی ئەشرەفیان کوشتبوو، بۆیە خەزرەجیەکانیش حەزیان دەکرد بگەنەوە بە برا ئەوسیەکانیاندا، ئەمەیان بە دەرفەت زانی و دوای جەنگی خەندەق داوایان کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) تا مۆڵەتیان بدات بچن بۆ کوشتنی ئیبن ئەبولحوقەیق کە لە خەیبەر دادەنیشت، پێغەمبەریش(ﷺ) مۆڵەتی پێدان.[٥]

لە سەرچاوەکاندا ناوی پێنج کەس هاتووە کە چووبن، ئەوانیش (عەبدوڵای کوڕی عەتیک، مەسعوودی کوڕی سینان، عەبدوڵای کوڕی ئونەیس، ئەبوو قەتادە حارثی کوڕی ریبعی، خوزاعی کوڕی ئەسوەد) [٦] بەڵام لای ئیبن

---

[١] أسد الغابة، ج١ص٧٤، الاصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٢٤.

[٢] الاصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٢٤.

[٣] أسد الغابة، ج١ص٧٤.

[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٢٣.

[٥] السيرة النبوية لإبن إسحاق، ج٢ص٤٣١، البداية والنهاية، ج٤ص١٣٧.

[٦] السيرة النبوية لإبن إسحاق، ج٢ص٤٣٢، تأريخ الطبري، ج٢ص٥٦، البداية والنهاية، ج٤ص١٣٧.

سەعد[1] و ئیبن شەببە[2] بە ئەسوەدی کوڕی خوزاعی هاتووە.

هەروەها لە بڕێ لە سەرچاوەکانی فەرموودەدا تەنها ناوی عەبدوڵای کوڕی عەتیک هاتووە کە ئەمیریان بووە و ناوی کەسەکانی تر نەهاتووە، بەڵکو دەڵێن دەستەیەک لە هاوەڵان.

ناوی ئەم هاوەڵەش لە کتێبەکانی ژیانی هاوەڵاندا تەنها لای ئیبن حەجەر هاتووە.

جا لەوانەیە جگە لەو پێنج کەسە کەسانێکی تریش چووبن، چونکە ڕەویانی پێی وایە دە کەس بوون چوون.[3]

لەبەرئەوەی ئیبن حەجەر کاتێک ناوی دێنێت هیچ گومانێک لە هاوەڵبوونی ناهێنێت و دەڵێت: بەشداری ئەو هێرشە بووە، هەروەها کتێبەکانی فەرموودەش بە گشتی ناوی عەبدوڵای کوڕی عەتیک دەهێنن لەگەڵ دەستەیەک لە پشتیوانان، ئەو فەرموودەی موسنەدی ڕەویانیش هەیە کە دەڵێت: دە کەس بون، بۆیە بەرپەرچدانەوەی راکەی ئیبن حەجەر شتێکی یەکلا نیە.

ذەهەبی لە کتێبی (تاريخ الإسلام) دا ناوی حارثی کوڕی ئەبیەضی کوڕی ئەسوەد دەهێنێت، ئیتر نازانین مەبەستی بەم هاوەڵەیە یان نا، بەڵام بەپێی مردنەکەی بێت گومان زۆرە کە کوڕی ئەم هاوەڵە بێت، چونکە حارث لەساڵی حەفتاو شەشی کۆچی مردووە.[4]

## ١٣. ئەثبەجی عەبدی(رضي الله عنه):

ئەم هاوەڵە تەنها لای ئیبن حەجەر ناوی هاتووە، ئیبن حەجەر بێ هیچ گومانێک لەسەر هاوەڵبوونی هێناویەتی، هەروەها دەڵێت: ماوەردی لەناو هاوەڵاندا باسی کردووە، گێڕانەوەیەک لە موسنەدی ئەبوداودی طەیالسیدا

[1] الطبقات الكبرى لإبن سعد، ج٢ص٩١.

[2] تأريخ المدينة، الرقم ٧٦٠.

[3] مسند الروياني، الرقم ٢٩٨.

[4] تأريخ الإسلام للذهبي، ج٢٠ص٣٣٠.

دێنێ کە زارع (کە یەکێک بووە لەوانەی بە وەفد چووە بۆ لای پێغەمبەر) برازایەکی خۆی بردووە لەگەڵ خۆیدا، ئەو برازاشی پێی دەوترا ئەثبەج.[1]

## ١٤. ئەثوەبی کوڕی عوتبە(رضي الله عنه):

هەریەک لە ئیبن قانع و ئیبن ئەثیر و ئیبن حەجەر ناویان هێناوە،[2] بەڵام ئیبن مندە و ئیبن عەبدولبەر و ئەبوونوعەیمی ئەصبەهانی ناویان نەهێناوە.

فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) کە دەفەرموێت (الديك الابيض صديقي)،[3] بەڵام دارەقوطنی ئەو سەنەدە بە راست نازانێت.[4]

لە گێڕانەوەی فەرموودەکەدا ئەو سەنەدانەی کە هاتون لەڕێی ئەم هاوەڵانەوەیە (عائیشە، ئەنەسی کوڕی مالیک، عەبدوڵای کوڕی عومەر، ئەبان، ئەبوو زەیدی ئەنصاری، جابری کوڕی عەبدوڵا، عوبەیدەی یەزینی)، تەنها لای ئیبن قانع سەنەدەکە بە ئەثوەب هاتووە، فەرموودەکەش لاوازە.

## ١٥. ئەثیلەی کچی راشید(رضي الله عنها):

ناوی ئەثیلەیە و کچی راشید[5]ە کە کونیەکەی ئەبوو ئەثیلە بوو،[6] ئەمانە خەڵکی حیجاز بوون،[7] راشیدی باوکی لە سەردەمی نەفامیدا ناوی ضالم بوو، پێغەمبەر(ﷺ) ناوی گۆڕی بۆ راشد.[8]

ئەثیلە هاوکاری باوکی بوو و شوانەیی دەکرد.[9]

جارێک ئەثیلە سەرقاڵی مەڕ لەوەراندن بوو، کەسێک بە ناوی حەمەلی

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١،ص٣٠.

[2] معجم الصحابة لابن قانع، ج١، ص٥٩، أسد الغابة، ج١، ص ٨٢، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٠.

[3] معجم الصحابة لابن قانع - أثوب بن عتبة، الرقم ٨٥

[4] أسد الغابة، ج١، ص ٨٢، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٠.

[5] أسد الغابة، ج٣، ص ١٣٩، الإصابة في تمييز الصحابة، ج٣، ص٦٠٢.

[6] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٢، ص٥٠٤.

[7] أسد الغابة، ج٦، ص٩.

[8] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٢، ص٥٠٤.

[9] أسد الغابة، ج٣، ص ١٤٠.

کوڕی مالیکی هوزەلی دای بە لایدا، لەو کاتەدا ئەثیلە بۆ لەوەڕاندنی ئاژەڵەکان پەچەی سەر دەموچاوی لابردبوو، حەمەل کە دەموچاوی ئەثیلەی بینی پێی سەرسام بوو، بۆیە وشترەکەی ڕاگرت و بەستیەوەو چوو بەرەو لای ئەثیلە و ویستی دەستدرێژی بکاتەسەر، ئەثیلە پێی وت: ئەی حەمەل ڕاوەستە و لەسەرخۆ بە، تۆ لە شوێنێکیت و من لە شوێنێکم، بڕۆ لای باوکم داوام بکە، باوکم ناتگێڕێتەوەو جوابت ناکات، بەڵام حەمەل خۆی نەگرت و بەوە ڕازی نەبوو و هەڵمەتی بۆ برد، ئەثیلەش هەڵمەتی برد بۆ حەمەل و خستیە سەرزەوی و لەسەر سنگی دانیشت و وەعدی لێوەرگرت کە وازی لێ بهێنێ، ئینجا هەستایەوەو وازی لێهێنا، بەڵام حەمەل لە وەعدەکەی پاشگەز بوویەوە، تا سێ جار ئەمە ڕوویدا، بۆ جاری سێیەم ئەثیلە کە لەسەر سنگی حەمەل دانیشتبوو فیهرێکی (پارچە بەردێکی) گرتەدەستی و کەوتە لێدانی حەمەل و دای بە سەریدا، ئینجا جێی هێشت و مەڕەکانی بەڕێکرد، پاش کەمێک خەڵکێ لە هۆزەکەی حەمەل دایان بە لای حەمەلدا، وتیان: بۆچی وات لێهاتووە؟ وتی: وشترەکەم وای لێکردم، وتیان: وانیە، وا وشترەکەت بەستراوەتەوەو لەپاڵیشتا فیهر (پارچە بەردێ) هەیە، بەهەرحاڵ بردیانەوە ماڵەوەو مەرگ یەخەی گرت، لە سەرەمەرگیدا وتیان: ئەی حەمەل تۆڵەت لە کێ بکەینەوە؟ وتی: کەس دەستی نیە لە خوێنمدا جگە لە ئەثیلە، کاتێک حەمەل مرد هوذەیل چوون بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و وتیان: خوێنی حەمەل لای ڕاشیدە، پێغەمبەر(ﷺ) ڕاشیدی بانگ کردو پێی فەرموو: (ئەی ڕاشید هوذەیل بانگەشەی ئەوە ئەکەن خوێنی حەمەل لای تۆیە)، ڕاشید وتی: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) من نەمکوشتووە، هوزەیل وتیان: ئەثیلە کوشتوویەتی، ڕاشید وتی: بۆ ئەثیلە ئاگادار نیم، ڕاشید چوو بۆ لای ئەثیلە و پێی وت: (هوزەیل بانگەشەی ئەوە ئەکەن خوێنی حەمەل لای تۆیە)، ئەثیلە وتی: مەگەر ئافرەت پیاو ئەکوژێ؟ بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) درۆی

لەگەڵ ناکرێ، ئەڤیلە چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و باسەکەی بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بارك الله فيك)، خوێنەکەی حەمەلیشی ڕەواکرد و خوێن بایی بۆ دانەنا.[1]

## ١٦. ئەجمەدی کوڕی عەجیان(رضي الله عنه):

ناوی ئەجمەدی کوڕی عەجیان یان عوجیانە،[2] وەک وەفد هاتووەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)،[3] سەرچاوەکان باس لەوە دەکەن نەخشەو پلانی ئەجمەد لە جیزەی میصردا دیارو بەرچاو بووە.[4]

## ١٧. ئەحمەدی کوڕی حەفص(رضي الله عنه):

چەند رایەک هەیە لەسەر ناوی ئەم هاوەڵەی پێغەمبەر(ﷺ)، هەندێ پێیان وایە ناوی ئەحمەدە،[5] هەندێ بە عەبدولحەمید ناوی دەبەن،[6] هەندێکیش دەڵێن ناوی ئەبوو عەمرە،[7] رایەکیش ناوی بە موغیرە دەهێنێت، بەڵام ئیبن حەجەر بەرپەرچی ئەم رایە دەداتەوە،[8] رای راستتر ئەوەیە ناوی ئەحمەد بێت، چونکە لە ئیبراهیمی کوڕی یەعقووبی جوزجانییەوە هاتووە سەبارەت بەناوی ئەبوو عەمر پرسیاری کرد لە ئەبوو هیشامی مەخزوومی کە شارەزایەکی زۆر دیاری نەسەب بو و، وتی: ناوی ئەحمەد بوو.[9]

کونیەکەی ئەبوو عەمرە،[10] رایەکیش دەڵێت: بەڵکو ئەبوو حەفص

---

[1] أسد الغابة، ج٣، ص ١٤٠، الإصابة في تمييز الصحابة، ج٣، ص٦٠٢.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣١.

[3] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١ص١٤٤، أسد الغابة، ج١، ص٨٢، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣١.

[4] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١ص١٤٤، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣١، أسد الغابة، ج١، ص٨٢.

[5] أسدالغابة، ج١ص٨٤ الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣١.

[6] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٤، ص١٧١٩.

[7] أسدالغابة، ج٦ص٢٤٠، الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٢٨٧.

[8] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٦، ص٣٧١.

[9] أسدالغابة، ج١ص٨٤ الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣١.

[10] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٤، ص١٧١٩، أسدالغابة، ج١ص٨٤ الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣١.

کونیەکەیەتی،[١] دەشوترێ ئەبووئەحمەد کونیەکەی بووە،[٢] لە گێڕانەوەیەکیشدا بە ئەبووبەکر هاتووە.[٣]

باوکی ناوی حەفصی کوڕی موغیرەی کوڕی عەبدوڵای کوڕی عومەری کوڕی مەخزوومی قورەیشیە،[٤] دایکیشی ناوی دوررەی کچی خوزاعی کوڕی حارثی کوڕی حوەیرثی ثەقەفییە.[٥]

ژنەکەی ناوی فاطیمەی کچی قەیسی کوڕی خالیدی قورەیشی فەهریە[٦] کە خوشکی ضەحاکی کوڕی قەیسە،[٧] فاطمە لە دەستەی یەکەمی کۆچەران بوو، ژیری و جوانیەکی زۆری هەبوو.[٨]

ئەحمەد لە مەدینە نیشتەجێ،[٩] کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) عەلی(ﷺ) وەک ئەمیر نارد بۆ یەمەن، ئەبوعەمریشی(ئەحمەد) لەگەڵیدا نارد، لەوێ ئەبووعەمر مایەوەو هەر لەوێش فاطیمەی کچی قەیسی تەڵاقدا،[١٠] بەڵام لە گێڕانەوەیەکی موسلیمدا هاتووە کە پێش چوونی بۆ یەمەن هەر سێ جار تەڵاقی داوە،[١١] ئەوەشی بە وەکیلێکدا ئەنجامدا،[١٢]ئەوەبوو فاطمە داوای نەفەقەی کرد،[١٣] بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (لانفقة لک)، (هیچ نەفەقەیەکت بۆ نیە)[١٤]بە ریوایەتێکی تر فەرمووی: (لیس لك علیه نفقة)، [١٥] (خەرجی و نەفەقەت لەسەر ئەو نیە).

[١] أسدالغابة، ج١ص٨٤، الإصابة في تمييز الصحابة، ج٦، ص٣٧١،
[٢] أسدالغابة، ج٢، ص٤٤.
[٣] الإصابة في تمييز الصحابة،ج٨، ص٦٩.
[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤، ص٢٨٠.
[٥] أسدالغابة، ج١ص٨٤
[٦] أسدالغابة، ج٧، ص٢٤٨.
[٧] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٨، ص٦٩.
[٨] أسدالغابة، ج٧، ص٢٤٨، الإصابة في تمييز الصحابة، ج٨، ص٦٩.
[٩] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٢٨٧.
[١٠] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٤، ص١٧١٩.
[١١] صحيح مسلم – كتاب الطلاق – باب المطلقة ثلاثا لا نفقة لها، الرقم ١٤٨٠.
[١٢] أسدالغابة، ج٦، ص٢٤١.
[١٣] الإصابة في تمييز الصحابة،ج٨، ص٦٩.
[١٤] صحيح مسلم – كتاب الطلاق – باب المطلقة ثلاثا لا نفقة لها، الرقم ١٤٨٠.
[١٥] أسدالغابة ج٦ص٢٤١.

پێغەمبەر(ﷺ) داوای کرد لە فاطمەی کچی قەیس تا ماوەی عیددەکەی (واتە ماوەی پاش تەڵاق) لە ماڵی ئیبن ئوم مەکتوم بمێنێتەوە،[1] دواتر دوو کەس چوونە داوای فاطیمە، یەکێکیان ناوی موعاویە بوو (ئەمە موعاویەی کوڕی ئەبوو سوفیان نەبوو، چونکە دەکەونە ئەو هەڵەوە)،[2] ئەوی تریشیان ئەبوو جەهم بوو، فاطمە هات و راوبۆچوونی پێغەمبەری(ﷺ) وەرگرت، ئەویش فەرمووی: (أما أبُو جهْمٍ فلا يضعُ عصاهُ عنْ عاتِقِهِ، وأما مُعاوِيةُ فصُعْلُوكٌ لا مال لهُ)، (سەبارەت بە ئەبووجەهم ئەوە هەر داردەسەکەی لەسەرشانی داناگرێت، موعاویە دەست بەتاڵەو هیچ سامانێکی نیە)، پاشان رێنمایی کرد شوو بکات بە ئوسامەی کوڕی زەید، فاطیمەش رازی بوو و شووی کرد بە ئوسامە.[3]

ئەبووعەمر هەر لە یەمەن مایەوە تا لەوێ مرد،[4] رایەکی تر دەڵێت: بەڵکو ماوەیەک دوای ئەوەش ژیا تا بەشداری فەتحی شامی کرد.[5]

گێڕانەوەیەک هاتووە کە عومەری کوڕی خەطاب(ﷺ) رۆژی (جابیە) وتاری دەدا وتی: داوای پۆزشتان لێدەکەم سەبارەت بە خالیدی کوڕی وەلید، چونکە سامانی داوە بە کەسی بەهێز و خانەدان، بۆیە منیش لامبرد و ئەبوو عوبەیدەم دانا، ئەبووعەمر (ئەحمەد)ی کوڕی حەفص وتی: سوێند بەخوا ئەی عومەر بڕیارەکەت جێی پۆزش نەبوو، تۆ کاربەدەستێکت لابردووە کە پێغەمبەر(ﷺ) دایدنابوو، شمشێرێکت خستە کالان کە خوا هەڵیکردبوو، ئاڵایەکت داگرت کە پێغەمبەر(ﷺ) هەڵیکردبوو، تۆ پەیوەندی خزمایەتیت پچڕاند و حەسوودیت هەبوو بەرامبەر ئامۆزاکەم، عومەر(ﷺ) لە وەڵامدا پێی وت: تۆ خزمایەتی نزکیت لەگەڵی هەیە و تەمەنت زۆر نیە و دەمارگیریشت هەیە بۆ ئامۆزاکەت.[6]

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة،ج٨، ص٦٩.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة،ج٦، ص٣٠٣.

[3] صحيح مسلم – كتاب الطلاق – باب المطلقة ثلاثا لا نفقة لها، الرقم ١٤٨٠.

[4] أسدالغابة ج٦ص٢٤٠، الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٢٨٧.

[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٢٨٧.

[6] أسدالغابة، ج١ص٨٤

## ١٨. ئەحمەر ئەبووعەسیب(رضي الله عنه):

ئەم هاوەڵە مەولای پێغەمبەری خوایە(ﷺ)[١]و ناوی ئەحمەرە،[٢] بەڵام سەبارەت بە باوكی رای جیاواز هەیە، ئیبن عەبدولبەر بە ئەحمەری كوڕی عەسیب هاتووە،[٣] بەڵام لای ئیبن ئەثیر و ئیبن حەجەر بە ئەحمەر ئەبوو عەسیب ناوی دەبەن،[٤] ئیبن حەجەر دەڵێت: لەوانەیە ئەبوو عەسیب ناوی باوكی بێت،[٥] بەڵام ئیبن ئەثیر ئەبووعەسیبی وەك كونیەی ئەحمەر هێناوە.[٦]

ئیبن كەثیر بە ئەبووعەشیب ناوی دەبات،[٧] كچێكی هەبوو ناوی مەیموونە.[٨]

ئەبووعەسیب زۆرجار شەوانە لە مزگەوت دەمایەوەو تێكەڵی ئەهلی صوففەی دەكرد.[٩]

ئەحمەر فەرمودەیەكی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێراوەتەوە سەبارەت بە تاو طاعوون، دەڵێت: لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیست فەرمووی: (أتانِي جِبْرِيلُ بِالحُمى والطاعُونِ، فأمْسكْتُ الحُمى بِالْمدِينةِ، وأرْسلْتُ الطاعُون إِلى الشامِ، فالطاعُونُ شهادةٌ لِأُمتِي ورحْمةٌ، ورِجْسٌ على الْكافِرِ)[١٠] (جبریل علیە السلام هات بۆ لام و تا و طاعوونی لەگەڵ خۆی هێنابوو، منیش تام لە مەدینە هێشتەوەو طاعوونم نارد بۆ شام، تاعوون شەهیدی و رەحمەتە بۆ ئوممەتەكەم و بۆ بێباوەرانیش سزایە).

---

[١] أسدالغابة،ج١ص٨٦ الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٢٧٥.
[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٢.
[٣] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١ص٧١.
[٤] أسدالغابة،ج١ص٨٦ الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٢.
[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٢.
[٦] أسدالغابة،ج١ص٨٦.
[٧] البدايةو النهاية، ج٥، ص٣٢٢.
[٨] سير أعلام النبلاء، ج٢ص٤٧٥.
[٩] حلية الأولياء لأبى نعيم، ج٢،ص٢٧.
[١٠] مسند أحمد بن حنبل – مسند البصريين(رضي الله عنه) – حديث أبي عسيب(رضي الله عنه)، الرقم ٢١٠٩٩، صححه الألباني في السلسلة الصحيحة، الرقم ٧٦١.

لە فەرموودەیەکی تردا دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) شەوێک چوویە دەر و منی بانگ کرد، منیش لەگەڵی چوومە دەرەوە، پاشان دای بە لای ئەبووبەکردا و بانگی کرد و ئەویش هاتەدەرەوە، پاشان دای بە لای عومەردا و بانگی کرد و ئەویش هاتە دەرەوە، پێغەمبەر(ﷺ) چوو تا چووە ناو حەوشەیەکی پشتیوانیەک..[1]

ئەبوو عەسیب لە رۆژی وەفاتی پێغەمبەردا(ﷺ) ئامادەی نوێژ لەسەرکردن و ئەسپەردەکردنی بوو.[2]

ئەبوو عەسیب دواتر چوویە بەصرەو لەوێ نیشتەجێ بوو و تەمەنێکی زۆر ژیا.[3]

مەیموونەی کچی دەڵێت: ئەبوو عەسیب بەسەر یەکەوە سێ رۆژ رۆژووی دەگرت، رۆژانی (البیض) یش رۆژووی دەگرت، نوێژی چێشتەنگاشی دەکرد، کاتێک پیر بوو و پەکی کەوت بە دانیشتنەوە نوێژی دەکرد، لە شوێنی خەوەکەشیدا (جلجل)[4] ێکی دانابوو کە نەیدەتوانی بانگم بکات بەوە ئاگاداری دەکردمەوە.[5]

## ١٩. ئەحمەری کوڕی سەلیم(ﷺ):

ناوی ئەحمەری کوڕی سەلیمە، دەشوترێ سەلیمی کوڕی ئەحمەر،[6] یەزیدی کوڕی شخیر فەرموودەی لێوە گێڕاوەتەوە.[7]

لای هەریەک لە ئیبن عەبدولبەر و ئیبن ئەثیر و ئیبن حەجەر ناوی هاتووە، ئیبن عەبدولبەر ئەم فەرموودەی هێناوە کە ئەحمەری کوڕی سەلیم

---

[1] حلیة الأولیاء لأبي نعیم، ج٢، ص٢٧-٢٨، البدایة و النهایة، ج٥، ص٣٢٣.

[2] البدایةو النهایة، ج٥، ص٣٢٢.

[3] سیر أعلام النبلاء، ج٣، ص٤٧٥.

[4] شتێک بوو کە دەیلەراندەوە دەنگی بەرزدەبوویەوە.

[5] سیر أعلام النبلاء، ج٢، ص٤٧٥، البدایة و النهایة، ج٥، ص٣٢٣.

[6] الإصابة في تمییز الصحابة، ج١ص٣٢، أسدالغابة، ج١ص٨٥.

[7] أسدالغابة، ج١ص٨٥.

ریوایەتی کردووە[1] کە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت (إن الله ليبتلي العبد بما أعطاه فمن رضى بما قسم الله له بارك له فيه ووسعه ومن لم يرض لم يبارك له فيه)،[2] (خوای گەورە بەندەکەی تاقی دەکاتەوە بەوەی پێی بەخشیوە، جاهەرکەس بەو بەشە رازی بێت کە خوا بۆی بڕیوەتەوە، ئەوە بەرەکەت دەخاتە بەشەکەیەوە و زیادو فراوانی دەکات، هەرکەسیش رازی نەبێت ئەوە خوا بەرەکەت ناخاتە بەشەکەیەوە).

بەپێی سەنەدی ئەم فەرموودەیە ئەحمەر لە بەنی سولەیم بووە.

## ٢٠. ئەحمەری کوڕی قەطەن(رضي الله عنه):

ناوی ئەحمەری کوڕی قەطەنی هەمەدانیە،[3] بەشداری فەتحی میسری کردووە،[4] کەسێکی بە تەمەنیش بووە.[5]

## ٢١. ئەحمەری کوڕی جەزء(رضي الله عنه):

ناوی ئەحمەری کوڕی جەزء یان جەزیئی[6] یان جیزیئی[7] کوڕی ثەعلەبەی کوڕی زەیدی کوڕی مالیکی کوڕی سینانی سدوسیە.[8]

بەڵام ئیبن عەبدولبەر پێی وایە ئەحمەری کوڕی جەزئی کوڕی موعاویەی کوڕی سولەیمانی مەولای حارثی سدوسیە،[9] ئیبنولقانعیش پێی وایە ئەحمەری کوڕی سوادی کوڕی جەزی کوڕی عەوفی کوڕی عەمری

---

[1] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٧٢.

[2] مسند أحمد بن حنبل - مسند البصريين(رضي الله عنه) - حديث رجل من بني سليم، الرقم ٢٠٦٠٤، صححه شعيب الأرناؤوط، وصححه الألباني في السلسلة الصحيحة، الرقم ١٦٥٨.

[3] أسدالغابة،ج١ص٨٦ الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٢.

[4] أسدالغابة،ج١ص٨٦

[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٢.

[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٣٢.

[7] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٧١.

[8] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٣٢.

[9] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٧١.

کوڕی سدوسی کوڕی شەیبانە.[1]

ئەم هاوەڵە چووەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)و فەرموودەیەکیشی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە،[2]حەسەنی بەصریش فەرموودەی لەم هاوەڵەوە گێڕاوەتەوە.[3]

## ٢٢. ئەحمەری کوڕی سەواء(رضي الله عنه):

ناوی ئەحمەری کوڕی سەوائی کوڕی عەدی کوڕی موررەی کوڕی حومرانی کوڕی عەوفی کوڕی عەمرە،[4] ئەم هاوەڵە لە کووفە دادەنیشت،[5] ئیادی کوڕی لقیط بە تەنها فەرموودەی لێوە گێڕاوەتەوە.[6]

ئەحمەر لەپێش موسڵمان بوونیدا بتێکی هەبوو کە دەیپەرست و بەخوای خۆی دەزانی، جارێک چوو بۆ لای بتەکەی و هەڵیگرت و بردی خستیە ناو بیرێکەوە، دواتر چوویە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمان بوو و بەیعەتی پێدا.[7]

## ٢٣. ئەحمەری کوڕی مازن(رضي الله عنه):

ناوی ئەحمەری کوڕی مازنی کوڕی ئەوسی کوڕی نابغەیە، لە دوای جەنگی حونەین بە وەفد هاتۆتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، تەنها ئیبن حەجەر باسی کردووە.[8]

---

[1] معجم الصحابة، ج١، ص٥٧.
[2] مسند أحمد بن حنبل – أول مسند الكوفيين(رضي الله عنه) – حديث أحمر بن جزي(رضي الله عنه)، الرقم ١٩٣١٧.
[3] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٧١، أسدالغابة، ج١ص٨٤
[4] أسدالغابة، ج١، ص٨٥ الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٢.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٢.
[6] أسدالغابة، ج١، ص٨٥ الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٢.
[7] أسدالغابة، ج١، ص٨٥ الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٢.
[8] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٢.

## ٢٤. ئەحمەری کوڕی موعاویە(رضي الله عنه):

ناوی ئەحمەری کوڕی موعاویەی کوڕی سەلیمی کوڕی لوئەی کوڕی حارثە،[1] رایەکی تر هەیە دەڵێت: ناوی موررە بووە،[2] کونیەکەی لای ئیبن حەجەر بە ئەبووشەعیل هاتووە،[3] بەڵام لای ئیبن ئەثیر کونیەکەی ئەبوو شیعبەلە،[4] سەر بە بەنوتەمیمە،[5]لەناو هاوەڵە کوفیەکاندا ناوی هاتووە.[6]

ئەحمەر کوڕێکی هەبوو بە ناوی شیعبەل کە ئەویش هاوەڵ بوو.[7]

ئەحمەر وەک وەفدی بەنی تەمیم هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)و پاش موسڵمان بوونیشی لەکاتی گەڕانەوەیدا پێغەمبەر(ﷺ) نامەیەکی پەنادانی بۆ خۆی و شیعبەلی کوڕی نووسی[8] کە تیایدا هاتبوو (هذا كتاب لأحمر بن معاوية وشعبل بن أحمر في رحالهم وأموالهم فمن آذاهم فذمة الله منه خلية إن كانوا صادقين) عەلی کوڕی ئەبوو طالیب ئەو نامەی نووسی و مۆری پێغەمبەری(ﷺ) لێدا.[9]

## ٢٥. ئەحمەری مەولای پێغەمبەر(ﷺ)

سەبارەت بە ناوی ئەم هاوەڵە رای زۆر هەیە، ئیبن حەجەر بیست و یەک ناو دێنێت (مهران، طهمان، مروان، نجران، رومان، ذكوان، كيسان، سليمان، سنة، أيمن، مرقنة، أحمر، أحمد، رباح، مفلح، عمير، معتب، قيس، عبس، عيسى)،[10] بەڵام زیاتر بە سەفینە ناسراوە، هەریەک لە ئیبن ئەثیر و ئیبن

---

[1] أسدالغابة،ج١ص٨٦، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٣.
[2] أسدالغابة،ج١ص٨٦
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٣.
[4] أسدالغابة،ج١ص٨٦
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٣.
[6] أسدالغابة،ج١ص٨٦
[7] أسدالغابة،ج١ص٨٦، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٣.
[8] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٣.
[9] أسدالغابة، ج١ص٨٦
[10] الإصابة في معرفة الصحابة، ج٣، ص١٣٢.

حەجەر لە ریزبەندی هاوەڵاندا لە پیتی (أ)و (س)دا باسیان کردووە،[1] بەڵام ئیبن عەبدولبەر بەس لە پیتی(س) دا باسی کردووە،[2] ئەبوو نوعەیمیش لە پیتی (أ)دا باسی کردووە.[3]

سەبارەت بە کونیەکەشی دوو کونیە هاتووە: عەبدورەحمان و ئەبولبوختەری،[4] بەڵام یەکەمیان لە راستیەوە نزیکترە.[5]

سەبارەت بە رەچەڵەکی ئەم هاوەڵە رای جیاواز هەیە، رایەک پێی وایە فارس بووە،[6] واقیدیش پێی وایە لە نەوەی ئەعرابە،[7]رایەکیش پێی وایە عەرەبە.[8]

ناوبانگی بە سەفینە بووە چونکە لە سەفەرێکدا لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) شمەکی موسڵمانانی گواستەوەو پێغەمبەریش(ﷺ) پێی فەرمووە (أنت سفينة)،[9] سەفینە ئەڵێت ئەو رۆژە باری وشترێکم هەڵگرتایە لەسەرم قورس نەئەبوو.[10]

ئەم هاوەڵە سەرەتا کۆیلەیەکی فارسی بوو و ئوموسەلەمە ئەوی کڕی،[11] دواتر ئازادی کرد بەو مەرجەی خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) بکات،[12] هەرچەندە هەندێ پێیان وایە پێغەمبەر(ﷺ) ئازادی کردووە،[13] بەڵام خۆی دەڵێت: ئوموسەلەمە ئازادی کردم و مەرجی لەسەر دانام خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) بکەم.[14]

---

[1] أسد الغابة، ج١ص٨٥ و ج٢ص٤٨١، الإصابة في معرفة الصحابة، ج١، ص٣٢ و ج٣، ص١٣٢.
[2] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٢، ص٦٨٥.
[3] معرفة الصحابة لإبي نعيم، الرقم ٩٦٧.
[4] أسد الغابة، ج٢،ص٤٨١.
[5] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٢، ص٦٨٤، أسد الغابة، ج٢،ص٤٨١.
[6] الإصابة في معرفة الصحابة، ج٣، ص١٣٢.
[7] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٢، ص٦٨٥.
[8] أسد الغابة، ج٢،ص٤٨١.
[9] مسند أحمد بن حنبل - مسند الأنصار(ﷺ) - حديث أبي عبد الرحمن سفينة مولى رسول الله(ﷺ)، الرقم ٢٢٣٤٧، وقد صححه الألباني في السلسلة الصحيحة، الرقم ٢٩٥٩.
[10] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٢، ص٦٨٥.
[11] الإصابة في معرفة الصحابة، ج٣، ص١٣٢.
[12] حلية الأولياء، ج١، ص٣٦٩، الإصابة في معرفة الصحابة، ج٣، ص١٣٢.
[13] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٢، ص٦٨٤.
[14] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٢، ص٦٨٥.

ئەم هاوەڵە خۆی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) ناوی ناوم سەفینە و جگە لەو ناوەش ناوی ترم ناوێت،[15] بەڵام لە گێرانەوەیەکدا کە حاکم هێناویەتی سەفینە بە حەشرەج دەڵێت: من ناوی خۆمت پێ دەڵێم، من ناوم قەیس بوو و پێغەمبەر(ﷺ) ناوی نام سەفینە.[16]

سەفینە لەناو ئەهلی صوففەدا بوو،[17] شوێنی نیشتەجێبوونی لە (بطن نخلە) بوو.[18]

جارێک ئەحمەر لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)وهاوەڵانێکی چوون بۆ غەزا، لە دۆڵێک یان رووبارێکدا ئەحمەر خەریک بوو خەڵکی دەپەڕاندەوە، پێغەمبەر(ﷺ) کە ئەوەی دی پێی فەرموو: (ما كنت اليوم الا سفينة)،[19] (ئەمڕۆ تۆ سەفینە بوویت).

سەفینە دەڵێت: جارێک لەسەر بەلەم بووم کە بەلەمەکە شکا، چوومە سەر پارچە دارێ، کە گەیشتمە کەناراو شێرێ هات بۆم، منیش وتم: ئەی ئەبولحارث من سەفینەم مەولای پێغەمبەری خوام(ﷺ)، ئەویش سەرێکی لەقاند و بە لاشانی پاڵی پێوەنام تا بردمیە سەر رێگەکە، ئەوکات دەنگێکی لێوە هات کە دەمزانی مەبەستی ماڵئاوایی کردنە لێم.[20]

سەفینە فەرموودەی ماوەی خیلافەتی گێڕاوەتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت:(الخِلافةُ فِي أُمتِي ثلاثُون سنة ثُم مُلْكٌ بعْد ذلِك)[21] (خیلافەت لە ئوممەتەکەمدا سی ساڵ دەبێت، دواتر دوای ئەوە دەبێتە پاشایەتی).

---

[15] حلية الأولياء، ج١، ص٣٦٩.

[16] المستدرك على الصحيحين، الرقم ٦٦٢٥.

[17] حلية الأولياء، ج١، ص٣٦٨.

[18] أسد الغابة، ج٢،ص٤٨١.

[19] مسند أحمد بن حنبل – مسند الأنصار(ﷺ) – حديث أبي عبد الرحمن سفينة مولى رسول الله(ﷺ)، الرقم ٢٢٣٤٢، قال شعيب الأرناؤوط في تعليقاته على مسند أحمد بن حنبل حديث حسن و هذا إسناد ضعيف.

[20] أسد الغابة، ج٢،ص٤٨١.

[21] جامع الترمذي – أبواب الفتن عن رسول الله(ﷺ) – باب ما جاء في الخلافة، الرقم ٢٢٢٦ وقال حديث حسن.

سەفینە ماوەی دە ساڵ لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) ژیا،[1] پاش وەفاتی پێغەمبەریش(ﷺ) ژیا تا لە سەردەمی حەجاجدا کۆچی دوایی کرد.[2]

هەرچیەک لە خوا و پێغەمبەری خواوە بێت لە هەموو شتێکی تر باشترە، ئاخۆ سەرچاوەی کەمال و حەقیقەت بەرهەمی کەموکورتی لێدەکەوێتەوە؟ نا، پەنا بەخوا، هیچکات شتێکی جوانتر و باشتر لە فەرمایشتی خوا و پێغەمبەرەکەی نیە، هەر ئەم روانینە وای لە سەفینە کردووە هیچ ناوێکی تر قبوڵ نەکات جگە لەو ناوەی پێغەمبەر(ﷺ)، ئەمە رەنگدانەوەی پەیوەستبوونی هاوەڵانە بە فەرمایشتی خوا و پێغەمبەر(ﷺ)، ئەمە رەوشتی هاوەڵان بووە.

## ٣٦. ئەحمەری(رضي الله عنه):

هەریەک لە ئیبن قانع و ئیبن ئەثیر و ئیبن حەجەر و ئەبوو نوعەیم باسیان کردووە.[3]

ناوی ئەم هاوەڵە نازانرێ، لەوانەیە ئەحمەری وەک نازناوێ بێت،[4] لەنێو هاوەڵە مەدەنیەکاندا ئەژمارد ئەکرێت.[5]

ئەحمەری دەڵێت: من بەڵێنم دابوو بە ژنەکەم بیبەم بۆ عومرە، لە دەقێکی تردا هاتووە (بەڵێنم پێ دابوو بیبەم بۆ حەجێک)، بەڵام چووم بۆ غەزا، ژنەکەم زۆر بەوە دڵگران بوو، منیش سکاڵام بردە لای پێغەمبەر(ﷺ) و مەسەلەکەم بۆ باسکرد، ئەویش فەرمووی: **(مرها فلتعتمر في رمضان، فإنها تعدل حجة)**،[6] (بیبە با لە رەمەزاندا عومرە بکات چونکە ئەو عومرەی رەمەزان هاوتای حەجێکە).

---

[1] حلية الأولياء، ج١، ص٣٦٨.

[2] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٢، ص٦٨٥.

[3] معجم الصحابة، ج١، ص٧١، أسدالغابة، ج١، ص٨٧، معرفة الصحابة لأبي نعيم، الرقم ٩٧٠.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٣.

[5] أسدالغابة، ج١، ص٨٧، معرفة الصحابة لأبي نعيم، الرقم ٩٧٠.

[6] معجم الصحابة، ج١، ص٧١، أسدالغابة، ج١، ص٨٧، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٣.

ئیبـن تەیمیـە دەڵێـت: (مەبەسـتی پێغەمبـەر(ﷺ) بـە (عمـرة فـي رمضـان تعـدل حجـة معـي) ئەوەیـە کـە عومرەکـەت لـە رەمەزانـدا هاوتـای حەجێکـە لەگـەڵ منـدا چونکـە ئـەو ئافرەتـە ویسـتوویەتی حەجی لەگەڵـدا بـکات، بـەڵام بـۆی نەگونجـاوە، بۆیـە پێغەمبـەر(ﷺ) وای پـێ فەرمـووە،... هەنـدێ نـەزان پێیـان وایـە عومـرەی یەکێـک لـە ئێمـە لـە میقاتـدا یـان لـە مەککـە هاوتـای حەجێکـە لەگەڵیـدا، دیـارو روونـە حەجـی تـەواو زۆر باشـترە لـە عومـرەی رەمـەزان، ئەگـەر یەکێـک لـە ئێمـە حەجـی فـەرز بەجێبگەیەنـێ وەک حەجـێ نیـە لەگـەڵ پێغەمبـەر(ﷺ)، ئیتـر چۆن عومرەیـەک هاوتـای حەجـێ بـێ لەگـەڵ پێغەمبـەردا(ﷺ)، مەبەسـتی فەرموودەکـە ئەوەیـە عومـرەی یەکێکمـان لـە رەمەزانـدا لـە میقاتـدا لەئاسـت حەجـێ بێـت، ئەمـەش بـۆ کەسـێک وا دەوتـرێ کـە ویسـتبێتی حـەج بـکات و بـۆی نەچووبێتەسـەر ئیتـر بـە نیـازی حـەج لەگەڵ عومـرەی رەمەزانـدا بـڕوات، هەردووکیـان پێکـەوە پاداشـتی حەجێکیـان هەیـە نـەک یەکێکیـان بـە تەنهـا.[١]

## ٣٧. ئەحوەصی کوڕی مەسعوود(ﷺ):

نـاوی ئەحوەصـی کـوڕی مەسـعوودی[٢] کـوڕی کەعبـی کـوڕی عامـری کـوڕی عـەدی کـوڕی مجدعـەی کـوڕی حارثـەی کـوڕی حارثـی کـوڕی خەزرەجی کوڕی عەمری کوڕی مالیکی کوڕی ئەوسـە،[٣] یەکێکە لە هاوەڵە پشـتیوانیەکان، بـرای محیصـە و حەوەیصەیە،[٤]بەشـداری غـەزای ئوحـود و غەزاکانـی تـری دوای ئوحودیشـی کـردووە.[٥]

---

[١] مجموع الفتاوى لشيخ الإسلام ابن تيمية، ج٢٦، ص٢٩٣-٢٩٤.
[٢] أسدالغابة، ج١، ص٨٨ الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٤.
[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص١٤٣.
[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٤.
[٥] أسدالغابة، ج١، ص٨٨.

## ٣٨. ئەخرەم(رضي الله عنه):

ئەخـرەم بـە سـوارچاكی پێغەمبـەر(صلى الله عليه وسلم) ناسـراوە،[١] بـە ئەخـرەم نـاوی دەركـردووە،[٢] بـەڵام نـاوی موحریـزی كـوڕی نەضلهـی كـوڕی عەبـدوڵای كـوڕی مـوررەی كـوڕی كەبیـری كـوڕی غەنمـی كـوڕی دودانـی ئەسـەدیە،[٣] كونیەكەشـی ئەبوونەضلهیە،[٤]هاوپەیمانـی بەنـی عەبدشـەمس بـووە، بەنـو عەبدولئەشـهەل بـاس لـەوە دەكـەن هاوپەیمانـی ئـەوان بـووە.[٥]

ئـەم هاوەڵـە لـە كۆچەرانـە،[٦] نازناوێكیشـی هەبـووە كـە پێـی وتـراوە (فهیـرة)،[٧] ئیبـن كەثیـر ئەڵێـت پێـی وتـراوە قومەیر،[٨]موحریـز كەسـێكی سـپی رەنـگ بـوو و دەموچاوێكـی زۆر جوانـی هەبـوو.[٩]

كاتێـك موسـڵمانان بـە فەرمانـی پێغەمبـەر(صلى الله عليه وسلم) كۆچیـان كـرد بـۆ مەدینـە، موسـڵمانانی بەنـو غەنمیـش كۆچیـان كـرد بـۆ مەدینـە، موحریـزی كـوڕی نەضلهـش لەگەڵیـان بـوو.[١٠]

موحریـز برایەكـی هەبـوو بەنـاوی موحەممەد، ئەویـش هاوەڵـی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بـوو و لەگـەڵ موحریـزی برایـدا كۆچـی كـرد بـۆ مەدینـە.[١١]

كاتێـك پێغەمبـەر(صلى الله عليه وسلم) برایەتـی خسـتە نێـوان كۆچـەران و پشـتیوانانەوە، ئەخـرەم و عومـارەی كـوڕی حەزمـی ئەنصـاری كـرد بـە بـرای یـەك.[١٢]

[١] أسد الغابة، ج١، ص٨٨، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٧.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٥، ص٧٨٣.

[٣] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٣، ص١٣٦٤، الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٩٥.

[٤] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٩٥.

[٥] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٣، ص ١٣٦٤.

[٦] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٤٨٦، أسد الغابة، ج٤، ص١٤٧، ج٥، ص٧٥.

[٧] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٣، ص ١٣٦٥.

[٨] البداية والنهاية لإبن كثير، ج٤، ص١٥٠.

[٩] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٩٥.

[١٠] أسد الغابة، ج٥، ص٧٥.

[١١] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٦٤٠.

[١٢] أسد الغابة، ج٤، ص١٤٧.

ئەخرەم بەشداری هەر سێ غەزای بەدر و ئوحود و خەندەقی کرد.

لە غەزای ذی قەرەد لە ساڵی شەشی کۆچی و لە تەمەنی سی و حەوت یان سی و هەشت ساڵیدا شەهید بوو.[1]

موحریز باس لەوە دەکات کە خەوی دیوە ئاسمانی دنیای بۆ کراوەتەوە و ئەویش چوەتە ناوی تا گەیشتوەتە ئاسمانی پێنجەم تا گەیشتوەتە (سدرة المنتهی)، دەڵێت: پێم وترا ئەوە شوێنی تۆیە، بەیانی چووم بۆ لای ئەبووبەکر کە لە هەموان شارەزاتریی زیاتر بوو بە لێکدانەوەی خەو، کاتێک خەوەکەم بۆ گێڕایەوە وتی: موژدەت لێ بێت شەهیدیت پێ دەبەخشرێ، ئەوەبوو رۆژێ دوای ئەوە شەهید بوو.[2]

غەزای ذی قەرەد ئەو غەزایە بوو کە عویەینەی کوڕی حصنی فەزازی بە بڕێ سوارەوە هەڵیکوتایە سەر وشترەکانی پێغەمبەر(ﷺ)، پیاوێکی بەنی غیفار لەگەڵ خێزانەکەی لای ئەو وشترانە بوو، شاڵاوبەرەکان ئەو پیاوەیان کوشت و ژنەکەیشیان بە وشترەکانەوە برد، لەو کاتەدا سەلەمەی کوڕی عەمری ئەسلەمی ئەوەی بینی و کۆیلەیەکی طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵاشی لەگەڵدا بوو کە بڕێ ئەسپی پێ بوو، کە گەیشتە (ثنیة الوداع) و ئەوەی بینی هاواری کرد (واصباحاه)، ئینجا کەوتە شوێن ئەو شاڵاوبەرە بێباوەڕانە و تیربارانی ئەکردن، هاوارەکەی ئیبنولئەکوەع گەیشتە پێغەمبەر(ﷺ) و ئەویش هاوەڵانی ئاگادار کردەوە و بڕێ لە هاوەڵان گوێیان لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو و خێرا چوونە خزمەتی، لەوانە موحریزی کوڕی نەضلە، پێغەمبەر(ﷺ) سەعدی کوڕی زەیدی کرد بە ئەمیریان، یەکەم کەس گەیشت بەو شاڵاوبەرانە موحریز بوو، موحریز سواری ئەسپێ بووبوو کە هی مەحموودی کوڕی مەسلەمە بوو،[3]

---

[1] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٣، ص ١٣٦٥.

[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٩٨.

[3] البداية والنهاية لإبن كثير، ج٤، ص١٥٠.

کاتێک گەیشت بە دوژمن پێی وتن ئەی گرۆی بەنی لوکەیعە بوەستن تا کۆچەران و پشتیوانان کە بەدواتانەوەن پێتان ئەگەن.[1]

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع دەڵێت: جڵەوی ئەسپەکەی ئەخرەمم گرت و پێم وت: ئەی ئەخرەم وریایان بە تا پێغەمبەر(ﷺ)و هاوەڵانی دەگەن، ئەخرەم وتی: ئەی سەلەمە ئەگەر بڕوات هەیە بەخوا و ڕۆژی دوایی و دەزانیت بەهەشت حەقە و دۆزەخ حەقە، مەکەوەرە نێوان من و شەهیدبوونمەوە (ڕێی شەهیدیم لێمەگرە)، سەلەمە ئەڵێت منیش وازم لێهێنا، ئەخرەم چوو تا گەیشت بە عەبدورەحمان و لەگەڵی جەنگا و ئەسپەکەی عەبدورەحمانی بریندار کرد، عەبدورەحمانیش دای لە ئەخرەم و کوشتی و چووە سەر ئەسپەکەی ئەخرەم تا ئەبوو قەتادە هات و عەبدورەحمانی کوشت.[2]

## ٣٩. ئەخرەمی هوجەیمی(ﷺ):

ئەم هاوەڵە لای هەریەک لە بوخاری و ئیبن ئەثیر و ئیبن حەجەر باس کراوە،[3] ئیبن ئەثیر پێش ئەمە ئەخرەمێکی تر دێنێ کە دواتر دەڵێت: وابزانم ئەم دوانە هەر یەک کەس بن،[4] لەناو ئەو هاوەڵانەدا ناوی هاتووە کە دواتر لە کووفە نیشتەجێ بوون،[5] فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) سەبارەت بە ڕۆژی ذی قار دەفەرموێت:(**اليوم أول يوم انتصفت فيه العرب من العجم وبي نصروا**)،[6] (ئەمڕۆ یەکەم ڕۆژە تیایدا عەرەب تۆڵەی خۆی کردبێتەوە لە عەجەم، لەبەر منیش سەرخران).

---

[1] البداية والنهاية لإبن كثير، ج٤، ص١٥١.

[2] صحيح مسلم - كتاب الجهاد والسير - باب غزوة ذي قرد وغيرها، الرقم ١٨٠٧.

[3] أسد الغابة، ج١، ص٨٩ الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٧.

[4] أسد الغابة، ج١، ص٨٩.

[5] التأريخ الكبير للبخاري، ج٢ص٦٣.

[6] التأريخ الكبير للبخاري، الرقم ٣٨٩ و ٤١، المعجم الكبير للطبراني، ١٢٢٤، أسد الغابة، ج١، ص٨٩ الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٧.

## ٣٠. ئەخنەسی سولەمی(رضي الله عنه):

ئەخنەسـی کـوڕی حەبیبی یان دەوترێ کوڕی خەبابـی[١] کوڕی جوررەی کـوڕی زیعبـی کـوڕی مالیکی کوڕی خفافی سـولەمیە.[٢] خـۆی و کورەکەی و کوڕەزاکەشـی هاوەڵـی پێغەمبـەر(ﷺ) بون،[٣] هەرسێکیشـیان بەشـداری غـەزای بەدریان کـردووە،[٤] تەنها ئەم کەسـە هەیە خۆی و کوڕو نەوەشـی پێکـەوە هاوەڵ بووبن و بەشـداربن لـە بەدردا.[٥]

نـاوی کوڕەکـەی بریتیـە لـە یەزیـد و کوڕەزاکەشـی نـاوی مەعنـی کـوڕی یەزیـدە.[٦]

## ٣١. ئەخنەسی کوڕی شەریق(رضي الله عنه):

ناوی ئوبەی کوڕی شەریقە و بە ئەخنەس ناسراوە.

## ٣٢. ئەدرەع ئەبووجەعد(رضي الله عنه):

ئـەم هاوەڵـەش نـاوی ئەدرەعـە بـەڵام زیاتـر بـە کونیەکـەی ناسـراوە کـە ئەبووجەعـدە،[٧] ئیبـن ئەثیـر بـە نـاوی عەمـری کـوڕی بەکـر نـاوی دەهێنـێ،[٨] ئـەدرەع لـە ضـەمریـە، دەشـوترێ بەڵکو نـاوی عەمـرە،[٩] لەنـاو بەنـی ضـەمـرە لـە مەدینـە خانوویەکـی هەبـووە، واتـە لـە مەدینـە نیشـتەجێ بـووە.[١٠]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٨.
[٢] أسدالغابة، ج١، ص٢٥١.
[٣] معجم الصحابة لابن قانع، ج٣، ص٩٢، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٨.
[٤] أسدالغابة، ج١، ص٢٥١.
[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٨.
[٦] أسدالغابة، ج١، ص٢٥١.
[٧] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٧٣، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٩.
[٨] أسدالغابة، ج٤، ص٢١٢.
[٩] أسدالغابة، ج١، ص٩٠.
[١٠] أسدالغابة، ج٤، ص٢١٢.

فەرموودەیەکی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە کە دەفەرموێت (من ترك الجمعة ثلاثا من غير عذر طبع الله على قلبه)،[1] (هەرکەس بێ بیانوو سێ هەینی نەچێت بۆ نوێژی هەینی خوا مۆر دەدات بەسەر دڵیدا).

## ٣٣. ئیدریس(رضي الله عنه):

ئیدریس هاودەم بە بوحەیراو ئەبرەهەو ئەشرەف و تەمام و ئەیمەن و نافع و تەمیم وەک وەفد هاتووەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ).[2]

ئیبن ئەثیر سەبارەت بە هاتنی ئەم هاوەڵە گێڕانەوەیەک دێنێت: کاتێک موسڵمانانی حەبەشە زانییان پێغەمبەر(ﷺ)و موسڵمانان لە جەنگی بەدردا سەرکەوتون، داوایان کرد لە نەجاشی مۆڵەتیان بدات تا بچنەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، ژمارەیەک لەو کەسانەی لای نەجاشی بوون و باوەڕیان هێنابوو بە نەجاشییان وت: مۆڵەت بدە بە ئێمەش با بچین بۆ لای ئەو پێغەمبەرەو بزانین ئەو کەسەیە کە لە کتێبەکەماندا باسی کراوە؟ ئەوەبوو چوون بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و لەگەڵیدا بەشداری ئوحود بوون، ریوایەتێ لە موقاتیل و کەسانی تریشەوە دێنێ کە وتویانە ئەوانە ٤٠ کەس بوون، سی و دوو کەسیان لە گەڵ جەعفەری طەیاردا هاتن، هەشت کەسیشیان لە شامەوە هاتن (بوحەیراو ئەبرەهەو ئەشرەف و تەمام و ئیدریس و ئەیمەن و نافع و تەمیم)، ئەمە گێڕانەوەی ئەبوو مووسا بوو کە ئیبن ئەثیر هێناویەتی، ئیبن ئەثیر دەڵێت: ئەگەر مەبەستی بە بوحەیرا یەکێکی تری جیا لەو بوحەیرایە بێت کە پێغەمبەر(ﷺ) بە منداڵی بینی، ئەوە ئەگەری هەیە ئەم هاتنی وەفدە راست بێت.[3]

ئیبن حەجەر دەڵێت: وادیارە ئەوە بوحەیرایەکی تر بێ، چونکە

---

[1] صحيح ابن خزيمة – كتاب الجمعة – جماع أبواب الصلاة قبل الجمعة – باب ذكر الدليل على أن الطبع على القلب بترك الجمعات الثلاث إنما يكون إذا تركها تهاونا بها، الرقم ١٨٥٨.

[2] أسد الغابة، ج١ص٧١.

[3] أسد الغابة، ج١ص٧١.

پێغەمبەر(ﷺ) ئەوی لە خاکی شام دیوە، بەڵام ئەم بوحەیرایەیان لە حەبەشە بووە، باکووری وڵات لەکوێ و باشووری لەکوێ، ئاساییە دوو کەس یەک ناویان هەبێ.[1]

بەڵام بەپێی هەموو سەرچاوەکان جەعفەری طەیار(ﷺ) و موسڵمانان لە فەتحی خەیبەردا چوون بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)،[2] دیاریشە غەزای ئوحود لەپێش فەتحی خەیبەر روویداوە، بۆیە هاتنی ئەو کەسانە لەگەڵ جەعفەری طەیار بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و بەشداری کردنیان لە غەزای ئوحوددا بەپێی سەرچاوەکان هەڵەیەو راستی تێدا نیە، دەشکرێ ئەو ئەگەرە دابنێین ئەو کەسانەی تر واتە ئەو ٤٠ کەسە بەجیا و بەبێ جەعفەر هاتبن، وەک چۆن ئیبن حەجەر باس لەوە ناکات ئەو کەسانە لەگەڵ جەعفەردا هاتبن.[3]

## ٣٤. ئەدرەعی ئەسلەمی(ﷺ):

ناوی ئەدرەعە و پاسەوانی پێغەمبەر(ﷺ) بووە،[4] ئەم هاوەڵەش سولەمییە،[5] فەرموودەیەکی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە کە سەعیدی کوڕی ئەبووسەعید لێوەی گێڕاوەتەوە، ئەدرەع بەسەرهاتێکی خۆی باس دەکات کە شەوێ پاسەوانی پێغەمبەری خوای(ﷺ) کردووە و دەڵێت: شەوێ پاسەوانی پێغەمبەر(ﷺ) بووم، هاتم و بینیم پیاوێکی مردوو (تەرمێک)یان هێنا، وترا ئەوە تەرمی عەبدوڵا (ذوالبجادین)ە، لە مەدینە مردبوو، کاتێک لە کفن کردنی بوونەوەو بردیان، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ارفقوا به رفق الله بكم فإنه كان يحب الله ورسوله)،[6] (بەنەرمی لێی بنەون و نەرم

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٢٢.
[2] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١ص٢٤٢، أسد الغابة، ج١ص٤٢١، سير أعلام النبلاء للذهبي، ج١ص٢٠٦.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٢٢.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٩، أسدالغابة، ج١، ص٣٩.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٩.
[6] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٠١٢، والحديث ضعيف، أسدالغابة، ج١، ص٨٩-٩٠.

بن لەگەڵی، خوا نەرم بێت لەگەڵتان، چونکە ئەو خواو پێغەمبەری خوای خۆشدەوێت).

لە ریوایەتێکی تردا ئەدرەع دەڵێت: پیاوێک زۆر بەجوانی قورئانی دەخوێندەوە، پێغەمبەر(ﷺ) هاتە دەرەوە...فەرموودەکە وەک پێشتر دێنێ و ئەوەشی بۆ زیاد دەکات کە پێغەمبەر(ﷺ) ئامادەی هەڵکەندنی گۆڕەکەی بوو، فەرمووی: (فراوان بۆی هەڵکەنن خوا گۆڕەکەی بۆ فراوان بکات)، یەکێ لە هاوەڵان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئایا بۆی دڵگران بوویت؟ فەرمووی بەڵێ، ئەو خواو پێغەمبەری خوای خۆشدەویست).[1]

## ٣٥. ئەدهەمی کوڕی حەظرەی راشیدی(ﷺ):

ئەدهەم سەر بە بەنی راشیدە، ئیبن ماکولا دەڵێت: هاوەڵە، ئیبن حەجەر وەک هاوەڵ ناوی هێناوە،[2]بەڵام هەریەک لە ئیبن مندە و ئیبن قانع و ئەبوو نوعەیمی ئەصبەهانی و ئین ئەثیر و ئیبن عەبدولبەر ناویان نەهێناوە.

## ٣٦. ئەدیەمی تەغلەبی(ﷺ):

ناوی ئەدیەمەو لە بەنی تەغلەبە.[3] هەریەک لەئیبن ئەثیر و ئەبوو نوعەیمی ئەصبەهانی و ئیبن قانع وەک هاوەڵ ناویان هێناوە،[4]هەریەک لە ئیبن قانع و ئەبوونوعەیم بە ئەدیم ناوی دێنن،[5] بەڵام ئیبن ئەثیر بە ئەدیەم ناوی دێنێ.[6]

صەبی کوڕی مەعبەد باس لەوە دەکات کاتێک تازە موسڵمان بووە ویستوویەتی حەج بکات، دەڵێت: پرسیارم کرد لە کەسێکی ناو هۆزەکەم کە

---

[1] سنن ابن ماجه - أبواب الجنائز - باب ما جاء في حفر القبر، الرقم ١٥٥٩.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٤٠

[3] معجم الصحابة، ج١، ص٥٧.

[4] معرفة الصحابة، الرقم ١٠٣٢، أسدالغابة، ج١، ص٩٠.

[5] معجم الصحابة، ج١، ص٥٧، معرفةالصحابة، الرقم ١٠٣٢.

[6] أسدالغابة، ج١، ص٩٠.

ناوی ئەدیم بوو، ئەویش فەرمانی پێکردم پێکەوە حەج و عومرەش بکەم و پێی وتم: پێغەمبەر(ﷺ) پێکەوە حەج و عومرەی دەکرد.[1]

## ٣٧. ئەربەدی خزمەتکاری پێغەمبەر(ﷺ):

هەریەک لە ئین ئەثیر و ئیبن حەجەر ناویان هێناوە.[2]

## ٣٨. ئەربەدی کوڕی حومەییر(رضي الله عنه):

ئەم هاوەڵە لە کۆچەرانە،[3] لە بەنی ئەسەدی کوڕی خوزەیمەیە،[4] ئیبن ئیسحاق پێی وایە لە هەردوو کۆچی حەبەشە و مەدینەش بەشداری کردووە.[5]

ناوی ئەربەدی کوڕی حومەییرە، رایەکی تر دەڵێت: کوڕی حەمزەیە،[6] ئەبوو نوعەیمیش بە ئەربەدی کوڕی جوبەیر هێناویەتی،[7] رایەکیش دەڵێت: ناوی سوەیدی کوڕی مەخشیە، بەڵام ئیبن سەعد وەڵامی ئەوە دێنێ و قسەی موحەممەد بن عەمارەی ئەنصاری دێنێ کە سوەید جیایە لە ئەربەد، ئەربەد غەزای بەدری بینیوە، بەڵام سوەید بەشداری ئوحود بووەو لەغەزای بەدردا بەشداری نەکردووە، کونیەکەی ئەبوومەخشییە.[8]

بەم پێیە کە ئەربەد بەشداری بەدر بووبێت کەواتە گەڕانەوەی ئەربەد لە حەبەشە بۆ مەککە بووە، ئینجا کۆچی کردووە بۆ مەدینە، چونکە کۆچەرانی حەبەشە کە راستەوخۆ چوونە مەدینە لە غەزای خەیبەردا چون،

---

[1] معجم الصحابة، ج١، ص٥٧، أسدالغابة، ج١، ص٩٠.
[2] أسدالغابة، ج١، ص٩٢، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٤٢.
[3] أسدالغابة، ج١، ص٩٢.
[4] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٩٣.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٤٢.
[6] أسدالغابة، ج١، ص٩٢.
[7] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم١٠٣٩.
[8] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٩٧.

بەڵام ئەربەد بەشداری بەدری کردووە و دیاریشە بەدر زۆر لەپێش غەزای خەیبەرەوە بووە.

## ٣٩. ئەربەدی کوڕی مەخشی(ﷺ):

ئەم هاوەڵە لە دەستەی یەکەمی کۆچەرانە، ئەربەد طائیە، هاوپەیمانی بەنی ئەسەد بوو.[١]

ناوی ئەربەدی کوڕی مەخشیە،[٢] دەشوترێ بەڵکو ناوی سوەیدی کوڕی مەخشیە،[٣] هەریەک لە ئیبن ئەثیر و ئیبن حەجەر کونیەکەی ئەم هاوەڵەیان بە ئەبوومەخشی هێناوە،[٤] بەڵام ئیبن سەعد کونیەی ئەبوو مەخشی بۆ ئەربەدی کوڕی حومەییر دێنێ.[٥]

هەروەها هەریەک لە ئیبن ئەثیر و ئیبن حەجەر هێناویانە بەشداری غەزای بەدر بووە،[٦] بەڵام ئیبن سەعد ریوایەتێکی موحەممەدی کوڕی عەممارەی ئەنصاری دێنێ کە دەڵێت: ئەربەدی کوڕی حومەییر بەشداری غەزای بەدر بووە و سوەیدی کوڕی مەخشی(واتە ئەربەدی کوڕی مەخشی) بەشداری غەزای ئوحود بووە و لەغەزای بەدردا بەشدار نەبووە.[٧]

## ٤٠. ئەرطەئەی کوڕی شەراحیل(ﷺ):

ناوی ئەرطەئەی کوڕی کەعبی کوڕی شەراحیلی کوڕی کەعبی کوڕی سەلامانی کوڕی عامری کوڕی حارثەی کوڕی سەعدی کوڕی مالیکە، ئەم

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٣٦٧.
[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٤٢.
[٣] أسدالغابة، ج١، ص٩٣.
[٤] أسدالغابة، ج١، ص٩٣، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٤٢.
[٥] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٩٧.
[٦] أسدالغابة، ج١، ص٩٣، الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٣٦٧.
[٧] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٩٧.

هاوەڵە نەخەعیە.[1]

وەک وەفد هاتووەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمان بووە.[2]

ئیبن سەعد گێڕانەوەیەکی هێناوە کە نەخەعیەکان دوو کەسیان نارد بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) تا موسڵمان بوونی خۆیان بگەیەننە پێغەمبەر(ﷺ)، ئەرطەئەی کوڕی شەراحیل لە بەنی حارثە و ئەرقەم لە بەنی بەکر، ئەم دوو کەسە شێوەو روخسارو کەسایەتییەکی باشیان هەبوو، چوونە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و پێغەمبەری خوایش(ﷺ) پێشنیازی موسڵمان بوونی بۆ کردن، ئەوانیش قبووڵیان کرد و بەیعەتی خۆیان و هۆزەکانی خۆیانیشیان دا بە پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەری خواش(ﷺ) سەرسام بوو بە قەد و باڵاو کەسایەتییان، فەرمووی: ئەریٚ هۆزەکانتان کەسی تریان وەک ئێوە تێدایە؟ وتیان: بەڵێ لەپشت خۆمانەوە لەناو هۆزەکانماندا حەفتا کەسمان جێهێشتووە کە هەموویان لە ئێمە باشترن و کاروبارەکان بەڕێوە دەبەن، پێغەمبەر(ﷺ) نزای کرد بۆ هەردووکیان و بۆ هۆزەکانی هەردووکیان و فەرمووی: (اللهم بارك في النخع)، ئینجا ئاڵایەکی دایە دەست ئەرطەئە تا رێبەری هۆزەکەی بکات، ئەویش ئاڵاکەی هێشتەوە تا لە رۆژی فەتحی مەککەدا ئەو ئاڵایەی لەگەڵ خۆی هێنا، لە رۆژی قادسیەشدا ئەو ئاڵایەی پێ بوو، بەڵام لە قادسیەدا شەهید بوو، ئینجا دورەیدی برای ئاڵاکەی گرتەدەست.[3]

## ٤١. ئەرطەئەی کوڕی کەعب(رضي الله عنه):

ناوی ئەرطەئەیە، دەشوترێ بەڵکو ناوی ئەبوو ئەرطەئەیە،[4] رایەکی تر دەڵێت: ناوی حوصەینی کوڕی رەبیعەیە،[5] بەڵام ئەبوو ئەرطەئە

---

[1] اسدالغابة، ج١، ص٩٤، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٤٢.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٤٢.

[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص٣٤٦.

[4] أسدالغابة، ج١، ص٩٢.

[5] الإستيعاب في معرفة الأصحب، ج٤، ص١٥٩٥.

کونیەکەیەتی،[1]، کاتێک موژدەی سەرکەوتنی (ذي الخلصة)ی هێنا، پێغەمبەر(ﷺ) ناوی نا بەشیر.[2]

ئەم هاوەڵەش طائیە،[3] ئیبن عەبدولبەر و ئیبن حەجەر بە ئەحمەسی دادەنێن.[4]

ذي الخلصةماڵێک بوو کە لە سەردەمی نەفامیدا خەڵکی دەیانپەرست و پێی دەوترا کەعبەی یەمانی، پێغەمبەر(ﷺ) بە جەریری فەرموو: (ألا تريحني من ذي الخلصة)، (ئەرێ ذیلخەلصەم لەکۆڵ ناکەیتەوە؟)، جەریری کوڕی عەبدوڵا وتی: با، بڕیاری دا بچێت، پێغەمبەر(ﷺ) دای بەسەر سنگیدا و پێی فەرموو: (اللهم ثبته واجعله هاديا مهديا)، (خوایە پێچەسپاوی بکەو هەم خۆی ڕێنموونی بکەو هەم بیکەرە هۆی ڕێنموونی خەڵک)، جەریر بە سەدو پەنجا سوارەوە چوو تا گەیشتە ئەوێ و لەناوی برد، ئینجا بە ئەبووئەرطەئەدا هەواڵی نارد بۆ پێغەمبەر(ﷺ).[5]

## ٤٣. ئەرقەمی کوڕی جوفەینە(ﷺ):

ناوی ئەرقەمی کوڕی جوفەینەی توجەیبیە، لە بەنی نەصری کوڕی موعاویەیە،[6]بەشداری فەتحی میصری کردووە.[7]

ئەرقەم لەگەڵ باوکیدا کێشەیەکی هەبوو، کێشەکەیان بردە لای عومەری کوڕی خەطاب.[8]

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص٨٦.
[2] أسدالغابة، ج١، ص٩٢.
[3] أسدالغابة، ج١، ص٩٢.
[4] الإستيعاب في معرفة الأصحب، ج٤، ص١٥٩٥، الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص٨٦.
[5] صحيح البخاري - كتاب المغازي - باب غزوة ذي الخلصة، الرقم ٤٣٥٧.
[6] أسدالغابة، ج ١، ص٩٦، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٤٥.
[7] أسدالغابة، ج ١، ص٩٦.
[8] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٤٥.

## ٤٣. ئەرقەمی نەخەعی(رضي الله عنه):

ناوی ئەوسی کوڕی جەهیشی کوڕی یەزیدە و لە نەخەعیەکانە.[1]

بەڵام ئیبن سەعد وا ناوی دێنێ، ئەرقەمی کوڕی یەزیدی کوڕی مالیکی کوڕی عەبدوڵا.[2]

ئیبن حەجەریش رایەکی تر دێنێ و دەڵێت: ناوی ئەرقەمی کوڕی عەبدوڵای کوڕی حارثە.[3]

وەک وەفد هاتووەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمان بووە.[4]

ئیبن سەعد گێڕانەوەیەکی هێناوە کە نەخەعیەکان دوو کەسیان نارد بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) تا موسڵمان بوونی خۆیان بگەیەننە پێغەمبەر(ﷺ)، ئەرطەئەی کوڕی شەراحیل لە بەنی حارثە و ئەرقەم لە بەنی بەکر، ئەم دوو کەسە شێوەو روخسارو کەسایەتییەکی باشیان هەبوو، چوونە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و پێغەمبەری خوایش(ﷺ) پێشنیازی موسڵمان بوونی بۆ کردن، ئەوانیش قبووڵیان کرد و بەیعەتی خۆیان و هۆزەکانی خۆیانیشیان دا بە پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەری خواش(ﷺ) سەرسام بوو بە قەد و باڵاو کەسایەتییان، فەرمووی: ئەرێ هۆزەکانتان کەسی تریان وەک ئێوە تێدایە؟ وتیان: بەڵێ لەپشت خۆمانەوە لەناو هۆزەکانماندا حەفتا کەسمان جێهێشتووە کە هەموویان لە ئێمە باشترن و کاروبارەکان بەڕێوە دەبەن، پێغەمبەر(ﷺ) نزای کرد بۆ هەردووکیان و بۆ هۆزەکانی هەردووکیان و فەرمووی: (اللهم بارک فی النخع).[5]

---

[1] أسدالغابة، ج١، ص٩٦.

[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٥، ص٥٣.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٤٥.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٤٢.

[5] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص٣٤٦.

## ٤٤. ئەرقەمی کوڕی ئەبی ئەرقەم(رضي الله عنه):

ناوی ئەرقەمی کوڕی عەبدمەنافی کوڕی ئەسەدی کوڕی عەبدوڵای کوڕی عومەری کوڕی مەخزوومی مەخزوومیە،[١] یەکێکە لە هاوەڵە کۆچەرەکان.[٢]

دایکی ناوی ئومەیمەی کچی حارثە لە بەنی سەهم،[٣] دەوترێ بەڵکو ناوی تەماضوری کچی حوذەیمە،[٤] یان دەوترێ ناوی صەفیەیە.[٥]

کونیەکەی ئەبووعەبدوڵایە و لە دەستەی یەکەمی موسڵمان بووەکانە،[٦] هەندێ بە حەوتەمین کەسی موسڵمان بووی دەزانن و هەندێکی تریش بە دەیەمین کەسی موسڵمانبووی دەزانن،[٧] رایەکیش بە دوانزەیەمین موسڵمان بووی دەزانێ.[٨]

ئەرقەم دوو منداڵی هەبوو کە هەردووکیان لە ئوم وەلەد بوون، واتە لە کەنیزەکەکەی، ئەوانیش بریتی بوون لە عوبەیدوڵا و عوثمان.[٩]

ئەرقەم لە مەککە لە ناوچەیەکی صەفا خانوویەکی هەبوو کە کردیە بنکەیەک بۆ بانگەوازی یەکەمی ئایینی خوا و پێغەمبەر(ﷺ)، موسڵمانان لەوێ کۆدەبوونەوە تا ئەو کاتەی ژمارەیان گەیشتە چل کەس، دەوترێ تا ئەو کاتەی عومەری کوڕی خەطاب موسڵمان بوو، ئیتر ئەوکات موسڵمانان چوونە دەرەوە.[١٠]

---

[١] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٢٤٢، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٤٣، سير أعلام النبلاء للذهبي، ٢، ص٤٧٩.

[٢] أسدالغابة، ج١، ص٩٤.

[٣] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٢٤٢.

[٤] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١،ص١٣١، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٤٣.

[٥] أسدالغابة، ج١، ص٩٤.

[٦] أسدالغابة، ج١، ص٩٥.

[٧] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٤٣.

[٨] اسدالغابة، ج١، ص٩٥.

[٩] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٢٤٢.

[١٠] أسدالغابة، ج١، ص٩٥.

هەروەها ئەرقەم بەشداری هاوپەیمانی الفضول بووە.[1]
فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە.[2]

سەبارەت بە موسڵمانبوونی باوکی رای جیاواز هەیە، ئیبن عەبدولبەر دەڵێت: موسڵمان نەبووە، دواتر سەبارەت بە مردنی باوکی دەڵێت: لەوانەیە لەکاتی وەفاتی ئەبووبەکردا مردبێت، ئەگەر ئەوە راست بێت ئەوە قسەکەی ئیبن ئەبی خەیثەمە راستە کە باوکی بە هاوەڵ دەزانێت.[3]

ئەرقەم یەکێکە لەو هاوەڵانەی کە بەشداری غەزای بەدری کردووە، پێغەمبەر(ﷺ) لەو غەزایەدا شمشێرێکی دایە دەستی.[4]

لە غەزای بەدردا ئەبوو ئوسەیدی ساعیدی شمشێرەکەی ئیبن عائیذی دانا، ئەرقەم ئەو شمشێرەی ناسیەوەو داوای لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد بیدات بەو، پێغەمبەریش(ﷺ) پێی بەخشی.[5]

هەروەها بەشداری غەزای ئوحود و خەندەق و هەموو غەزاکانی تری کردووە.[6]

پێغەمبەر(ﷺ) هەندێ جار ئەرکی کۆکردنەوەی زەکاتی دەسپارد بە ئەرقەم،[7] جارێکیان کە پێغەمبەر(ﷺ) ئەو ئەرکەی پێ سپارد، ئەرقەم داوای لە ئەبوو رافیع کرد یارمەتی بدات لەبەرامبەردا بەشداری پشکی (العاملین علیها)ی بکات، ئەبوورافیع وتی: با پرس بکەم بە پێغەمبەر(ﷺ)، کاتێک پرسی پێکرد پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (يا أبا رافع إنا أهل بيت لا تحل لنا الصدقة)،

[1] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٣١.
[2] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٣١، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٤٤.
[3] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٣١-١٣٢.
[4] أسدالغابة، ج١، ص٩٥، سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٢، ص٤٨٠.
[5] مسند أحمد بن حنبل - مسند المكيين(ﷺ) - حديث أبي أسيد الساعدي(ﷺ)، الرقم ١٦٣٠٢، صححه الألباني في السلسلة الصحيحة، الرقم ٢٩٠٣.
[6] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٢٤٤.
[7] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٢، ص٤٨٠، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٤٤.

(ئەی ئەبوورافیع ئێمەی ئالوبەیت صەدەقەمان بۆ حەڵاڵ نیە).[1]

جارێکیان ئەرقەم خۆی ئامادە کرد تا بچێت بۆ مزگەوتی ئەقصا، هات تاماڵئاوایی بکات لە پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەری خوایش پێی فەرموو: بۆ بازرگانیە یان بۆ سەردان؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بە دایک و باوکمەوە بەقوربانت بم بەڵکو ئەمەوێ بچم نوێژی تێدا بکەم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(صلاة في مسجدي هذا خير من ألف صلاة فيما سواه من المساجد إلا المسجد الحرام)**، (نوێژێ لەم مزگەوتەی مندا خێری زیاترە لەهەزار نوێژ لە مزگەوتانی تردا جگە لە مەسجیدولحەرام)، ئیتر ئەویش دانیشت و نەچوو بۆ گەشتەکەی.[2]

ئەمە وانەیەکە تا ئەوەی لێوە فێر بین بیرکردنەوە و بروا و قەناعەتمان تا سنووری شەریعەت زیاتر نەڕوات و لەکوێدا شەریعەت رایەکی جیا لە رای عەقڵی ئێمەی هەبوو دەبێت راستەوخۆی ملکەچی بین، ئەرقەم بە لێکدانەوەی خۆی دەرۆیشت تا پاداشتێکی گەورە بەدەست بخات، بەڵام کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) رێی چاکتری نیشاندا، دەستبەجێ وەستا، هەرچەندە تەواوی ئامادەکاری بۆ کردبوو، خۆ چوونی بۆ بەیتولمەقدیسیش دروستبوو وەک لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە **(لا تشدوا الرحال إلا إلى ثلاثة مساجد: مسجدي هذا، والمسجد الحرام، والمسجد الأقصى)**،[3] (کۆڵ و باری سەردان تەنها بۆ سێ مزگەوت بپێچنەوە، ئەم مزگەوتەی من و مەسجیدولحەرام و مزگەوتی ئەقصا)، بەڵام کاتێک باشترینی بینی ئامادە نەبوو باشترینەکە بگۆڕێتەوە بە باشێکی کەمتر لەو، ئەمە تەمای بەرزی هاوەڵان بۆ دەستخستنی پاداشت نیشان دەدات کە هەر هەنگاوێکیان ناوە تا باشترین رێگەی گەیشتن بە رەزامەندی خوا و کۆکردنەوەی پاداشتی زیاتر بگرنەبەر.

[1] السنن الكبرى للنسائي - كتاب الزكاة - باب مولى القوم منهم، الرقم ٢٤٠٥، صححه الألباني في إرواء الغليل، الرقم ٨٨٠.

[2] أسدالغابة، ج١، ص٩٥، سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٢، ص٤٧٩.

[3] صحيح مسلم - كتاب الحج - باب سفر المرأة مع محرم إلى حج وغيره، الرقم ٨٢٧.

ئەرقەم یەکێک بووە لەو هاوەڵانەی نامەی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) نووسیوەتەوە وەک ئیبن سەعد نامەیەک دێنێ کە ئەرقەم نووسیویەتی (كتب رسول الله لعبديغوث بن وعلة الحارثي أن له ما أسلم عليه من أرضها وأشيائها يعني نخلها ما أقام الصلاة وآتى الزكاة وأعطى خمس المغانم في الغزو ولا عشر ولا حشر ومن تبعه من قومه وكتب الأرقم بن أبي الأرقم المخزومي)[1]

نووسینی ناوی ئەو کەسەی نامەکەی نووسیوە لەسەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) هەبووە و یەکەم کەسیش ئوبەی کوڕی کەعب بوو ئەمەی کرد، لە کۆتایی نوسینەکەدا دەینووسی (وكتبه...) واتە ناوی خۆی دەنووسی.[2]

سەبارەت بە مردنی ئەرقەم سێ را هەیە، رایەک دەڵێت: لە رۆژی مردنی ئەبووبەکری صدیقدا وەفاتی کردووە،[3] رایەکی تر دەڵێت: لە ساڵی پەنجا و سێی کۆچی وەفاتی کردووە،[4] رای سێیەم دەڵێت: لە ساڵی پەنجاو پێنجی کۆچیدا وەفاتی کردووەو وەسیەتی کردووە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص نوێژی لەسەر بکات، هەرچەندە سەعد لەو کاتەدا دووربوو و لە عەقیق بوو، بۆیە مەروان رازی نەبوو و وتی: تەرمی هاوەڵی پێغەمبەری خوا بوەستێنرێ تا کەسێک کە لێرە نیە بێتەوە؟! بۆیە ویستی نوێژی لەسەر بکات، مشتومڕێ دروست بوو تا ئەوەی سەعد هاتەوەو نوێژی لەسەرکرد.[5]

ئیبن عەبدولبەر دەڵێت: ئەگەر ئەم ریوایەتە راست بێت ئەوە ئەو کەسەی لە سەردەمی ئەبووبەکر مرد باوکی ئەرقەم بوو،[6] ئیبن ئەثیر دەڵێت: لە

---

(1) الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص٢٦٨.

(2) الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٢٧، الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٦٨.

(3) أسدالغابة، ج١، ص٩٦.

(4) سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٢، ص٤٨٠.

(5) الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٢٤٤، الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٣٢، أسدالغابة، ج١، ص٩٥-٩٦.

(6) الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٣٢.

گۆڕستانی بەقیعیش ئەسپەردە کراوە،[1] ذەهەبی رای دووەمی پێ راستترەو وتەیەکی عوثمانی کوڕی ئەرقەم دێنێ کە دەڵێت: باوکم لە ساڵی پەنجاو سێی کۆچی وەفاتی کردووە.[2]

حاکم لە موستەدرەک هێناویەتی کە کۆتا هاوەڵە بەدرییەکان وەفاتی کردبێت ئەرقەمی کوڕی ئەبی ئەرقەم بووە.[3]

تەمەنی ئەرقەم نزیکەی هەشتاو ئەوەندە ساڵ بوو.[4]

ئەرقەم سەبارەت بە خانووەکەی لە مەککە وەسیەتێکی نووسی کە بە صەدەقەی دانا و منداڵەکانی نابێت بیفرۆشن، دەقەکەشی بەم چەشنە بوو (بِسْمِ اللهِ الرحْمنِ الرحِيمِ هذا ما قضى الْأَرْقَمُ فِي رِبْعِهِ ما حاز الصفا، أنها صدقةٌ بِمَكانِها مِن الحْرمِ لا تبُاعُ، ولا تُورثُ شهِد هِشامُ بْنُ الْعاصِ، وفُلانٌ مولى هِشامِ بْنِ الْعاصِ)، بەڵام دواتر لە سەردەمی ئەبووجەعفەری مەنصووردا وەسیەتەکەی شکێنرا و خانووەکەی فرۆشرا.[5]

## ٤٥. ئەزهەری کوڕی قەیس(رضي الله عنه):

هەریەک لە بەغەوی و ئیبن شاهین و ئەبوو مووسا و ئیبن عەبدولبەر و ئیبن ئەثیر ناویان هێناوە فەرموودەیەکیان هێناوە و دەڵێن ئەو ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە، بەڵام ئیبن حەجەر بە وردی باسی کردووەو نیشانی داوە کە لەو سەنەدەیدا باوکی ئەزهەر لەبیرکراوە واتە ئەزهەر لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە، بۆیە ئەو سەنەدە بە راست نازانێت کە بەو هۆیەوە ئەزهەر بە هاوەڵ دانراوە.[6]

---

[1] أسدالغابة، ج١، ص٩٦.
[2] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٢، ص٤٨٠.
[3] المستدرک على الصحيحين، الرقم ٦١٨٢.
[4] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٢٤٤.
[5] المستدرک على الصحيحين - كتاب معرفة الصحابة(ﷺ) - ذكر الأرقم بن أبي الأرقم المخزومي(ﷺ) - قيام النبي في دار الأرقم، الرقم ٦١٨٤.
[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ٢٢٨-٢٢٩.

## ٤٦. ئەزهەری کوڕی مینقەر(ﷺ):

ناوی ئەزهەری کوڕی مینقەرە و لە ئەعرابییەکانی بەصرەیە.[١]

فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوە و دەڵێت: پێغەمبەرم(ﷺ) بینی و لەدوایەوە نوێژم کرد، بیستم بە (الحمد لله رب العالمین) دەستی پێکرد و دوو جاریش سەلامی دایەوە.[٢]

## ٤٧. ئەسەدی کوڕی حارثە(ﷺ):

ئەسەدی کوڕی حارثەی کەلبی لە بەنی عولەیمە،[٣] لەگەڵ کەسانێکی هۆزەکەیدا هاتنە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و داوایان کرد نزای باران بارینیان بۆ بکات،[٤] براکەشی کە ناوی (قطن) بوو لەگەڵیاندا بوو و ئەو دەمڕاستیان بوو.[٥]

## ٤٨. ئەسەدی کوڕی خومیلد(ﷺ):

لە هەندێ سەرچاوەدا بە ئەسەدی کوڕی برای خەدیجە واتە برازای خەدیجە ناوی هاتووە، ئیبن ئەثیر سەرەتا بە ناوی ئەسەدی کوڕی برای خەدیجە ناوی دێنێ، دواتر رای تر دێنێ لەسەری،[٦] لە سەرچاوەکاندا ناوی دوو برای خەدیجە هاتووە، یەکەم عەوامی باوکی زوبەیر کە لە سەردەمی جاهیلیدا مردووە، دووەمیش نەوفەل کە بە بێباوەڕی لە رۆژی بەدردا کوژرا، ئیبن حەجەر دەڵێت: لەوانەیە ئەسەد کوڕی نەوفەل بێت، بەڵام ئەوەیان باس نەکردووە.[٧]

---

[١] أسدالغابة، ج١، ص١٠٠.

[٢] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، حرف الألف. لە نێوان ژمارەکانی ٩٩٤-٩٩٥.

[٣] الإصابة في معرفة الصحابة، ج١، ص٥١.

[٤] أسدالغابة، ج١، ص١٠٧.

[٥] الإصابة في معرفة الصحابة، ج١، ص٥١.

[٦] أسدالغابة، ج١، ص١٠٧.

[٧] الإصابة في معرفة الصحابة، ج١، ص٥١.

فەرموودەیەکی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە کە دەفەرموێت (لا تبع ما لیس عندك)،[1] (ئەوەی لای خۆت نیە مەیفرۆشە).

ئەم فەرموودەیە لە سەرچاوەکانی فەرموودەدا بە سەنەدی حەکیمی کوڕی حیزام هاتووە،[2] لەوانەیە ئەسەدیش ئامادەی ئەو مەجلیسە بووبێت کە تیایدا حەکیم پرسیاری کردووە لە پێغەمبەر(ﷺ) و ئەویش لە وەڵامدا ئەوەی پێ فەرمووە.

## ٤٩. ئەسەدی کوڕی سەعیە(رضي الله عنه):

ناوی ئەسەد یان ئەسیدی کوڕی سەعیەی قورەیضیە، واتە لە بەنی قورەیضەیە،[3] ئیبن ئەثیر دەڵێت: ئەسید ناوە راستەکەیەتی.[4]

ئەسەد لەگەڵ دوو کەسی تری جوولەکەی بەنی قورەیضە موسڵمان بوو کە بریتی بوون لە ئەسەدی کوڕی عوبەید و ثەعلەبەی کوڕی سەعیە.[5]

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) هێرشی بردە سەر بەنی قورەیضە و گەمارۆی دان و دواتر ناچار بوون خۆیان بدەن بە دەست بڕیار و دادوەری سەعدی کوڕی موعاذەوە، شەوێ پێش ئەوە ئەسەد موسڵمان بوو، ئەو دوانەش لەگەڵیدا موسڵمان بوون.[6]

ئیبنولهیبان کە جوولەکەیەکی شام بوو چەندساڵێ بەر لە ئیسلام هات بۆ مەدینە، لەوێ وەسفی تەواوی کۆتا پێغەمبەری بۆ کردن، لەسەرەمەرگیدا پێی وتن: من لەبەر هاتنی ئەو پێغەمبەرە هاتوم بۆ ئێرە، ئەم قسەی ئەم جوولەکە خواناسە لە شەوی فەتحی بەنی قورەیضەدا بوو بە خێر بۆ

(1) الإصابة في معرفة الصحابة، ج١، ص٥١.
(2) الإصابة، ج١، ص ٢٠٥، وقال: ذكره العقيلي، وقال: في إسناده مقال.
(3) الإصابة في معرفة الصحابة، ج١، ص٥١.
(4) أسدالغابة، ج١، ص١٠٩.
(5) الإصابة في معرفة الصحابة، ج١، ص٥١.
(6) الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٧٩.

ئەم سێ کەسە و ئەوانیش ئەم قسەیان بەبیری ئەوانی تر هێنایەوە، بەڵام ئەوان سوودیان لێ نەبینی.[1]

ئەم سێ کەسە داوایان کرد لە بەنی قورەیضە تا لەخوا بترسن و باوەڕ بهێنن بە پێغەمبەرایەتی موحەممەد(ﷺ)، بەڵام ئەوان رازی نەبوون، بۆیە ئەم سیانە دابەزینە خوارەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمانبونی خۆیان راگەیاند، جولەکەکانیش وتیان: موحەممەد تەنها کەسە زۆر خراپەکانی ئێمەی بۆ چووە، مەبەستیان ئەم سیانە و عەبدوڵای کوڕی سەلام بوو کە موسڵمان بووبوون.[2]

## ٥٠. ئەسەدی کوڕی عوبەید(رضي الله عنه):

ئەسەد جوولەکە بوو و لە بەنی قورەیضە بوو، بەسەرهاتەکەی لەگەڵ ئەسەدی کوڕی سەعیەدا هاتووە.

## ٥١. ئەسەدی کوڕی کورز(رضي الله عنه):

ناوی ئەسەدی کوڕی کورزی کوڕی عامری کوڕی عەبدوڵای کوڕی عەبدشەمسی بەجەلی قەسرییە،[3] کوڕێکی هەبوو بەناوی یەزید کە ئەویش هاوەڵ بوو،[4]یەزید فەرموودەی گێڕاوەتەوە.[5]

ئەسەد کەوانێکی پێشکەشی پێغەمبەر(ﷺ) کرد، کاتێک کەوانەکەی پێشکەش کرد وتی: ئەی پێغەمبەری خوا نزای خێرم بۆ بکە، پێغەمبەریش(ﷺ) نزای خێری بۆ خۆی و یەزیدی کوڕیشی کرد.[6]

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص١٦٠.
[2] الإصابة في معرفة الصحابة، ج١، ص٥١.
[3] أسد الغبة، ج١، ص١٠٩.
[4] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٧٩.
[5] أسد الغبة، ج١، ص١١٠.
[6] الإصابة في معرفة الصحابة، ج١، ص٥٣.

ئەسەد فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە، لەوانە دەگێڕێتەوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (إن المريض لتحات خطاياه كما يتحات ورق الشجر)،[1] (نەخۆش تاوانی دەوەرێ وەک چۆن گەڵای دار ئەوەرێت).

ئەم فەرموودەیە ئاماژەیەکە بە دیدی گەشبینی بۆ ژیان، کاتێک نەخۆشیەکت تووش دەبێت لەبری ئازار و نارەحەتیەکانی بیر لە بەرهەمەکانی بکەرەوە، وەرگرتنی پاداشت و هەڵوەرینی تاوان، چونکە ئیسلام هیچ شوێن و حاڵێکی بۆ رەشبینی نەهێشتوەتەوە و لە هەموو کاتێکدا تاکی ناو کۆمەڵگە و خودی کۆمەڵگەش رێنموونی دەکات بۆ گەشبینی لە ژیاندا.

هەروەها ئەسەد دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرمووم (يا أسد بن كرز لا تدخل الجنة بعمل ولكن برحمة الله)، (ئەی ئەسەدی کوڕی کورز بە کردەوە ناچیتە بەهەشتەوە، بەڵکو بە رەحمەتی خوا) وتم: تەنانەت تۆیش ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: (ولا أنا إلا أن يتلافاني الله - أو يتغمدني الله - منه برحمة)،[2] واتە (تەنانەت منیش مەگەر خوا فریام کەوێ –یان خوا بە رەحمی خۆی بەزەیی پیامدا بێتەوە).

## ٥٢. ئەسەدی کوڕی یەعمور(ﷺ):

ناوی ئەسەدی کوڕی یەعموری کوڕی وەهیبی کوڕی ئەصرەمەو لە خوزاعەیە، ناسراوە بە نعیت، لە فەتحی مەککەدا چەند دێرە شیعرێکی سەبارەت بە پێغەمبەر(ﷺ) وتووە.[3]

---

[1] مسند أحمد بن حنبل – أول مسند المدنيين(ﷺ) أجمعين – حديث أسد بن كرز جد خالد القسري(ﷺ)، الرقم ١٦٩٢٢، حسنه شعيب الأرناؤوط، صححه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب، الرقم ٣٤٢٦ و قال صحيح لغيره.
[2] المعجم الكبير للطبراني – باب الألف – باب من اسمه أسد – أسد بن كرز البجلي ثم القشيري، الرقم ١٠٠١.
[3] الإصابة في معرفة الصحابة، ج٦، ص٤٥٥.

## ٥٣. ئەسەدی کوڕی ئوسەید(رضي الله عنه):

ناوی ئەسەدی کوڕی ئوسەیدی کوڕی ئەبی ئوناسە، ئیبن حەجەر ناوی هێناوەو دەڵێت: ڕۆژی فەتحی مەککە خۆی و باوکی موسڵمان بون،[1] سەر بە بەنی عەبدی کوڕی عەددی بوون.[2]

باوکی ئەسەد لەلایەن پێغەمبەری خواوە(ﷺ) خوێنی ڕەوا کرابوو، بەڵام لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا هات و دەستی خستە دەستی پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمان بوو و بە چەند دێڕە شیعرێک وەسفی پێغەمبەری خوای کرد.[3]

## ٥٤. ئەسعەدی کوڕی حارثە(رضي الله عنه):

ناوی ئەسعەدی کوڕی حارثەی کوڕی لەوذانە،[4] هەریەک لە ئیبن ئەثیر و ئیبن حەجەر ناویان هێناوە.[5]

سەربە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکانە لەبەنی ساعیدە،[6]لە جەنگی (الجسر) بەشداری کردو تیایدا شەهید بوو،[7] ئەم جەنگە لە سەردەمی خەلیفە عومەری کوڕی خەطابدا ڕوویدا.[8]

## ٥٥. ئەسعەدی کوڕی زورارە(رضي الله عنه):

ناوی ئەسعەدی کوڕی زورارەیە،[9] هەروەها ڕایەک هەیە دەڵێت: ناوی

---

[1] الإصابة في معرفة الصحابة، ج١، ص٥١.

[2] الإصابة في معرفة الصحابة، ج١، ص٧٩.

[3] أسدالغابة، ج١، ص١٣٨-١٣٩.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٥٤.

[5] أسدالغابة،ج١، ص١١٠، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٥٤.

[6] أسدالغابة،ج١، ص١١٠.

[7] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٥٤.

[8] أسدالغابة،ج١، ص١١٠.

[9] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٥٦.

ئەسـەدە نـەک ئەسـعەد،[1] بـەڵام ئیبن قانـع و ئیبـن حەجـەر بـە ئەسـعەد ئەیهێنـن، ئـەم هاوەڵـە لـە پشـتیوانانە.[2]

کوڕێکی هەبوو بە ناوی عەبدوڵا کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە.[3]

گێڕانەوەیـەک هاتـووە گوایـە ئەسـعەد فەرموودەیـەک دەگێڕێتـەوەو دەڵێت: پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمـووی: (لما انتـهي بي الى السماء انتـهي بي الى قصر من لؤلؤة فراشه ذهب فأوحى الي ربي أو قال أمرني في علي رضى الله عنه بثلاث خصال بأنه سيد المسلمين وامام المتقين وقائد الغر المحجلين).[4] بـەڵام ئەلبانی ئـەم فەرمـوودەی بـە (موضـوع) دانـاوە، هەروەهـا ئیمامـی ذەهەبیـش دەفەرموێـت مـن بـە موضوعـی دەزانـم.[5]

## ٥٦. ئەسعەدی کوڕی زوورارەی کوڕی عەدەس(رضي الله عنه):

نـاوی ئەسـعەدی کوڕی زوورارەی کوڕی عەدەسـی کوڕی عوبەیدی کوڕی ثەعلەبـەی کوڕی غەنەمـی کوڕی مالیکە،[6] ئیبـن حەجـەر پێی وایـە ئـەم هاوەڵـە و ئـەوەی پێشـوو هەردووکیـان یـەک بـن،[7] بـەڵام ئیبـن ئەثیـر بەجیـا باسـیان ئـەکات، پێی وایـە یەکەمیـان نـاوی ئەسـەدە و دووەمیـان نـاوی ئەسـعەدە.[8]

بـەڵام ئـەم دوانـە لەیـەک جیـان، چونکـە ئـەوەی پێشـوو کوڕێکـی هەبـووە بـە نـاوی عەبدوڵا،[9] بـەڵام ئەمەیـان هیـچ کوڕێکـی نەبـووە، بەڵکو تەنهـا کچـی هەبووە.[10]

---

[1] أسدالغابة،ج١، ص١٠٨.

[2] أسدالغابة،ج١، ص١٠٨.

[3] معجم الصحابة لابن قانع، ج١، ص٦٩.

[4] معجم الصحابة لابن قانع، ج١، ص٦٩-٧٠.

[5] سلسلة الأحاديث الضعيفة والموضوعة و أثرها السيئ في الأمة، الرقم ٤٨٨٩، السلسلة الضعيفة، الرقم ٦٤٠١.

[6] أسد الغابة، ج١، ص ١١٠، سير إعلام النبلاء، ج١، ص٢٩٩.

[7] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٥٦.

[8] أسد الغابة، ج١، ص١٠٨، ١١٠.

[9] معجم الصحابة لابن قانع، ج١، ص٦٩.

[10] الطبقات، ج٣، ص٦٠٨.

ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە و لە خەزرەجیەکانە، ناسراوە بە (أسعد الخير)، کونیەکەشی ئەبوو ئومامەیە.[١]

ئەسعەد یەکەم کەسی پشتیوانان بوو کە موسڵمان بوو،[٢] ئەو و ذەکوان پێکەوە موسڵمان بوون.[٣]

ئەسعەد سەرقاڵی کاری بازرگانی بوو و دەچوو بۆ شام،[٤] هەروەها پێش موسڵمانبوونیشی بڕوای بە بتپەرستی نەبوو و هەردەم باسی یەکخواپەرستی دەکرد.[٥]

دایکی ناوی سوعاد بوو، دەوترێ بەڵکو دایکی ناوی فریعەی کچی رافعی کوڕی موعاویە بووە.[٦]

ناوی ژنەکەی عومەیرەی کچی سەهل بوو کە لەم ژنەی سێ کچی هەبوو، فریعەو کەبشە و حەبیبە، ژنەکەشی و هەر سێ کچەکەشی موسڵمان بوون و بەیعەتیان دابوو بە پێغەمبەر(ﷺ). [٧]

براکەی ناوی سەعد بوو،[٨] ئیبن عەبدولبەر گومانی هەیە لە موسڵمانبوونی، چونکە زۆربەیان فریای موسڵمان بوون نەکەوتون،[٩] خوشکێکیشی هەبوو بە ناوی زغیبە،[١٠] هەروەها ئەسعەد کوڕی نەبوو،[١١] بەڵام ئیبن عەبدولبەر پێی وایە عەبدوڵا کوڕی ئەم ئەسعەدە بووە کە کونیەکەی ئەبوو ئومامەیە.[١٢]

[١] أسد الغابة، ج١، ص ١١١.
[٢] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٦٠٨.
[٣] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج١، ص٣٠٢.
[٤] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص١٦٥.
[٥] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج١، ص١٩٠.
[٦] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٦٠٨.
[٧] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص٤٤٦.
[٨] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٦٠٨، سير أعلام النبلاء، ج٤، ٥٠٧.
[٩] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٢، ص٥٩١.
[١٠] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥١٢.
[١١] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٦٠٨.
[١٢] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٣، ص٨٦٨

جارێک ئەسعەد کە لە شامەوە دەگەڕایەوە، لەگەڵ چل کەسی هۆزەکەیدا بوو، خەوێکی دی، لە خەوەکەیدا کەسێ هات و پێی وت: ئەی ئەبوو ئومامە لە مەککە پێغەمبەرێ دەردەکەوێ تۆیش شوێنی بکەوە، نیشانەش بۆ ئەمە ئەوەیە کە ئێوە دەچنە شوێنێ هەموو هاورێکانت بەردەکەون و تەنها تۆ رزگارت دەبێت، فلان کەسیش چاوی بەردەکەوێ، ئەوەبوو چوونە شوێنێ هەموو تووشی تاعوون بوون جگە لە ئەبوو ئومامە کە رزگاری بوو لەگەڵ یەکێکیان کە چاوی بەرکەوت.[١]

سەبارەت بە موسڵمان بوونی ئەسعەد ئەوەبوو کاتێک لەگەڵ ذەکوانی هاورێیدا دەچوون بۆ مەککە بۆ لای عوتبەی کوڕی رەبیعە، لەوێ هەواڵی پێغەمبەریان(ﷺ) بیست و چوون بۆ لای، پێغەمبەریش(ﷺ) بانگهێشتی کردن بۆ ئیسلام و قورئانی بۆ خوێندنەوە، ئەوانیش موسڵمان بوون،[٢] ئیتر نەچوون بۆ لای عوتبە.[٣]

ئەسعەد بەشداری هەموو بەیعەتەکانی عەقەبە بوو،[٤] یەکێک بوو لە دوانزە نەقیبەکەش، نەقیبی بەنی نەجار بوو،[٥] رایەکیش دەڵێت: بەڵکو نەقیبی بەنی ساعیدە بووە، بەڵام ئیبن ئەثیر بەرپەرچی دەداتەوەو دەڵێت: نەقیبی بەنی نەجار بووە چونکە خۆی لە بەنی نەجار بووە، هەروەها نەقیبی بەنی ساعیدەش سەعدی کوڕی عوبادە بوو،[٦] لەناو نەقیبەکاندا تەمەنی لە هەموویان کەمتر بوو،[٧]بەڵام پێشڕەوی هەر دوانزەکە بوو.[٨]

ئەسعەد کاتێک موسڵمان بوو لەگەڵ هەریەک لە عمارەی کوڕی حەزم و

---

[١] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١ص١٦٦.
[٢] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج١، ص٣٠٢.
[٣] أسد الغابة، ج١، ص١١١.
[٤] أسد الغابة، ج١، ص١١١.
[٥] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١ص٢٢٠.
[٦] أسد الغابة، ج١، ص١١٢.
[٧] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٥٤.
[٨] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج١، ص٣٠٢.

عەوفی کوڕی عەفرادا بتەکانی هۆزی بەنی نەجاریان دەشکاند،[1] هەروەک سەعدی کوڕی موعاذ و ئوسەیدی کوڕی حوضەیریش ئەم کارەیان دەکرد،[2] هاوکات خەڵکی مەدینەی بانگهێشت دەکرد بۆ ئیسلام، پێش هەموویشی ماڵ و منالّی خۆی بانگ کرد و لەبەر راستگۆیی و رەوشتی جوانی، خێزانەکەی خێرا چوون بەدەم بانگەوازەکەیەوە.

لە بەیعەتی عەقەبەدا ئەسعەد دەستی خستە ناو دەستی پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی خەڵکینە ئایا ئەزانن لەسەر چی بەیعەت ئەدەن بە موحەممەد؟ ئێوە بەیعەتی پێدەدەن لەسەر ئەوەی جەنگی عەرەب و عەجەم و مرۆڤ و جنۆکە بکەن، وتیان: بەڵێ لەگەڵ هەرکەس بجەنگێ ئێمەش دەجەنگین و ئاشتیش لەگەڵ هەر کەس ببەستێ ئێمەش ئاشتی لەگەڵ دەبەستین، ئینجا ئەسعەدی کوڕی زورارە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) مەرجم لەسەر دابنێ، ئەویش فەرمووی: (بەیعەتم پێ بدەن لەسەر ئەوەی شایەتی بدەن هیچ پەرستراوێ نیە جگە لە الله و منیش پێغەمبەری خوام و نوێژ بکەن و زەکات بدەن و گوێگری و گوێڕایەڵیتان هەبێ و لەسەر دەسەڵات رکەبەری خاوەن دەسەڵات نەکەن، خۆتان و ژن و منالّتان لە چی دەپارێزن منیشی لێ بپارێزن) دەمراستی پشتیوانان وتی: بەڵێ ئەمەت بۆ دەکەین ئەی پێغەمبەری خوا، ئەی ئێمە چیمان بۆ هەیە؟ فەرمووی: بەهەشت و سەرکەوتن.[3]

ئەسعەد لە مەدینە پێنج فەرزە بەرنوێژی دەکرد بۆ موسڵمانانی مەدینە[4] و یەکەم کەسیش بوو نوێژی هەینی بۆ کردن،[5] دوو کوڕی لابوو بە ناوەکانی سەهل و سوهەیل کە برا بوون زەویەکیان هەبوو، ئەمیش

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٤٨٦.
[2] البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص٢٢٩.
[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٦٠٩.
[4] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج١، ص٣٠٢.
[5] أسد الغابة، ج١، ص١١٢.

سەرپەرشتی دەکردن و لای خۆی ئاگایی دەکردن،[1] ئەسعەد ئەو شوێنەی کردبوو بە مزگەوت و لەوێ نوێژی بۆ موسڵمانان دەکرد.[2]

پشتیوانان داوایان لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد کەسێکیان بۆ بنێرێ تا قورئانیان فێر بکات، ئەویش موصعەبی کوڕی عومەیری نارد، موصعەبیش لە ماڵی ئەسعەد دەمایەوە.[3]

بۆ ساڵی دواتر کە موسڵمانە پشتیوانەکان چوونەوە بۆ مەککە، ئەسعەدیش لەگەڵیان چوو.[4]

جارێک ئەسعەد موصعەبی برد بۆ لای بەنی عەبدولئەشهەل تا لەسەر ئیسلام قسەیان بۆ بکات، گەیشتنە ناو باخێکی بنی ظفر و لای بیرێ دانیشتن، بڕێ لە خەڵکی هۆزی ئەسلەم لە دەوریان کۆبوونەوە، هێشتا سەعدی کوڕی موعاذ و ئوسەیدی کوڕی حوضەیر کە گەورەی هۆزەکانیان بوون موسڵمان نەبووبوون، کاتێک قسەکانی ئەسعەدو موصعەبیان بیست سەعد بە ئوسەیدی وت: هەی بێباوک بڕۆ بۆیان، سەیرکە چۆن هاتوونەتە خاکمان تا هەرزەکارەکانمان لەخشتەبەرن، بڕۆ بەریان پێ بگرە و مەهێڵە بێنە ناوچەی ئێمە، ئوسەیدیش بە خەنجەرێکەوە هات، ئەسعەد بە موصعەبی وت: ئەمە گەورەی هۆزەکەیەتی، دێت بۆ لات، راست پەیامی خوای پێ بڵێ، موصعەب وتی: ئەگەر دابنیشێ قسەی لەگەڵ ئەکەم، ئوسەید بە قسەوتنەوە هاتەبەردەمیان، وتی: بۆچی هاتون بۆ لامان تا هەرزەکارەکانمان لەخشتەبەرن، ئەگەر گیانی خۆتانتان لا خۆشەویستە دووربگرن لێمان، موصعەب پێی وت: بۆچی دانانیشیت تا گوێمان لێ بگریت، ئەگەر بەدڵت نەبوو وازدێنین، ئەویش وتی: قسەکەت جوانە، خەنجەرەکەی دەستی داچەقاند بەناو زەویدا و لەبەردەمیاندا دانیشت،

[1] صحيح البخاري – كتاب مناقب الأنصار – باب هجرة النبي(ﷺ) وأصحابه إلى المدينة، الرقم ٣٩٠٦.
[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص٢٣٩.
[3] البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص١٤٩.
[4] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص١١٩، الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٨٠.

موصعەب باسی ئیسلامی بۆ کرد و قورئانی بۆ خوێندەوە، خێرا ئومێدی موسڵمانبوونیان لە روخساریدا بەدیکرد، ئوسەید وتی: چەند جوان و چاک ئەڵێن، باشە ئەگەر بتانەوێ بچنە ناوئەم ئاینە چی دەکەن؟ ئەوانیش پێیان وت: خۆت بشۆ و جلەکانت بشۆ و دواتر شایەتومانی حەق بهێنە و دواتر نوێژ بکە، ئەویش وایکرد، دواتر ئوسەید وتی: من کەسێکم لەدوای خۆم جێهێشتووە ئەگەر ئەویش شوێنتان بکەوێ چی کەسی ناو هۆزەکەی هەیە شوێنتان ئەکەون، ئێستا ئەینێرم بۆ لاتان، ئەویش سەعدی کوڕی موعاذە، ئینجا ئوسەید خەنجەرەکەی هەڵگرت و چوو بۆ لای سەعد و هۆزەکەشی چاوەڕوان بوون، سەعد پێی وت: چیت کرد؟ ئوسەید وتی: من قسەم لەگەڵ کردن بەخوا وای نابینم خراپ بن، رێم لێگرتن، ئەوانیش وتیان: چیت پێ خۆشە وادەکەین، بەنی حارثە ویستیان بچن ئەسعەدی کوڕی زوراره بکوژن، ئەشزانن پوورزای تۆیە، وادەکەن وەک سووکایەتی بە تۆ، سەعد بە توورەیی و خێرایی هەستا و چوو بۆ لایان، کە چوو بینی هەردووکیان بێخەم دانیشتون زانی ئوسەید ویستوویەتی گوێیان لێ بگرێ، بە قسەوتنەوە لەبەردەمیاندا راوەستا، بە ئەسعەدی کوڕی زرارەی وت: بەخوا لەبەر خزمایەتی نێوانمان نەبوایە ئەمەت بەسەردا تێنەئەپەڕی، موصعەب پێی وت: بۆچی دانانیشیت گوێمان لێ بگریت، ئەگەر بەدڵت بوو باشە، ئەگەر بەدڵت نەبوو لێت دووردەکەوینەوە، سەعد وتی: قسەکەت جوانە، دانیشت و خەنجەرەکەی داچەقاند بە زەویداو گوێی لێگرتن، هەمان شتیش بۆ ئەم روویدا، کە سەعد گەڕایەوە، هۆزەکەی وتیان: بەوخوایە سەعد بەدەموچاوێکی ترەوە هاتوەتەوە، کاتێک سەعد گەیشتە لایان وتی: ئەی بەنی عەبدولئەشهەل منتان لا چۆنە؟ وتیان: گەورەو شارەاز و بەڕێزترینی ئێمەیت، ئەویش وتی: دەی دەنگم لە ژن و پیاوتان هەڵدەگرم تا کاتێک باوەر دێنن بە خوا و پێغەمبەرەکەی، بەوە هەرهەموو بەنی عەبدولئەشهەل

موسڵمان بوون جگە لە چەند کەسێ، پاشان ئەسعەد موصعەبی بردەوە بۆ ماڵی خۆیان.[1]

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی کرد بۆ مەدینە، خێرا ئەسعەد وشترەکەی پێغەمبەری(ﷺ) بردەوە بۆ لای خۆی و بە جوانی سەرپەرشتی دەکرد.[2]

هەروەها سەرەتا کە طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵا هاتە مەدینە لای ئەسعەدی کوڕی زورارە دەمایەوە.[3]

ئەسعەد تووشی نەخۆشیەک بوو کە پێی دەوترا (الذبحة)، جوولەکەکان تانەیان دەدا لە پێغەمبەر(ﷺ)کە بۆچی چاکی ناکاتەوە، پێغەمبەر(ﷺ) چوو بۆ لای تا سەردانی بکات و سەیری حاڵی کرد، پاشان خۆی چارەسەی داخکردنی بۆ بەکارهێنا، بەڵام هەر مرد، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (مِيتةُ سوْءٍ لِلْيهُودِ، يقُولُون: أفلا دفع عنْ صاحِبِهِ، وما أمْلِكُ لهُ ولا لِنفْسِي شيْئا)،[4] (مەرگێکی خراپ بەشی جوولەکە بێت، دەڵێن بۆ نەیتوانی دەردی هاوەڵەکەی بپەڕێنێ، من بۆ ئەو و بۆ خۆیشم هیچم پێ ناکرێ).

ئەسعەد وەسیەتی کرد دوای خۆی کچەکانی لەژێر چاودێری پێغەمبەردا(ﷺ) بن، بەوجۆرە کچەکانی زۆر تێکەڵی خێزانەکانی پێغەمبەر(ﷺ) دەبوون.[5]

ئەمە نموونەیەکی جوانە بۆ ئەوانەی پێیان وایە نوشستی موسڵمانان لە هەڵە و ناتەواویانەوەیە، بەڵکو زۆرجار خوای گەورە بەندەکانی تاقی دەکاتەوە بە چەند نیازێ: تا تاوانی ئەو کەس و کۆمەڵە بسڕێتەوە، پاداشتیان زیاد بکات، ئەوەش تەنها لە دەست خوای گەورەدایە، تەنانەت پێغەمبەری خواش(ﷺ) بە بڕیارو ویستی خوا نەبێت هیچی پێ ناکرێ،

---

[1] البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص١٥٢-١٥٣.

[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص٢٣٧، البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص٢٠٢.

[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٢١٦.

[4] -سنن ابن ماجه - أبواب الطب - باب من اكتوى، الرقم ٣٦٠٢، حسنه الألباني.

[5] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٦١٠.

خوای گەورەش بۆ هەموو ئەو شتانە سوننەتی ژیان ناگۆڕێت ئەگەرچی هەندێ جار موعجیزە نیشانی بەندەکانی دەدات، بەڵام بە گشتی ڕێیداوە سوننەتەکانی ژیان وەک نەخۆشی و نارەحەتی و مەرگ و... هتد بمێننەوە.

**کاتی مردنی:**

مردنی ئەسعەد لە پێش جەنگی بەدردا بوو، واقیدی دەڵێت: نۆ مانگ دوای کۆچکردن بوو، لە مانگی شەوال واتە مانگێ پێش جەنگی بەدر کە لە رەمەزاندا روویدا ئەسعەد وەفاتی کرد،[1] لەو کاتەی هێشتا سەرقاڵی دروستکردنی مزگەوتەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بوون،[2] بەوە یەکەم موسڵمان بوو لە دوای کۆچ بۆ مەدینە وەفاتی کرد،[3] هەرچەندە رایەکی تر هەیە دەڵێت: کلثومی کوڕی هدم یەکەم کەس بووە مردووە، چەند رۆژێ پێش ئەسعەد مردووە،[4] پێغەمبەر(ﷺ) خۆی ئامادەی شۆردن و کفن کردن و نوێژ لەسەرکردنی بوو.[5]

رایەکیش هەیە دەڵێت: پێش هاتنی پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کردووە، بەڵام رای یەکەم راستە.[6]

ئەسعەد لە گۆڕستانی بەقیع ئەسپەردە کرا، یەکەم موسڵمانیش بوو لەو گۆڕستانە ئەسپەردە کرا، بەڵام رایەک هەیە دەڵێت: عوثمانی کوڕی مەظعوون یەکەم موسڵمان بووە لەو گۆڕستانە ئەسپەردە کراوە،[7] بەڵام ئەوەیان راستە کە ئەسعەد یەکەم ئەسپەردەکراوی موسڵمانی ئەو گۆڕستانە بووە، چونکە عوثمان لە ساڵی دووەمی

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٥٥.
[2] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج١، ص٣٠٠.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٥٥.
[4] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٣، ص١٣٢٨.
[5] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٦١١.
[6] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٤، ص١٦٠٠.
[7] سير أعلام لاالنبلاء للذهبي، ج١، ص١٥٥.

کۆچی و پاش جەنگی بەدر وەفاتی کرد،[1] بەڵام ئەسعەد لە پێش جەنگی بەدر و لە مانگی شەوالدا وەفاتی کرد، واتە نزیکەی مانگێ پێش جەنگی بەدر.

دەکرێت بڵێین ئەسعەدی کوڕی زورارە یەکەم کەس بوو لە پشتیوانان لە پاش کۆچی پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کردو لە بەیقیع ئەسپەردە کرا، عوثمانی کوڕی مەظعوونیش یەکەم کەس بوو لە کۆچەران لە لە پاش کۆچی پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد و لە بەیقیع ئەسپەردە کرا.

کاتێک وەفاتی کرد بەنی نەجار هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و وتیان: نەقیبەکەمان وەفاتی کردووە نەقیبێکی ترمان بۆ دابنێ، پێغەمبەر(ﷺ) لە وەڵامدا پێی فەرموون (أنتم أخوالي وأنا نقيبكم) [2] (ئێوە خاڵوانی منن و منیش نەقیبی ئێوەم)، ئەمەش ڕێزلێنانێکی گەورە بوو لەبەنی نەجار.

خوای گەورە برێ تایبەتمەندی بەم هاوەڵە خۆشەویستە بەخشی، لەوانە:

- یەکەم کەس بوو لەپشتیوانان موسڵمانان بوو.
- بەشداری هەموو بەیعەتەکانی عەقەبەی کرد.
- یەکەم کەس بوو لە بەیعەتی عەقەبەدا دەستی خستە ناو دەستی پێغەمبەر (ﷺ).
- یەکەم کەس بوو لە مەدینە نوێژی هەینی بۆ موسڵمانان کرد.
- یەکەم موسڵمانی ناو مەدینە بوو کە دوای کۆچ وەفاتی کرد.
- پێغەمبەر(ﷺ) ئامادەی شۆردن و کفنکردن و ئەسپەردەکردنیشی بوو.
- یەکەم موسڵمان بوو لە مەدینە پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی مردووی لەسەر کرد.
- یەکەم موسڵمان بوو لە گۆڕستانی بەقیع ئەسپەردە کرا.
- پێغەمبەر(ﷺ) بە دەستی خۆی چارەسەری نەخۆشی بۆ ئەنجامدا.

---

[1] أسد الغابة، ج٣، ص٦٢١، سير أعلام النبلاء للذهبي، ج١، ص١٥٥.

[2] أسدالغابة، ج١، ص١١٢.

• کچەکانی لەدوای خۆی لەژێر سەرپەرستی راستەوخۆی پێغەمبەری خوادا بوون و بەردەوام سەردانی ماڵی خێزانەکانی پێغەمبەریان(ﷺ) دەکرد.
• کاتێک وەفاتی کرد پێغەمبەر(ﷺ) ئەرکەکەی ئەوی گرتەئەستۆ کە نەقیبی بەنی نەجار بوو، ئەوەبوو دوای وەفاتی ئەسعەد پێغەمبەر(ﷺ) بە بەنی نەجاری راگەیاند ئەو دەبێتە نەقیبیان.
• لەناو نەقیبەکاندا تەمەنی لە هەموویان کەمتر بوو، بەڵام کاراترین و پێشرەوی هەموویان بوو.

## ٥٧. ئەسعەدی کوڕی سەلامە(رضي الله عنه):

ناوی ئەسعەدی کوڕی سەلامەی ئەشهەلی ئەنصاریە، لە جەنگی الجسر شەهید بوو.[١]

## ٥٨. ئەسعەدی کوڕی سەهل(رضي الله عنه):

ناوی ئەسعەدی کوڕی سەهلی کوڕی حونەیفە، لە پشتیوانانە.[٢]

سەهلی باوکیشی هاوەڵێکی دڵسۆزی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، بەشداری غەزای بەدر و غەزاکانی تری کرد، لە غەزای ئوحوددا کە خەڵکی بڵاوەیان لێکرد سەهل لە دەوری پێغەمبەر(ﷺ) مایەوە و بەرگری لێکرد.[٣]

دایکیشی ناوی حەبیبەی کچی ئەسعەدی کوڕی زورارە بوو.[٤]

ئەسەد لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) لەدایکبوو، دوو ساڵ پێش وەفاتی پێغەمەر(ﷺ) لەدایکبوو، باوکی بردی بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و ئەویش دەمی بە خورما شیرین کرد و بەناوی ئەسعەدی باپیریەوە ناوی نا.[٥]

---

[١] أسد الغابة، ج١، ص١١٢، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٥٦.
[٢] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٨٢.
[٣] أسدالغابة، ج٢، ص٥٤٥.
[٤] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٤٧١.
[٥] أسد الغابة، ج١، ص١١٢.

## ٥٩. ئەسعەدی کوڕی عەبدولا(رضي الله عنه):

ناوی ئەسعەدی کوڕی عەبدوڵای کوڕی مالیکی کوڕی ئەفصای خوزاعیە، فەرموودەیەکی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە دەفەرموێت (أحب الأديان إلى الله الحنيفية السمحة وإذا رأيت أمتي لا يقولون للظالم أنت ظالم فقد تُوُدع منهم)،[1] (خۆشەویستترینی ئایینەکان لای خوا حەنەفیەتی پاک و پوختە، ئەگەر بینیت ئوممەتەکەم بە ستەمکاریان نەوت تۆ ستەمکاریت، ئەوە ئیتر ماڵیاواییان لێکراوە –دەستیان لێ بشۆ-)، لەو گێڕانەوەدا کە ئیبن حەجەر هێناویەتی تا ئێرەی هێناوە (أحب الأديان إلى الله الحنيفية السمحة).

## ٦٠. ئەسعەدی کوڕی عەطیە(رضي الله عنه):

ناوی ئەسعەدی کوڕی عەطیەی کوڕی عوبەیدی کوڕی بجالەی کوڕی عەوفی قوضاعیە،[2] بەشداری بەیعەتی ریضوان بووە و لە ژێر ئەو درەختەدا بەیعەتی داوە بە پێغەمبەر(ﷺ).[3]

بەیعەتی ریضوان لە سەروبەندی رێککەوتنی حودەیبیەدا بوو، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ)لەگەڵ هاوەڵان ویستیان بچن بۆ عومرە و بێباوەڕانی قورەیش رێیان پێگرتن، بۆ دواندنی بێباوەڕان پێغەمبەر(ﷺ) عوثمانی کوڕی عەففانی نارد بۆ ناو قورەیش، بەڵام دەنگۆ بڵاو بوویەوە کە عوثمانیان شەهید کردووە، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) لە بن درەختێ لەو شوێنەی تیایدا مابوونەوە داوای لە هاوەڵان کرد بێن و بەیعەت بدەن، هاوەڵانیش چوون بەیعەتیان دا بە پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەر(ﷺ) لەبری عوثمان دەستەکەی تری خۆی

---

[1] أسدالغابة، ج١، ص١١٣.

[2] أسدالغابة، ج١، ص١١٣.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٥٧.

خستە دەستی و لەبریدا بەیعەتی دا،[1] خوای گەورەش شایەتی راستگۆیی پێدان و ئایەتی لە بارەوە دابەزاندن (لقد رضي الله عن المؤمنين إذ يبايعونك تحت الشجرة).[2]

هەروەها ئەسعەد لە فەتحی میصریشدا بەشداری کرد.[3]

## ٦١. ئەسعەدی کوڕی یەربووعی ئەنصاری(رضي الله عنه):

ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان و لە بەنی ساعیدەیە،[4] هەریەک لە ئیبن ئەثیر و ئیبن حەجەر ناویان هێناوە.[5]

لە جەنگی یەمامە شەهید بوو،[6] جەنگی یەمامەش لە سەردەمی خەلیفە ئەبووبەکردا روویدا.[7]

## ٦٢. ئەسعەدی کوڕی یەزید(رضي الله عنه):

ناوی ئەسعەدی کوڕی یەزیدی کوڕی فاکیهی کوڕی یەزیدە،[8] ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان،[9] هەرچەندە ئەبوونەعیم دەڵێت: سەر بە بەنی نەجارە، بەڵام هەریەک لە ئیبن ئەثیر و ئیبن حەجەر ئەوە بە هەڵە دەزانن.[10]

---

[1] السيرة النبوية لابن هشام، ج٤، ص ٢٧٥-٢٨٣.
[2] تفسير ابن كثير، ج٤، ص١٩٢.
[3] أسدالغابة، ج١، ص١١٣، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٥٧.
[4] أسد الغابة، ج١، ص١١٣.
[5] أسد الغابة، ج١، ص١١٣، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٥٧.
[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٥٧.
[7] تاريخ ابن خلدون، ج٢، ص٥٠٢.
[8] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٥٧.
[9] أسدالغابة، ج١، ص١١٤.
[10] أسدالغابة، ج١، ص١١٤، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٥٧.

بەشداری غەزای بەدری کردووە،[1] هەروەها بەشداری جەنگی ئوحودیشی کردووە، کاتێکیش وەفاتی کرد، دوای خۆی هیچ نەوەیەکی نەما.[2]

## ٦٣. ئەسفەعی بەکری(رضي الله عنه):

هەریەک لە ئیبن ئەثیر و ئیبن حەجەر باسیان کردووە، فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ لامان و کەسێک پرسیاری کرد کام ئایەتەی قورئان گەورەترە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (الله لا إله إلا هو الحي القيوم).[3]

ئەم فەرموودەیە بەو واتایە بۆ ئوبەی کوڕی کەعب هاتووە، ئوبەی دەگێڕێتەوە جارێکیان پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری کرد لە ئوبەی و پێی فەرموو: (یا ابا المنذر أتدري أي آية من كتاب الله معك أعظم) واتە (ئەی ئەبومونزیر ئایا ئەزانی چ ئایەتێکی کتێبی خوا هەیەو لەبەرت بێت گەورەترین ئایەتە) ئوبەی دەڵێت: منیش وتم: (الله لا إله إلا هو الحی القيوم)، پێغەمبەریش(ﷺ) دای بەسەر سنگمدا و فەرمووی: (و الله ليهنئک العلم ابا المنذر) یاخوا زانستت لێ پیرۆز بێت ئەی ئەبوو مونذیر.[4]

## ٦٤. ئەسقەع(رضي الله عنه):

ناوی ئەسقەعی کوڕی شورەیحی کوڕی صەریمی کوڕی عەمری کوڕی ریاحی جرمیە،[5] لای ئیبن حەجەر بە ئەسفەع هاتووە.[6]

وەک وەفد هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمان بوو.[7]

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٥٧.

[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٥٩٤.

[3] أسد الغابة، ج١، ص١١٥، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٥٧.

[4] صحيح مسلم - كتاب صلاة المسافرين وقصرها - باب فضل سورة الكهف وآية الكرسي، الرقم ٨١٠.

[5] أسد الغابة، ج١، ص١١٥.

[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٥٧.

[7] أسد الغابة، ج١، ص١١٥.

## ٦٥. ئەسلەعی کوڕی شەریک(رضي الله عنه):

ناوی ئەسلەعی کوڕی شەریکی کوڕی عەوفی ئەعوەجی تەمیمیە،[١] دەوترێ کوڕی کەعبی کوڕی سەعدە،[٢] خزمەتکاری پێغەمبەر(ﷺ) بوو و گەشتی لە گەڵدا کردووە،[٣]دواتر لە بەصرە نیشتەجێ بوو.[٤]

ئەسلەع دەڵێت: جارێک کە وشترەکەی پێغەمبەرم(ﷺ) دەبردەڕێ، لە ڕێدا لە شەوێکی سارددا تووشی لەشگرانی بووم، ترسام ئەگەر بە ئاوی سارد خۆم بشۆم بمرم یان نەخۆش بکەوم، حەزیشم نەئەکرد بە لەشگرانیەوە جڵەوی وشترەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بگرم بۆ پێغەمبەری خوا، بۆیە وتم: ئەی پێغەمبەری خوا تووشی لەشگرانی بوم، فەرمووی: تەیەمموم بکە ئەی ئەسلەع، وتم: چۆن؟ پێغەمبەریش(ﷺ) دووجار دەستی دا بە زەویدا، جارێک بۆ دەموچاوی و جارێکیش بۆ هەردوو دەستی تا ئانیشکی،[٥] بە ریوایەتێکی تر هاتووە پێغەمبەر(ﷺ) ماوەیەک بێدەنگ بوو، دواتر جبریل هات بۆ لای و ئایەتی (الصعید)ی بۆ هێنا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: هەستە ئەی ئەسلەع تەیەمموم بکە.[٦]

## ٦٦. ئەسلەعی کوڕی ئەسقەع(رضي الله عنه):

ئەسلەعی کوڕی ئەسقەعی ئەعرابی هاوەڵی پێغەمبەرە(ﷺ)، فەرموودەیەکی سەبارەت بە تەیەمموم گێڕاوەتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت (ضربة للوجه وضربة لليدين إلى المرفقين) [٧] (دەست لە زەوی دانی بۆ دەموچاو و دەست لە زەویدانی بۆ هەردوو دەست تا ئانیشک).

---

[١] أسد الغابة، ج١، ١١٦.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٥٨.

[٣] معجم الصحابة لابن قانع، ج١، ص٦٠.

[٤] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٣٩.

[٥] الأوسط لابن المنذر، الرقم ٥٢٨، أسد الغابة، ج١، ١١٦.

[٦] معجم الصحابة لابن قانع، ج١، ص٥٠، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٨٧٣

[٧] أسد الغابة، ج١، ١١٦.

## ٦٧. ئەسلەمی حەبەشی(رضي الله عنه):

ئەمە ئەو هاوەڵەیە کە بێ ئەوەی نوێژێ بکات دنیای جێهێشت،

ئەبوو نوعەیم دەڵێت: ناوی یەسارە،[١] ئیبن ئەثیر دەڵێت: ناوی ئەسلەمە، بەڵام بە ئەسوەد ناسراوە، کۆیلەیەکی حەبەشی ڕەش بوو کە کۆیلەی کەسێکی جوولەکە بوو، ئەو جوولەکەش لە خەیبەر دەژیا.[٢]

ئەسوەدی حەبەشی کاری شوانەیی دەکرد بۆ خاوەنە جوولەکەکەی، پێغەمبەر(ﷺ) کە گەمارۆی خەیبەری دا، ئەسوەد پاش گەڕانەوەی لە لەوەڕاندنی ئاژەڵەکان چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و پێی وت: دەکرێ باسی ئیسلامم بۆ بکەیت و پێم بڵێیت ئیسلام چیە؟ پێغەمبەریش(ﷺ) تێیگەیاند کە ئیسلام چیە، ئەویش موسڵمان بوو، ئینجا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەم مەڕو ئاژەڵانە هی ئەو کابرایەن من چییان لێ بکەم، فەرمووی: (اضرب في وجوهها فإنها سترجع إلى ربها) (بەڕێیان بکە خۆیان دەچنەوە بۆ لای خاوەنەکانیان)، ئەویش مشتێ خۆڵی هەڵگرت و وەشاندی بەرووی ئاژەڵەکاندا و وتی: بڕۆنەوە بۆ لای خاوەنەکانتان سوێند بەخوا خۆم ناتانبەمەوە، هەموویان چوون تا گەیشتنەوە ناو قەڵاکە، ئینجا ئەسلەم لێنەوی تا لەگەڵ موسڵمانان بەشداری جیهادی خەیبەر بکات، بەردێکی بەرکەوت و شەهید بوو، هاوەڵان تەرمەکەیان هێنا بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و لە پشت پێغەمبەرەوە(ﷺ) بە داپۆشراوی دایاننا، هەندێ لە هاوەڵانیش لە دەوری پێغەمبەر(ﷺ) بوون، پێغەمبەر(ﷺ) لایەکی کردەوە تا سەیری بکات، خێرا رووی وەرگێڕا، هاوەڵان وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا رووت لێ وەرگێڕا؟![٣]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٦٣.

[٢] أسدالغابة، ج١، ص١١٨.

[٣] أسدالغابة، ج١، ص١١٨.

پێغەمبەر(ﷺ) تێیگەیاندن کە روووەرگێڕانەکە لە رقەوە نیە و پێی فەرموون (إن معه الآن زوجته من الحور العين) ئێستا ژنە حۆریەکەی بەهەشتی لەگەڵیدایە.[1]

پەند و وانە:

⌘ بانگەواز کاتی دیاری کراوی بۆ نیە و تەنانەت لە جەنگیشدا نابێ لە گەیاندنی پەیامی خوا بوەستێت.

⌘ گوێ نەدرێ بە ئاستی کۆمەڵایەتی ئەو کەسەی بانگی دەکەیت بۆ رێبازی خوا، چ کۆیلەیەک بێت یان دەسەڵاتدارێک بێت لای خوا حسابی بەندەی بۆ دەکرێت.

⌘ بێهیوا نەبیت لە موسڵمانبوونی هیچ کەسێ، ئەگەرچی ئەسلەم ماوەیەکی زۆر کەم لە ژیانی مابوو، بەڵام خوا رێنموونی کرد بۆ ئیسلام و لەو ماوە کەمەشدا پلەی شەهیدی پێ بەخشی.

⌘ گەڕانەوە بۆ بڕیاری خواو پێغەمبەرەکەی(ﷺ) پێویستە، وەک چۆن ئەسلەم خێرا لەگەڵ موسڵمانبوویدا ئەو هەنگاوەی گرتەبەر.

## ٦٨. ئەسلەمی کوڕی عەمیرە(رضي الله عنه):

ناوی ئەسلەمی کوڕی عەمیرەی کوڕی ئومەییەی کوڕی عامری کوڕی جوشەمە، لە پشتیوانانە و بەشداری غەزای ئوحودی کردووە.[2]

## ٦٩. ئەسلەمی کوڕی ئەوس(رضي الله عنه):

ناوی ئەسلەمی کوڕی ئەوسی کوڕی بەجرەی کوڕی حارثی خەزرەجیە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکانە لە بەنی ساعیدە.[3]

ئیبن ئەثیر لەگەڵ ئەسلەمی کوڕی بەجرە بەجیا ئەیهێنێ، بەڵام ئیبن

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٦٣.
[2] أسدالغابة، ج١، ص١٢١، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٦٣.
[3] أسد الغابة، ج١، ١١٧.

حەجەر بە یەکیان ئەزانێ و ئەڵێت ئەگەریش لەیەک جیابن ئەوە لەوانەیە یەکێکیان برازای ئەوی تریان بێت،[1]بەشداری غەزای ئوحودی کردووە،[2] دەڵێن ئەم ڕێگر بووە لەوەی تەرمی عوثمان لە بەقیع ئەسپەردە بکرێ.[3]

گێڕانەوەیەکی لێوە گێڕدراوەتەوە کە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) لای بەندکراوەکانی قورەیضە داینام، منیش سەیری فەرجی مێرد منداڵەکانم دەکرد ئەگەر پێگەیشتوو بوایە (مووی هەبوایە) دەمدا لە ملی، ئەگەر نا لە دەستکەوتی موسڵماناندا دەمهێشتەوە،[4]ئیبن عەبدولبەر سەنەدی ئەم فەرموودەیە بە لاواز دەزانێت.[5]

ئەم گێڕانەوەیە لاوازە، هەروەها لەگەڵ ڕەوشتی پێغەمبەردا(ﷺ) ناگونجێت کەسێکی دانابێت سەیری داوێنی کوڕان بکات تا بزانێت کامیان باڵغ بوون و بکوژرێن.

## ٧٠. ئەسلەمی کوڕی جوبەیرە(ﷺ):

ناوی ئەسلەمی کوڕی جوبەیرەی کوڕی حوصەینی کوڕی جوبەیرەیە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان و لەوانیشدا لە بەنی عەبدولئەشهەلە. [6]

بوخاری بە ئەسلەمی کوڕی حوصەینی کوڕی جوبەیرە ناوی دێنێ و وەک هاوەڵ ناوی دێنێ بەڵام فەرموودەی لێوە نەگێڕاوەتەوە،[7] ئیبن ئەثیر و ئیبن حەجەریش پێیان وایە ئەو دوانە هەردووکیان یەک بن.[8]

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٦٠.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٦٠.
[3] أسد الغابة، ج١، ١١٧.
[4] معجم الصحابة لابن قانع، ج١، ص٤٦، المعجم الصغير للطبراني، الرقم١٨١، والحديث موضع إرسال.
[5] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٨٦.
[6] أسد الغابة، ج١، ١١٧.
[7] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٦١.
[8] أسد الغابة، ج١، ١١٨، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٦١.

## ٧١. ئەسلەمی مەولای پێغەمبەر(ﷺ):

ئەسلەم لە بنەرەتدا لە قیبطیەکانی میصرە،[1] هەروەها لە کۆچەرانە، لە مەککەوە کۆچی کردووە بۆ مەدینە،[2] خاوەن زانست و گەورەیی و ڕێزێکی زۆر بوو.[3]

سەبارەت بە ناوی ئەم هاوەڵە ڕاجیایی هەیە، هەریەک لەم ناوانە هاتون (ئەسلەم، ئیبن نومەیر، ئیبراهیم، هورمز، ثابت)،[4] ئیبن عەبدولبەر دەڵێت: زیاترین ناویٚ پێی ناسرابێ ئەسلەمە،[5] کونیەکەی ئەبوورافیعە و زیاتر بەوە ناسراوە.[6]

مەولای پێغەمبەری خوا بووە، پێغەمبەر(ﷺ) سەلمای مەولای مارەکرد لە ئەبوو رافیع و خوای گەورەش کوڕێکی پێ بەخشین کە ناویان نا عوبەیدوڵا،[7] ئەم عوبەیدوڵایە دواتر لە سەردەمی خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبووطالیبدا نووسەر و خەزنەداری خەلیفە بوو،[8] عوبەیدوڵا فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە.[9]

ئیبن حەجەر گێڕانەوەیەکی هێناوە کە عوبەیدوڵای بە کورەزای ئەبوورافیع هێناوە واتە ئەبورافیع کوڕێکی هەبووە بە ناوی عەلی کە ئەویش کوڕێکی هەبووە ناوی عوبەیدوڵا بووە،[10] ئەم عوبەیدوڵایە جیایە لە عوبەیدوڵای کوڕی ئەسلەم، واتە ئەو دوو عوبەیدوڵایە مام و برازا بون.

---

[1] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٢، ص١٦.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص١٣٦.
[3] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٢، ص١٦.
[4] أسدالغابة، ج١، ص٦٦.
[5] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٨٣.
[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٠.
[7] أسدالغابة، ج١، ص٦٦.
[8] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٨٤.
[9] أسدالغابة، ج١، ص٦٦.
[10] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٥، ص٦٧.

کوڕێکی تریشی هەبوو بە ناوی حەسەن کە ئەویش فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە.[1]

ئیبن حەجەر ناوی دوو کوڕی تری دێنێ (رافع و موغیره) کە فەرموودەیان لە باوکیانەوە گێڕاوەتەوە.[2]

ئەسلەم پێشتر مەولای عەبباسی مامی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، بەڵام عەبباس بەخشی بە پێغەمبەر(ﷺ)،[3] دەشوترێ بەڵکو مەولای سەعیدی کوڕی عاص بووە، کاتێک سەعید مرد منداڵەکانی بە میراتیان گرت، هەموو ئازادیان کرد جگە لە خالید، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) داوای لێکرد یان ئازادی بکات یان بیفرۆشێت یان بە دیاری پێی ببەخشێ، خالید رازی نەبوو، دواتر بە دیاری بەخشی بە پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش ئازادی کرد،[4] لە رایەکی ترا هاتووە سێ منداڵی سەعید ئازادیان کرد و ئەوانی تر ئازادیان نەکرد، بۆیە ئەبوورافیع چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و داوای لێکرد یارمەتی بدات و قسەیان لەگەڵدا بکات، پێغەمبەریش(ﷺ) قسەی لەگەڵ کردن، ئەوانیش بەخشییان بە پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش ئازادی کرد.[5]

ئیبن ئەثیر دەڵێت: بۆچوونی یەکەم راستترە کە هی عەبباس بووەو پاش ئەوەی بەخشیویەتی بە پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش ئازادی کردووە.

کاتێک مژدەی موسڵمانبوونی عەبباسی برد بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش ئازادی کرد،[6] بەڵام عیکریمەی مەولای عەبباس دەڵێت: ئەبورافیع وتی: من مەولای عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیب بووم و ئیسلامیش چووبووە ناو ئالوبەیتەوەو هەریەک لە عەبباس و ئوممولفەضلیش موسڵمان بووبوون.[7]

---

[1] أسدالغابة، ج١، ص

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص١٣٤.

[3] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٨٣

[4] أسدالغابة، ج١، ص

[5] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٨٣.

[6] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٨٣. الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص١٣٤.

[7] أسد الغابة، ج٦، ص١١٣.

موسڵمانبوونی لەپێش جەنگی بەدردا بوو.[1]

ئەبوورافیع موسڵمانبوون عەبباس دوای موسڵمانبوونی خۆی دێنێ، بەڵام عەبباس موسڵمانبوونی خۆی دەشاردەوە،[2] بەڵام لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە ئەبوورافیع دوای موسڵمانبوونی عەبباس و ئوممولفەضل موسڵمان بووە.[3]

مەسەلەی موسڵمانبوونی عەبباسی مامی پێغەمبەر(ﷺ) و بەشداربوونی لە بەدردا پەیوەستە بە گوێڕایەڵی عەبباس بۆ فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) نەک دژایەتی کردنی، چونکە عەبباس وەک هەواڵگری پێغەمبەر(ﷺ) لە مەککە مابوویەوە، ئەگینا خۆشەویستی بەرچاوی عەبباس بۆ پێغەمبەر(ﷺ) لە چەندین هەڵوێستدا دیارە، وەک چوونی لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بۆ بەیعەتی عەقەبە و ڕاسپاردەی بۆ پشتیوانان تا چاک نازی پێغەمبەر(ﷺ) ڕاگرن و وریای بن،[4] هەروەها لە بەدردا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد هەرکەس گەیشت بە عەبباس نەیکوژێت چونکە بە نابەدڵی هاتووە،[5] کاتێکیش بەدیل گیرا بە پێغەمبەری خوا ناوی پێغەمبەری(ﷺ) دەبرد نەک بە موحەممەد[6] لە کاتێکدا برازاشی بوو، ئیتر چۆن لەدژی شمشێر هەڵگرێ، بەڵکو عەبباس کاتێک ویستی کۆچ بکات بۆ مەدینە پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: (مقامک بمکة خیر)(مانەوەت لە مەککە چاکترە)، بۆیە مایەوە و لەوێ هەواڵی دەنارد بۆ پێغەمبەر(ﷺ).[7]

ئەبوو ڕافیع بەشداری جەنگی بەدری نەکرد چونکە ئەوکات لە مەککە بوو.[8]

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص١٣٤.
[2] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٢، ص٨٧
[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص١٠.
[4] البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص١٦٠.
[5] البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص٢٨٤.
[6] البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص٢٧٨.
[7] أسدالغبة، ج٣، ص١٦٣.
[8] البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص٣٠٨- ٣٠٩.

کاتێک عەبباس لە جەنگی بەدردا گیرا، دەبوو خۆی بە پارە ئازاد بکات، بۆیە ئەبوورافیع پارەی رزگار کردنەکەی عەبباسی برد بۆ مەیدنە، عەبباس پارەی ئازادکردنی خۆی و عقیلی برازای دا و ئەبوورافیع بردی و گەڕایەوە.[1]

ئەبوو رافیع لەگەڵ بڕێ لە موسڵمانانی تردا کۆچی کرد بۆ مەدینە، ئەوکات طەلحە خاوخێزانی ئەبووبەکری کۆچ پێدەکرد بۆ مەدینە، زەیدو ئەبوورافیعیش هەریەک لە فاطمە و ئوم کلثوم و سەودەو ئوم ئەیمەن و ئوسامەیان کۆچ پێدەکردن بۆ مەدینە، هەموویان پێکەوە چوون.[2]

پێشتر پێغەمبەر(ﷺ) هەریەک لە زەید و ئەبوورافیعی ناردبوون بۆ مەککە و دوو وشتر و پێنج سەد درهەمیشی پێدان تا ئەو ئەرکە بەجێبگەیەنن.[3]

ئەبوورافیع بەسەرهاتی خۆی دەگێڕێتەوە کە کاتێک جەنگی بەدر روویدا، ئەو لە مەککە بوو، دەڵێت: من کەسێکی لاواز بووم و سەرقاڵی چاککردنی پەرداخ و قاپ و قاچاخ بووم، کە هەواڵی سەرکەوتنی موسڵمانان هات ئێمە ورەمان بەرزبوویەوەو دڵخۆش بووین، ئەبوولەهەب نەچووبوو و لەبری خۆیدا عاصی کوڕی هیشامی ناردبوو، من لای ئاوی زەمزەم لەگەڵ ئوممولفەضل بووم سەرقاڵی ئەو کارەم بووم، ئەبووجەهل هات و قاچی راکێشا و پشتی تێکردم و دانیشت، ئەوەندەم بیست وتیان: ئەوە ئەبووسوفیان هاتەوە، ئەبوولەهەب وتی ئادەی برازام سوێند بەتەمەنم تۆ هەواڵت لایە، چوو بۆ لای ئەیوسوفیان و خەڵکی لە دەوری وەستابوون، پرسیاری کرد لە ئەبووسوفیان، ئەبووسوفیانیش وتی: بەخوا هیچ نەبوو، تەنها ئەوەی بەرنگاری خەڵکێ بووینەوەو گەردنی خۆمانمان پێدان تا چۆن بیانەوێ بمانکوژن و بمانگرن، بەخوا لەگەڵ ئەوەشدا سەرکۆنەی خەڵکەکەمان ناکەم، بەرنگاری پیاوانێکی سپی بووینەوە بەسەر ئەسپەوە

[1] الطبقات الکبری لابن سعد، ج٤، ص١٤.
[2] سیر أعلام النبلاء للذهبي، ج٢، ص١٥٢.
[3] سیر أعلام النبلاء للذهبي، ج٢، ص٢٦٩.

کە لەنێوان ئاسمان و زەویدا بوون، ئەبوو رافیع هاواری کرد وتی: بەخوا ئەوانە فریشتەی خوا بون، ئەبوولەهەبیش تا توانی دای بەناو دەممدا، منیش ئەوەنەی تر ورووژاندم، هات بۆم و دامی بە زەویدا و کەوتە لێدانم، منیش کەسێکی لاواز بووم، ئوممولفەضلیش هەستا و دارێکی هەڵگرت و دای بە سەریدا و سەرکۆنەی کرد چۆن دەدات لە مەولای کەسێک کە خۆی ئامادە نیە، ئەبوولەهەبیش بە سەرشۆڕیەوە ملی رێی گرتەبەر و چوو، سوێند بەخوا حەوت شەوی بەسەردا نەچوو تا خوا تووشی نەخۆشیەکی کرد کە بەهۆیەوە مرد و دوو کوڕەکەشی دووریان دەگرت لێی و دوو سێ شەو تەرمەکەیان لە ماڵەوە جێهێشت ئەسپەردەیان نەدەکرد تا بۆنی کرد، خەڵکێ لە قورەیش سەرکۆنەیان کردن و وتیان: بەسەرینە، ئەرێ شەرم ناکەن ناچن باوکتان ئەسپەردە بکەن لەکاتێکدا وا لە ماڵەوە بۆنی کردووە، وتیان: دەترسین تووش بین، یەکێک وتی: وەرن منیش دێم لەگەڵتانا، بەو حاڵەشەوە دەستیان بەری نەکەوت، بەڵکو هەر لە دوورەوە ئاویان کرد بە سەریدا، دوایی بردیان لە سەرووی مەککەوە ئەسپەردەیان کرد و بەردیان لەسەری دانا.[1]

ئەسلەم بەشداری غەزاکانی ئوحود و خەندەق و غەزاکانی دواتریشی کرد، چونکە بەشداری کردنی جیهاد لای هاوەڵان تەنها ئەرکێ نەبوو، بەڵکو حەز و ویستێ بوو کە تاسەیان بۆی هەبوو.

لە عەمرەی پاش رێککەوتنی حودەیبیەدا ئەبوورافیعیش لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) چوو و بەشداری کرد، کاتێک وادەی مانەوەیان لە مەککە تەواو بوو پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد بە ئەبوورافیع تا هاوار بکات بۆ موسڵمانان تا هەستن و بچن و لە مەککە نەمێننەوە، پێغەمبەر(ﷺ) خۆی چووە دەرەوە بۆ ناوچەی سرف، بەڵام فەرمانی کرد ئەبوورافیع لە مەککە مایەوە تا شەو و مەیموونەی کچی حارثی برد بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص٧٣- ٧٤، البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص٣٠٨- ٣٠٩.

پێغەمبەریش(ﷺ) لەوێ مەیموونەی گواستەوە.[1]

رایەک هەیە دەڵێت: مەیموونە خۆی داوای کردووە پێغەمبەر(ﷺ) بچێت داوای، بەڵام ئیبن کەثیر دەڵێت: رای راستتر ئەوەیە پێغەمبەر(ﷺ) خۆی داوای کرد و ئەبوورافیعی نارد بۆ داوای و ئەبوورافیع لە نێوانیاندا بوو،[2] ئەبوو رافیع دەڵێت: من نێردراوی نێوانیان بووم.[3]

لە غەزای خەیبەردا ئەسلەم بەشداری کرد و سەلمای ژنیشی لەگەڵیدا بەشداری ئەو غەزایە بوو،[4]ئەمەش نموونەیەکی باڵای خێزانێکی موسڵمانە کە لەپێناو گەیشتن بە رەزامەندی خوا و بەهەشتەکەی کێبڕکێ لەسەر هەر چاکەیەک دەکەن.

ئەسلەم دەڵێت: شەوێک سەرمایەکی سەختمان تووش بوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد هەرکەس لێفەو شتی پێیە بیدات بەسەر ئەوەشدا کە نیەتی، من کەسم شک نەبرد هاوبەشیم بکات، بۆیە چووم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، لێفەکەی خۆی دا بەسەر منیشدا، پێکەوە خەوتین تا بەیانی، بەیانی کە هەستاین مارێک لای قاچیەوە بوو، فەرمووی: ئەی ئەبوورافیع بیکوژە بیکوژە.[5]

پێغەمبەر(ﷺ) هەندێ جار ئەرکی کۆکردنەوەی زەکاتی دەسپارد بە ئەرقەم،[6] جارێکیان کە پێغەمبەر(ﷺ) ئەو ئەرکەی پێ سپارد ئەرقەم داوای کرد لە ئەبوو رافیع تا یارمەتی بدات لەبەرامبەردا بەشداری پشکی (العاملین علیها)ی دەکات، ئەبوورافیع وتی: با پرس بکەم بە پێغەمبەر(ﷺ)، کاتێک پرسی پێکرد پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (یا أبا رافع إنا أهل بیت لا تحل لنا الصدقة)،

---

[1] الطبقات الکبری لابن سعد، ج٢، ص١٢٢.
[2] البدایة والنهایة لابن کثیر، ج٥، ص٢٩٥.
[3] سیر أعلام النبلاء للذهبي، ج٢، ص٢٤١.
[4] الإستیعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٨٤.
[5] البدایة والنهایة لابن کثیر، ج٥، ص٣١٣.
[6] سیر أعلام النبلاء للذهبي، ج٢، ص٤٨٠، الإصابة في تمییز الصحابة، ج١، ص٤٤.

(ئەی رافیع ئێمەی ئالوبەیت صەدەقەمان بۆ حەڵاڵ نیە).[١]

کاتێک ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر(ﷺ) لە مانگی زیلحجەی ساڵی هەشتی کۆچی لە مەدینە لە ناوچەی (العالیة) لەدایکبوو،[٢] لەو کاتەدا سەلمای خێزانی لەوێ بوو، خێرا سەلما هەواڵەکەی گەیاند بە ئەبوورافع، ئەویش هەواڵەکەی گەیاند بە پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش بەندەیەکی پێبەخشی.[٣]

پێغەمبەر(ﷺ) جارجارە دەچوو بۆ گۆڕستانی بەقیع و نزای خێری دەکرد بۆ مردوانی موسڵمانان، لەگەڵ خۆیشیدا ئەبوورافیعی دەبرد، دایکمان عائیشە باس دەکات کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) چوو بۆ بەقیع لەگەڵ خۆیدا ئەبوورافیعی برد، ئەبوو رافیع دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) نزای لێخۆشبوونی بۆ ئەو مردوانە دەکرد، پاشان فەرمووی: (يا أبا رافع إني قد خيرت بين خزائن الدنيا والخلد ثم الجنة وبين لقاء ربي والجنة فاخترت لقاء ربي)[٤] (ئەی ئەبوورافیع من سەرپشک کرام لەنێوان خەزێنەکانی دنیا و نێوان ژیانی سەخت و پاشان بەهەشت و لەنێوان گەیشتنەوە بە پەروەردگارم و بەهەشتدا، منیش گەیشتنەوە بە پەروەردگارم هەڵبژارد).

ئەبوو رافیع دەگێڕێتەوە بەرخێکی برژاویان هێنا بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و ئەویش فەرمووی: ئەی ئەبورافع باڵەکەیم بەرێ، منیش پێمدا، پاشان فەرمووی: ئەی ئەبوورافیع باڵەکەیم بەرێ، منیش پێمدا، جاری سێیەم فەرمووی: ئەی ئەبوورافیع باڵەکەیم بەرێ، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا مەگەر لە دوو باڵ زیاتری هەیە؟ فەرمووی: (لو سكت لناولتني منها ما دعوت به)[٥] (ئەگەر بێدەنگ بوویتایە تا داوایم بکردایە پێت دەدام).

---

[١] السنن الكبرى للنسائي - كتاب الزكاة - باب مولى القوم منهم، الرقم ٢٤٠٥، صححه الألباني في إرواء الغليل، الرقم ٨٨٠.

[٢] الاستيعاب ج١ ص٥٤، أسد الغابة ج١ص٦٢.

[٣] أسد الغابة ج١ص٦٢، الاستيعاب ج١ ص٥٤.

[٤] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص٢٠٤.

[٥] مسند أحمد بن حنبل - مسند الأنصار(ﭫ) - حديث أبي رافع(ﭬ)، الرقم ٢٤٣٨٢، ئیمامی ئەحمەد ریوایەتێکی تری هێناوە (عن أبي رافع قال أهديت له شاة فجعلها في القدر فدخل رسول الله(ﷺ) فقال ما هذا

جارێک سەلمای خێزانی ئەبوورافیع چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)لەسەر ئەبوورافیع سکاڵای خۆی کرد، وتی: ئەبوورافیع لێیداوم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ما لک ولها یا أبارافع) (چی بووە بۆ وایت لەگەڵی ئەبوورافیع-چی لە نێوانتاندا روویداوە)، ئەبوورافیع وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئازارم دەدات، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بم آذیتیه یا سلمی) (ئەی سەلما بە چی ئازارت داوە)، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا هیچ ئازارم نەداوە، تەنها ئەوەنەبێ بای لێبوویەوەو نوێژی دەکرد، منیش وتم: ئەی ئەبوورافیع پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کردووە بە موسڵمانان ئەگەر یەکێکیان بایەکی لێبوویەوە دەست نوێژ بگرێ، ئەویش هەستا و لێیدام، پێغەمبەر(ﷺ) پێکەنی و فەرمووی: (یا أبارافع إنها لم تأمرک إلا بخیر) (ئەی ئەبوو رافیع ئەوتەنها فەرمانی چاکەی پێکردویت)، پاشان پێی فەرموو: (لا تضربها)(لێی مەدە).[1]

ئەبوورافیع دوای وەفاتی پێغەمبەری خوایش(ﷺ) ژیا و رۆڵی هەبوو لە فتووحاتی ئیسلامیدا و لەسەردەمی خەلیفە عومەری کوڕی خەتتابدا بەشداری فەتحی میصری کرد.[2]

سەبارەت بە مردنی دوو را هەیە، رایەک دەڵێت: لە سەردەمی خیلافەتی عوثمانی کوڕی عەففاندا وەفاتی کردووە، رایەکی تر دەڵێت: لە سەردەمی خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبووطالیبدا وەفاتی کردووە،[3] دەوترێ لە ساڵی چلی کۆچیدا وەفاتی کردووە.[4] ئیبن ئەثیر پێی وایە رای دووەمیان (سەردەمی

---

یا أبا رافع فقال شاة أهدیت لنا یا رسول الله فطبختها في القدر قال ناولني الذراع یا أبا رافع فناولته الذراع ثم قال ناولني الذراع الآخر فناولته الذراع الآخر ثم قال ناولني الذراع الآخر فقال یا رسول الله إنما للشاة ذراعان فقال له رسول الله(ﷺ) أما إنک لو سکت لناولتني ذراعا فذراعا ما سکت ثم دعا بماء فتمضمض فاه وغسل أطراف أصابعه ثم قام فصلی ثم عاد إلیهم فوجد عندهم لحما باردا فأکل ثم دخل المسجد فصلی ولم یمس ماء)، شێخی ئەلبانی ئەمەی بە لاواز داناوە لە مشکاة المصابیح، الرقم ٣٢٧، بەڵام هاوواتای ئەو دەقەی سەرەوە کە لە ئەبووعوبەیدەوە هاتووە بە راست دادەنێت لە مختصر الشمائل، الرقم ١٤٣.

[1] أسدالغابة، ج٧، ص١٦٣.

[2] البدایة والنهایة لابن کثیر، ج٥، ص٣١٣.

[3] الإستیعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٨٥، أسد الغابة، ج١، ص١٢٠.

[4] سیر أعلام النبلاء للذهبي، ج٢، ص١٦.

خەلیفە عەلی) راستترە،[1]

خۆشەویستی ئەسلەم لەگەڵ ئیمامی عەلیدا زۆر دیار بوو، تەنانەت ئەسلەم لەپێش مردنیدا وەسیەتی کرد بۆ خەلیفە عەلی کوڕی ئەبووطالیب تا وریای منداڵەکانی بێت، خەلیفەش ئەو وەسیەتەی بەجێگەیاند و سەرپەرشتی منداڵەکانی ئەبوورافیعی دەکرد،[2]هاوکات عوبەیدوڵای کوڕیشی وەک نووسەر و خەزنەداریش خزمەتی خەلیفە عەلی کوڕی ئەبووطالیبی دەکرد.[3]

**پەند و وانە:**

⌘ گەورەیی بانگەوازی پێغەمبەرایەتی موحەممەد(ﷺ) وایکرد گەورەیەک و کۆیلەیەک پێکەوە موسڵمان بن، عەبباس و ئەسلەم هەردووکیان موسڵمان بوون، ئەمە واتای ئەوەش دەگەیەنێت عەبباس بەرامبەر بە ئەسلەم رەق و زبر نەبووە، ئەگەرنا ئەسلەم لە داخی خراپەی عەبباس موسڵمان نەدەبوو، یان هەر هیچ نا دەیوت نابمە شوێنکەوتەی برازای کەسێ کە خراپەم لێ دیوە.

⌘ هاوەڵان جوان منداڵیان پەروەردە دەکرد، رێزو خۆشەویستی نێوان کوڕ و باوک و دایک لە خاڵێکدا بەدیدەکەین کە زۆربەی زۆری منداڵانی هاوەڵان فەرموودەیان لە باوکیانەوە گێڕاوەتەوە، ئەمەش ئاماژەیە بەوەی هاوەڵان گەورەیی فەرموودەیان فێری منداڵانیان کردووە تا منداڵەکانیشیان بە گرنگی لێی بنەون، خوا پاداشتیان بداتەوە کە ئەو کۆگا گەورەی زانستیان بۆ ئێمە پاراست.

⌘ بەشێکی گرنگی پلانی سەرخستنی دەوڵەت، بوونی دەزگایەکی بەهێزی هەواڵگرییە، کارکردن لە دەزگایەکی واشدا کە بۆ رەزامەندی خوا بێت و بە فەرمان و رێنموونی خوا و پێغەمبەرەکەی بێت شانازیە نەک عەیبە، بۆیە دەبینین عەبباسێک کە سەرپەرشتی زۆر کاری گرنگی حەجی پێش هاتنی ئیسلامی

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص٦٦.

[2] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٢، ص١٦.

[3] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٨٤

لەدەست بوو و ناودارێکی پیاوماقووڵ وقسەرۆیشتووی ناو قورەیش بوو بە شانازیەوە ئەو کارە بۆ پێغەمبەر(ﷺ)دەکات و لە مەککە دەمێنێتەوە.

⌘ ئەرکی ژن و مێردە هەڵەکانی یەکتر راست بکەنەوەو لەو کارەشدا شەرم رێگریان نەبێت، دەبێت ئەوانیش لە نیازی پاکی یەکدی تێبگەن، هەرچەندە ئەبوورافع وایزانی ئامۆژگاریەکەی سەلمای خێزانی ئازارە بۆی و شکاندنەوەیەتی بەڵام سەلما تێیگەیاند تەنها و تەنها نیازی یارمەتیدان و راستکردنەوەی هەڵەیەکی بووە نەک ئازاردانی.

⌘ گەیشتنەوە بەخوای گەورە و بینینی خوا و چوونە بەهەشتەکەی زۆر گرنگترە تا دنیا و خۆشیەکانی، دنیا کاتیە و زوو بەسەردەچێت، بەهەشت هەتاییەو لەناو ناچێت، چ ژیریێ خۆشیەکی کاتی پێشدەخات بۆ خۆشیەکی هەتایی لەناونەچوو، دەی ئێوەش وەک پێغەمبەرەکەتان گەیشتنەوە بە خوای گەورە پێش خۆشیەکانی دنیا بخەن و ئەوەیان هەڵبژێرن.

⌘ گەرانەوە بۆ بڕیاری خواو پێغەمبەرەکەی لە هەر مەسەلەیەکدا ئەرکی موسڵمانەو نابێت لەبیری بکات، دەبینین ئەبوورافیع لە مەسەلەیەکی وادا کە داوای یارمەتی کۆکردنەوەی زەکاتی لێکرا خێرا وتی: دەبێت رای پێغەمبەری خوا وەربگرم.

⌘ بەشداریکردن بە ژن و منداڵ لەهەر چاکەیەکدا و پاراستنیان لە هەر خراپەیەک (قوا أنفسكم وأهليكم نارا)، ئەسلەم هاودەم بە خۆی سەلماشی برد بۆ غەزای خەیبەر، ئەمە سەرمەشقێکی جوانە تا ئێمەش بۆ بانگەوازی ریێ خوا خێزانمان بەشداری پێبکەین.

⌘ خۆشحاڵبوون بە سەرکەوتنی موسڵمانان بەشێکی چەسپاوی ناو ناخی تاکی موسڵمانە، ئەسلەمێکی کۆیلەی میصری ناو مەککە دڵخۆش دەبێت بە سەرکەوتنی براکانی لە بەدر لەکاتێکدا براکانی لە مەدینە بوون و ئاشکرابوونی موسڵمانبوونی ئەمیش لە مەککە هەرەشە بوو بۆ سەر ژیانی.

⌘ ئەگەر خوای گەورە خۆشی و چێژی هاوەڵبوونی بە ئێمە نەبەخشیوەو ناتوانین ئەسلەم ئاسا لە خزمەتی پێغەمبەردا(ﷺ) هەستین و دابنیشین، ئەوا ژیان لە خزمەت فەرمودە و سوننەتەکانیدا رەنگ و بۆ وەرگرتنێکی ئەو بارەیە و چێژێکی نەبڕاوەی هەیە، بەڵکو خوای گەورە لە بەهەشتەکەیدا بەشدارمان بکات بە چێژی بینین و ژیان لە خزمەتی ئەو ئازیزەدا.

## ٧٢. ئەسمائی کوڕی حارثە(رضي الله عنه):

ناوی ئەسمائی کوڕی حارثەی کوڕی سەعیدی کوڕی عەبدوڵایە، براکەی ناوی هیندە،[١] کونیەکەی ئەبوو موحەممەدە.[٢]

ئەم هاوەڵە لەگەڵ هیندی برایدا لە ئەهلی صوففە بوون.[٣]

ئەبووهورەیرە دەڵێت: من ئەسماء و هندی کوڕانی حارثەم وادیوە خزمەتکاری پێغەمبەر(ﷺ) بون، لە بەردەرگای پێغەمبەر(ﷺ) بوون و خزمەتیان دەکرد.[٤]

پێغەمبەر(ﷺ) لە رۆژی عاشوورادا ئەسمائی نارد بۆ لای هۆزەکەی و پێی فەرموو: (مر قومک بصیام عاشوراء) (بڕۆ بۆ لای هۆزەکەت و پێیان بڵێ با رۆژووی عاشوورا بگرن)، وتی: ئەی ئەگەر چووم و بینیم نانیان خواردبوو، فەرمووی: (فلیتموا) با لەو کاتەوە بیگرن.[٥]

پرسیارکردنی ئەسماء سەبارەت بە وردەکاریەکان ئاماژەیە بە تامەزرۆیی ئەو هاوەڵە بۆ گەیاندنی نیازی تەواوی پێغەمبەر(ﷺ)، چونکە ئەو دەیزانی بەشێکی رۆژەکە چووبوو و ئەگەر هەیە ئەوان نانیان خواردبێت، مەرجێکی

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٦٤.

[٢] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٨٦.

[٣] أسدالغابة، ج١، ص١٢٢.

[٤] أسدالغابة، ج١، ص١٢٢، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٦٤.

[٥] مسند أحمد بن حنبل - مسند المكيين(رضي الله عنهم) - حديث هند بن أسماء الأسلمي وكان هند من أصحاب الحديبية(رضي الله عنهم)، الرقم ١٦٢٠٩، قال شعيب الأرناؤوط صحيح لغيره.

رۆژوویش ئەوەیە لە بانگی بەیانیەوە هیچ نەخۆیت، بۆیە ئەو پرسیارەی کرد تا وردەکاری فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ هۆزەکەی وەربگرێت.

سەبارەت بە مردنی دوو را هەیە، رایەک دەڵێت: ئەسماء لە سەردەمی موعاویە لە بەصرە کۆچی دوایی کردووە، لە سەردەمی ئیمارەتی زیاد و لە ساڵی پەنجا و سێی کۆچیدا بووە، رای دووەم پێی وایە لە ساڵی شەست و شەشدا کۆچی دوایی کردووەو ئەوکات تەمەنی هەشتا ساڵ بووە.[1]

## ٧٣. ئەسمائی کوڕی ریبان(ﷺ):

ئیبن عەبدولبەر بە ئیبن ریان هێناویەتی، بەڵام ئیبن ئەثیر بە ئیبن ریبان هێناویەتی.

ناوی ئەسمائی کوڕی ریبانی کوڕی موعاویەی کوڕی مالیکە،[2]

ئاوێ هەبوو لە خاکی ئیبن عامر کە بە عقیق ناسرابوو، جرمی و عەقیلیەکان ناکۆکییان لەسەری هەبوو، کێشەکەیان بردە لای پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش لە بەرژەوەندی جرمیەکان بڕیاری دا.[3]

پێشتر ئەسماء سەبارەت بە ملکەچبوونی تەواوی بۆ بڕیار و دادوەری پێغەمبەر(ﷺ) ئەم شیعرەی وتبوو:

وإني أخو جرم كما قد علمتم

إذا اجتمعت عند النبي المجامع

فإن أنتم لم تقنعوا بقضائه

فإني بما قال النبي لقانع[4]

(من لە جرمم وەک دەزانن، کاتێک هەموو شتەکان لای پێغەمبەر(ﷺ) کۆبوونەوە، ئەگەر ئێوە بە دادوەری ئەو رازی نەبن، ئەوا من رازیم بەوەی

[1] أسدالغابة، ج١، ص١٢٢.

[2] أسد الغابة، ج١، ص١٢٢.

[3] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٨٧.

[4] أسد الغابة، ج١، ص١٢٣.

پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموێت).

ئەمە ئاماژەیە بە ملکەچی تەواوی ئەم هاوەڵە بۆ بڕیاری پێغەمبەر(ﷺ) کە هێشتا نازانێت بڕیارەکە لە بەرژەوەندی ئەوە یان بەرووی ئەودایە، کەچی ئەو خەڵکە دەکاتە شاهید بەسەر خۆیەوەو بەڵێن دەدات تەنانەت ئەگەر ئەوان بە بڕیاری رازی نەبن ئەو بێ ئەملاولا کردن رازیە بە بڕیاری ئەو پێشەوایەی مرۆڤایەتی، خوای گەورەش لە قورئاندا فەرموویەتی (وما كان لِمُؤْمِنٍ ولا مُؤْمِنةٍ إذا قضى اللهُ ورسُولُهُ أمرا أنْ يكُون لهُمُ الخِيرةُ مِنْ أمْرِهِم)[1](هیچ باوەردارێکی نێرینە یان مێینە بۆیان نیە کاتێک خواو پێغەمبەرەکەی بڕیارێکیان دا، ئەمان لە کار و بڕیاریاندا هەڵبژاردن و سەرپشک بوون بگرنەبەر)، ئەمە نموونەیەکی جوانە بۆ ئەمرۆی موسڵمانان تا فێربن هەموو شتێک بدەنە دەست بڕیاری قورئان و سوننەتەوە، نەوەک پێشوەختە هەنگاو بنێن و دواتر بڕواننە بڕیاری شەریعەت.

## ٧٤. ئەسمەری کوڕی موضەریس(ﷺ):

ناوی ئەسمەری کوڕی موضەریسە، دەوترێ ناوی ئەسمەری کوڕی ئەبیەضی کوڕی موضەریسە، برای عوروەی کوڕی موضەریسە، لە ئەعرابیەکانی بەصرە بووە، کچێکی هەبوو بە ناوی عەقیلە کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە.[2]

چووەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و بەیعەتی پێداوە، ئەو فەرموودەشی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە کە دەفەرموێت (من سبق إلى ماء لم يسبق إليه مسلم فهو له)[3] (هەرکەس پێشتر بگات بە ئاوێ کە پێشتر موسڵمانێکی

[1] الأحزاب: ٣٦.

[2] أسدالغابة، ج١، ص١٢٥.

[3] سنن أبي داود - كتاب الخراج والفيء والإمارة - باب في إقطاع الأرضين، الرقم ٣٠٧١، ضعفه الألباني في مختصر إرواءالغليل، الرقم ١٥٥٥.

تر پێی نەگەیشتبێت ئەوە هی ئەوە).[1]

## ٧٥. ئەسوەد(رضي الله عنه):

ئەم هاوەڵە بەڕێزە سەرەتا ناوی ئەسوەد بوو، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) ناوی گۆڕی و ناوی نا ئەبیەض.[2]

ئەسوەد یەکێک بوو لەوانەی کە دواتر چوو بۆ میصر و لەوێ مایەوە.[3]

## ٧٦. ئەسوەدی حەبەشی(رضي الله عنه):

ئەم هاوەڵە حەبەشیە و هاتوەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و پرسیاری لێکردووە،[4] هەر لە خزمەتیشیدا وەفاتی کردووە و لە مەدینە ئەسپەردە کراوە.[5]

لە ئیبن عومەرەوە هاتووە کەسێکی حەبەشی هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و پرسیاری دەکرد لە پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (پرسیار بکە و هەوڵ بدە تێبگەیت)، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئێوە بە شێوە و ڕەنگ و پێغەمبەرایەتی فەزڵتان لەپێش ئێمەیە، ئایا ئەگەر من وەک ئەوەی تۆ باوەڕت هێناوە باوەڕ بهێنم و وەک ئەوەی تۆ دەیکەیت منیش وا بکەم لە بەهەشتدا لەگەڵتدا دەبم؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بەڵێ)، دواتر فەرمووی: (والذي نفسي بيده إنه ليرى بياض الأسود في الجنة من مسيرة ألف عام)، واتە (سوێند بەوەی گیانمی بەدەستە لە بەهەشتدا ماوەی دووری هەزار ساڵ سپیایی ڕەشپێست دەبینرێ)... هاوەڵە حەبەشیەکە وتی: دوو چاوی منیش ئەوە دەبینن کە دوو چاوی تۆ لە بەهەشتدا دەیبینن؟ فەرمووی: (بەڵێ)، هاوەڵەکە

---

[1] بە ریوایەتێکی تر لە بری ماء تەنها ما هاتووە (من سبق إلى ما لم يسبق إليه مسلم فهو له)، بڕوانە: المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٨١٣، معرفة الصحابة لأبي نعيم، الرقم ٩٩٨، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٦٧.

[2] معرفة الصحابة لابن منده، ص١٩٦، أسد الغابة، ج١ص٧٣، الاصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٢٤.

[3] أسد الغابة، ج١ص٧٣، الاصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٢٤.

[4] ابن منده: معرفة الصحابة، ص١٩٥.

[5] أسد الغابة،ج١، ص ١٢٩.

هێندە گریا تا گیانی دەرچوو، ئیبن عومەر دەڵێت: پێغەمبەرم(ﷺ) بینی بە دەستی خۆی لە گۆڕەکەیدا دایدەنا).[1]

## ٧. ئەسوەدی کوڕی نەوفەل(رضي الله عنه):

ناوی ئەسوەدی کوڕی نەوفەلی کوڕی خوەیلیدی کوڕی ئەسەدی قورەیشیە، برازای خەدیجەی دایکی باوەڕداران و ئامۆزای وەرەقەی کوڕی نەوفەلە، دایکی ناوی فورەیعەی کچی عەددیە.[2]

نەوفەلی باوکی زۆر دژایەتی موسڵمانانی دەکرد و هەر ئەویش بوو لە مەککە ئەبووبەکر و طەلحەی پێکەوە بە گوریسێ بەستەوە، بەڵام دواتر لە جەنگی بەدردا بە بێباوەڕی کوژرا.[3]

ئەسوەد بەشدار بوو لە کۆچی دووەمی حەبەشدا، دواتریش کۆچی کرد بۆ مەدینە.[4]

**پەند و وانە:**

⌘ تاوان و خراپەی کەس نادرێ بەسەر کەسدا وەک خوا دەفەرموێت (ولا تكسِبُ كُل نفسٍ إلا عليها ولا تزِرُ وازِرةٌ وِزْر أُخْرى ثُمّ إلى ربكُمْ مرْجِعُكُمْ فيُنبئُكُمْ بِما كُنتُمْ فِيهِ تخْتلِفُون)،[5] خراپی نەوفەل و دژایەتی کردنی بۆ ئیسلام و موسڵمانان هۆکار نیە بۆ تاوانباربوونی ئەسوەدی کوڕی، بەڵکو بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) سەبارەت بە پاداشتی کۆچەرانی حەبەشە ئەسوەد پاداشتی دوو کۆچی بۆ نووسراوە، جارجارە دەبیستین کە ناوی کەسێک دەبرێت کەسانێ دەڵێن کورە ئەوە کوڕی فلانە کەسە، یان ئەوە باوکی ئاواوئاوایە

---

[1] المعجم الكبير للطبراني - باب العين - من اسمه عبد الله - عبد الله بن عمر بن الخطاب(رضي الله عنهما) - ومما أسند عبد الله بن عمر(رضي الله عنهما) - عطاء بن أبي رباح عن ابن عمر، الرقم ١٣٥٩٥، ضعفه الألباني في السلسلة الضعيفة، الرقم ٦٦١٨.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٧٧.

[3] أسدالغابة، ج١، ص١٣٦.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٧٧.

[5] الأنعام: ١٦٤.

ئیتر چاوەڕێی چی لە خۆی بکەین، ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیە، زۆرجار قسەیەکی لەوجۆرە هەموو هەوڵ و ورەی کەسێک بۆ خزمەتکردن بە ئیسلام تێکدەشکێنێ.

لێنەوین و هەوڵدان بۆ ئیسلام زۆر شیرینتر و گەورەترە لە ئارەزووە دەروونیەکانی مرۆڤ، ئەسوەد لەپێناو خوادا باوکی خۆی و وڵات و خاکی خۆی جێهێشت، واتە بنەرەتی ئایینی پێش بنەرەتی خوێن خست.

## ٧٨. ئەسوەدی کوڕی ئەبیەض(رضي الله عنه):

یەکێک بوو لەوانەی بەشدار بوو لە کوشتنی ئیبن ئەبیلحوقەیقدا، رایەک هەیە پێی وایە لەبری ئەسوەدی کوڕی حەرام ئەسوەدی کوڕی ئەبیەض بووە،[١] بەڵام ئیبن حەجەر پێی وایە راستتر ئەوەیە ئەسوەدی کوڕی خوزاعی و ئەسوەدی کوڕی حەرام بەشدار بون.[٢]

## ٧٩. ئەسوەدی کوڕی بەختەری(رضي الله عنه):

ناوی ئەسوەدی کوڕی بەختەری کوڕی خوەیلدە،[٣] ئیبن ئەثیر پێی وایە لەگەڵ هاوەڵێکی تردا کە ناوی ئەسوەدە یەک کەسایەتیە،[٤] بەڵام ئیبن حەجەر بە هاوەڵێکی جیای دەزانێت.[٥]

ئەگەر راکەی ئیبن حەجەر دروست بێت ئەوا کونیەی ئەبوو حازم هی ئەمە، چونکە لە فەرموودەیەکدا کە ئەبوو نوعەیم هێناویەتی لە ئەبووحازم ئەسوەدی کوڕی بەختەریەوە هێناویەتی وتی(یا رسول الله أعظم لأجري أن أستغني

---

[١] أسد الغابة، ج١، ص١٢٦.
[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٦٧.
[٣] ابن منده: معرفة الصحابة، ص١٩٥، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٧٠.
[٤] أسد الغابة،ج١،ص ١٢٨.
[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٧٠.

عن قومي)،[1] ئیبن حەجەر سەبارەت بە سەنەدی ئەم دەقە دەڵێت: پیاوانی سەنەدەکەی جێمتمانەن و مورسەلیشە.[2]

## ٨٠. ئەسودی کوڕی ثەعلەبە(ﷺ):

ناوی ئەسلەمی کوڕی ثەعلەبەی یەربووعیە، لە حەجیماڵئاواییدا پێغەمبەری خوای(ﷺ) بینیوە.[3]

## ٨١. ئەسودی کوڕی حازم(ﷺ):

عبادی کوڕی هیشام کە بانگبێژی مزگەوتی گوندێکی نزیک بوخارا بوو دەگێڕێتەوە کاتێک تەمەنی شەش یان حەوت ساڵان بووە لەگەڵ باوکیدا هاوەڵێکی پێغەمبەری خوای(ﷺ) دیوە کە پێی وتراوە ئەسوەدی کوڕی حازمی کوڕی صەفوان، ئەسوەد وتوویەتی لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) بەشداری حودەیبیە بووم و ئەو کاتیش تەمەنم ٣٠ساڵان بوو، پرسیارکرا لە عباد کەی بینیت؟ وتی: ساڵی ١٥٥.[4]

لە گێڕانەوەکەی ئیبن حەجەردا ئەو بەشەی تێدا نیە (پرسیارکرا لە عباد کەی بینیت؟ وتی: ساڵی ١٥٥)، ئیبن حەجەر دەڵێت: سەنەدەکەی زۆر لاوازە.[5]

ئەگەر ئەو بەشە زیادەی لای ئیبن ئەثیر هاتووە بکەینە بەڵگە ئەوە دەبێتە بەڵگەی نادروستی هاوەڵبونی، چونکە دوای سەدساڵ لە وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) هیچ هاوەڵێک نەماوە بە بەڵگەی فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) کە مانگێ بەر لە مردنی فەرمووی: (أرأيتكُمْ ليْلتكُمْ هذِهِ، فإن رأْس مِائةٍ، لا يبْقى مِمنْ

---

[1] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٨٦٠.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٧٠.

[3] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٩٠، أسد الغابة، ج١،ص ١٢٨.

[4] أسد الغابة،ج١، ص ١٢٨.

[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٧٠.

هُو اليَوْم على ظَهْرِ الْأَرْضِ أحدٌ)،[1] (ئەمشەوتان ئەبینن، لەمشەوەوە تا سەد ساڵی تر لەم سەرزەویەدا یەک کەس نامێنێ کە ئەمرۆ لەسەریەتی).

## ٨٢. ئەسودی کوڕی حەرام(ﭬ):

یەکێک بووە لەوانەی بەشدار بووە لە کوشتنی ئیبن ئەبیلحوقەیقدا.[2]

## ٨٣. ئەسودی کوڕی خەلەف(ﭬ):

ناوی ئەسوەدی کوڕی خەلەفی کوڕی ئەسعەدی کوڕی عامری خوزاعیە، ئەمە جیایەلە ئەسوەدی کوڕی خەلەفی کوڕی عەبد یەغووث و ئیبن سەعد لەوەدا لێی تێکەڵ بووە، بەڵام ذەهەبی بەو تێکەڵبوونەی زانیوە، ئیبن حەجەریش ئەوەی خستوەتەروو.[3]

## ٨٤. ئەسودی کوڕی خەلەفی کوڕی عەبد یەغووث(ﭬ):

ئەم هاوەڵە بەناوی مامێکیەوە ناونراوە کە قسەخۆشێکی سەردەمی نەفامی بووەو بە بێباوەڕی مردووە، ئەسوەد لە فەتحی مەککەدا موسڵمان بووە.

ئەسوەد کوڕێکی هەبوو بەناوی موحەممەد کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە.[4]

ئەسوەد باسی ڕووداوێکی سەردەمی نەفامی دەکات کە خۆی ئاگاداری بووە و دەڵێت: لەخوارووی مەقامەوە نوسینێکیان دیوە، قورەیش کەسێکیان لە حیمیەر بانگکرد تا بیخوێنێتەوە، ئەویش وتی: قسەیەکی تێدایە ئەگەر پێتان بڵێم دەمکوژن، جا ئێمەش گومانمان بۆ ئەوە چوو باسی موحەممەدی(ﷺ)

[1] صحيح البخاري - كتاب مواقيت الصلاة - باب السمر في الفقه والخير بعد العشاء، الرقم ٦٠١.
[2] أسد الغابة، ج١، ص١٢٥.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٧١.
[4] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٨٩.

تێدا بێت، بۆیە شاردمانەوە.[1]

ئەسوەد فەرموودەیەکی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوەو دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) حوسەینی گرتەباوەش و ماچی کرد و دواتر روویکردە هاوەڵان و فەرمووی:(إن الولد مبخلة مجبنة محزنة)،[2] (منداڵ مرۆڤ پیسکە و ترسنۆک و خەفەتبار دەکات).

## ٨٥. ئەسوەدی کوڕی خوزاعی(رضي الله عنه):

ئەم ئەسوەدەیان لە پشتیوانانە لە بەنی سەلەمە،[3]یەکێک بوو لە بەشداربووانی لە کوشتنی ئیبن ئەبیلحوقەیق، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) بە رێبەری عەبدوڵای کوڕی عەتیک چەند کەسێکی نارد بۆ کوشتنی ئیبن ئەبیلحوقەیق.

ئیبن ئەبولحوقەیق کە ناوی سەلام بوو و بە ئەبوو رافع ناسرابوو، یەکێک بوو لەوانەی خەڵکی هاندەدا تا دژی پێغەمبەر(ﷺ) کۆببنەوە بۆ جەنگی ئەحزاب، موسڵمانان حەزیان دەکرد لەناوی ببەن، پێشتر ئەوسیەکان بە فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) کەعبی کوڕی ئەشرەفیان کوشتبوو، بۆیە خەزرەجیەکانیش حەزیان دەکرد بگەنەوە بە برا ئەوسیەکانیاندا، ئەمەیان بە دەرفەت زانی و دوای جەنگی خەندەق داوایان کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) تا مۆڵەتیان بدات بچن بۆ کوشتنی ئیبن ئەبولحوقەیق کە لە خەیبەر دادەنیشت، پێغەمبەریش(ﷺ) مۆڵەتی پێدان.[4]

لە سەرچاوەکاندا ناوی پێنج کەس هاتووە کە چووبن، ئەوانیش (عەبدوڵای کوڕی عەتیک، مەسعوودی کوڕی سینان، عەبدوڵای کوڕی ئونەیس، ئەبوو

---

[1] التاريخ الكبير للبخاري، ج١، ص٤٤٤، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٧٢.

[2] المستدرک على الصحيحين - كتاب معرفة الصحابة(رضي الله عنهم) - ذكر الأسود بن خلف بن عبد يغوث(رضي الله عنه)، الرقم ٥٣٢١.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٧١.

[4] السيرة النبوية لإبن إسحاق، ج٢ص٤٣١، البداية والنهاية، ج٤ص١٣٧.

قەتادە حارثی کوڕی ڕیبعی، خوزاعی کوڕی ئەسوەد)[1] بەڵام لای ئیبن سەعد[2] و ئیبن شەببە[3] بە ئەسوەدی کوڕی خوزاعی هاتووە.

هەروەها لە بڕێ لە سەرچاوەکانی فەرموودەدا تەنها ناوی عەبدوڵای کوڕی عەتیک هاتووە کە ئەمیریان بووە و ناوی کەسەکانی تر نەهاتووە، بەڵکو دەڵێن دەستەیەک لە هاوەڵان.

ئەمە دەکرێ بەڵگە بێت بۆ ئەوەی ئەگەر هەبێت هەریەک لە ئەسوەدی کوڕی حەرام و ئەسوەدی کوڕی ئەبیەض بەشدار بووبن.

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) عەلی کوڕی ئەبووطالیبی نارد بۆ یەمەن، ئەسوەد هاودەم بە عەلی چوو.[4]

## ٨٦. ئەسوەدی کوڕی رەبیعە(ﭬ):

ناوی ئەسوەدی کوڕی رەبیعەی کوڕی ئەسوەدی یەشکریە،[5] لە ئەعرابی بەصرەدا ناوی هاتووە.[6]

ئامادەی وتاری پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو لە فەتحی مەککەدا.[7]

فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) لە وتارەکەیدا فەرموویەتی (ألا إن كل مكرمة كانت في الجاهلية فقد جعلتها تحت قدمي الا السقاية والسدانة)، (بزانن هەموو گەورەیی و مەکرەمەیەک کە لە سەردەمی نەفامیدا هەبووە هەمووی دەخەمە ژێرپێم جگە لە ئاودان و ناندانی حاجیان)، ئەسوەدی کوڕی رەبیعەش هەستا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) باوکم جاران بڕێ لە سامانەکەی دەکرد بە خێر بۆ ڕێبواران، جا ئەگەر هیچ خێر و

---

[1] السيرة النبوية لإبن إسحاق، ج٢ص٤٣٢، تأريخ الطبري، ج٢ص٥٦، البداية والنهاية، ج٤ص١٣٧.
[2] الطبقات الكبرى لإبن سعد، ج٢ص٩١.
[3] تأريخ المدينة، الرقم ٧٦٠.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٧١.
[5] أسد الغابة، ج١، ص ١٣١، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٧٣.
[6] أسد الغابة، ج١، ص ١٣١.
[7] أسد الغابة، ج١، ص ١٣١، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٧٣.

گەورەييەكى نەبێ وازى لێ دێنم، ئەگەريش خێر و گەورەييەكى تێدايە ئەوە من خۆم پێى شياوترم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووى: (بل هى لك مكرمە)، (بەڵكو ئەو خێر و گەورەييە بۆ تۆ).[1]

## ٨٧. ئەسوەدى كوڕى رەبيعە(رضي الله عنه):

ناوى ئەسوەدى كوڕى رەبيعەى حەنظەليە،[2] لە بەنى رەبيعەيە،[3] ئيبن حەجەر لەژێر ناوى ئەسوەدى كوڕى عەبەسيش هێناويەتى، يەكێكە لە كۆچەران. [4]

كۆچيكردووەو هاتوەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، كاتێك هات پێغەمبەر(ﷺ) پرسيارى لێكرد بۆچى هاتويت؟ وتى: هاتوم تا بە هاوەڵى كردنى تۆ لەخوا نزيك ببمەوە، بۆيە لەوە بەدوا بە موقتەريب ناوى دەهات،[5] لاى ئيبن حەجەر هاتووە كە پێغەمبەر(ﷺ) ناوى نا موقەريب،[6] بەردەوام هاوەڵێتى پێغەمبەرى خواى دەكرد.[7]

دواى پێغەمبەريش(ﷺ) بەردەوام بوو لە خزمەتكردنى رێبازى ئيسلامدا، لە سەردەمى عومەرى كوڕى خەطابدا خەليفە لەسەر سەربازگەى بەصرە داينا.[8]

لە سەردەمى خەليفە عەلى كوڕى ئەبووطاليبيشدا بەشدارى جەنگى صفينى كرد و لە ريزى سوپاى خەليفە عەليدا بوو.[9]

---

(١) الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٧٣.
(٢) الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٧٣.
(٣) أسد الغابة، ج١، ص١٣١.
(٤) الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٧٦.
(٥) أسد الغابة، ج١، ص١٣١.
(٦) الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٧٦.
(٧) أسد الغابة، ج١، ص١٣١.
(٨) الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٧٦.
(٩) الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٧٦.

## ٨٨. ئەسوەدی کوڕی زەید (رضي الله عنه):

ناوی ئەسوەدی کوڕی زەیدە و لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکانە لە بەنی سەلەمە،[1] یەکێک بوو لە بەشداربوانی غەزای بەدر.[2]

## ٨٩. ئەسوەدی کوڕی سەریع (رضي الله عنه):

ناوی ئەسوەدی کوڕی سەریعی کوڕی حیمیەری کوڕی عوبادەی سەعدیە، کونیەکەی ئەبووعەبدوڵایە،[3] لەگەڵ پێغەمبەری خوادا(ﷺ) لە چوار غەزادا بەشداری غەزا و جیهادی کردووە،[4] شاعیرێکی ناسراو بووە.[5]

ئەسوەد دەڵێت: جارێک چوومە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا بە بڕێ دەستەواژە وەسف و ستایش و سوپاسی خوام کردووە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئادەی بڵێ بزانم چۆن سوپاسی پەروەردگارتت کردووە (هات ما حمدت به ربک)، منیش بۆم دەوتەوە، لەو کاتەدا کەسێک هات، داوای مۆڵەتی کرد، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرمووم (أُس أُس) –بێدەنگ بە، دوو سێ جار ئەمە روویدایەوە، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو کەسە کێ بوو وا منت بێدەنگ کرد بۆی؟ فەرمووی: (هذا عمر بن الخطاب، هذا رجل لا يحب الباطل)،[6] (ئەوە عومەری کوڕی خەططابە، ئەوە پیاوێکە حەزی بە نارەوایی نیە).

ئەسوەد لە ساڵی چل و دووی کۆچی وەفاتی کرد، رایەکیش دەڵێت: لە جەنگی جەمەلدا کوژرا.[7]

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص١٣٢.

[2] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٩٠.

[3] أسد الغابة، ج١، ص١٣٣.

[4] التاريخ الكبير للبخاري، ج١، ص٤٤٥.

[5] معجم الصحابة لابن قانع، ج١، ص١٨، الاإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٧٤.

[6] فضائل الصحابة لأحمد بن حنبل، الرقم ٣١٣، قال شعيب الأرنؤوط إسناده ضعيف لضعف علي بن زيد وبقية رجاله ثقات رجال الصحيح.

[7] التاريخ الكبير للبخاري، ج١، ص٤٤٥.

## ٩٠. ئەسوەدی کوڕی عەوف(ﷺ):

ناوی ئەسوەدی کوڕی عەوفی کوڕی عەبدعەوفی زوهریە، برای عەبدورەحمانی کوڕی عەوفە، عەبدورەحمانی برای یەکێکە لە دە مژدەپێدراوانی بەهەشت،[١] دایکی ناوی شیفایە.

برایەکی تریشی هەبوو بەناوی عەبدوڵا کە پێکەوە لەرۆژی فەتحی مەککەدا موسڵمان بوون،[٢] بەڵام ئیبن عەبدولبەر دەڵێت: ئەسەد پێش فەتحی مەککە کۆچی کردووە بۆ مەدینە و موسڵمان بووە.[٣]

ئەسوەد سێ کوڕی هەبوو: جابر کە دواتر لە دەسەڵاتەکەی عەبدوڵای کوڕی زوبەیردا والی مەدینە بوو، موحەممەد و عەبباس.[٤]

ئەسوەد لە مەدینە نیشتەجێ بوو و هەر لەوێش مرد.[٥]

## ٩١. ئەسوەدی کوڕی عیمران(ﷺ):

ناوی ئەسوەدی کوڕی عیمرانی بەکریە، رایەکیش دەڵێت: بەڵکو ناوی عیمرانی کوڕی ئەسوەدە، بە وەفد هاتوەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ).[٦]

ئەسوەد دەڵێت: من نێردراوی هۆزەکەم بووم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، کاتێک موسڵمان بوون و دانیان نا بە ئیسلامدا وەک نوێنەری ئەوان چووم.[٧]

---

[١] أسدالغابة، ج١، ص١٣٥.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٧٦.

[٣] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٨٧.

[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٧٦.

[٥] أسدالغابة، ج١، ص١٣٥.

[٦] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٩١، أسد الغابة، ج١، ص١٣٥، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٧٦.

[٧] أسد الغابة، ج١، ص١٣٥.

## ٩٢. ئەسوەدی کوڕی مالیک(ﷺ):

ناوی ئەسوەدی کوڕی مالیکی ئەسەدی یەمانیە،[1] واتە خەڵکی یەمەنە، لەگەڵ حیدرجانی برایدا چوونە مەدینە بۆ خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) و باوەڕیان پێ هێنا و خزمەتی پێغەمبەری خوایان دەکرد.[2]

## ٩٣. ئەسوەدی کوڕی مەسعوود(ﷺ):

ئیبن حەجەر هێناویەتی و گێڕانەوەیەکیشی هێناوە کە ئەسوەد چووەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و لە خزمەت ئەودا لەگەڵ ظبیانی کوڕی کداد گفتگۆیەکیان هەبووە.[3]

## ٩٤. ئەسوەدی کوڕی وەهب(ﷺ):

ناوی ئەسوەدی کوڕ وەهبی کوڕی عەبدمەنافی قورەیشیە، خاڵۆی پێغەمبەری خوایە(ﷺ).

ئەسوەد دەگێڕێتەوە جارێک چووەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و ئەویش بە ئەسوەدی خاڵۆی فەرموو: ئایا شتێکت فێر بکەم سەبارەت بە سوو؟ ئەسوەد وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: (الربا سبعون بابا، أدنى فجرة منها كاضطجاع الرجل مع أمه)،[4] (سوو حەفتا بەشە، نزمترین تاوانی وەک ئەوەیە کەسێ لەگەڵ دایکی خۆی سەرجێ بکات).

جارێک پێغەمبەر(ﷺ) بە ئەسوەدی فەرموو: ئەی خاڵۆ چەند وشەیەکت فێر بکەم کە ئەگەر خوا نیازی چاکەی بە هەرکەس هەبێ ئەو وشانەی فێر دەکات ئیتر هەرگیز بیری ناچێتەوە؟ وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری

---

[1] معرفة الصحابة لابن مندة، ص١٩٣، أسد الغابة، ج١، ص١٣٥.

[2] أسد الغابة، ج١، ص١٣٦، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٧٧.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٧٧.

[4] صححه الألباني في السلسلة الصحيحة، الرقم ١٨٧١.

خـوا، فەرمـووی: بڵێ:(اللهم إني ضعيف فقو في رضاك ضعفي، وخذ إلى الخير بناصيتي، واجعل السلام منتهى رضائي وبلغني رحمتك الذي أرجو من رحمتك، واجعل لي ودا في صدور الذين آمنوا، وعهدا منك). بـەڵام شـێخی ئەلبانـی ئـەم فەرموودەیـەی بـە موضـوع دانـاوە، تەنها ئەمەمـان هێنـا تـا خوێنـەری ئازیـز ئـاگادار بێـت بـە ناراسـتی ئـەم فەرموودەیـە.[1]

لـە فەرموودەیەکـی تـردا لـە دایکمـان عائیشـەوە هاتـووە: ئەسـوەد چوویـە ژوورەوە بـۆ لای پێغەمبـەر(ﷺ)، پێغەمبەریـش فەرمـووی: (ئـەی خاڵـۆ وەرە ژوورەوە)، ئەویـش هاتـەژوورەوە، پێغەمبـەر(ﷺ) عەباکـەی خـۆی بـۆ ڕاخسـت و فەرمـووی: (لەسـەری دابنیشـە)، ئەویـش وتـی: بەسـمە، فەرمـووی: (چـۆن دادەنیشـیت وا دابنیشـە).[2]

## ٩٥. ئەسومدی کوڕی ئەبولبوختەری(رضي الله عنه):

ناوی ئەسـوەدی کـوڕی ئەبولبەختـری عاصـی کـوڕی هاشـمی ئەسـەدیە،[3] کونیەکـەی ئەبووحازمـە،[4] دایکـی نـاوی عاتیکـەی کچـی ئومەییەیـە،[5] ئەسـوەد لـە موسـڵمانبوانی فەتحـی مەککەیـە.[6]

ئەبولبەختری باوکی بە بێباوەڕی لە جەنگی بەدردا کوژرا.[7]

ئەسـوەد کوڕێکـی هەبـوو بـە نـاوی سـەعید کـە هێنـدە جـوان بـوو ئافرەتـان شـیعریان بەسـەردا دەهۆنیـەوە،[8] ئـەم کوڕەی لـە سـەردەمی عوثمانـی کـوڕی عەففانـدا دلێرێکـی بەرچاوبـوو و پارێزگاری لـە خەلیفـە دەکـرد، بـەڵام خەلیفـە

---

[1] حكم الألباني عليه بالوضع في سلسلة الأحاديث الضعيفة والموضوعة و أثرها، الرقم ٣٣٥٩.
[2] ضعفه الألباني في سلسلة الأحاديث الضعيفة والموضوعة و أثرها، الرقم ٧١٢٦.
[3] أسد الغابة، ج١، ص ١٢٧.
[4] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٨٦٠.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٦٩.
[6] أسد الغابة، ج١، ص ١٢٧، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٦٩.
[7] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٦٩.
[8] أسد الغابة،ج١،ص ١٢٧.

خۆی ڕێی نەدا جەنگ بەرامبەر نەیارانی بکرێت.[1]

ئەسوەد هاوەڵێکی ناسراو بوو و لە سەردەمی موعاویەی کوڕی ئەبوو سوفیاندا راوێژی پێ دەکرا، کاتێک بوسری نوێنەری موعاویە چوویە مەدینە، موعاویە وەسیەتی بۆ کردبوو راوێژ بە ئەسوەد بکات، ئەسوەدیش لە وەسیەتەکەیدا بۆ بوسر ڕێگری کرد لەوەی بوسر نەیارانی دەسەڵاتەکەی موعاویە بکوژێت.[2]

## ٩٦. ئەسوەدی کوڕی ئەصرەم(ﷺ):

ناوی ئەسوەدی کوڕی ئەصرەمی موحاریبییە،[3] لە دانیشتوانی شامدا ناوی ئەژمارد کراوە.[4]

ئەسوەد دەڵێت: بە وشترێکی قەڵەوەوە چوومە مەدینە، کاتەکەشی وشکەساڵی بوو، خەڵکی مەدینە کە وشترەکەیان بینی سەرسامی قەڵەویەکەی بوون، ئەمە لای پێغەمبەر(ﷺ) باسکرا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد چوون وشترەکەیان هێنا، پێغەمبەر(ﷺ) سەیری کرد، بە ئەسوەدی فەرموو: (بۆچی ئەو وشترەت هێناوە؟ وتی: بەنیازم بیگۆڕمەوە بە خزمەتکارێ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (کێ خزمەتکارێکی لایە؟ عوثمانی کوڕی عەففان وتی: من ئەی پێغەمبەری خوا، فەرموی بیهێنە، عوثمانیش خزمەتکارەکەی هێنا، ئەسوەد کە بینی وتی: یەکێکی تری وام ئەوێ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بیبە با لای خۆت بێ) ئەسوەدیش خزمەتکارەکەی برد و پێغەمبەریش(ﷺ) وشترەکەی هێشتەوە، ئەسوەد وتی: ئەی پێغەمبەری خوا وەسیەتم بۆ بکە، فەرمووی: (أتملک یدک) ئایا خاوەنی دەستی خۆتی؟ وتم: ئەگەر خاوەنی دەستی خۆم نەبم ئیتر خاوەنی چی بم؟ فەرمووی: (أتملک لسانک) ئایا

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٦٩.
[2] أسد الغابة،ج١، ص ١٢٧.
[3] معجم الصحابة لابن قانع، ج١، ص٢٠.
[4] ابن منده: معرفة الصحابة، ص١٨٧، الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٩٠، أسد الغابة، ج١، ص١٢٦.

خاوەنی زمانی خۆتیت؟ وتم: ئەگەر خاوەنی زمانی خۆم نەبم ئیتر خاوەنی چی بم؟ فەرمووی: (لا تبسط يدك إلا إلى خير ولا تقل بلسانك إلا معروفا)،[1] (دەستت مەکەرەوە جگە بۆ خێر، بە زمانت قسە مەکە تەنها قسەی خێر نەبێت).

**پەند و وانە:**

داوای ئامۆژگاری و قۆستنەوەی دەرفەتی بینینی زانایان و خواناسان، وەک چۆن ئەسوەد بەو بینینە کەمەی لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) خێرا داوای وەسیەت و ئامۆژگاری لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد.

شێوازی پرسیارکردن و بیرکۆکردنەوەی ئەو کەسەی ئامۆژگاری دەکەیت لەم دیمەنەی ژیانی پێغەمبەردا(ﷺ) بەدیدەکەین، بەجۆرێک بەو پرسیارکردنانەی لەلایەکەوە هەموو بیری ئەسوەدی کۆکردەوە لەسەر ئەو بابەتە، دواتریش واتای خاوەندارێتی دەست و زمانی تێگەیاند.

پاراستنی دەست و زمان نموونەیەکە بۆ پاراستنی بەشەکانی تری جەستە، پێغەمبەر(ﷺ) بە نموونە دەست و زمانی تێگەیاند تا بزانێت ئایا خاوەنی چاو و گوێ و بەشەکانی تری لەشی خۆیەتی و زاڵە بەسەریاندا، نەوەک وابزانین پێغەمبەر(ﷺ) تەنها ئەو دوانەی بە مەرج داناوە بۆ پاراستن، لەوانەشە پێغەمبەر(ﷺ) بەپێی ناسینی سروشتی هاوەڵانی، زیاتر جەختی لەو دوو شتە کردبێتەوە بۆ ئەسوەد.

## ٩٧. ئەسید(رضي الله عنه):

ئەم هاوەڵە ناوی ئەسیدی کوڕی عەبدوڵایە، لە نەوەی فەیطوونە،[2] کونیەکەی ئەبولموقەعشەرە، پێغەمبەر(ﷺ) نزای بۆ کرد و فەرمووی: (اللهم أدم جماله)،[3] (خوایە بەردەوامی بدە بە جوانیەکەی).

---

[1] المعجم الكبير للطبراني – باب الألف – من اسمه أسود – أسود بن أصرم المحاربي، الرقم ٨١٨ صححه الألباني في السلسلة الصحيحة، الرقم ١٥٦٠.

[2] المفصل في تأريخ العرب قبل الإسلام، ط٤، دار الساقي، سنة٢٠٠١، ج٧، ص١٣٤.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ١، ص ٨١.

فەیطوون کەسێکی زۆر ناپاک و خراپ بوو، هەردەم دەستدرێژی دەکردە سەر ژنانی ئەوس و خەزرەج، بۆیە کەسێ هەستا و کوشتی،[1] بەڵام ویستی خوا وابوو لە نەوەی ئەم کەسە خراپە هاوەڵێکی خواناس دەرکەوێ، ئەمە ئاماژەیە بە رۆڵی چاکسازی پێغەمبەری خوا کە رێچکەی دەستدرێژی فەیطوونی گۆڕی و نەوەکانی لەسەر رەوشتی جوان و چاکەکاری پەروەردە کرد، لەبری دەستدرێژی بۆ ژنانی ئەوس و خەزرەج رێز و بەرەکەتی نەوەکانی فەیطوون بوویە دیاری بۆ مەدینە.

## ٩٨. ئەسیدی کوڕی جاریە(ﷺ):

ناوی ئەسیدی کوڕی جاریەی کوڕی ئوسەیدی کوڕی عەبدولایە.[2]

لە رۆژی فەتحی مەککەدا موسڵمان بوو و دواتر هاودەمی پێغەمبەر(ﷺ) بوو و لە جەنگی حونەیندا بەشداری کرد،[3] دواتر لەکاتی دابەشکردنی دەستکەوتەکاندا پێغەمبەر(ﷺ) سەد وشتری پێدا.[4]

## ٩٩. ئەسیدی کوڕی سەعیە(ﷺ):

ناوی ئەسەد یان ئەسیدی کوڕی سەعیەی قورەیضیە، واتە لە بەنی قورەیضەیە،[5] ئیبن ئەثیر دەڵێت: ناوە راستەکەی ئەسیدە.[6]

لەگەڵ دوو کەسی تری جوولەکەی بەنی قورەیضە موسڵمان بوو، ئەو دوانەش بریتی بوون لە ئەسەدی کوڕی عوبەید و ثەعلەبەی کوڕی سەعیە.[7]

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) هێرشی بردە سەر بەنی قورەیضە و گەمارۆی دان و

---

[1] المفصل في تأريخ العرب قبل الإسلام، ج٧، ص١٣٤.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٨٠

[3] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٩٨، أسد الغابة، ج١، ص ١٤٠.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٨٠

[5] الإصابة في معرفة الصحابة، ج١، ص٥١.

[6] أسدالغابة، ج١، ص١٠٩.

[7] الإصابة في معرفة الصحابة، ج١، ص٥١.

دواتر ناچار بوون خۆیان بدەن بە دەست بڕیار و دادوەری سەعدی کوڕی موعاذەوە، شەوێ پێش ئەوە ئەسەد موسڵمان بوو، ئەو دوانەش لەگەڵیدا موسڵمان بوون.[1]

ئیبنولهیبان کە جوولەکەیەکی شام بوو چەند ساڵێ بەر لە ئیسلام هات بۆ مەدینە، لەوێ وەسفی تەواوی کۆتا پێغەمبەری بۆ کردن، لەسەرەمەرگیدا پێی وتن: من لەبەر هاتنی ئەو پێغەمبەرە هاتوم بۆ ئێرە، ئەم قسەی ئەم جوولەکە خواناسە لە شەوی فەتحی بەنی قورەیضەدا بوو بە خێر بۆ ئەم سێ کەسە و ئەوانیش ئەم قسەیان بەبیری ئەوانی تر هێنایەوە، بەڵام ئەوان سوودیان لێ نەبینی.[2]

ئەم سێ کەسە داوایان کرد لە بەنی قورەیضە تا لەخوا بترسن و باوەڕ بهێنن بە پێغەمبەرایەتی موحەممەد(ﷺ)، بەڵام ئەوان رازی نەبوون، بۆیە ئەم سیانە دابەزینە خوارەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمانبونی خۆیان راگەیاند، جولەکەکانیش وتیان: موحەممەد تەنها کەسە زۆر خراپەکانی ئێمەی بۆ چووە، مەبەستیان ئەم سیانە و عەبدوڵای کوڕی سەلام بوو کە موسڵمان بووبوون.[3]

سەبارەت بەمردنی ئەسید بۆچوونی زیاتر لەسەر ئەوەیە کە لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) کۆچی دوایی کردبێت.[4]

## ١٠٠. ئەسیدی کوڕی عەمر(رضي الله عنه):

ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە،[5] ناوی ئەسیدی کوڕی عەمری کوڕی میحصەنی کوڕی عەمرە و لە بەنی نەجارە، چەند رایەکی تر هەن سەبارەت

---

[1] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٧٩.
[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص١٦٠.
[3] الإصابة في معرفة الصحابة، ج١، ص٥١.
[4] أسد الغابة، ج١، ص١٤٠.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٨٤.

بە ناوی، لەوانە (بیشر، بەشیر، ثەعلەبە)، بەشداری جەنگی بەدر بوو.[1]

## ١٠١. ئەسیدی کوڕی کورز(ﷺ):

ناوی ئەسیدی کوڕی کورزی قەسریە، هەروەها بە ئەسەدیش ناوی هاتووە و ئیبن ئەثیریش پێی وایە راستتر وایە ناوی ئەسەدە،[2] لەژێر ناوی ئەسەدی کوڕی کورزدا باسی ژیانەکەیمان هێناوە.

## ١٠٢. ئەسیدی کوڕی ئەبوو ئوسەید(ﷺ):

ناوی ئەسیدی کوڕی ئەبوو ئوسەیدە، لە هاوەڵە پشتیوانیەکانە لە خەزرەجیەکانە لە بەنی ساعیدە.[3]

ئەسید بەسەرهاتێکی خۆی لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) باس دەکات و دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) ژنێکی هێنا لە بەلجوونیەکان، پاشان منی نارد تا بچم و ئەو ژنەی بهێنمەوە، منیش هێنام و چووم وتم: ئەی پێغەمبەری خوا وا خێزانەکەتم هێنا، ئەویش حەزی کرد ماچێکی بکات، بەڵام خێزانەکەی وتی: پەنا دەگرم بە خوا لێت، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (عذت بمعاذ)، (پەنات گرت بە پەنا دەرێک)، بۆیە ئافرەتەکەی ناردەوە بۆ لای کەس و کاری.[4]

بەڵام لای بوخاری و لە سەرچاوەکانی تری فەرموودەدا ئەم فەرموودەیە لە ئەبوو ئوسەیدەوە هاتووە،[5] ئیبن حەجەریش رای وایە ئەم فەرموودەیە کە لە ئەسیدەوە هاتووە سەنەدەکەی کێشەی هەبێت و وتەی (لە باوکیەوە) ی تێدا نەنووسرابێ،[6] واتە ئەم فەرموودەیە ئەسید نەیگێڕاوەتەوە.

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص١٤١.

[2] أسد الغابة، ج١، ص١٤٢.

[3] أسد الغابة، ج١، ص ١٣٨.

[4] أسد الغابة، ج١، ص ١٣٨، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٣٦.

[5] صحيح البخاري - كتاب الطلاق - باب من طلق وهل يواجه الرجل امرأته بالطلاق، الرقم ٥٢٥٥.

[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٣٦.

مەسەلەی ژنهێنانەکانی پێغەمبەر(ﷺ) لە سەرچاوەکاندا قسەی زۆری لەسەر هاتووەو چەندین نووسین هەن تایبەت بە ژمارەی خێزانەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و چۆنێتی و هۆکاری بەهاوسەرگرتنیان، هەندێکیان بێگومانن و یەکدەنگییان لەسەرە، هەندێکیشیان جێی گومانن یان یەکلا نەکراونەتەوە.

## ١٠٣. ئەسیدی کوڕی ئەبی ئوناس(رضي الله عنه):

ناوی ئەسیدی کوڕی ئەبی ئوناسی کوڕی زونەیمی کوڕی عەمرە، برازای ساریەی کوڕی زونەیمە،[١] ئەو ساریەی کە ئیمامی عومەر لە مینبەری مەدینەوە هاواری لێکرد و ئەویش دەنگی بیست.[٢]

ئەم هاوەڵە کوڕێکی هەبوو بەناوی ئەسەد کە لەگەڵ باوکیدا پاش فەتحی مەککە موسڵمان بوون.[٣]

ئەم هاوەڵە سەرەتا یەکێک بوو لە نەیارە سەرسەختەکانی ئیسلام و موسڵمانان، شاعیرێکی بەهێز بوو و شیعرەکانی بۆ دژایەتی موسڵمانان بەکاردەهێنا، تەنانەت دژ بە هاوەڵە بەشداربووەکانی بەدر شیعری دەوت، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) ڕشتنی خوێنی ئەسیدی ڕەوا کرد.[٤]

بەڵام ویستی خوا وابوو گەورەیی پلەوپایەی هاوەڵێتی بە نسیب بێت، ئەوەبوو کاتێک ئەسید زانی خوێنی ڕەوا کراوە چوو بۆ طائیف و لەوێ مایەوە تا دوای فەتحی مەککە، ئەوکات ساریەی مامی چوو و هەواڵی پێدا و دەستی ئەسیدی گرت و بردی بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش موسڵمان بوو و پێغەمبەریش(ﷺ) موسڵمانبوونەکەی قبووڵ کرد و دەستی هێنا بە دەموچاو

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٧٩.
[٢] أسد الغابة، ج٢، ص ٣٦٥.
[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٥١.
[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٧٩.

و سەرسنگیدا،[1] ئینجا ئەسید شیعر وتنەکەی خۆی خستەگەڕ بۆ خزمەتی ئیسلام و شیعرێکی وت: کە وەسف و پیاهەڵدانی پێغەمبەری خوای(ﷺ) لەخۆدەگرت، هەر هەڵەیەکی بیروباوەریشی تێدا بوایە پێغەمبەر(ﷺ) بۆی راست دەکردەوە، بۆ نموونە کاتێک وتی:

و أنت الفتى تهدى معدا لدينها

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بل الله يهديها)، (بەڵکو خوا رێنموونی دەکات)، بۆیە ئەسید شیعرەکەی وا لێکرد:

و أنت الفتى تهدي معدا لدينها

بل الله يهديها وقال لك أشهد

فما حملت ناقة فوق ورها

أبر و أوفى ذمة من محمد[2]

**پەند و وانە:**

رێنموونی تەنها و تەنها لای خوایە و کەسی تر رێنموونی بەدەست نیە وەک خوا دەفەرموێت (**إنك لا تهْدِي منْ أحْببْت ولكِن الله يهْدِي منْ يشاءُ وهُو أعْلمُ بِالْمُهْتدِين**).[3]

غەیب تەنها و تەنها لای خوایە، وەک دەبینین پێغەمبەری خوایش(ﷺ) غەیبی نەزانیوە، چونکە ئەگەر غەیبی بزانیایە و ئاگادار بوایە بڕیارە ئەسید موسڵمان بێت فەتوای رشتنی خوێنی ئەسیدی دەرنەدەکرد، کەچی لە زانستی غەیبی خوادا بریار وابوو ئەسید موسڵمان بێت، ئەمەش هیوا بە موسڵمان دەبەخشێ تا کەسە بێباوەڕەکان بکەونە بەر رەحمەتی رێنموونی خوا و بێئومێد نەبین لە موسڵمان بوونیان.

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص ١٣٩، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٧٩.

[2] أسد الغابة، ج١، ص ١٣٩.

[3] القصص: ٥٦.

راستکردنەوەی هەڵەکان ئەرکی سەرشانی تاکی موسڵمانی شارەزایە، بەڵام بە مەرجێک ئەو کەسە هەم بزانێ هەڵەکە چیە و هەم بزانێ راستکردنەوەکە بەپێی قورئان و سوننەت چۆنە؟ نەک کەسێک بۆ راستکردنەوەی هەڵەیەک بە هەڵە هەوڵی راستکردنەوەکە بدات، بەتایبەت راستکردنەوەی هەڵەی شاعیران بەشێکی کەنارخراوە لەناو جیهاندا بەگشتی و لە کوردستانیشدا بەشێوەیەکی بەرچاو، بەتایبەتی تر پێویستە هەڵەکانی پەیوەست بە بیروباوەڕ لە شیعری شاعیراندا راست بکرێنەوە، دەبینین شیعری شاعیران بەچاوی پیرۆزیەوە سەیر دەکرێت کەسێکیش نابینیت بوێرانە هەڵەکانیان راست بکاتەوە بێ ئەوەی پێویستبکات شاعیرەکان بشکێنێ، بەتایبەت لە تێکەوتنی شاعیرانی کورد لە بواری ئیتیحاد و حلوول و ئیشراق و مەسەلەی وەحدەتولوجود و بوارەکانی تەصەوفی فەلسەفی کە زۆر بە زەقی و زۆری لە شیعری شاعیرانی کورددا بەدی دەکەین پێویستە بە دیدێکی زانستی و دوور لە شکاندنی نارەوای شاعیران ئەو هەڵانە بخرێنە بەرچاو و راست بکرێنەوە.

نەرمونیانی پێغەمبەر(ﷺ) بەرامبەر بە دەوروبەرەکەی دەبینین کە چۆن هەڵسوکەوت دەکات لەگەڵ کەسێکدا کە بڕیاری رشتنی خوێنی دراوە، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) مەسەلەی ئیسلامەتی و موسڵمانبوونی تاکی لە هەموو شت لا گەورەتر بووە، وەک لە فەرموودەیەکدا بە ئیمامی عەلی دەفەرموێت (فوالله لأن يهدي الله بك رجلا خير لك من أن يكون لك من حمر النعم)،[1] (سوێند بەخوا ئەگەر خوا بەهۆی تۆوە کەسێک رێنموونی بکات زۆر بۆت باشترە لە وشتری سوور).

---

[1] صحيح البخاري – كتاب الجهاد والسير – باب فضل من أسلم على يديه رجل، الرقم ٣٠٠٩.

## ١٠٤. ئەسیدی موزەنی(رضي الله عنه):

ئەم هاوەڵە لە موزەنیەکانە، چووەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و فەرموودەی لێوە گێڕاوەتەوە، ئیبن ئەثیر فەرموودەیەکی هێناوە کە ئەسید دەیگێڕێتەوە، بەڵام ئیمامی ئەحمەد ئەو فەرموودەی هێناوەو ناوی ئەسیدی نەهێناوە تەنها دەڵێت: لە کەسێ لە موزەنیەکانەوە کە دایکی پێی وت: بۆچی ناچیت بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وەک ئەو خەڵکەی تر تۆیش داوای شتێکی لێ بکەیت؟[1] دەڵێت: منیش چووم تا پرسیار بکەم لە پێغەمبەر(ﷺ)، کە گەیشتمە خزمەتی دەبینم کەسێک لەلایەتی و داوای شتی لێ دەکات، پێغەمبەریش(ﷺ) دوو یان سێ جار رووی لێ وەرگێڕا-واتە وەڵامی داواکەی نەدایەوە- پاشان فەرمووی (من كان له أوقية ثم سأل فقد سأل إلحافا)، (هەرکەس ئۆقیەیەکی هەبێت و داوا لە خەڵک بکات -سواڵ بکات- ئەوە داواکاریەکەی ورک گرتنە)، منیش لای خۆمەوە وتم: خۆ من فلانە شتم هەیە کە بەهاکەی لە ئۆقیەیەک زیاترە، پاشان یەکێ لە پشتیوانەکان خەڵاتێکی پێدام، منیش لەگەڵ وشترەکەی خۆمدا بردم، پاشان برێ خورمایشی پێدام، لەو کاتەوە تا ئێستا هەر لە خۆشیدام.[2]

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە کەسێ لە موزەینە هەبوو دایکی پێی وت: بۆچی ناچیت بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و وەک ئەو خەڵکە داوای شتی لێ بکەیت؟ کەسەکە دەڵێت: منیش چووم و بینیم پێغەمبەر(ﷺ) بە پێوە وەستابوو و وتاری دەدا و دەیفەرموو (من استعف أعفه الله، ومن استغنى أغناه الله، ومن سأل الناس وله عدل خمس أواق فقد سأل إلحافا)،[3] (هەرکەس داوێن پاکی بوێت خوا داوێن پاکی پێ دەبەخشێ، هەرکەس دەوڵەمەندی بوێت خوا

[1] - مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٦٨٩٦.

[2] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٨٤٢.

[3] مسند أحمد بن حنبل - مسند الشاميين(رضي الله عنهم) - حديث رجل من مزينة(رضي الله عنه)، الرقم ١٧٥١٠، صححه شعيب الأرناؤوط، كما صححه الألباني في السلسلة الصحيحة، الرقم ٢٣١٤.

دەوڵەمەندی دەکات، هەرکەس هاوتای پێنج ئۆقیەی هەبێت و داوا لە خەڵک بکات، ئەوە داواکاریەکەی ورک گرتنە).

## ١٠٥. ئەسیدی کوڕی صەفوان(رضي الله عنه):

ئەم هاوەڵە ناوی لەناو هاوەڵانی خەڵکی حیجازدا هاتووە،[1] بە ئوسەید[2] هەروەها بە ئەسید[3] هەروەها بە ئوسەیر[4] ناوی هاتووە.

ئەسید باسی ئەو رۆژە دەکات کە خەلیفەی موسڵمانان ئەبووبەکری صدیق کۆچی دوایی کرد و دەڵێت:

کاتێک ئەبووبەکر وەفاتی کرد بە بەرگێ دایانپۆشی و گریان مەدینەی گرتەوەو خەڵکی شڵەژان چەشنی ئەو رۆژەی پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی دوایی کرد، عەلی کوڕی ئەبووطالیب خێرا بە گریانەوە گەڕایەوەو دەیفەرموو (ئەمڕۆ خیلافەتی پێغەمبەر(ﷺ) دابڕا)، ئینجا هات تا گەیشتە بەردەرگای ئەوماڵەی ئەبووبەکری تێدا بوو، وەستا و وتی: (بەر رەحمەتی خوا کەویت ئەی ئەبووبەکر، تۆ یەکەم کەس بوویت موسڵمان بوویت، لەهەمووان پوختتر و دڵسۆزانەتر باوەڕت هێنا، دڵنیایی و بێگومانیت لە هەموان زیاتر بوو، لە هەموان لەخواترس تر و دەوڵەمەندتر بوویت و لە هەموان زیاتر لە دەوری پێغەمبەر(ﷺ) بوویت... پلەوپایەت لە هەموویان بەرزتر بوو، پێشڕەوی هەموویان بوویت، پلەت لەهەموویان بەرزتر بوو، لە هەموویان زیاتر لە پێغەمبەری خواوە نزیک بوویت، لەرووی رەوشت و هەڵوێستەوە لە هەموان زیاتر لە پێغەمبەر(ﷺ) دەچوویت، لای پێغەمبەر(ﷺ) لە هەموویان جێ متمانەتر و پایەبەرزتر بوویت و بەڕێزتریان بوویت لە خزمەتیدا، دەی خوای گەورە لەسەر ئیسلام و پێغەمبەرەکەی و موسڵمانان پاداشتی خێرت بداتەوە، کاتێک خەڵکی پێغەمبەری خوایان بە درۆزن دەزانی

[1] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٨٤١، أسد الغابة، ج١، ص١٤٠.

[2] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٨٤١، الشريعة للآجري، الرقم ١٧٨١.

[3] أسد الغابة، ج١، ص١٤٠.

[4] البحر الزخار مسند البزار، الرقم ٨٣١.

تۆ بەراستت دەزانی، بۆیە خوای گەورە لە کتێبەکەی خۆیدا بە صدیق ناوی هێنایت (والذي جاء بالصدق)، کاتێک خەڵکی بەرامبەر پێغەمبەر(ﷺ) پیسکە بوون، تۆ شوێنکەوتە و دڵنەواکەری بوویت، کاتێک خەڵکی دانیشتن و لەگەڵی نەچوون تۆ لەگەڵیدا راوەستایت، لەکاتی سەختیدا بە جوانترین شێوە هاوەڵی ئەوت کرد، سوکناییت بۆ دەهێنا و هاورێی کۆچ و باروحاڵی نارەحەتی پێغەمبەر(ﷺ) بوویت، دوای پێغەمبەر(ﷺ) بەجوانترین شێوە خیلافەتت کرد بۆ ئوممەتەکەی، کاتێک خەڵکی لە ئیسلام هەڵگەرانەوە بەجۆرێک ئایینی خوات بەجێگەیاند کە خەلیفەی هیچ پێغەمبەرێکی پێشتر وا بەجێی نەگەیاندووە، کاتی لاوازی هاوەڵانت بەهێز بوویت، کاتی ترسی ئەوان سەرپێ راوەستایت، وێرای پێ ناخۆشبوونی دووروان و بێزاری و توورەیی بێباوەران دەستت گرتبوو بە رێباز و بەرنامەی پێغەمبەری خواوە، کاتێک دەوروبەرت شکستیان خوارد بە رووناکی خوا خیلافەتت گرتەدەست، لەسەروو هەموویانەوە بویت و لەهەموشیان کەمتر قسەت دەکرد و لە هەموان زیاتر راستیت دەپێکا و لە هەموان زیاتر بێدەنگ دەبوویت، رەوانبێژی و بڕیاردروستی و دلێری و دڵنیایی و کرداری چاک و شارەزاییت بە کارەکان لە هەموان زیاتر بوو، بۆ ئیسلام سەرگەورەیەک بوویت و بۆ باوەڕدارانیش باوکێکی میهرەبان، کاتێک بە خاوخێزانەوە دەهاتنە لات باری قورسی لاوازی ئەوانت دەگرتە ئەستۆ، چییان لەدەست دەدا تۆ دەتپاراست، چییان پشتگوێ بخستایە تۆ ئاگاداری دەبوویت، کاتی کەمصەبری ئەوان خۆڕاگر بوویت، ئەوەی ئەوان هەوڵیان بۆ دەدا تۆ پێی گەیشتیت، بەهۆی تۆوە گەیشتن بەوەی کە چاوەڕێ نەبوون دەستیان بکەوێ، بۆ بێباوەران سزایەک بوویت و دەرژایت بەسەریاندا، بۆ باوەردارانیش بارانی رەحمەت و بەرەکەت بوویت، بارانی دەوڵەمەندی و سوکنایی و پارێزگاری بوویت... وەک شاخێ وابوویت کە رەشەبا نایجووڵێنێت و شکێنەرەکان لەناوی نابەن... کەسی لاواز و زەلیل لای تۆ بەهێز بوو تا مافت بۆ وەردەگرتەوە، کەسی بەهێز و بە

دەسەڵتیش لای تۆ زەلیل و لاواز بوو تا کاتێک مافت لێ وەردەگرتەوە، لەوەشدا دوور و نزیک لای تۆ وەک یەک بوون... بەخوا پێشڕەیو زۆرت کردو ئەوەی دوای تۆ دێت چاک ماندووی دەکەیت... رازین بە قەزای خودا و ملکەچی کارو فەرمانی دەبین، دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) موسڵمانان بە هیچ شتێ هێندەی مەرگی تۆ موصیبەتبار نابن... خوای گەورە بتگەیەنێتەوە بە پێغەمبەرەکەت و ئێمەش لە پاداشتت بێ بەش نەکات و دوای تۆ گومڕامان نەکات) خەڵکی بێدەنگ بووبوون تا وتەکانی تەواو بوون، دواتر هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) گریان و وتیان: راستت فەرموو: ئەی ئامۆزای پێغەمبەری خوا(ﷺ).[1]

ئەمە بەڵگەیەکی زۆر جوانە لەسەر خۆشەویستی نێوان ئالوبەیتی پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵان بەتایبەت خۆشەویستی نێوان ئیمامی عەلی و ئیمامی ئەبووبەکر رەزای خوا لە هەردووکیان، دوو موژدەپێدراوی بەهەشت و دوو خەلیفەی راشیدی و دوو هاوەڵی زۆر نزیکی پێغەمبەر(ﷺ).

## ١٠٦. ئەشەجی عەبدی(ﷺ):

ئەشەجی کوڕی عەبدشەمس یان ئەشەجی بەنی عومەر، بەڵام زیاتر ناسراوە بە ئەشەجی عەبدی، ناوی مونذیری کوڕی عەمر یان مونذیری کوڕی حارثە.[2]

## ١٠٧. ئەشرەسی کوڕی غاضرە(ﷺ):

ناوی ئەشرەسی کوڕی غاضیرەی کندیە ویەکێکە لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ)، ئیسحاقی کوڕی حارثی قورەیشی دەگێڕێتەوە هەر یەک لە عومەیری کوڕی جابر و ئەشرەسی کوڕی غاضیرەی دیوە و هەردووکیان

---

[1] البحر الزخار المعروف بمسند البزار - مسند علي بن أبي طالب - أسير بن صفوان عن علي، الرقم ٩٢٨.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٨٧

هاوەڵی پێغەمبەرن(ﷺ)، ئەو دوو هاوەڵە خەنەو (الکتم) یان بەکاردەهێنا.[1]

کەتەم جۆرە گیایەکە لە یەمەن کە رەنگێکی لێ بەرهەم دێ مەیلەو رەشە، خەنەش سووررەنگە، کاتێک هەردووکیان بەکاردێن رەنگێکی سوورو رەش تێکەڵ دەبێت.

سەبارەت بە بەکارهێنانی خەنەو کەتەم لەلایەن پیاوانەوە بۆ کەسانی پیر سوننەتەو پێغەمبەری خواش(ﷺ) لە چەندین فەرموودەدا فەرمانی پێکردووە، وەک دەفەرموێت (إن اليهود والنصارى لا يصبغون فخالفوهم).[2] (جوولەکەو مەسیحیەکان رەنگی موویان ناگۆڕن، دەی ئێوە پێچەوانەی ئەوان بکەن)، بەڵام رەنگی ڕەش نابێت و بە حەرام دانراوە، بەڵکو ئەوەی هەیە بەکارهێنانی خەنەو کەتەم حەڵاڵە، بە داخەوە ئەمڕۆ لەلایەن گەنجانی موسڵمانەوە بۆیەی رەش تەنانەت بۆ تۆخکردنی رەشی ڕیش و سەریش بەکاردێت بێ گوێدانە ئەوەی ئایا حەڵاڵە یان نا.

## ١٠٨. ئەشرەف(رضي الله عنه):

یەکێکە لەو هاوەڵانەی لە حەبەشەوە هاتن.[3]

ئیبن ئەثیر سەبارەت بە هاتنی ئەم هاوەڵە گێڕانەوەیەک دێنێت: کاتێک موسڵمانانی حەبەشە زانییان پێغەمبەر(ﷺ)و موسڵمانان لە جەنگی بەدردا سەرکەوتن، داوای مۆڵەتیان کرد لە نەجاشی تا بچنەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، ژمارەیەک لەوانەی لای نەجاشی بوون و بڕوایان هێنابوو بە نەجاشییان وت: مۆڵەت بدە بە ئێمەش با بچین بۆ لای ئەو پێغەمبەرەو بزانین ئەو کەسەیە کە لە کتێبەکەماندا باسی کراوە؟ ئەوەبوو چوون بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و لەگەڵیدا بەشداری غەزای ئوحود بوون، ریوایەتێ لە موقاتیل و کەسانی تریشەوە دێنێ

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص ١٤٩-١٥٠، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٨٧.

[2] صحيح البخاري - كتاب أحاديث الأنبياء - باب ما ذكر عن بني إسرائيل، الرقم ٣٤٦٢.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٨٧.

که وتویانه ئەوانه ٤٠ کەس بوون، سی و دوو کەسیان له گەڵ جەعفەری طەیاردا هاتن، هەشت کەسیشیان له شامەوه هاتن (بوحەیراو ئەبرەهەو ئەشرەف و تەمام و ئیدریس و ئەیمەن و نافع و تەمیم)، ئەمە گێڕانەوەی ئەبوو مووسا بوو که ئیبن ئەثیر هێناویەتی، ئیبن ئەثیر دەڵێت: ئەگەر مەبەستی به بوحەیرا یەکێکی تری جیا لەو بوحەیرایه بێت که پێغەمبەر(ﷺ) به منداڵی بینی، ئەوه ئەگەری هەیه ئەم هاتنی وەفده راست بێت.[٤]

ئیبن حەجەر دەڵێت: وادیاره ئەمه بوحەیرایەکی تره، چونکه پێغەمبەر(ﷺ) ئەوی له خاکی شام دیوه، بەڵام ئەم بوحەیرایەیان له حەبەشه بووه، باکووری وڵات لەکوێ و باشووری لەکوێ، ئاساییه دوو کەس یەک ناویان هەبێ.[٥]

بەڵام بەپێی هەموو سەرچاوەکان جەعفەری طەیار(ﷺ) و موسڵمانان له فەتحی خەیبەردا هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)،[٦] دیاریشه غەزای ئوحود لەپێش فەتحی خەیبەر روویداوه، بۆیه هاتنی ئەو کەسانه لەگەڵ جەعفەری طەیار بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و بەشداری کردنیان له غەزای ئوحوددا، بەپێی سەرچاوەکان هەڵەیەو راستی تێدا نیه، دەشکرێ ئەو ئەگەره دابنێین ئەو کەسانەی تر (واته ئەو ٤٠ کەسه) بەجیا و بەبێ جەعفەر هاتبن، وەک چۆن ئیبن حەجەر باس لەوه ناکات هاتنی ئەو کەسانه لەگەڵ جەعفەردا بووبێت.[٧]

## ١٠٩. ئەشرەف(رضي الله عنه):

وردەکاری لەسەر ژیانی نازانرێ، تەنها هێندە زانراوه له ناوچەی هوراتەوە هاتووه،[٨] ناوچەی هوراتیش دەکەوێته ناوچەی خوراسانی جارانەوه.[٩]

---

[٤] أسد الغابة، ج١ص٧١.

[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٢٢.

[٦] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١ص٢٤٢، أسد الغابة، ج١ص٤٢١، سير أعلام النبلاء للذهبي، ج١ص٢٠٦.

[٧] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٢٢.

[٨] أسد الغابة، ج١، ص ١٥٠، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٨٧.

[٩] معجم البلدان لياقوت الحموي، ج٥، ص ٣٩٦.

## ١١٠. ئەشعەثی کوڕی قەیس(رضي الله عنه):

ناوی ئەشعەثی کوڕی قەیسی کوڕی مەعدیەکریبی کوڕی موعاویەی کیندیە، کونیەکەی ئەبوو موحەممەدە، بە وەفد هاتووەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)،لە ساڵی دەی کۆچیدا و هاودەم بە شەست سوار لە ناوچەی کیندەوە هاتن،[1] ئەشعەث لە پاشایانی کیندە بوو و ناوی خۆی مەعدیەکریب بوو، بەڵام نازناوەکەی ئەشعەث بوو.[2]

برایەکی هەبوو بە ناوی ئیبراهیم کە ئەویش هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمانبوونی خۆی راگەیاند،[3] هەروەها ئەشعەث کچێکیشی هەبوو بە ناوی جەعدە.[4]

کاتێک ئەشعەث هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) لە ساڵی دەی کۆچیدا بوو، بە پێغەمبەری خوای(ﷺ) وت: تۆ لە ئێمەیت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (نحن بنو النضر بن كنانة..)، (ئێمە لە بەنو نەضری کوڕی کینانەین)، ئەشعەث دەیوت ئیتر هەرکەس بهاتایە بۆ لام و نکووڵی بکردایە لە قوڕەیشی بوونی بەنی نەضری کوڕی کینانە جەلدم لێدەدا. [5]

کاتێک وەفدەکە چوون بۆ مزگەوت بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، کاروانەکە ئەندامانی وەفدەکە کلیان کردبوو و جلێکیان لەبەر بوو کە ڕێژەیەک ئاوریشمی تێدابوو و بە زێڕیش رازێنرابوویەوە، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموون (مەگەر ئێوە موسڵمان نەبون؟) وتیان: بەڵێ، فەرمووی: (دەی ئەوە چیە لەبەرتانە؟)، ئەوانیش لایانبرد، کاتێک ویستیان بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان،

[1] أسد الغابة، ج١، ص١٥١.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٨٧

[3] أسد الغابة، ج١، ص٦٩.

[4] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٥، ص١٦٥.

[5] سنن ابن ماجه - أبواب الحدود - باب من نفى رجلا من قبيلته، الرقم ٢٦١٢، حسنه شعيب الأرناؤوط، صححه الألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة، الرقم ٢٣٧٥.

پێغەمبەر(ﷺ) دە ئۆقیەی بەخشی بە هەرکامیان، دوانزە ئۆقیەشی بەخشی بە ئەشعەث.[1]

ئەشعەث لە دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) لە ئیسلام هەڵگەڕایەوە، بەڵام بەند کرا و هێنرا بۆ لای خەلیفەی باوەڕداران ئەبووبەکری صدیق، لەوێ ئەشعەث موسڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاندەوە، خەلیفە خوشکێکی خۆی بەناوی ئوم فەروە لێ مارەکرد، ئەشعەثیش چوویە ناو بازاڕ و هەرچی وشترێکی بەدیدەکرد بە شمشێر سەری دەبڕی، خەڵکی کە ئەوەیان دی وتیان: هەمدی ئەشعەث لە ئیسلام هەڵگەڕایەوە، ئەشعەث وتی: نا سوێند بەخوا لە ئیسلام هەڵنەگەڕاومەتەوە، بەڵکو خەلیفە خوشکەکەی خۆی لێ مارە کردوم و ئەگەر لای خۆمان بوایە خواردنی ئاهەنگەکەی زۆر لەمە زیاتر دەبوو، دەی خەڵکینە لەو گۆشتەی بخۆن، ئەی خاوەن وشترەکان ئێوەش وەرن و پارەی وشترەکانتان وەبگرن.[2]

ئەو کەسەی ئەشعەثی بەندکردو ناردی بۆ لای خەلیفە، زیادی کوڕی لوبەید بوو کە لەکاتی وەفاتی پێغەمبەردا(ﷺ) والی حەضرەمەوت بوو.[3]

ئوم فەروەی کچی ئەبوو قوحافە لە ئەشعەثەوە منداڵێکی بوو بە ناوی موحەممەد.[4]

دواتر ئەشعەث بەشداری کرد لە فتووحاتی ئیسلامیدا و لە هەریەک لە غەزاکانی یەرمووک لە شام و قادسیە لە عێراق و چەند غەزایەکی تریشدا بەشداری کرد، ئینجا چوو لە کووفە نیشتەجێ بوو، لە جەنگی صفینیشدا لە ریزی سوپای خەلیفە عەلی کوڕی ئەبووطالیبدا بەشداری کرد.[5]

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص٣٢٨.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٨٨.

[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص٥٩٨.

[4] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٣٤.

[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٨٨.

لە غەزای یەرموک لەشام چاوێکی لەدەستدا، بەڵام بەوەوە نەوەستا و چوو بۆ عێراق بۆ جیهاد،[1] لەوێ لەگەڵ سەعددا بەشداری جەنگەکانی قادسیەو مەدائین و جەلەولا و نەهاوەندی کرد.[2]

سەبارەت بە مردنی سێ را هەیە، رایەکیان دەڵێت: چل شەو دوای شەهید بوونی عەلی کوڕی ئەبوو تالیب کۆچی دوایی کرد،[3] رایەکی تر پێی وایە لە ساڵی چلی کۆچیدا وەفاتی کردووە،[4] رایەکی تر پێی وایە ساڵی ٤٢ کۆچی وەفاتی کردووە و حەسەنی کوڕی عەلی نوێژی لەسەر کردووە، بەڵام ئیبن ئەثیر بەرپەرچی ئەمە دەداتەوەو دەڵێت: لەو کاتەدا حەسەنی کوڕی عەلی لە ساڵی چل و دووی کۆچیدا لە کووفە نەبووە،[5] بەڵام ئیبن سەعد دەڵێت: لەو کاتەدا هێشتا حەسەن لە کووفە بوو و سەرقاڵی رێککەوتن بوو لەگەڵ موعاویەو نوێژی لەسەر ئەشعەث خوێند،[6] لە کاتی وەفاتیدا ئەشعەث تەمەنی شەست و سێ ساڵ بوو.[7]

ئەشعەث فەرموودەیەکی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە کە دەفەرموێت (إن أشكر الناس لله أشكرهم للناس)،[8] (بەراستی ئەو کەسە زۆر سوپاسگوزارە لای خوا کە زۆر سوپاسی خەڵک بکات).

سوپاسکردنی خەڵک لەسەر چاکە پێویستە و واجبێکی سەرشانمانە وەک چۆن لە فەرموودەی پێغەمبەردا(ﷺ) هاتووە دەفەموێت (مَنْ لا يشْكُرْ الناس لا يشْكُرْ الله)،[9] (ئەوەی سوپاسی خەڵک نەکات سوپاسی خوا ناکات).

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص١٥٢.

[2] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٣٤.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٨٨.

[4] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٣٤.

[5] أسد الغابة، ج١، ص١٥٢.

[6] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٦، ص٢٢.

[7] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٨٨.

[8] مسند أحمد بن حنبل - مسند الأنصار(ﷺ) - حديث الأشعث بن قيس الكندي(ﷺ)، الرقم ٢٢٢٦٢، قال الأرناؤوط صحيح لغيره و هذا إسناد ضعيف، ضعفه الألباني في السلسلة الضعيفة، الرقم ٥٣٣٩.

[9] جامع الترمذي - أبواب البر والصلة عن رسول الله(ﷺ) - باب ما جاء في الشكر لمن أحسن إليك،

## ١١١. ئەشعەثی ئەنصاری(ﷺ):

ناوی ئەشعەثە و لە پشتیوانانە، وردەکاری لەسەر ژیانی بەردەست نیە، بەڵام ئیبن حەجەر ناوی هێناوە و گێڕانەوەیەکیشی هێناوە کە دوو برای پشتیوانی هەبوون یەکێکیان ناوی ئەشعەث بوو، لە سوپایەکی موسڵماناندا بەشداری غەزای کرد، ژنی ئەو کەسەکەی تر بە پیاوەکەی وت: ئەریٚ ناڕوانیت بۆ براژنەکەت پیاوێکی لەگەڵە قسەی لەگەڵ دەکات، ئەویش سەرکەوت و سەیری کرد پیاویٚ لەگەڵ براژنەکەیدایە و ژنەکە مریشکی ورد دەکرد و پیاوەکەش ئەم شیعرەی دەوت:

و أشعث غزه الإسلام مني    خلوت بعرسه ليل التمام

ئەویش چوو و دای بەسەر پیاوەکەدا و کوشتی و دواتر فڕێی دا، خەلیفە عومەری کوڕی خەتتاب ئەوەی بیستەوە، وتی: هەرکامتان زانیاری لەو بارەوە هەیە سوێندی ئەدەم بە خوا باسی بکات، بەکری کوڕی شەدداخ هەستاو وتی: من ئاگادارم، عومەر وتی: الله أكبر، بەکر وتی: فڵانە کەس چوو بۆ غەزاو منی راسپارد ئاگاداری ماڵ و خێزانی بم، منیش کە چوومە بەردەرگای ماڵیان دەبینم ئەم جوولەکەیە لەویٚ بوو و ئەم شیعرەی دەوت، خەلیفەش کە ئەو بەسەرهاتەی بیست تۆڵەی خوێنی جوولەکەکەی وەلانا.[1]

## ١١٢. ئەصبەغی کوڕی غیاث(ﷺ):

ناوی ئەصبەغی کوڕی غیاث یان کوڕی عتابە، فەرمودەیەکی گێڕاوەتەوە.[2]

---

الرقم ١٩٥٤ وقال حديث صحيح.

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٨٩.

[2] أسد الغابة، ج١، ص١٥٢، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٠٣٨.

## ١١٣. ئەصەمی عامری(رضي الله عنه):

وەفدێکی بەنیلبوکا هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) کە گەورەکەیان موعاویەی کوڕی ثەور بوو و لەو کاتەدا تەمەنی سەد ساڵ بوو، یەکێک لەوانەش لەو وەفدەدا بوو ئەصەم بوو، هەموویان لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) موسڵمان بوون و چەند رۆژێ بە میوانی پێغەمبەر(ﷺ) مانەوە.[١]

## ١١٤. ئەصرەم(رضي الله عنه):

بە ئەصرەم یان ئوصەیرم هاتووە، بەڵام لە بنەرەتدا ناوی عەمری کوڕی ثابتی کوڕی وەقشە، لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان، لە جەنگی ئوحوددا شەهید بوو و پێغەمبەری خوایش(ﷺ) شایەتی بەهەشتی بۆ دا،[٢]دایکی ناوی لیای کچی یەمانە،[٣] برای سەلەمەی کوڕی ثابتە.[٤]

لە جەنگی ئوحوددا ئەصرەم موسڵمان بوو و بەشداری جەنگی کرد تا بریندار بوو، دوای جەنگەکە کە بەناو کوژراوەکاندا دەگەڕان ئەصرەمیان بینی برینێکی سەختی هەبوو، لێیان پرسی ئەی عەمر لەبەر خێڵایەتی هاتیت بۆ جەنگ یان لەبەر ئیسلام؟ وتی: بەڵکو لەبەر ئیسلام، من موسڵمان بووم و لەبەر ئیسلام هاتم و جەنگام تا ئاوام بەسەرهات، هێندەی نەبرد مرد، دواتر بەسەرهاتەکەیان بۆ پێغەمبەر(ﷺ) گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: ئەو لە ئەهلی بەهەشتە.[٥]

ئەصرەم لە ژیانیدا یەک رکات نوێژی نەکرد کەچی بەهەشت بوو بە بەشی نەبڕاوەی.[٦]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٩١.
[٢] أسد الغابة، ج١، ص١٥٤.
[٣] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٣، ص١١٦٧.
[٤] أسد الغابة، ج٤، ص٢١٤.
[٥] معرفة الصحابة، الرقم ٩٩٧، أسد الغابة، ج٤، ص٢١٥.
[٦] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٣، ص١١٦٧.

ئەمە موژدەیەکی گەورەیە بۆ ئەو کەسانەی کە هێشتا موسڵمان نەبون تا بزانن هیچ کات درەنگ نیە بۆ خۆڕزگارکردن، کات نەفەوتاوە تا بڵێیت دەرفەت کەمە بۆ کۆکردنەوەی توێشووی پێویست، بەڵکو دەتوانیت خێرا بڕی پێویستی توێشوو کۆبکەیتەوە بێ ئەوەی پێویست بە دەرفەتی زۆر بکات، ئەوە هاوەڵێکە لە ماوەی تاقێکدا توانی بەهەشتی خوا بکڕێت و پێغەمبەری خوایش شاهیدی ئەوەی بۆ دا، بۆیە هیچکات بێهیوایی روو نەکاتە کەسمان، هاوکات ئەمە نمونەیەکی باشە تا بزانین دەبێت جیهاد تەنها بۆ سەرخستنی ئایینی خوا بێت نەک دەمارگیری رەگەزی یان خوێن یان هەر دەمارگیریەکی تر، خوای گەورە جیهادێک وەردەگرێت کە تەنهاو تەنها بۆ سەرخستنی ئیسلام بێت.

## ١١٥. ئەصرەمی شەقەری(رضي الله عنه):

بە وەفد هاتووەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەریش(ﷺ) نزای خێری بۆ کرد و ناوی نا زورعە.[١]

ئەصرەم دەگێڕێتەوەو دەڵێت: کۆیلەیەکی رەشم لەگەڵ خۆم برد بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من ئەم کۆیلەم کڕیوەو پێم خۆشە ناوی بنێیت و نزای بەرەکەتی بۆ بکەیت، پێغەمبەریش(ﷺ) پێی فەرمووم (ناوت چیە؟) وتم: ناوم ئەصرەمە، فەرمووی: (بل أنت زرعة) (بەڵکو تۆ زورعەیت) واتە ناوی نا زورعە، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (فما تریدە) دەتەوێ کۆیلەکە چی بێ و چیت بۆ بکات؟ وتم: دەمەوێ شوانە بێت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (فهو عاصم) دەی ناوی عاصمە، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) دەستی کۆیلەکەی داخست.[٢] بەڵام تەبەرانی بە گێڕانەوەیەکی

---

[١] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٤١، أسد الغابة، ج١، ص ١٥٤.

[٢] معجم الصحابة لابن قانع، ج١، ص١٣، الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص٧٨، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٧٧٩٩ صححه ووافقه الذهبي في التلخيص.

تر هێناویەتی ئەصرەم وتی: دەمەوێت جووتیار بێت.[١]

دەبینین پێغەمبەر(ﷺ) پێش ئەوەی داواکەی ئەصرەم بێنێتە دی پرسیاری لە خودی ئەصرەم کرد تا بزانێت ناوی خۆی چیە؟ کە ناوەکەی پێ جوان نەبوو ناوی خۆی گۆڕی ئینجا چوویە سەر باسی کۆیلەکەی.

## ١١٦. ئەصیەد(ﷺ):

ناوی ئەصیەدی کوڕی سەلەمەی سولەمیە، خۆیشی و باوکیشی شاعیر بوون.

عەلی کوڕی ئەبووطالیب دەگێڕێتەوە پێغەمبەر(ﷺ) سریەیەکی نارد سریەکەش کەسێکیان لە بەنی سولەیم دەستگیرکرد کە پێی دەوترا ئەصیەدی کوڕی سەلەمە، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) ئەصیەدی بینی دڵی بۆی سووتا و پێشنیاری بۆ کرد موسڵمان ببێت، ئەویش موسڵمان بوو، کاتێک سەلەمەی باوکی بیستیەوە کە کوڕەکەی موسڵمان بووە، تووڕە بوو، تەمەنێکی زۆریشی هەبوو، شیعرێکی نووسی بۆ کوڕەکەی کە ئەمە پوختەیەکی واتاکەیەتی:

(لە سوارێکەوە کە بە سەلامەتی دەگاتە مەدینە تا وتەکەم بگەیەنێتە ئەصیەد، خراپترین منداڵ ئەوەیە باوکی ئازار بدات و لەگەڵ کەسانی دوور چاک بێت، واز دێنی لە ئایینی باوکت و شوێن ئایینی موحەممەد دەکەویت، لەبەر چی کوڕم ئازارت دام و بەم پیریەم جێت هێشتم، ڕۆژانم بە فرمێسک ڕشتن و شەوانیشم بە شەونخونی بەسەر دەبەم، لەوانەیە خوایەک بەرەو ئایینی خۆی ڕێنموونی کردبێت، دەی دەستخۆشی بکە بەڵکو ڕاستت پێکابێ، دەی باسی ئەوەم بۆ بکە چی ڕێنموونیت لێ وەرگرتووە بۆم باس بکەو بە تەنها جێم مەهێڵە، بزانە ئەگەر تۆش پەیوەندیت پێمەوە بپچڕێنیت تەنها و تەنها بە دڵگرانیتەوە ڕادێم و دێم).

[١] المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٨٧٢.

کاتێک ئەصیەد نامەکەی باوکی خوێندەوە هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و داوای مۆڵەتی لێکرد تا وەڵامی بۆ بنووسێت، پێغەمبەر(ﷺ) مۆڵەتی دا و ئەویش لە وەڵامدا شیعرێکی بۆ نووسی کە ئەمە پوختەیەکی واتاکەیەتی:

(ئەوەی بە تاک و تەنها بە توانای خۆی ئاسمانی راگرتووە، پێغەمبەری خۆی موحەممەدی بە رەحمەتی خۆیەوە ناردووە، بەندەکانی بانگ کرد بۆ ئایینی خوا بەخۆشی بێت یان ناخۆشی، ئەوانیش بەرەو رێنموونی هەنگاویان نا، لەو ئاگرەش ترسان کە بەهۆیەوە کەسی سەرکەش ماڵوێران دەبێت، بزانە تۆیش دەمریت و لێپێچینەوەت لەگەڵ دەکرێت، دەی تا کەی وا لە پەستی و گومڕاییدا دەمێنیتەوە)

کاتێک باوکی نامەکەی خوێندەوە هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمان بوو.[1]

## ١١٧. ئەصیەدی کیلابی(رضي الله عنه):

ناوی ئەصیەدی کوڕی سەلەمەی کیلابیە، لە ساڵی نۆی کۆچیدا پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ سوپایەکدا بە سەرکردایەتی ضحاکی کوڕی سوفیان ناردی بۆ هێرش بردنە سەر هۆزەکەیان، لە مانگی رەبیعولئەوەلدا کە گەیشتن بە یەک، ئەصیەد باوکی بانگ کرد تا موسڵمان بێت، بەڵام باوکی موسڵمان نەبوو،[2] دواتر پەنای دا، کەچی باوکی نەک ئەوەی پەناکەی قبووڵ نەکرد بەڵکو قسەی وت: بە خودی ئەصیەد و بە ئاینەکەشی،[3] ئەصیەدیش هەڵیکوتایە سەری و دای لە ملی ئەسپەکەی و سەلەمەش لەسەر ئەسپەکە کەوتە خوارەوە و بە رمەکەیەوە خۆی گرتەوە، ئەصیەد وەک رێزێ بەرامبەر بە باوکی نەیکوشت و چوو وازی لێ هێنا، بەڵام دواتر

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص ١٥٤- ١٥٥.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٩٢.

[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص١٦٢.

موسڵمانان کە گەیشتن بە باوکی کوشتیان.[1]

ئەمە نموونەیەکی تری ژیانی هاوەڵانە کە دەیسەلمێنێت لای هاوەڵان موسڵمانێتی لەپێش خوێنەوە بووە، بۆیە کەسێکی موسڵمانی زمان جیاواز خۆشەویستتر و لە پێشتر بووە لە باوکێکی بێباوەڕی خوانەناس، ئەگەرچی زۆرجار ماددیگەراکان کە لە دیدی ماددیەوە لێکدانەوە دەکەن بۆ مێژوو، وا دەڕواننە جەنگ وفتوحاتە ئیسلامیەکانی قۆناغی هاوەڵانیش کە لەپێناو ماددەدا بووە و بەرژەوەندیەماددیەکان هۆکار بون، کەچی لە نموونەیەکی لەم جۆرەو دەیان و سەدان نموونەی تریشدا دەبینین شمشێر هەڵگرتنی هاوەڵان بۆ سەرخستنی ئایینی خوا بووە، ئەصیەد زۆر هەوڵیدا باوکی موسڵمان بێت تا گیان و دنیاو قیامەتی پارێزراو بێت، ئەگەریش موسڵمان بوایە ئەوا زیاتر لە گیانی خۆی دەیپاراست، بەلام کاتێک بینی باوکی لەبری موسڵمانبوونی کەوتە قسەوتن بە ئایینی خوا، بۆیە ئەوپەڕی ڕێزنواندنی بۆی ئەوەبوو خۆی نەیکوشت و وازی هێنا تا موسڵمانێکی تر بیکوژێت.

## ١١٨. ئەضبەطی سەلەمی(رضي الله عنه):

کونیەکەی ئەبو حارثەیەو حارثەی کوڕی فەرموودەی لێوە گێڕاوەتەوە.[2]

فەرموودەیەکی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوەو دەڵێت: لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیست دەیفەرموو (اطلعت في النار فرأيت أكثر أهلها النساء)،[3] (سەیری ناو دۆزەخم کرد بینیم زۆربەی خەڵکەکەی ئافرەتان بوون).

ئەم فەرموودەیە بە صەحیحی لە چەند هاوەڵێکی ترەوە بە دەقی هاوشێوە و نزیک لەم دەقە گێڕدراوەتەوە.

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٩٢، الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص١٦٢.

[2] أسد الغابة، ج١، ص١٥٦.

[3] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٠٢٥، أسد الغابة، ج١، ص١٥٦، الإصابة في تمييز الصحابة، ١، ص ٩٤.

هەريەك لە ئەبوو نوعەيم[1]و ئيبن ئەثير[2] بە جيا لە ئەضبە طى كوڕى حويەى ناوى دێنن و فەرموودەيەكى لێوە دەگێڕنەوە، بەڵام ئيبن حەجەر پێى وايە ئەم دوو ئەضبەطە هەردووكيان يەك كەسن نەك ئەوەى دوو هاوەڵى جيا بن.[3]

بەڵام لە سەنەدى هەردوو فەرموودەكەدا كە هاتووە دەبينين هەركام فەرموودەيەكيان گێڕاوەتەوەو هەركام منداڵێكيان هەيە، منداڵى يەكێكيان بە عەبدولموهەيمين هاتووەو منداڵى ئەوى تريان بە حارثە هاتووە، مەگەر بڵێين ئەو دوو منداڵە برا بن، خواش زاناترە.

## ١١٩. ئەضبەطى كوڕى حويەى(رضي الله عنه):

هەريەك لە ئەبوونوعەيم و ئيبن ئەثير و ئيبن حەجەريش هێناويانە، ئەويش بە پشت بەستن بە فەرموودەيەك كە لە عەبدولموهەيمنى كوڕيەوە هاتووە لە ئەضبەطى باوكيەوە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووى: (ليس منا من لم يرحم صغيرنا ويوقر كبيرنا)،[4] (لە ئێمە نيە هەر كەس سۆزو رەحمى نەبێت بۆ بچووكمان و رێزى گەورەمان نەگرێت)، بەڵام ئيبن حەجەر ناوى باوكى بە جنى هێناوە نەك حويەى.

ئەم فەرموودەيە بە صەحيحى لە چەند هاوەڵێكى ترەوە گێڕدراوەتەوە.

## ١٢٠. ئەعرەج(رضي الله عنه):

ناوى عەبدوڵاى كوڕى ئيسحاقە، هاودەمى پێغەمبەرى خواى(ﷺ) كردووە، جارێك لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بوو كە پێى بريندار بوو، ئيتر پێغەمبەر(ﷺ)

---

[1] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٠٢٥.

[2] أسد الغابة، ج١، ص١٥٦.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ١، ص ٩٤.

[4] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٨٥٣، أسد الغابة، ج١، ص١٥٦، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٩٣.

پێی فەرموو: (أعرج)، بۆیە بەو ناوەوە ناسراوە،[1] ئەعرەج کوڕێکی هەبوو ناوی ئەبان بوو.[2]

## ١٣١. ئەعرەسی کوڕی عەمر(ﭬ):

ئەعرەسی کوڕی عەمری یەشکوری لە بەنی یەشکورە، لە هاوەڵە بەصریەکان ئەژمار ئەکرێت،[3] وەک نوێنەری یەشکریەکان صەدەقەی هۆزەکەی هێناوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری لێکرد تۆ کێیت؟وتی من ئەعرەسی کوڕی عەمرم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بەڵکو تۆ عەبدولاَیت، واتە ناوی نا عەبدولاَ.[4]

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە کە ئەعرەس دەڵێت: دیاریەکم برد بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و ئەویش لێی وەرگرتم و نزای بۆ لەوەڕگاکانمان کرد.[5]

٥

## ١٣٢. ئەعشای مازنی(ﭬ):

ناوی عەبدولاَی کوڕی ئەعوەرەو لە بەنی مازنە، نیشتەجێی بەصرە بوو.

ئەم هاوەڵە ژنێکی هەبوو بە ناوی موعاذە، ئەم خێزانەی بێ بیانوو ئەم مێردەی خۆی جێهێشت، واتە نشوزی بەرامبەر ئەنجامدا، جارێک کە ئەعشا چوویە دەرەوە، موعاذە رایکردو چوو بۆ لای میترەفی کوڕی نەهصەل و داوای کرد پەنای بدات، کاتێک ئەعشا گەڕایەوە بۆ ماڵەوە بینی ژنەکەی لە ماڵەوە نیە، هەواڵی پێدرا کە رایکردووەو نشوزی کردووە و پەنای بدوەتە لای میترەف، ئەعشا چوو بۆ لای میترەف و سەیری کرد ژنەکەی لەوێ نیە چونکە میترەف شاردبوویەوە، ئەعشا پێی وت: ژنەکەمم بۆ بگێڕەوە،

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤، ص٥.

[2] أسدالغابة، ج٣، ص١٧٣.

[3] معرفة الصحابة لابن مندة، ج١، ص٢٠٨.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٩٤.

[5] أسدالغابة، ج١، ص١٥٧، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٩٤.

ئەویش وتی: لای من نیە و ئەگەریش لای من بوایە بۆم نەدەگێڕایتەوە، میترەف بەهێزتر و بەدەسەلاتدارتر بوو لە ئەعشا، ئەعشا هەروا گەڕایەوەو چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و مەسەلەکەی بۆ باسکرد،[1] پێغەمبەر(ﷺ) نامەی نووسی بۆ میترەف و فەرمانی پێکرد ژنەکەی بۆ بگێڕێتەوە، کاتێک میترەف نامەکەی پێ گەیشت و خوێندیەوە، بە موعاذەی وت: ئەوە نامەی پێغەمبەری خوایە و منیش تۆ دەدەمەوە بە ئەعشا، موعاذەش وتی: دەی بەڵێن و پەیمان و پەنای پێەمبەری خوام بۆ وەربگرە تا لەسەر ئەوەی کردوومە سزام نەدات، ئەویش ئەو بەڵێنەی لە ئەعشا وەرگرت ئینجا ژنەکەی دایەوە پێی.[2]

**پەند و وانە:**

گەڕانەوە بۆ لای خوا و پێغەمبەری خوا لە هەموو کێشەکاندا و بڕیارنەدانی پێشوەختە بۆ ڕووداوەکان، چونکە بڕیاری خوا و پێغەمبەری خوا تاکە سەرچاوەی شەریعەتن و نابێ هیچکات لە هیچ مەسەلەیەکدا لەو دوو سەرچاوە دەربچین، هەر ئیجتیهادێکی زانایانیش لەسەر بنەمای ئەو دوو سەرچاوەیە، ئەمە ئەو ڕاستیەیە کە بە درێژایی مێژوو زانایانی ئیسلام (ئەهلی سوننەو جەماعە) بانگەوازیان بۆ کردووە.

بەدەمەوەچوونی کێشەی هاوڵاتی لەلایەن سەرکردەوە بە پەندوەرگرتن لەم نموونەو سەدان نموونەی تری ناو ژیانی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، وەک دەبینین پاش ئەوەی پێشتر جوان گوێی لێگرت، خێرا چارەسەری کێشەکەی ئەعشای کرد، هاوکات میترەفیش لە ئەعشا هەرچەندە بەهێزتر بوو بەڵام مادەم بڕیاری پێغەمبەری خوای لەسەربوو، خێرا ملکەچ بوو و موعاذەشی تێگەیاند کە بەهیچ جۆرێک لەو بڕیارە دەرناچێت.

مەسەلەی نشوز لەلایەن ئافرەتانەوە شتێکی ناڕەواو قەدەغەکراوەو

[1] معجم الصحابة لابن القانع، ج١، ص٦٥-٦٦، الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٤٤.
[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص ٥٣، أسد الغابة، ج١، ص١٥٧- ١٥٨.

خوای گەورەش لە قورئاندا باسی کردووەو چارەسەرەکانیشی بۆ داناوەو وردەکاری حوکمەکانیشی لە قورئان و فەرموودەدا هەن و لە کتێبەکانی فیقهی ئیسلامیدا باسکراون، بۆیە خوێنەر دەتوانێت بۆ وەرگرتنی زانیاری ورد لەو بارەیەوە بگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەکان.

ئەرمونیانی هەڵسوکەوت و جووڵانەوەی نێوان هاوەڵان و ساکاری چارەسەرکردنی کێشەکانی نێوانیان بەدی دەکەین کە چۆن لە ماویەکی کورتدا بە مشتومڕێکی نەرم و قسەو باسی خۆیان دەکەن و بە فەرمانێکی پێغەمبەر(ﷺ) خێرا هەر سێ هاوەڵ ملکەچی بڕیارەکەی دەبن و کێشەکەی نێوانیان چارەسەر دەبێت.

## ١٢٣. ئەعوەری کوڕی بەشامە(رضي الله عنه):

ناوی ئەعوەری کوڕی بەشامەی عەنبەریە، دەشوترێ ناوی ناشبە و ئەعوەر نازناوە، بەلام بەپێی گێڕانەوەکان کە لەبارەیەوە هاتووە ناوی بە ئەعوەر هاتووە، لە عەنبەریەکانە، لەبەر بوونی کێشەیەک چووە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وەک نوێنەری عەنبەریەکان لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) قسەی کردووە.[1]

لەگەڵ هەریەک لە وردانی کوڕی مەخرەمەو رەبیعەی کوڕی رەفیع چووە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، چونکە عەنبەریەکان کێشەیەکیان هەبوو و دەبوو لە خزمەت پێغەمبەری خوادا چارەسەری بکەن.[2]

ئەعوەر خوشکێکی هەبوو ناوی صەفیە بوو کە بە سەبی گیرا، پێغەمبەر(ﷺ) سەرپشکی کرد لای ئەو بمێنێتەوە یان بگەڕێتەوە، ئەویش گەڕانەوەی هەڵبژارد، پێغەمبەریش(ﷺ) رازی بوو.[3]

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٩٥.

[2] أسد الغابة، ج١، ص١٥٨.

[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ١٥٤.

بەنی عەنبەر کەسێکیان کوشتبوو، بۆیە ناچار پەنایان بردە لای خوزاعە کە خاڵۆزایان بوون، پێغەمبەر(ﷺ) نوێنەری خۆی نارد بۆ لای خوزاعە تا صەدەقەکەیان بدەن، ئەوانیش صەدەقەی خۆیان دا، بەڵام عەنبەریەکان صەدەقەی خۆیان نەدا، پێغەمبەر(ﷺ) سەدو پەنجا کەسی بە سەرکردایەتی عویەینەی کوڕی حصن نارد، ئەو سوپایە نۆ پیاو و یانزە ئافرەت و منداڵی گرت و گەڕایەوە.

کاتێک عەنبەریەکان ئەوەیان بیست حەفتا کەسیان کەوتنەڕێ و چوون بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، لە نێویاندا ئەعوەریش چووبوو کە تەمەنی لە هەموویان کەمتر بوو، کە گەیشتنە مەدینە و ژن و منداڵەکانیان بینین چوونە بەردەم ماڵی پێغەمبەر(ﷺ) و هاواریان دەکرد ئەی موحەممەد چۆن منداڵانمان بەسەبی دەگریت لە کاتێکدا ئێمە لە پەیمانت دەرنەچوین، پێغەمبەر(ﷺ) چوویەدەرەوە بۆ لایان و فەرمووی: کەسێ وەک دادوەر دابنێن لە نیوان من و ئێوەدا، (واتە کەسێکتان وەک نوێنەریان قسە بکات)، ئەوانیش وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە ئەعوەری کوڕی بەشامە دادەنێین، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بەڵکو عەمری گەورەتان، ئەوانیش وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە ئەعوەری کوڕی بەشامە دیاری دەکەین، پێغەمبەر(ﷺ) رازی بوو تا حوکم بدات، ئەویش بڕیاری دا نیوەیان بە کڕینەوە ئازاد بکرێن واتە فیدیەیان بدرێت و نیوەشیان ئازاد بکرێن.[1]

لە گێڕانەوەیەکدا هاتوە کاتێک چوونە بەردەم ماڵی پێغەمبەر(ﷺ) ئەو لە ژوورەوە خەوتبوو و لەو کاتەشدا عویەینە ژن و منداڵەکانی ئەوانی هێنا، عەنبەریەکان وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا بۆچی بە سەبی گیراوین لەکاتێکدا ئێمە موسڵمانین؟ ئەویش فەرمووی: سوێند بخۆن بە موسڵمانی هاتون، هەریەک لە ئەعوەر و وردان بێدەنگ بوون، بەلام رەبیعە وتی: من سوێند دەخۆم ئەی پێغەمبەری خوا نەهاتوین تا پێشتر چوین بۆ مزگەوتەکەمان

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٩٥.

(واتـه نوێژمـان کـردووه)و زەکاتـی سـامانمان جیاکردوەتـەوەو بـە موسـڵمانی هاتویـن، پێغەمبەریـش(ﷺ) فەرمـووی: (اذهبوا عفا الله عنكم)، (بـڕۆن خـوا لێتـان خـۆش بـێ).[1]

بـەڵام راجیایی هەیـە ئایا هاوەڵـە یـان نـا، چونکە وەک خانـەدان و نێردراو نـاوی هاتـووەو راشـکاوانە نەهاتـووە وەک هـاوەڵ بـاس بکرێ، هەروەهـا بەپێی ئەو فەرمـوودەی پێشـوو کە هاتـووە گومـان دروسـت دەبێت ئایا هـاوەڵ بـووە یـان نـا کاتێـک پێغەمبـەر(ﷺ) داوای کـرد سـوێند بخـۆن ئەعـوەر سـوێندی نەخـوارد، بـەڵام ئـەوەش کـە رەبیعـە بـە نـاوی ئەوانیشـەوە سـوێندی خـوارد و بەسـەرهاتی موسـڵمانی خۆیانی خسـتەڕوو و ئەوانیش بێدەنگ بـوون واتـە رازی بـوون دەبێتـە بەڵگـەی موسـڵمابوونیان.

## ١٢٤. ئـەغەری(ﷺ):

زانیـاری ورد لەسـەر ئـەم هاوەڵـە نیە تەنها هێندە نەبێت کە فەرموودەیەکی گێڕاوەتـەوە، ئـەم هاوەڵـە غیفاریـە، هەرچەنـدە هەنـدێ بـە ئەغـەری موزەنـی دێنـن و پێیـان وایـە ئـەم ئەغـەرەو ئـەوەش هـەر یەکن، بـەڵام ئەمـە هاوەڵێکی تـرە، فەرموودەیەکی گێڕاوەتـەوە کـە پێغەمبـەر(ﷺ) نوێـژی بەیانـی کـرد بـۆ هاوەڵانـی و تیایـدا سـوورەتی (الـروم)ی خوێنـد.[2]

## ١٢٥. ئـەغەری موزەنـی(ﷺ):

نـاوی ئەغـەری کـوڕی یەسـاری موزەنیـە، هەروەهـا هاتـووە جوهەنیـە، لـە نێـو هاوەڵانـی نیشـتەجێی کووفـەدا نـاوی هاتـووە،[3] فەرمـوودەی لـە پێغەمبـەری خـواوە(ﷺ) گێڕاوەتـەوە، لەوانـە دەگێڕێتـەوە کەسـێک هـات وتـی:

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص١٥٨.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٩٧.
[3] أسد الغابة،ج١، ص١٦٠.

ئەی پێغەمبەری خوا من بەیانیم کردەوە کەچی ویتری شەوم نەکردووە، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی (إنما الوتر بالليل أعادها ثلاثا أو أربعا، قم فأوتر)، (ویتر تەنها بە شەوە، سێ یان چوار جار دووبارەی کردەوە، پاشان فەرمووی: هەستە و ویتر بکە).[1]

هەروەها فەرموودەیەکی تری گێڕاوەتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت (يا أيها الناس توبوا إلى الله فإني أتوب في اليوم مائة مرة).[2](ئەی خەڵکینە تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای خوا چونکە من لە یەک ڕۆژدا سەدجار تەوبە دەکەم).

ڕاجیایی هەیە سەبارەت بە ئەغەرەکان، هەیانە بە سێ کەسایەتی جیا دەیانهێنێت، ئەغەری موزەنی و ئەغەری جوهەنی و ئەغەرێکی تر، ئەمەش ڕای ئیبن مندەیە، هەیە هەر سێیان بە یەک دەزانێت کە ئەمەش ڕای ئەبوونوعەیمە، هەیە بە دوانیان دەزانێت، ئەغەری پێشوو، هەروەها ئەغەری موزەنی و جوهەنی بەیەک دەزانێت، ئیبن ئەثیر پێی وایە ڕاکەی ئەبوونوعەیم نەگونجاوە، بەڵام ڕای ئەوەی دوان بن یان سیان بن هەردووکیان ئەگەریان هەیە.[3]

**پەند و وانە:**

گرنگیدانی هاوەڵان بە سوننەتەکان هێندە زۆر بووە کە ئەگەر جارێک سوننەتێکیان لەبیر بچوایە دەبوو بە خەفەتیان و هەوڵیان دەدا بەدیل یان قەرەبوو بدۆزنەوە بۆ ئەو لەدەست چوونەیان، وەک دەبینین ئەم هاوەڵە بە لەدەستچوونی نوێژێکی ویتر چۆن پەژارە دایدەگرێت و هەوڵ دەدات چارەسەری قەرەبووکردنەوەی بزانێت، هاوکات پابەندی تەواوی هاوەڵان نیشان دەدات بۆ گەڕانەوەیان بۆ لای خواو پێغەمبەری خوا لە هەر مەسەلەیەکدا، دەبینین خێرا باسەکەی بردەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا نەک بە عەقڵی خۆی یان لەسەر بنەمای سۆز یان نیەتی خۆی بڕیار بدات.

---

[1] السنن الكبرى للبيهقي – كتاب الصلاة – جماع أبواب صلاة التطوع وقيام شهر رمضان – باب من أصبح ولم يوتر فليوتر ما بينه وبين أن يصلي الصبح، الرقم ٤٥٩٤، حسنه الألباني في السلسلة الصحيحة، الرقم ١٧١٢.

[2] صحيح مسلم – كتاب الذكر والدعاء والتوبة والاستغفار – باب استحباب الاستغفار والاستكثار منه، الرقم ٢٧٠٢.

[3] أسد الغابة،ج١، ص١٦١.

مەسەلەی نوێژی ویتر سوننەتێکی جەخت لێکراوەیە و خودی پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵانی هەمیشە لەبیریان بووەو نەیانهێشتووە لە کیسیان بچێت، چەندین فەرموودەش لەسەر فەزڵ و گەورەیی ویتر هاتووە، لەوانە ئەبوو هورەیرە دەڵێت: خۆشەویستم پێغەمبەر(ﷺ) وەسیەتی بۆ کرد بە سێ شت، رۆژووی سێ رۆژ لە هەموو مانگێک، وە دوو رکاتی چێشتنگا، وە پێش ئەوەی بنووم ویتر بکەم).[1] چەندین فەرموودەی تریش لەو بارەوە هەن، هەروەها چاکترین کات بۆ نوێژی ویتر کۆتاییەکانی شەوە، ئەگەریش کەسێک نوێژی ویتری بە شەو فەوتا ئەوە رێژەیەک لە زانایان رێیان داوە لە بەیانیەکەیدا لە کاتی چێشتنگادا بگێردرێتەوە، گێرانەوەکەشی بە تاک نەبێت بەڵکو بە دوو رکاتی دەبێت.

بەداخەوە گرنگیدان بە نوێژە سوننەتەکان و لەنێویاندا نوێژی ویتر کە گەورەی نوێژە سوننەتەکانە لەنێو موسڵمانانندا زۆر کزبووە، بەجۆرێ زۆرجار کەسانێ بیانەوێت ئەو نوێژە بکەن پرسیار دەکەن لەسەری، واتە هێندە ئەو نوێژەیان نەکردووە کە حوکم و تایبەتمەندیەکانی نازانن، ئەمەش دڵگرانیەکی گەورەیە، چونکە چەندین فەرموودەی صەحیح تایبەت بەو نوێژە هاتون و هیچ گومان لەوەدا نیە کە پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵان هیچ کات دەستبەرداری ئەو نوێژە نەبون.

ئیبن تەیمیە سەبارەت بە ویتر دەڵێت: (ویتر لە سوننەتی نیوەڕۆو ئێوارەو عیشا زیاتر جەختی لێ کراوەتەوە، ویتر لە هەموو نوێژە سوننەتەکانی رۆژ گەورەترە وەک نوێژی چێشتنگا، بەڵکو گەورەترین نوێژ دوای نوێژە فەرزەکان نوێژەکانی شەون، جەخت لێکراوەترینی ئەوانەش نوێژی ویتر و دوو رکات نوێژی پێش نوێژی بەیانییە).[2]

تەوبەکردن و گەڕانەوە بۆ لای خوای گەورە ئەرکی سەرشانی هەموو

---

[1] صحيح البخاري - أبواب التهجد - باب صلاة الضحى في الحضر، الرقم ١١٧٨.

[2] مجموع الفتاوى لابن تيمية، ج٢٣، ص ٨٨.

کەسێکەو پێشەنگمان لەوەدا پێغەمبەری خوایە کە هەرچەندە خوای گەورە مزگێنی لێخۆشبوونی پێبەخشیبوو کەچی رۆژانە زیاد لە حەفتا جار یان سەد جار تەوبەی دەکرد، خوای گەورەش لە قورئانی پیرۆزدا لە زۆر شوێندا فەرمانی پێ کردوین بگەڕێینەوە بۆ لای خوا و تەوبە بکەین، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت (والذي نفسي بيده لو لم تذنبوا لذهب الله بكم ولجاء بقوم يذنبون فيستغفرون الله فيغفر لهم)،[1] (سوێند بەوەی گیانمی بە دەستە ئەگەر تاوانتان نەکردایە ئەوا خوا ئێوەی لادەبرد و بە دڵنیاییەوە خەڵکێکی دەهێنا تاوانیان بکردایە و ئینجا داوای لێخۆشبوونیان لە خوا بکردایە و خواش لێیان خۆش دەبوو)، هیچ سنوورێکیش نیە بۆ لێخۆشبوونی خوای گەورە و بێهیوابوون لە خوای گەورە تاوانە، خوا دەفەرموێت (قُلْ يا عِبادِيَ الذِين أسْرَفُوا على أنفُسِهِمْ لا تقْنطُوا مِن رحْمةِ اللهِ إن الله يغْفِرُ الذنُوب جمِيعا إِنهُ هُو الْغفُورُ الرحِيمُ).[2]

## ١٣٦. ئەفطەس(رضي الله عنه):

هیچ زانیاریەک لەسەر ژیانی نەهاتووە، تەنها هێندە نەبێت کە ئیبراهیمی کوڕی ئەبی عەبلە دەڵێت: گەیشتم بە یەکێک لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) کە پێی دەوترا ئەفطەس.[3]

## ١٣٧. ئەفلەح(رضي الله عنه):

ئەم هاوەڵە مامی شیری دایکی باوەڕداران عائیشەیە، دەشوترێ بەڵکو برای ئەبولقوعەیسە، یان دەوترێ ئەبولقوعەیس کونیەی بووە،[4] رایەکیش هەیە دەڵێت: کونیەکەی ئەبولجەعد بووە،[5] ئیبن ئەثیر پێی وایە راستتر وایە

[1] صحيح مسلم – كتاب التوبة – باب سقوط الذنوب بالاستغفار توبة، الرقم ٢٧٤٩.
[2] الزمر: ٥٣.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٩٩.
[4] أسد الغابة، ج١، ص١٦٢.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٩٩.

برای ئەبولقوعەیس بووە،[1] بەڵام لە موسنەدی ئەحمەدی کوڕی حەنبەلدا کە فەرموودەکەی تایبەت بەم هاوەڵە هێناوە بە ئەبولقوعەیس ناوی هێناوە.[2]

پاش ئەوەی ئایەتی حیجاب دابەزی بۆ سەر خێزانەکانی پێغەمبەر(ﷺ)، ئەفلەح جارێک چوو بۆ لای دایکی باوەڕداران عائیشە، بەڵام دایکی باوەڕداران عائیشە مۆڵەتی پێنەدا بچێتە ژوورەوە، ئەویش وتی: خۆ من مامی تۆم، دواتر کە پێغەمبەر(ﷺ) هاتەوە عائیشە مەسەلەکەی باس کرد بۆی، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمانی پێکرد کە مۆڵەتی بدات.[3]

لە صەحیحی بوخاریدا فەرموودەکە وا هاتووە کە ئەفلەح پێی وت: ڕێم پێ نادەیت لە کاتێکدا من مامی تۆم؟ ئەویش وتی: چۆن؟ ئەفلەح وتی: براژنەکەم شیری داوە بە تۆ، عائیشەش ئەوەی باسکرد بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش فەرمووی: (صدق أفلح ائذني له)،[4] ئەفلەح ڕاست دەکات مۆڵەتی بدە.

ئەمە ئاماژەیە بەوپەڕی گوێڕایەڵی دایکی باوەڕداران عائیشە بۆ پێغەمبەری خوا و دەستپێشخەری نەکردن لە بڕیاردا تا دڵنیا بێت لە بڕیاری خوا و پێغەمبەری خوا، وەک خوای گەورە فەرمان دەکات بە باوەڕداران (يا أيها الذين آمنُوا لا تُقدمُوا بيْن يديِ اللهِ ورسُولِهِ واتقُوا الله إن الله سمِيعٌ علِيمٌ)،[5] هەروەک نیشانەی ئەوپەڕی داوێن پاکی ئەو ژنەیە بە جۆرێ تەنانەت بۆ مامیشی ڕێی نەداوە بێت مادەم ئایەتی خوا دابەزیوە و ئەویش دڵنیا نەبووە ئایا ئەو ئایەتە ئەو مامە شیریەشی دەگرێتەوە یان نا، بۆیە نمونەی ئەم جۆرە گێڕانەوانە دەبنە ئازار و دڵگرانی بۆ ناحەزانی دایکی باوەڕداران عائیشەی کچی ئەبووبەکر، لە لایەکەوە لەبەر ئەوەی گوێڕایەڵی و پاک داوێنی ئەو ئافرەتە نیشان دەدات، لەلایەکی ترەوە لەبەرئەوەی باسی نزیکی ئەو دەکات

[1] أسد الغابة، ج١، ص١٦٢.
[2] مسند أحمد بن حنبل - مسند عائشة(ﷺ)، الرقم ٢٦٢٩٠.
[3] أسد الغابة، ج١، ص١٦٢.
[4] صحيح البخاري - كتاب الشهادات - باب الشهادة على الأنساب والرضاع المستفيض، الرقم ٢٦٤٤.
[5] الحجرات: ١.

لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ)، هەورەها ئەوان تەنها بە بیستنی ناوی قەڵس دەبن بۆیە کە بەمجۆەش ناوی بخوێننەوە هێندەی تر قەڵس دەبن.

## ١٣٨. ئەفلەح(رضي الله عنه):

ئەم هاوەڵە مەولای بەنی عەبدودار بووەو کونیەکەی ئەبوو فوکەیهەیە، دەشوترێ مەولای صەفوانی کوڕی ئومەییە بووە، هەروەها رایەک هەیە پێی وایە ناوی یەسار بووە، بەڵام زیاتر بە کونیەکەی ناسراو بووە، لە قۆناغی مەککەدا موسڵمان بووەو لە سەر موسڵمان بوونەکەشی ئازارو ئەشکەنجەی زۆر دراوە.[1]

سەبارەت بە رەچەڵەکی ئەفلەح هاتووە کە جوهەمی بووە، دەشوترێ بەڵکو بە بنەڕەت ئەزدی بووە، دەشوترێ دەدرێتەوە پاڵ ئەشعەریەکان.[2]

بەنی عەبدودار لە گەرمای هاویندا دەیانبردە دەرەوەو بە کۆتێکی ئاسنین دەیانبەستەوەو ئازاریان دەدا تا تەواو گەرمای بێت، ئینجا بەردی گەورەیان دەخستە سەر پشتی تا واز بێنێ لە ئیسلام، لەتاو ئازار لە هۆش خۆی دەچوو، حاڵی بەوجۆرە بوو تا موسڵمانان کۆچیان کرد بۆ حەبەشە، لە کۆچی دووەمی حەبەشەدا ئەویش لەگەڵ موسڵماناندا چوو بۆ حەبەشە.[3]

ئیبن حەجەر بەسەرهاتی رزگاربوونەکەی وا هێناوە کە جارێک ئومەییەی کوڕی خەلەف ئازاری ئەبوو فوکەیهەی دەداو بە پەتێک بەستبوویەوەو رایدەکێشاو خستبوویە سەر زەویەکی رووتەلانی زۆر گەرمەوەو دەستی خستبوویە قوڕگیەوە، کاتێک ئوبەی کوڕی خەلەف کە برای ئومەییە بوو تێپەڕ بوو و ئەوی بینی و هانی دا تا زیاتر ئازاری بدات، ئەویش هێندە بەردەوام بوو تا وایزانی مردووە، لەو کاتەدا ئەبووبەکری صدیق بەوێدا

---

[1] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٤، ص١٧٣٠.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٣٢٢.

[3] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٤، ص١٧٣٠، الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص١٢٣.

تێپەڕ بوو و بینی و ئەوی لە ئومەییە کڕییەوە.[1]

ئەم هاوەڵە لەگەڵ ژمارەیەکی تری هاوەڵە لاوازەکان وەک خەبباب و عەممار کۆدەبوونەوەو لە مەجلیسی پێغەمبەر(ﷺ) دادەنیشتن، کاتێک بێباوەڕان دەیانبینی پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ ئەوانەدا دانیشتووە کە بڕێ کۆیلە و کەسی لاواز و بێدەسەلات بون، لەسەر ئەوان گاڵتەیان پێ دەکرد، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) گوێی نەدەدا بە گەمژەیی بێباوەڕان، بێباوەڕەکان دەیانوت ئەگەر ئەوەی موحەممەد هێناویەتی چاک و باش بوایە ئەوانە پێش ئێمە نەدەکەوتن بۆ وەرگرتنی، خوای گەورەش ئەم ئایەتانەی دابەزاند(ولا تطرد الذين يدعون ربهم بالغداة والعشي يريدون وجهه ما عليك من حسابهم من شيء وما من حسابك عليهم من شيء فتطردهم فتكون من الظالمين وكذلك فتنا بعضهم ببعض ليقولوا أهؤلاء من الله عليهم من بيننا أليس الله بأعلم بالشاكرين وإذا جاءك الذين يؤمنون بآياتنا فقل سلام عليكم كتب ربكم على نفسه الرحمة أنه من عمل منكم سوءا بجهالة ثم تاب من بعده وأصلح فأنه غفور رحيم).[2]

ئیبن سەعد هێناویەتی کە دەستەیەک لە هاوەڵان هێندە ئازار دەدران تا نەیاندەزانی چی قسەیەک دەکەن، هەر لەسەر ئەوانە ئەم ئایەتەی خوا دابەزی (والذين هاجروا في الله من بعد ما فتنوا).[3]

ئەم هاوەڵە دواتر کۆچی کرد بۆ مەدینە، چونکە باسکراوە ئەهلی صوففە بووە،[4] ئەهلی صوففەش لە مەدینە لە مزگەوتی پێغەمبەر(ﷺ) بوون.

**پەند و وانە:**

هیچ کات پلەو پایەی کۆمەڵایەتی یان دەسەڵات یان روخسار لای خوای گەورە نابێتە پێوەر بۆ گەورەیی و ڕێزداری وەک پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٣٢٢.

[2] البداية و النهاية لابن كثير، ج٣، ص١٠٤.

[3] الطبقات الكبرى لاب سعد، ج٣، ص٢٤٨.

[4] حلية الأولياء، ج٢، ص٢٤.

(ألا أخبركم بأهل الجنة؟ كل ضعيف متضعف، لو أقسم على الله لأبره)،[1] (ئایا پێتان بڵێم له دارودەستەی بەهەشت کێن، هەموو لاوازێکی لاوازکراو کە ئەگەر سوێندی خوا بدات واتە سوێند بخوات خوا شتێکی بۆ بکات ئەوە خوا سوێندەکەی دێنێتەدی و نایخات)، هەرچەندە ئەفلەح و هاوەڵەکانی تری لە رووی کۆمەلایەتیەوە بە کۆیلە تەماشا دەکران و بێ کەس سەیر دەکران، بەلام هێندە گەورەبوون کە خوای گەورە ئایەتی قورئانی دابەزاند بۆ پشتگیری ئەوان، پێغەمبەری خوایش لە کۆڕ و مەجلیسی ئەواندا دادەنیشت و دڵی بەوان دەکرایەوە، ئیتر چ رێزێ زیاترو گەورەتر لەوە.

زۆر گرنگە لە هەنگاوی بانگەوازی تاک یان دەستە یان رەوەندی بانگخوازیدا ئەو خاڵە لەبەرچاو بگیرێت کە بانگەواز پەیوەست نیە بە ئاستی کۆمەلایەتیەوە، بەڵێ جێی خۆشحاڵییە ئەگەر زانایەکی بێباوەڕان یان دەسەلاتدارێک یان کەسێکی ناسراویان موسڵمان بێت، بەلام هیچ کات ئەوە لە پێشتر نیە لە موسڵمان بوونی کرێکارێ یان خوێندکارێ یان لانەوازێکی بێباوەڕ، چونکە هەرکام لەوانە لای خوای گەورە بەندەن و پێدەچێت ئەو پاکیەی لە موسڵمانبوونی کرێکارێ یان کۆیلەیەکی بێباوەڕدا هەبێ لە کەسایەتیەکی گەورەدا نەبێت، وەک دەبینین هەندێ لەو کەسە دیارانەی موسڵمان دەبن بە تەواوی واتا ئەم ئایەتە دەیانگرێتەوە (يمنون عليك أن أسلموا قل لا تمنوا علي إسلامكم بل الله يمن عليكم أن هداكم للإيمان).[2]

## ١٣٩. ئەفلەحی مەولای ئوموسەلەمە (رضي الله عنها):

ئەم هاوەڵە خزمەتکاری ئوموسەلەمە بووە، ئوموسەلەمە دەگێڕێتەوە کە مەولایەکمان هەبوو پێی دەوترا ئەفلەح، کاتێک دەچوو بە سوجدەدا پێشتر

---

[1] صحيح البخاري - كتاب تفسير القرآن - سورة ن والقلم - باب عتل بعد ذلك زنيم، الرقم ٤٩١٨.

[2] الحجرات: ١٧.

فووی دەکرد تا خۆڵەکە لابچێت، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: (ترب وجهك)،[1] (با دەموچاوت خۆڵی بەربکەوێ).

بەڵام لە کتێبەکانی فەرموودەدا ناوی ئەم هاوەڵە بە رەباح هاتووە هەرچەندە ترمذی بە هەردووکیان هێناویەتی، ئیبن ئەثیر بە جیا هەردووکیانی هێناوە،[2] واتە دوو هاوەڵی جیاواز بن و هەردووکیان ئەم فەرموودەیان لەسەر بێت.

## ١٣٠. ئەقرەعی کوڕی حابس(ﷺ):

ناوی ئەقرەعی کوڕی حابسی کوڕی عقالی تەمیمی مەجاشعی دارەمیە،[3] رایەکیش هەیە دەڵێت: ناوی حابس بووە بەڵام بە ئەقرەع ناسراوە،[4] مامی فەرەزدەقی شاعیر بوو،[5] لە خاکی بەنی تەمیم لە ناوچەی بەصرە نیشتەجێ بوو.[6]

لە سەردەمانی پێش موسڵمان بوونیدا یەکێک بوو لە کەسە دیارو خانەدانەکان و لەناو هۆزی خۆیدا قسە رۆیشتوو بووە، بگرە لە سەردەمی جاهیلیدا دەسەڵاتدار بوو.[7]

لە مەککەدا جارێک ئەقرەع لە گەڵ عویەینە تێپەڕ دەبوون، سەیریان کرد پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ عەممار و صوهەیبو بیلال و خەبباب و چەند موسڵمانێکی تری لاوازدا دانیشتووە، ئەوانیش گاڵتەیان پێکرد و دەیانوت کە وەفدی عەرەب دێن شەرم دەکەین بمانبینن لەگەڵ ئەوانەدا دانیشتبیت، ئەگەر هاتین بۆ لات تۆ ئەوانە دەرکە، پێغەمبەریش(ﷺ) رازی بوو، ئەوانیش

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص١٦٣.
[2] أسد الغابة، ج١، ص ١٦٣، ج٢، ص٢٤٠.
[3] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٠٣.
[4] أسد الغابة، ج١، ص١٦٦.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٠٢.
[6] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص٣٧.
[7] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٠١.

وتیـان: دەی بەڵێنێکمـان بـۆ بنووسـە، ئەویـش ویسـتی بینووسـێت و عەلـی کوڕی ئەبوو طالیبی بانگ کرد تـا بینووسێت، ئەوەبوو جبریل هـات و ئـەم ئایەتـەی خـوای بـۆ هێنـا (ولا تطرد الذين يدعون ربهم بالغداة والعشي يريدون وجهه ما عليك من حسابهم من شئ وما من حسابك عليهم من شئ فتطردهم فتكون من الظالمين وكذلك فتنا بعضهم ببعض ليقولوا أهؤلاء من الله عليهم من بيننا أليس الله بأعلم بالشاكرين)، پێغەمبـەر(ﷺ) وەرەقەکـەی فـڕێ داو ئـەو هاوەڵانـەی بانـگ کـردەوەو پێـی فەرمـوون (سـلام علیکـم)، ئەوانیـش لێـی نزیـک بوونـەوە.[1]

کاتێک وەفدی تەمیم هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) ئەقرەعیش لەگەڵ وەفدەکەدا بـوو، کـە گەیشـتنە مەدینـە ئەقـرەع هـاواری دەکـرد ئـەی موحەممـەد وەسـف و سـەنام جوانـە و سـەرکۆنەو لـەدژ خوێندنیشـم زۆر خراپـە، پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمـووی: (ذلكم الله سبحانه)، لـە گێڕانـەوەی تـردا هاتـووە کـە هەمـوو وەفدەکـە پێکـەوە هاواریـان دەکـرد و ئەوەیـان دەوت، پێغەمبەریـش(ﷺ) هاتـە دەرەوە بـۆ لایـان و فەرمـووی: (ذلكم الله فما تريدون). ئەوانیـش وتیـان: ئێمـە خەڵکێکیـن لـە بەنـو تەمیـم بـە شـاعیرو وتاربێژمانـەوە هاتویـن تـا لـە بەرامبـەرت شـیعر بڵێیـن و فەخـر بنوێنین، پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمـووی: (ما بالشعر بعثنا ولا بالفخار أمرنا ولكن هاتوا)، (ئێمـە بە شـیعر نەنێرداویـن و فەرمانمـان پـێ نەکراوە فەخـر بکەیـن بـەڵام ئـادەی)، ئەقرەعیش بـە یەکێک لـە گەنجەکانی وت: فڵانـە کـەس هەسـتە و باسـی فەزڵی خـۆت و هـۆزەکـەت بکـە، ئەویـش وتارێکی دا و وتـی: سـوپاس بـۆ خوایـەک کـە ئێمـەی کردۆتـە چاکترین دروسـتکراوی و سـامانی پـێ بەخشـیوین تـا چیمـان بوێـت پێـی بکەیـن، جـا ئێمـە چاکتریـن کەسـانی سـەرزەوین، لـە هەمـوان زۆرترین و زیاترین چەکیشـمان هەیە، هەرکـەس نکوڵـی ئـەو قسـەمان دەکات بـا هەسـتێت و قسـەیەکی باشـتر لـەوەی ئێمـەو کارێکی باشـتر لـە کاری ئێمـە نیشـان بـدات، پێغەمبەریـش(ﷺ) بـە ثابیتـی کـوڕی قەیسـی ئەنصـاری فەرمـوو: وتاربێژی فەرمـوو: هەسـتەو وەڵامـی بدەرەوە، ئەویـش هەسـتاو لـە

[1] حلية الأولياء، ١، ص١٤٧، البداية والنهاية، ج٦، ص٥٧.

وەڵامیدا وتی: سوپاس بۆ خوا، سوپاسی دەکەم و پشتی پێ دەبەستم و بڕوام پێی هەیە و پشتم بەو بەستووەو شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێ نیە جگە لە خوای تاک وتەنهای بێ هاوەڵ، شایەتی دەدەم موحەممەد بەندەو نێردراوی خوایە، کۆچەرانی ئامۆزای خۆی بانگ کرد کە چاکترین و دیارترینی کەسان بوون و ئەوانیش چوون بەدەم داواکەیەوە، سوپاس بۆ خوا کە ئێمەشی کردە پشتیوان و وەزیرانی پێغەمبەرەکەی و مایەی شکۆمەندی بۆ ئایینەکەی، ئێمە لەگەڵ خەڵک دەجەنگین تا کاتێک شایەتی دەدەن هیچ پەرستراوێ نیە جگە لە خوا، هەرکەس ئەوەی وت: گیان وماڵی لێمان حەرام دەبێت، هەرکەسیش وانەکات لەگەڵی دەجەنگین و لەبەرخوا لامان سووک و بێ بایەخ دەبێت، ئەمە دەڵێم و داوای لێخۆشبوون لای خوا دەکەم بۆ هەموو باوەڕداران چ پیاوان و چ ئافرەتانیان، پاشان زوبرقانی کوڕی بەدر هەستاو بە یەکێک لە کەسەکانی خۆیانی وت: ئادەی هەستە و چەند دێڕە شیعرێ بڵێ کە تیایدا فەزڵی خۆت و هۆزەکەت باس بکەیت، ئەویش هەستاو ئەم شیعرەی وت:

نحن الكرام فلا حي يعادلنا... نحن الرؤوس وفينا يقسم الربع

ونطعم الناس عند المحل كلهم... من السديف إذا لم يؤنس القزع

إذا أبينا فلا يأبى لنا أحد... إنا كذلك عند الفخر نرتفع

پێغەمبەریش(ﷺ) داوای حەسانی کوڕی ثابتی کرد و ئەویش هات پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێکرد وەڵامی بداتەوە، ئەویش لە وەڵامیاندا وتی:

نصرنا رسول الله والدين عنوة... على رغم عات من معد وحاضر

بضرب كإبزاغ المخاض مشاشه... وطعن كأفواه اللقاح الصوادر

وسل أحدا يوم استقلت شعابه... بضرب لنا مثل الليوث الخوادر

ألسنا نخوض الموت في حومة الوغى... إذا طاب ورد الموت بين العساكر

ونضرب هام الدارعين وننتمي... إلى حسب من جذم غسان قاهر

فأحياؤنا من خير من وطئ الحصى... وأمواتنا من خير أهل المقابر

فلولا حياء الله قلنا تكرما... على الناس بالخيفين هل من منافر

ئەقرەع هەستاو وتی: ئەی موحەممەد سوێند بەخوا ئەوەی من بۆی هاتوم جیایە لەوەی ئەمانە بۆی هاتون، من شیعرێکم وتووە گوێی بۆ بگرە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئادەی، ئەویش وتی:

أتيناك كيما يعرف الناس فضلنا... إذا خالفونا عند ذكر المكارم

وأنا رؤوس الناس من كل معسر... وأن ليس في أرض الحجاز كدارم

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: حەسسان هەستە وەڵامی بدەرەوە، ئەویش وا وەڵامی دایەوە:

بني دارم لا تفخروا إن فخركم... يعود وبالا عند ذكر المكارم

هبلتم علينا تفخرون وأنتم... لنا خول من بين ظئر وخادم

ئەقرەع هەستاو وتی: ئەی خزمینە نازانم بۆ وایە، وتاربێژیان لە ئێمە بەهێزتر و شاعیریان لە ئێمە چاکترە، دواتر نزیک بوویەوە لە پێغەمبەر(ﷺ) و شایەتومانی هێنا، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (لا يضرك ما كان قبل هذا)، (چی پێش ئەمە روویداوە زیانت پێ ناگەیەنێت). ئەم ئایەتەش لەسەر بەنی تەمیم دابەزی (إن الذين ينادونك من وراء الحجرات أكثرهم لا يعقلون)،[1] دواتر هەموویان موسڵمان بون و ماوەیەک لە مەدینە مانەوە تا فێری قورئان و ئایین ببن، دواتر کە ویستیان بگەڕێنەوە پێغەمبەر(ﷺ) جلو بەرگ و بەخششی پێ بەخشین.[2]

ئەقرەعی کوڕی حابیس لە هەریەک لە غەزاکانی فەتحی مەککەو حونەین و تائیفدا لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بەشداری غەزای کرد.[3]

بۆیەدەکرێت بڵێین موسڵمانبوونی ئەقرەع پێش فەتحی مەککە بووە،

---

(١) الحجرات: ٤.

(٢) أسد الغابة، ج١، ص١٦٤-١٦٦.

(٣) الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٠١.

چونکە بەشدار بووە لە فەتحی مەککەدا، ئەو کاتەش کە وەک ئەندامێکی ناو وەفدەکەی بەنی تەمیم دوای فەتحی مەککە چووە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) بە موسڵمانی چووەو لەوێدا هۆزەکەی موسڵمان بون.

ئیبن سەعد هێناویەتی لە دەستکەوتەکانی غەزای خەیبەردا پێغەمبەر(ﷺ) سەد وشتری بەخشی بە ئەقرەع،[1] ئیبن عەبدولبەر هێناویەتی کە لە حونەیندا ئەوەی پێ بەخشیوە،[2] لە صەحیحی بوخاریشدا وا هاتووە،[3] ئەمەشیان راستە چونکە ئەقرەع بەشداری حونەینی کرد.

کاتێک عەلی کوڕی ئەبووطالیب زێڕی یەمەنی نارد بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش دابەشی کرد بەسەر چوار کەسدا، یەکێک لەو چوار کەسە ئرەقەعی کوڕی حابیس بوو.[4]

جارێک کە کاروانێکی بەنی تەمیم هاتبوون بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، ئەبووبەکری صدیق وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) قەعقاعی کوڕی میعبەد بکە بە ئەمیر، عومەریش وتی: بەڵکو ئەقرەعی کوڕی حابیس بکە بە ئەمیر، ئەبووبەکر وتی: ئەتەوێ عینادی من بکەیت، عومەریش وتی: مەبەستم عینادی تۆ نیە، وا دەمەبۆڵەیان بوو تا دەنگیان لەیەک بەرزکردەوە، لەم باەیەوە خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند(یا أیها الذین ءامنوا لا تقدموا بین یدي اللە و رسوله).[5]

جارێک ئەقرەعی کوڕی حابیس لای پێغەمبەر(ﷺ) بوو، سەیری کرد پێغەمبەر(ﷺ) حەسەنی کوڕی عەلی ماچ کرد، ئەقرەع وتی: من دە منداڵم هەیە هێشتا یەکێکیانم ماچ نەکردووە، پێغەمبەر(ﷺ) سەیری کرد و پاشان

---

[1] الطبقات الکبری لابن سعد، ج٤، ص٢٤٦.

[2] الإستیعاب في معرفة الأصحاب، ج٢، ص٨١٧

[3] صحیح البخاري - کتاب فرض الخمس - باب ما کان النبي یعطي المؤلفة قلوبهم وغیرهم، الرقم ٣١٥٠.

[4] صحیح البخاري - کتاب أحادیث الأنبیاء - باب قول الله عز وجل وأما عاد فأهلکوا بریح صرصر، الرقم ٣٣٤٤.

[5] صحیح البخاري - کتاب المغازي - باب قال ابن إسحاق غزوة عیینة بن حصن، الرقم ٤٣٦٧.

فەرمـووی: (من لا یرحم لا یرحم)،[1] (ئـەوەی ڕەحـم و سـۆزی نەبێـت، ڕەحـم و سـۆزی بـۆ نیـە).

جارێـک پێغەمبـەر(ﷺ) لەنـاو هاوەڵانیـدا بـوو فەرمـووی: (خـوای گـەورە حەجـی نووسـیوە لەسـەرتان)، ئەقرەع وتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا هەمـوو ساڵێک؟ پێغەمبـەر(ﷺ) بێدەنـگ بـوو، پاشـان فەرمووی: ئەگـەر بموتایـە بەڵێ ئـەوا واجـب دەبـوو و ئـەوکات ئێـوەش گوێڕایـەڵ نەدەبـوون و ملکەچیتـان نەدەنوانـد، بـەڵام تەنهـا یـەک حەجتـان لەسـەر واجبـە.[2]

لـەو بەڵێنـەدا کـە پێغەمبـەر(ﷺ) بـۆ خەڵکـی نەجرانـی نووسـی یەکێـک لـە شـاهیدەکان بریتـی بـوو لـە ئەقرەعـی کـوڕی حابیـس.[3]

بەنـی عەنبـەر کەسێکیان کوشـتبوو، بۆیـە ناچار پەنایـان بردە لای خوزاعـە کـە خاڵۆزایـان بـوون، پێغەمبـەر(ﷺ) نوێنـەری خـۆی نـارد بـۆ لای خوزاعـە تـا صەدەقەکەیـان بـدەن، ئەوانیـش صەدەقـەی خۆیـان دا، بـەڵام عەنبەریـەکان صەدەقـەی خۆیـان نـەدا، پێغەمبـەر(ﷺ) سـەدو پەنجـا کەسـی بـە سـەرکردایەتی عویەینـەی کـوڕی حصـن نـارد، ئـەو سـوپایە نـۆ پیـاو و یانـزە ئافرەت و منداڵی گـرت و گەڕایـەوە.

کاتێک عەنبەریەکان ئەوەیان بیسـت حەفتا کەسـیان کەوتنەڕێ و چوون بۆ لای پێغەمبـەر(ﷺ)، لـە نێوانـدا ئەعوەریش چووبوو کە تەمەنی لـە هەموویـان کەمتر بـوو، کـە گەیشـتنە مەدینـە و ژن و منداڵەکانیـان بینیـن چوونـە بـەردەم ماڵـی پێغەمبـەر(ﷺ) و هاواریـان دەکـرد ئـەی موحەممـەد چـۆن منداڵانمـان بەسـەبی دەگریـت لـە کاتێکدا ئێمـە لـە پەیمانـت دەرنەچویـن، پێغەمبـەر(ﷺ) چوویـەدەرەوە بـۆ لایـان و فەرمـووی: کەسـێ وەک دادوەر دابنێـن لـە نێوان مـن و ئێوەدا، (واتـە کەسـێکتان وەک نوێنەریـان قسـە بکات)، ئەوانیش وتیـان:

---

[1] صحيح البخاري – كتاب الأدب – باب رحمة الولد وتقبيله ومعانقته، الرقم ٥٩٩٧.

[2] سنن الدارقطني – كتاب الحج – باب فرض الحج وكم مرة حج النبي(ﷺ)، الرقم ٢٦٩٨.

[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص٣٥٨.

ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە ئەعوەری کوڕی بەشامە دادەنێین، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بەڵکو عەمری گەورەتان، ئەوانیش وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە ئەعوەری کوڕی بەشامە دیاری دەکەین، پێغەمبەر(ﷺ) رازی بوو تا حوکم بدات، ئەویش بڕیاری دا نیوەیان بە کڕینەوە ئازاد بکرێن واتە فیدیەیان بدرێت و نیوەشیان ئازاد بکرێن.[1]

ئەقرەع یەکێک بوو لە تازە دڵراگیرکراوان، واتە (المؤلفة قلوبهم)،[2] بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) بەخششی دەکرد، لە سەردەمی خەلیفە ئەبووبەکری صدیقدا ئەقرەع لەگەڵ عویەینەدا هاتن وداوایان لە خەلیفە کرد پارچە زەویەکیان پێ بدات، عومەری کوڕی خەتتابیش بە هەردووکیانی وت: پێغەمبەر(ﷺ) لەبەر تازەوابەستەییتان بە ئیسلام بەخششی دەکردن، ئێستا خۆتان بڕۆن تێ بکۆشن، ئیتر ئەو بەخششەی لێ برین.[3]

ئەقرەع بەشداری کرد لە فتووحاتی عێراقدا، دواتریش لە سەردەمی خەلیفە عوثمانی کوڕی عەففاندا عەبدوڵای کوڕی عامر کردی بە سەرکردەی سوپایەک تا بچێ بۆ خوراسان، لە ناوچەی جوزجان بریندار بوو، رایەک دەڵێت: لە جەنگی یەرمووکدا لەنێو هەر دە کوڕەکەیدا کوژرا. [4]

## ١٣١. ئەقرەعی کوڕی شوفەی(ﭬ):

ئەقرەعی کوڕی شوفەی لە رەملە نیشتەجێ بوو و لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەتتابدا کۆچی دوایی کرد. [5]

ئەقرەع دەڵێت: جارێ نەخۆش ببووم پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ سەردانم، وتم: هەرچی سەیر دەکەم ئەمجارە بەم نەخۆشیەم ئەمرم، پێغەمبەر(ﷺ)

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٩٥.
[2] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٠٣.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٠٢.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٠٢.
[5] أسد الغابة، ج١، ص١٦٧.

پێی فەرموو: (كلا لتبقين ولتهاجرن إلى أرض الشام وتموت وتدفن بالربوة من أرض فلسطين)، (نەخێر،بە دڵنیاییەوە دەمێنیت و کۆچ دەکەیت بۆ خاکی شام و لەوێ دەمریت و لە رەبوە لە خاکی فەلەستین ژێرخاک دەنرێیت)،[1] ئەوەبوو لەوێ مرد و لە رەملە ئەسپەردە کرا.

## ١٣٢. ئەقرەعی کوڕی عەبدولا (رضي الله عنه):

ئەقرەعی کوڕی عەبدوڵای حیمیەری کە پێغەمبەر (ﷺ) ناردی بۆ ذی موران و دەستەیەکی یەمەنیەکان.[2]

دوای وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) ئوسامەی کوڕی زەید چەند نێردراوێکی نارد بۆ یەمەن بۆ زانینی هەواڵی لە ئیسلام هەڵگەڕاوەکان، یەکێک لەو نێردراوانەش ئەقرەعی کوڕی عەبدولا بوو.[3]

## ١٣٣. ئەقرەمی کوڕی زەید (رضي الله عنه):

ئەقرەمی کوڕی زەید ئەبووعەبدوڵای خوزاعی، کوڕێکی هەبوو بە ناوی عەبدوڵا کە فەرموودەی لێوە گێڕاوەتەوە.[4]

عەبدوڵای کوڕی دەڵێت: جارێک لەگەڵ باوکم لای ئاژەڵەکان بووین، کاروانێ هاتن ولە نزیکمانەوە دابەزین، باوکم وتی: تۆ لێرە بە با بڕۆم پرسیارێکیان لێ بکەم، منیش چووم بە دوایدا کە چووین دەبینم پێغەمبەری خوایە.[5]

هەروەها فەرموودەیەکی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە کە ئەقرەع دەڵێت:

---

[1] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٩٨٦.

[2] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٠٤، أسد الغابة، ج١، ص ١٦٧.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ١٠٤.

[4] أسد الغابة، ج١، ص١٦٨.

[5] أسد الغابة، ج١، ص ١٦٨.

لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) نوێژم کرد لەکاتی سوجدەبردندا بن باڵیم دەبینی،[1] لە گێڕانەوەی تردا هاتووە کە عەبدوڵای کوڕیشی بەشداری نوێژەکە بووە.[2]

ئەو گێڕانەوەی دووەم جیایە لە گێڕانەوەی یەکەم، چونکە ئەوەی کە عەبدوڵای کوڕیشی تیایدا بەشدار بووە ئەوە بووە کە چووە بە دوای باوکیداو لەوێ پێغەمبەری خوای بینیوە.

مەبەست بەوەی بن باڵی پێغەمبەری خوای(ﷺ) بینیوە ئەوەیە کە لە کاتی سوجدەبردندا پێغەمبەر(ﷺ) هێندە بە کراوەیی دەستی داناوە تا بە تەواوەتی بن باڵی بینراوە، هەروەک لە گێڕانەوەی تردا هاتووە کە لەکاتی سوجدە بردندا هێندە بەرز و کراوە رادەوەستا بەرخێ دەیتوانی بە بن دەستیدا بڕوات، پێچەوانەی کەسانێ کە هێندە نزم سوجدە دەبەن کە وەک لە فەرموودەکەدا هاتووە وەک دانیشتنی سەگ دەکەن کاتێک باڵیان دەلکێنن بە سکیانەوە، ئەوەش لە فەرموودەدا دوورەپەرێزی لێکراوە، بەگشتی تەمبەڵی و ساردی موسڵمان لە جوانی نوێژەکەیدا نەبونی خشووعە لە نوێژدا، بە دەگمەن دەبینیت لە نەزانیەوە بێت، هەرچەندە لە نەزانیەوە بێت یان لە کەمتەرخەمیەوە بێت هەردووکیان قبووڵ نەکراون.

## ١٣٤. ئەقعەسی کوڕی سەلەمە(رضي الله عنه):

ئەقعەسی کوڕی سەلەمە یان دەوترێ ئوقەیصری کوڕی سەلەمە[3] یان دەوترێ مەسلەمەی حەنەفی، ئەم هاوەڵەی پێغەمبەر(ﷺ) بە خەڵکی یەمامە ناوی هاتووە، لەگەڵ چەند کەسێکی تردا وەک وەفد هاتووەتە خزمەت

---

[1] السنن الكبرى للنسائي - كتاب السهو - التطبيق - صفة السجود، الرقم ٦٩٩، صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن النسائي.، الرقم ١١٠٨.

[2] جامع الترمذي - أبواب الصلاة عن رسول الله(ﷺ) - باب ما جاء في التجافي في السجود، الرقم ٢٧٤ و حسنه، صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن الترمذي، الرقم ٢٧٤.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٠٥.

پێغەمبەر (ﷺ).[1]

## ١٣٥. ئەقمەر(ﷺ):

ئەقمەر ئەبوو عەلی، خەڵکی کووفەیە، دەوترێ ناوی عەمری کوڕی حارثە، کوڕێکی هەبووە بە ناوی عەلی کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە،[2] هەروەها کچێکی هەبوو ناوی کلثووم بوو.[3]

## ١٣٦. ئەکالی کوڕی نوعمان(ﷺ):

ئەکالی کوڕی نوعمانی ئەنصاری مازنی لە پشتیوانانە، لە جەنگی یەمامەدا شەهید بوو،[4] ئیبن عەبدولبەر و ئیبن ئەثیر ناوی ئەم هاوەڵەیان نەهێناوە، بەڵام ئیبن حەجەر ناوی هێناوە.

## ١٣٧. ئەکبەری حارثی(ﷺ):

ناوی ئەکبەر بوو بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) ناوی گۆڕی بۆ بەشیر.[5]

## ١٣٨. ئەکتەلی کوڕی شەمماخ(ﷺ):

ئەکتەلی کوڕی شەمماخی کوڕی یەزیدی کوڕی شەددادی کوڕی صەخری عوکی، خەلیفەی باوەڕداران عەلی کوڕی ئەبووطالیب زۆر پێی سەرسام بوو، لە جەنگی جسردا بەشداری کرد، لەو جەنگەی هاودەم بە باوکی موختاری ثەقەفی بەشداری کرد توانی فەرخان شا بگرێت و بدات لە گەردنی، هەروەها بەشداری قادسیەی کردو تیایدا رۆڵێکی زۆر گرنگ و

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص ١٦٩.

[2] أسد الغابة، ج١، ص ١٦٩.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ١٠٦.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ١٠٦.

[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ١٠٦.

بەرچاوی بینی.[1]

## ١٣٩. ئەکثەمی کوڕی جەون(ﷺ):

ئەکثەمی کوڕی جەون یان دەوترێ کوڕی ئەبولجەونە کە ناوی عەبدولعوززا بووە، دەشوترێ بەڵکو ئەبوو میعبەدی خوزاعی بووەو هاوسەری ئوم مەعبەد بووە.

ئەم هاوەڵە بوو کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (رأيت الدجال فإذا أشبه الناس به أكثم بن عبدالعزى)، (دەجالم بینی، ئەو کەسەی زۆر لەو دەچوو ئەهمی کوڕی عەبدولعوززایە)، ئەکثەمیش بەوە غەمبار بوو و پرسیاری کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) ئایا ئەو لێکچوونە زیانم پێ دەگەیەنێت؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (لا أنت مؤمن وهو كافر)،[2] (نا، تۆ باوەڕداریت و ئەو بێباوەڕە).

ئیبن حەجەر پێی وایە ئەم فەرموودەی باسی هاوشێوەیی دەجال دەکات سەبارەت بە ئەکثەم نیە.[3]

بەڵام لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە پێغەمبەر(ﷺ) بە ئەکثەمی فەرموو: (يا أكثم بن الجون رأيت عمرو بن لحي يجر قُصْبه في النار فما رأيت رجلا أشبه برجل منك به)، (ئەی ئەکثەمی کوڕی جەون عەمری کوڕی لوحەیم بینی لە دۆزەخدا ریخۆڵەی خۆی رادەکێشا، کەسم نەدیوە هێندەی تۆ لەو کابرایە بچێت)، ئەکثەم وتی: ئەی ئەو لەو چوونەم زیانم پێ دەگەیەنێت؟ فەرمووی: (نا، تۆ باوەڕداریت و ئەو بێباوەڕە). عەمر یەکەم کەس بوو ئایینی ئیسماعیلی گۆڕی و بتپەرستی خستە ناو عەرەبەوە.[4]

بەڵام ئەو بەسەرهاتە لە کتێبەکانی فەرموودەدا واهاتووە کە پێغەمبەر(ﷺ)

---

[1] أسد الغابة، ج١، ١٦٩.
[2] أسد الغابة، ج١، ١٧٠.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٠٧.
[4] أسد الغابة، ج١، ١٧٠.

ئەوەی بە مەعبەدی کوڕی ئەکثەمی کەعبی فەرمووە.[1]

ئەکثەم فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوە کە لە غەزایەکدا کەسێکیان دیوە زۆر دلێرانە جەنگاوە، بۆیە وتوویانە ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەراستی فڵانەکەس زۆر دلێرانە دەجەنگێت، ئەویش لە وەڵامیاندا فەرمووی: (ئەو لە دۆزەخدایە)، ئیبن حەجەر دەڵێت: ئەو رووداوە لە جەنگی خەیبەردا روویدا، بەمەش دەردەکەوێت ئەکثەم لە غەزای خەیبەردا بەشدار بووە.[2]

**پەند و وانە:**

نموونە هێنانەوە بە کەسێکی چاک بۆ کەسێکی خراپ شتێکی دروست و رەوایە، چونکە واتای ئەوە نیە هەموو شتیان لەیەک بچێت، بەڵکو ئەگەر ئەو لایەنەی کە بە نیازیەوە چواندنەکە باس دەکرێت باس بکرێت با لە بواری تردا لەیەک نەچن شتێکی رەوایە و لە نموونەی ژیانی پێغەمبەردا(ﷺ) چەند نموونەی وادەبینین کە تیایدا پێغەمبەری خوا(ﷺ) نموونەی لەیەکچوونی هێناوەتەوە لەسەر کەسی خراپ و بێباوەڕ، بەڵام لایەنی لەیەک چوونەکەی باسکردووە.

## ١٤٠. ئەکوەعی ئەسلەمی(رضي الله عنه):

ناوی سیننانی کوڕی عەبدوڵای کوڕی قوشەیرە، بەڵام بە ئەکوەع ناسراوە، سەبارەت بە کونیەکەی چەند رایەک هەیە، لەوانە (ئەبوو موسلیم، ئەبوو عامر، ئەبوو ئیاس) بەڵام زیاتر بە ئەبوو ئیاس ناسراوە، کوڕێکی هەبوو بە ناوی ئیاس،[3] هەر لە زووەوە موسڵمان بوو و هاودەمی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو، کوڕێکی تری هەبوو بە ناوی عامر.[4]

عامری کوڕی منداڵێکی هەبوو بە ناوی سەلەمە، هەندێ پێیان وایە هەم

[1] مسند أحمد بن حنبل – مسند جابر بن عبد الله(رضي الله عنه)، الرقم ١٤٩٥٦.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٠٧.

[3] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٢، ص٦٣٩، أسد الغابة، ج٢، ص ٤٩٤.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٣، ص١٨٨.

عامر و هەم سەلەمەش هاوەڵ بون، واتە کوڕ و باوک و باپیر هەرسێکەوە هاوەڵ بون،[٥] بەڵام ئیبن حەجەر بە دووری دەزانێت سەلەمەش (کە کوڕەزای ئەکوەع دەکات) هاوەڵ بووبێت.[٦]

## ١٤١. ئەمانات(ﭬ):

ناوی ئەماناتی کوڕی قەیسی کیندیە، وەک وەفد هاتووەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، تەمەنێکی زۆر ژیاوە تا ئەوەی عەوضەی شاعیر لە شیعرەکانیدا بە نموونەی تەمەندرێژی باسی کردووە:

ألا ليتني عُمرتُ يا أم خالد

كعمر أماناة بن قيس بن شيبانِ

لقد عاش حتى قيل ليس بميتٍ

وأفنى فِئاما من كهولٍ وشبانٍ[٧]

ناوی لەناو هاوەڵاندا هاتووەو قسەو باسی جۆراوجۆریشی لەسەرە، ئەویش لەبەر زۆر ژیانی، تەنانەت رای وای لەسەر هاتووە وتوویانە ٣٢٠ساڵ ژیاوە، یان راوبۆچوونی وا هەبووە وتویانە ئەو کەسە هەر نەمردووە، ئەمانەش لەروی شەرعیەوە راست نین، چونکە هەم لەگەڵ ماوەی هاوەڵاندا ناگونجێت، هەم لەگەڵ ماوەی ژیانی خەڵکانی ئەو سەردەمەدا نەگونجاو بووە، چونکە کەس لەو سەردەمەدا نەژیاوە کە تەمەنی تەنانەت بگاتە ٢٠٠ ساڵیش نەک ٣٢٠ ساڵ.[٨]

زانایان لەسەر ئەوە کۆکن کە هەرکەس دوای سەدساڵ لە وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) بانگەشەی هاوەڵبوونی کردبێت بڕوای پێ نەکەن،[٩] ئەوەش

---

[٥] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٢، ص٦٣٩، أسد الغابة، ج٢، ص ٤٩٤.

[٦] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٣، ص١٨٨.

[٧] أسد الغابة، ج١، ص١٧٣.

[٨] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ١١٠.

[٩] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٨-٩.

لەبەر ئەو فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) کە مانگێ بەر لە مردنی فەرمووی: (أرأيتكُمْ ليْلتكُمْ هذِهِ، فإن رأس مِائةٍ، لا يبْقى مِمنْ هُو اليوْم على ظهْرِ الأرْضِ أحدٌ).[1] (ئەمشەوتان ئەبینن، لەمشەوەوە تا سەد ساڵی تر لەم سەرزەویەدا یەک کەس نامێنێ کە ئەمڕۆ لەسەریەتی).

بۆیە ئەگەریش بوترێت ماوەی زیاتری ژیانی پێش ئەو سەردەمە بووە هەر نەگونجاوە، ئەگەرنا ڕووداوی وا بەرچاو دەبوویە باسێکی زەق و بەرچاوی وا کە لە هەموو سەرچاوەکاندا باس بکرێت، بەڵام هێندە هەیە ئەم هاوەڵە تەمەنێکی زۆری هەبووە، بەڵام سەبارەت بەو ساڵانەی وتراوە ڕاستی نیەو زانایانیش کە ئەو ژمارەیان هێناوە وەک تۆمارێکی قسەی ناو خەڵک هێناویانە نەک وەک ڕاستیەک کە بڕوایان پێی هەبێت، تەنانەت ئین ئەثیر هەر ئەو ساڵانە ناهێنێت و دەڵێت: ماوەیەکی زۆر ژیاوە، بەڵام ئیبن حەجەر هێناویەتی دەڵێت: هێندە ژیاوە تەنانەت وتراوە ٣٢٠ ساڵ ژیاوە، بۆیە دەتوانین بڵێین ئەو ژمارەیە زیادەڕەوی قسەی خەڵک بووە، ئەمەش گومان دروست ناکات لەسەر هاوەڵ بوونی، چونکە سەرچاوەکان هێناویانە کە وەک وەفد چووەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و لەگەڵ خۆیشیدا یەزیدی کوڕی موسڵمان بووە.[2]

ئیبن عەبدولبەر سەنەدێکی هێناوە ئەنەسی کوڕی مالیک دەڵێت: بە تەمەنترین هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) بریتی بوون لە ئەبووبەکر و سوهەیلی کوڕی بەیضاء.[3]

ئەمانات کوڕێکی هەبوو بەناوی یەزید کە موسڵمان بوو و تا وەفاتی پێغەمبەریش(ﷺ) بە موسڵمانی مایەوە، بەڵام لە سەردەمی ئیمامی ئەبووبەکردا لەئیسلام هەڵگەڕایەوەو بەو بێباوەڕیەوە کوژرا.[4]

[1] صحيح البخاري - كتاب مواقيت الصلاة - باب السمر في الفقه والخير بعد العشاء، الرقم ٦٠١.
[2] أسد الغابة، ج١، ص١٧٣، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ١١٠.
[3] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٢، ص٦٦٨.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ١١٠.

بەم پێیە مەرجی هاوەڵ بوون یەزیدی کوڕی ناگرێتەوە، چونکە مەرجێکی هاوەڵبوون دوای چوونە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوەیە ئەو کەسە بە باوەڕداری ژیانی دنیای جێ هێشتبێت.

## ١٤٢. ئەمەدی کوڕی ئەبەد(ﷺ):

هەریەک لە ئیبن ئەثیر و ئیبن حەجەر باسی ئەم هاوەڵەیان هێناوە، ئەم هاوەڵە خەڵکی حەضرەمەوتە، تەمەنێکی زۆری هەبووە تەنانەت دەوترێت ٣٠٠ ساڵ ژیاوە.

جارێک موعاویەی کوڕی ئەبووسوفیان وتی: خۆزگە کەسێکی بە تەمەن دەبوو باسی رابردووی بۆ دەکردین، ئەوانەی دەوریشی باسی ئەم هاوەڵەیان بۆ کرد، ئەویش داوای کرد بیهێنن، کاتێک ئەمەدیان هێنا، موعاویە دایینیشاند و دواتر پرسیاری لێکرد ناوت چیە؟ وتی: ناوم ئەمەدە، پرسیاری لێکرد تەمەنت چەندە؟ وتی: تەمەنم ٣٠٠ ساڵە، موعاویە پێی وت: درۆ دەکەیت، دوای ماوەیەک موعاویە وتی: شتێکمان بۆ بگێڕەوە، ئەویش وتی: چ پێویستت بە باسی کەسی درۆزنە، موعاویەش وتی: من بە درۆزنت نازانم ویستم عەقڵت تاقی بکەمەوە بزانم عەقڵت لە جێی خۆی ماوەو شت تێکەڵ ناکەیت؟ باسی زوومان بۆ بکە، سەردەم هەبووە وەک ئەمڕۆ وابووبێت؟ وتی: بەڵێ هەر وەک ئەمشەو کە دەیبینیت، دواتر موعاویە بڕێک پرسیاری لێدەکرد سەبارەت بە رابردوو، ئەویش وەڵامی دەدایەوە، دواتر سەبارەت بە پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری لێکرد و وتی: ئایا موحەممەدت بینیوە؟ وتی: کامە موحەممەد؟ وتی: پێغەمبەری خوا، ئەمەد وتی: سوبحانەڵا، وتت پێغەمبەری خوا؟ بەڵێ دیومە، موعاویە وتی: وەسفی بکە بۆم، ئەویش وتی: بە دایک و باوکمەوە بەقوربانی بم شتی وەک ئەوم پێش ئەو و پاش ئەویش نەدیوە، موعاویە پێی وت: چیت دەوێت داوام لێ بکە، ئەویش وتی:

گەنجی خۆمم بۆ بگێڕەوە، ئەویش وتی: بە دەستی من نیە، وتی: دەی بمخەرە بەهەشتەوە، ئەویش وتی: بە دەستی من نیە، ئەمەد وتی: دەبینم بۆ دنیاو قیامەتیش هیچت لەدەست نایەت، دەی بمگێڕەوە بۆ شوێنی خۆم، موعاویە وتی: ئەمەیان باشە.[1]

لەم بەسەرهاتەدا هەندێ شت هەن کە جێی گومانن، لەوانە:

٣٠٠ ساڵ ژیان لەو کاتەدا، چونکە ئەو تەمەنە هاوکات بە تەمەنی خەڵکانی ئەو سەردەمە شتێکی خەیاڵیە، بەڵام هیچ بەڵگەیەکی نەقلیمان نیە کە بەرپەرچی ئەوە بداتەوە، چونکە لە کتێبەکەی ئیبن حەجەردا لە ژیانی هاوەڵاندا لە ژیانی هەندێ هاوەڵدا باسی تەمەنیان دەکات کە هەیانبووە ٣٠٠ ساڵ بووە وەک ئەمانات یان ٢٠٠ ساڵ بەرەو سەر یان کەمتر.

ئیبن عەبدولبەر سەنەدێکی هێناوە کە ئەنەسی کوڕی مالیک دەڵێت: بە تەمەنترین هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بریتی بوون لە ئەبووبەکر و سوهەیلی کوڕی بەیضاء.[2]

لە قسەکانی نێوان ئەمەد و موعاویەدا هەندێ زانیاری باسکراون کە ئیبن حەجەر بە شتانێکی نادڵنیایان دەزانێت و جێی گومانن.

ئەم باس و بەسەرهاتە لە کتێبەکانی فەرموودەدا نەهاتووە، بەڵام هەریەک لە ئیبن ئەثیر و ئیبن حەجەر لە کتێبەکانیان تایبەت بە هاوەڵان ئەوەیان هێناویانە.

## ١٤٣. ئەنەسە(رضي الله عنه):

ئەنەسە یان دەوترێت ئەبوو ئەنەسە مەولای پێغەمبەری خوا(ﷺ) بووەو ناسراوە بە ئەبوو مەسرووح یان دەوترێت ئەبوو موسرح، کاتێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) دادەنیشت و کەسێک دەهات بۆ لای، ئەنەسە دەچوو

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص ١٧٤، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ١١١.

[2] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٢، ص٦٦٨.

لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) مۆڵەتی بۆ ئەو کەسە وەردەگرت.[1]

ئەنەسە لە جەنگی بەدردا بەشداری کرد، هەروەها لە غەزای ئوحودیشدا بەشداری کرد، دواتر لە سەردەمی ئەبووبەکری صدیقدا کۆچی دوایی کرد، هەرچەندە رایەک هەیە دەڵێت: لە جەنگی بەدردا شەهید بووە، بەڵام رای پێشووتر راستە کە دوای پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کردووە.[2]

هیچ فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوای(ﷺ) لێوە نەگێردراوەتەوە.

## ١٤٤. ئەنەسی کوڕی ئەبوو ئەنەس(ﷺ):

سەبارەت بە ناوی راجیایی هەیە، هەندێ دەڵێن ناوی ئوسەیرە، یان دەوترێت ئوسەید، یان ئەنەس، یان ئونەیس، یان سەبرە، کونیەکەی ئەبوو سولەیطە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانەکانە و لە بەشداربووە بەدریەکاندا ناوی هاتووە، فەرموودەیەکی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە.[3]

## ١٤٥. ئەنەسی کوڕی حارث(ﷺ):

ناوی ئەنەسی کوڕی حارثي کوڕی نەبیهە،[4] لە هاوەڵانی دانیشتووی کووفەدا ناوی هاتووە،[5] جۆرێک مشتومڕ هەیە لەسەر ئەوەی ئایا هاوەڵە یان نا، بەڵام ئیبن حەجەریش جەخت دەکاتەوە لە هاوەڵ بوونی[6] و هەریەک لەمانەش وەک هاوەڵ ناویان هێناوە (بوخاری، ئیبن مەندە، بەغەوی، ئیبن سەکەن، ئیبن شاهین، ئەبوو نوعەیم، ئیبن ئەثیر، ئیبن حەجەر).

بوخاری لە بارەیەوە دەڵێت:(لەگەڵ حوسەینی کوڕی عەلی کوژراو

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٣٥، أسد الغابة، ج١، ص٢٠٠.
[2] أسد الغابة، ج١، ص٢٠٠.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص١٨٩.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٢١.
[5] أسد الغابة، ج١، ص١٨٧.
[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٢١.

فەرمـوودەی لـە پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) بیسـتووە).[1]

فەرموودەیەکی لـە پێغەمبـەری خـواوە(ﷺ) گێڕاوەتـەوە کـە دەڵێت: بیسـتم لـە پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) دەیفەرمـوو (إن ابني هذا -يعني الحسين- يقتل بأرض يقال لها كربلاء فمن شهد ذلك منكم فلينصره)،[2] (ئـەم کوڕەم-واتـە حوسـەین- لـە زەویـەک دەکوژرێت پێی دەوترێت کەربـەلا، جـا هـەرکامتـان ئەوەتـان بینی بـا سـەری بخـات و پاڵپشـتی بێـت)، بۆیـە ئەنـەس چـوو بـۆ کەربـەلا و لـەوێ لەگـەڵ حوسـەیندا کـوژرا.[3]

ئـەو فەرمـوودەی گێڕاویەتیـەوە لـە کتێبەکانی فەرمـوودەدا نەهاتووە، بـەڵام هەریـەک لـە ئەبوو نوعەیم و ئیبن ئەثیر و ئیبن حەجـەر لـە کتێبەکانیاندا کە باسـی ئـەم هاوەڵـە دێنن ئـەو فەرموودەشـیان هێناوە.

## ١٤٦. ئەنەسی کوڕی رافع(رضي الله عنه):

نـاوی ئەنەسـی کـوڕی رافعـەو بـە ئەبولحەسـیر ناسـراوە، لـە پشـتیوانانە لـە ئەوسـیەکان، چـوو بـۆ مەککە بـۆ لای قورەیشـیەکان و لـەوێ پێغەمبـەری خـوای(ﷺ) بینـی، بـەڵام موسـڵمان نەبـوو، دواتـر گەڕایـەوەو دوای ئـەوە لـە مەدینـە موسـڵمان بـوو.[4]

## ١٤٧. ئەنەسی کوڕی زونەیم(رضي الله عنه):

نـاوی ئەنەسـی کـوڕی زونەیمـی کـوڕی عەمرە، بـرای سـاریەی کـوڕی زونەیمـە،[5] ئـەو سـاریەی کـە ئیمامـی عومـەر لـە مینبـەری مەدینـەوە هـاواری

---

[1] البخاري: التاريخ الكبير، ج٢، ص٣٠.
[2] دلائل النبوة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٤٧٦.
[3] أسد الغابة، ج١، ص١٨٧.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٥٦.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٢٢-١٢٣.

لێکرد و ئەویش دەنگی بیست.[1]

ئەنەس کەسێکی شاعیر بوو، سەرەتا بێباوەڕ بوو و بە شیعرەکانی هێرشی دەکردە سەر پێغەمبەر(ﷺ)، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) خوێنی ئەوی ڕەوا کرد، کاتێک ئەنەس ئەوەی بیستەوە بۆ پۆزش هێنانەوە چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و بە چەند دێڕە شیعرێک وەسفی پێغەمبەری خوای(ﷺ) کرد.[2]

ڕایەکی تر هەیە دەڵێت: ئەو موسڵمان بوونەی ئەنەس لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا بووە و ئەوکات باوەڕی هێناوە، بۆ ئەوەش نەوفەلی کوڕی موعاویەی دەیلی چوویە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) تا داوای لێ بوردنی بۆ وەربگرێت،[3] بە پێغەمبەری خوای(ﷺ) وت: تۆ شیاوترینی بە لێبوردن، بۆ کام لە ئێمە ئازاری تۆی نەداوەو دژایەتی نەکردویت، ئێمە لە نەفامیدا بووین ونەماندەزانی چی بکەین و چی نەکەین تا خوای گەورە بەهۆی تۆوە ڕێنموونی کردین و لە فەوتان ڕزگاری کردین، پێغەمبەری خوایش(ﷺ) داواکەی قبووڵکرد و لێی خۆش بوو، ئەنەسیش پاش موسڵمان بوونی شیعرێکی لەسەر پێغەمبەر(ﷺ) هۆنیەوە.[4]

## ١٤٨. ئەنەسی کوڕی ضەبوع(رضي الله عنه):

ناوی ئەنەسی کوڕی ضەبوعی کوڕی عامرە، ئەم هاوەڵە لەپشتیوانانە،[5] لە غەزای ئوحوددا بەشداری کردووە.[6]

بەو پێیەی زۆربەی هەرەزۆری پشتیوانان هەر لە سەرەتای هاتنی

---

[1] أسد الغابة، ج٢، ص ٣٦٥.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٢٢.

[3] أسد الغابة، ج١، ص١٨٨.

[4] الإصابة في تمييز الصحلبة، ج١، ص١٢٣.

[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٢٤.

[6] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١١٢، أسد الغابة، ج١، ص ١٨٩.

پێغەمبەر(ﷺ) و پێش هاتن و پاش هاتنی موسڵمان بون، بۆیە لەسەر ئەم بنەمایە دەڵێین لەوانەیە موسڵمان بوونی ئەم هاوەڵە پێش بەدریش بووبێت، بەڵام بەشدارنەبوونی لەبەدردا لەبەر ئەوە بێت زۆرێک موسڵمان لەبەر هۆی جیاجیا لە بەدردا بەشدارییان نەکرد، وەک نەبوونی پێویستی جەنگی، یان نەبوونی تەمەنی گونجاو، یان زیاتریان لەبەر ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵان بە نیازی جەنگ نەچوون و دواتر جەنگیان هاتەڕێ و جەنگی بەدر روویدا، ئەوەبوو ژمارەیەکی بەرچاوی هاوەڵان لە مەدینە مابوونەوەو بەشداری جەنگی بەدر نەبوون.

## ١٤٩. ئەنەسی کوڕی ظوهەیر(رضي الله عنه):

ناوی ئەنەسی کوڕی ظوهەیرە، برای ئوسەیدی کوڕی ظوهەیرە، ئەم هاوەڵە لەپشتیوانانە،[١] برایەکی تری هەبوو کە لە دایکیان یەک بوو و ناوی عیبادی کوڕی بیشر بوو،[٢] دایکی ناوی فاطیمەی کچی بیشری کوڕی عەددیە،[٣] کوڕێکی هەبوو کە ناوی ثابت بوو و فەرمودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە.[٤]

ظوهەیری باوکی یەکێک بوو پشتیوانان کە زۆر زوو موسڵمان بووبوو، ئەو لە بەیعەتی دووەمی عەقەبە و جەنگی ئوحودیشدا بەشدار بوو.[٥]

ئەنەس بەسەرهاتێکی جەنگی ئوحود دەگێڕێتەوە ودەڵێت رافعی کوڕی خەدیج هات تا بەشداری غەزای ئوحود بکات، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) بە منداڵی زانی و فەرمووی: ئەوە منداڵێکی بچووکە، ویستی بیگەڕێنێتەوە، خێرا رافعی کوڕی ظوهەیری مامم وتی: برازاکەم تیرهاوێژێکی باشە، بۆیە

[١] أسد الغابة، ج١، ص ١٨٩.
[٢] أسد الغابة، ج١، ص ١٤٦.
[٣] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٩٥، أسد الغابة، ج١، ص ١٤٦.
[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٢٤.
[٥] أسد الغابة، ج٣، ص١٠٢.

پێغەمبەر(ﷺ) مۆڵەتی پێدا بەشداری غەزاکە بکات.[1]

بەو پێیەی دەبینین باوکی ئەم هاوەڵە لە موسڵمانبووە یەکەمینەکانی پشتیوانانە، رای زیاتر بۆ ئەوە دەچێت ئەنەس و ئوسەیدی کوڕیشی هەر زوو موسڵمان بووبن، چونکە وەک دەبینین هەرسێکیان بەشدار بون لە غەزای ئوحوددا، سەبارەت بە بەشدارنەبوونی ئەنەس لە غەزای بەدردا هیچ گومان لەسەر موسڵمان بوونی دروست ناکات، چونکە هەرچەندە باوکی لە ئەندامانی ئامادەبووی عەقەبەی دووەم بوو، کەچی بەشداری بەدر نەبوو، چونکە لە بەدردا زۆرێک موسڵمان هەبوون لەبەر هۆی جیاجیا بەشدارییان نەکرد.

## ١٥٠. ئەنەسی کوڕی عەبباس(ﭬ):

ناوی ئەنەسی کوڕی عەبباسی کوڕی ئەنەسی کوڕی عامری سولەمیە، لە ساڵی فەتحی مەککەدا هاودەم بە ژمارەیەکی زۆری بەنی سولەیم هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمان بوو.[2]

## ١٥١. ئەنەسی کوڕی عەبدە(ﭬ):

ناوی ئەنەسی کوڕی عەبدەی کوڕی جابری قورەیشیە، کوڕەکەی ناوی عوبەیدوڵا بوو.[3]

## ١٥٢. ئەنەسی کوڕی فەضالە(ﭬ):

ناوی ئەنەسی کوڕی فەضالەی کوڕی عەدی کوڕی حەرامە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە، کوڕێکی هەبوو ناوی موحەمەد بوو، ئەنەس خۆی و باوکیشی

---

[1] التأريخ الكبير للبخاري، ج٢، ص٢٨، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٧٨٢.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٢٥.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٢٥.

هاوەڵ بوون،[1] ژنەکەی ناوی عەیسائی کچی حارث بوو کە موسڵمان بوو و بەیعەتی دابوو بە پێغەمبەر(ﷺ).

موحەممەدی کوڕی ئەنەس دەگێڕێتەوەو دەڵێت: کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) هاتە مەدینە من دوو هەفتە بووم، بردام بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و ئەویش دەستی هێنا بەسەرمدا و نزای خێری بۆ کردم و فەرمووی: ناوی منی لێ بنێن بەڵام کونیەی منی لێ مەنێن، هەروەها لە ساڵی حەجیماڵئاواییدا بۆ حەج منی برد و ئەوکات تەمەنم دەساڵ بوو.[2]

لە غەزای ئوحوددا کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) بیستی قورەیش خەریکە نزیک دەبنەوە بەرەو ئوحود بێن، ئەنەس و موئنیسی برای نارد تا هەواڵی قورەیشی بۆ بهێنن، ئەوانیش چوون و هەواڵیان وەرگرت و گەڕانەوەو هەواڵەکەیان هێنا بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و لەو غەزایەشدا لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) بەشدارییان کرد، لە غەزای ئوحوددا ئەنەس کوژرا، ئینجا موحەممەدی کوڕی هێنرا بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش صەدەقەیەکی پێ بەخشی و مەرجی دانا ئەو صەدەقەیە نەبەخشرێ و خەڵات نەکرێ بۆ هیچ کەس.[3]

## ١٥٣. ئەنەسی کوڕی قەتادە(رضي الله عنه):

ناوی ئەنەسی کوڕی قەتادەی کوڕی ڕەبیعەیە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان، هەروەها دەشوترێ ناوی ئونەیسە،[4] ڕایەکیش هەیە دەڵێت: ناوی ئیلیاسە،[5] ژنەکەی ناوی خەنسای کچی خوذام بوو،[6] ئەم ژنەشی لە پشتیوانان بوو و هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوو.[7]

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص١٩٠، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٢٥.
[2] أسد الغابة، ج١، ص١٩٠.
[3] أسد الغابة، ج١، ص١٩٠-١٩١.
[4] أسد الغابة، ج١، ص١٩١، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٣٧.
[5] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٤٦٤.
[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٣٧.
[7] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٦١١.

ئەنەسی کوڕی قەتادە لە جەنگی بەدردابەشداری کرد،[1] هەروەها لە غەزای ئوحوددا بەشداری کردو تیایدا شەهید بوو،[2] ئەوەی ئەم هاوەڵەی شەهید کرد ئەخنەسی کوڕی شریق بوو،[3] ئیبن سەعد دەڵێت: ئەبولحەکەمی کوڕی ئەخنەس کوشتوویەتی،[4] دوای ئەوە باوکی خەنسا دوای شەهیدبوونی ئەنەس خەنسای کچی لە پیاوێکی تر مارەکرد، بەڵام خەنسا بەوە رازی نەبوو و چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و ئەویش ئەو هاوسەرگیریەی هەڵوەشاندەوە، دواتر شووی کرد بە ئەبوو لوبابە.[5]

ئەنەسی کوڕی قەتادە لە دوای خۆی هیچ منداڵێکی جێ نەهێشت.[6]

## ١٥٤. ئەنەسی کوڕی قەتادەی باهلی(ﷺ):

ئەم هاوەڵە بە ئەنەس و بە ئونەیسیش ناوی هاتووە، لە هاوەڵە نیشتەجێکانی بەصرەدا ناوی هاتووە، ئەم هاوەڵەش لە پشتیوانانە.[7]

ئەنەس دەڵێت: لە ناو وەفدێکی بەنی ضوبەیعەدا چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ).[8]

کاتێک فیتنەی نێوان هاوەڵان هەبوو، لە بەصرە خەڵکێک وتاریان دەداو تیایدا قسەیان دەوت: بە ئیمامی عەلی، ئەنەسی کوڕی قەتادەش لەوێ بوو، هەستا و چوو وتارێکی پێشکەش کرد، پاش سوپاس و ستایشی خوای گەورە وتی: ئێوە ئەمڕۆ زۆر قسەتان وت: بەو پیاوە، منیش سوێند دەخۆم بە خوای گەورە لە پێغەمبەری خوام(ﷺ) بیستووە دەیفەرموو:

---

[1] البدایةو النهایة لابن کثیر، ج٣، ص٣١٥.
[2] تاریخ الإسلام للذهبي، ج٢، ص٢٠١.
[3] الإستیعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١١٣.
[4] الطبقات الکبری لابن سعد، ج٣، ص٤٦٤.
[5] الإصابة في تمییز الصحابة، ج١، ص١٣٨.
[6] الطبقات الکبری لابن سعد، ج٣، ص٤٦٤.
[7] أسد الغابة، ج١، ص ٢٠٢.
[8] الإصابة في تمییز الصحابة، ج١، ص١٣٧.

(إني لأشفع يوم القيامة لأكثر مما على الأرض من مدر وشجر)، (مـن لـه رۆژی دواییدا شـەفاعەت دەكـەم بۆ خەڵكێ كـە زیاتـرن لـە هەرچـی تۆپەڵـە قـوڕی لینـج و درەختـی سـەرزەوی هەیـە)، دەی سـوێندیش دەخـۆم بـە خـوای گـەورە هیـچ كـەس نیـە لـە خزمایەتیدا لـە عەلـی نزیكتـر بێـت لـە پێغەمبـەر(ﷺ)، جـا ئایـا پێتـان وایـە شـەفاعەتی پێغەمبـەر(ﷺ) ئێوە دەگرێتـەوە كەچـی ئالوبەیتـی خۆی ناگرێتـەوە؟).[1]

## ١٥٥. ئەنەسی كوڕی قەیس(رضي الله عنه):

نـاوی ئەنەسـی كـوڕی قەیسـی عوقەیلیـە، لەگـەڵ وەفـدی عوقەیلیەكانـدا هاتوەتـە خزمـەت پێغەمبـەر(ﷺ) و موسـڵمان بـووەو بەیعەتـی پێداوە،[2] ئەنـەس هـاودەم بـە میطـرەف و چەنـد كەسـێكی تـر هاتـە خزمـەت پێغەمبـەر(ﷺ) و بەیعەتـی موسـڵمان بوونـی ئـە كەسـانەی تـری هۆزەكەشـیان پـێ بـوو كـە نەهاتبـوون، پێغەمبەریـش(ﷺ) مافـی خاوەنێتـی زەوی عەقیقـی پـێ دان كـە كانـی و دارخورمـای تێدا بـوو، ئـەو مافەشـی بـە نامەیەک بۆ نووسـین، تیایدا هاتـووە تـا كاتێـک نوێـژ بكـەن و زەكات بـدەن و گوێڕایـەڵ بـن.[3]

## ١٥٦. ئەنەسی كوڕی مالیک(رضي الله عنه):

ناوی ئەنەسی كوڕی مالیكی كوڕی نەضرە، لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەكان و لـە بەنـی نەجـار،[4] كونیەكـەی ئەبـوو حەمزەیە و پێغەمبـەر(ﷺ) ئـەو كونیـەی بـۆ دانـا،[5] خزمەتـكاری پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) بـوو و بـەوەش ناسـرابوو و

[1] أسد الغابة، ج١، ص ٢٠٢.

[2] -الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٢٦.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٦، ص١٢٨.

[4] معجم الصحابة لابن قانع، ج١، ص١٤، الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٠٩، أسد الغابة، ج١، ص١٩٢، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٢٦، سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٣، ص٣٩٥، البداية و النهاية لابن كثير، ج٥، ص٣٣١.

[5] أسد الغابة، ج١، ص١٩٣، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٢٦، سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٣،

خۆیشی شانازی پێوە دەکرد.[1]

ئەنەس لەبەر ناوی مامی کە ناوی ئەنەسی کوڕی نەضرە بوو ئەو ناوەی لێ نرا.[2]

دایکی ناوی ئوممو سولەیمی کچی ملحان بوو کە ئەویش باوەڕدار بوو و هاوەڵێکی پێغەمبەر(ﷺ) بوو،[3] کاتێک موسڵمان بوو داوای کرد لە مالیکی مێردی تا ئەویش موسڵمان بێت، بەڵام ئەو لێی تووڕە بوو، هەر بەو تووڕەیەشیەوە چوو بۆ کارێک و لەوێ نەگەڕایەوەو کوژرا، ئیتر ئوممو سولەیم شووی کرد بە ئەبوو طەلحەی ئەنصاری و لەم مێردەی دوو منداڵی بوو بە ناوی ئەبووعومەیر و عەبدوڵا.[4]

ئوممو سولەیم مەرجی بۆ شووکردنی بە ئەبوو طەلحە ئەوەبوو موسڵمان بێت و ئەوەشی لەبری مارەیی ویست، ئەویش موسڵمان بوو، ئیتر ئوممو سولەیم شووی پێکرد.[5]

کاتێک ئوممو سولەیم موسڵمان بوو زوو زوو بە ئەنەسی دەوت: بڵێ أشهد أن لا إله إلا الله، بڵێ أشهد أن محمد رسول الله، مالیکیش دەیوت کوڕەکە تێک مەدە، ئەویش دەیوت تێکی نادەم.[6]

ئوممو سولەیم لە غەزای ئوحوددا بەشداری کرد و بە خەنجەرێکەوە بەرگری دەکرد، هەروەها لە غەزای حونەینیشدا بەشداری کرد.[7]

ئەبوو طەلحەی مێردی ئەو کەسە بوو کە پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو دەنگی لە سوپادا باشترە لە یەک دەستەو تاقم، ئەنەسیش لە مێردە تازەکەی

ص٣٩٨.

[1] أسد الغابة، ج١، ص١٩٢.

[2] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٠٩.

[3] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٠٩.

[4] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٢، ص٣٠٤-٣٠٥.

[5] أسد الغابة، ج٢، ص٣٤٦.

[6] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٢، ص٣٠٥.

[7] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٢، ص٣٠٤.

دایکیەوە فەرمموودەی گێڕاوەتەوە،[1] ئەمەش لووتکەی ڕێزو خۆشەویستی نێوان کوڕێک و زڕباوکێکە کە هەردووکیان دەبنە خزمەتکاری پەیامی خوا.

ئەنەس پوورێکی هەبوو کە ناوی ئومموحارثە بوو، دەگێڕێتەوە کە لە غەزای بەدردا حارثەی کوڕی شەهید بوو، ئوممو‌حارثە بە پێغەمبەری(ﷺ) وت: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ پلەوپایەی حارثە لای من دەزانی، دەی پێم بڵێ ئەگەر لە بەهەشتە بەرگە دەگرم، ئەگەریش وانیە با تێر بۆی بگریم، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: (**یا أم حارثة إنها جنان في الجنة وإن ابنك أصاب الفردوس الأعلى**)،[2] (ئەی ئوممو حارثە چەند بەهەشتێک لە بەهەشتدا هەن، بە دڵنیاییەوە کوڕەکەت فیردەوسی ئەعلای دەست کەوتووە).

ئەنەس سێ برای هەبوو: بەراء،[3] ئەبووعومەیر، عەبدوڵا، ئەم دوانەی کۆتایی لە دایکیەوە برای بوون.[4]

بەرائی برای کەسێک بوو کە پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژەی بەوە دابوو نزای گیرایە، بەراء تەواو تامەزرۆی جیهادی ڕێی خوا بوو، جارێک ئەنەس چوو بۆ لای بەرا و و سەیری کرد شیعر دەڵێتەوە، ئەویش وتی: براکەم شیعر دەڵێیتەوە لەکاتێکدا خوای گەورە لەبری شیعر چاکتری بۆ داناویت کە قورئانە؟ ئەویش وتی: دەترسیت خوا لەناو جێگەدا بممرێنێ لەکاتێکدا بە تەنها نەوەدو نۆ بێباوەڕم کوشتووە جگە لەوەی لەگەڵ هاوەڵان بێباوەڕی ترم کوشتووە؟ ئەوە بوو دواجار لە ساڵی بیستی کۆچی لە فەتحی توستوردا شەهید بوو.[5]

زۆر جار پێغەمبەر(ﷺ) کە دەچوو بۆ ماڵی ئوممو‌سولەیم یاری لەگەڵ ئەبوعومەیر دەکرد و بە خۆشحاڵی دەیبینی، پێغەمبەر(ﷺ) پێی دەفەرموو

---

[1] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٢، ص٢٧-٢٨.

[2] صحيح البخاري - كتاب الجهاد والسير - باب من أتاه سهم غرب فقتله، الرقم ٢٨٠٩.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٥٣.

[4] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٢، ص٣٠٤.

[5] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج١، ص١٩٧- ١٩٨.

(يا أباعمير ما فعل النغير)،[1] (ئـەی ئەبـوو عومەیـر نوغەیـر چـی دەکات و چۆنـە؟) نوغەیـر باڵندەیەکـی ئەبوعومەیـر بـوو کـە یـاری لەگەڵـدا دەکـرد، جارێـک پێغەمبـەر(ﷺ) چـوو بۆ لای بینـی عومەیـر غەمبـارە، پرسـی بۆچـی غەمبـارە؟ دایکـی وتـی: نوغەیـر (کـە باڵندیەکـی بـوو) مـردووە.[2]

ئـەو شـەوەی ئەبووعومەیـر کۆچـی دوایـی کـرد و ئەبـوو طەلحـە هاتـەوە، ئومموسـەلەمە پێـی نـەوت و شـەو چوونـە لای یـەک، بەیانـی کـە ئەبـوو طەلحـە بـەوەی زانـی سـکاڵای بـردە لای پێغەمبـەر(ﷺ)، ئەویـش فەرمـووی: (أعرستم الليلة بارك الله لكم في ليلتكم)، (ئەمشـەو چوونـە لای یـەک، خـوا بەرەکـەت بخاتـە شـەوەکەتانەوە)، ئەوەبـوو خـوا عەبـدوڵای پـێ بەخشـین و پێغەمبەریـش(ﷺ) نـاوی نـا عەبدوڵا.[3]

کاتێـک پێغەمبـەر(ﷺ) هـات بـۆ مەدینـە ئـەوکات تەمەنـی ئەنـەس دە سـاڵان بـوو، ئوممسـولەیم ئەنەسـی بـرد و چـوو بـۆ خزمـەت پێغەمبـەر(ﷺ) و وتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) ئـەوە ئەنەسـە بـا خزمـەتت بـکات، پێغەمبەریـش(ﷺ) رازی بـوو.[4]

رایـەک دەڵێـت: ئەنـەس لـە جەنگـی بەدردا هاودەم بە پێغەمبەر(ﷺ) بەشداری کـردووە، بەڵام ئیبـن حەجـەر دەڵێـت: نـاوی لـە بەدریەکانـدا نەهاتـووە چونکـە لـەو کاتـەدا تەمەنـی کـەم بـووە و رێ نـەدراوە لـە غـەزای بـەدردا بەشـداری بـکات،[5] بـەڵام ئیبـن ئەثیـر هێناویەتـی کـە لەگـەڵ پێغەمبـەر(ﷺ) چـووە بـۆ بـەدر و لەوێیـش خزمەتـی پێغەمبـەری خـوای(ﷺ) کـردووە نـەک ئـەوەی بەشـداری جەنگەکـەی کردبێـت.[6]

---

[1] صحيح البخاري – كتاب الأدب – باب الكنية للصبي وقبل أن يولد للرجل، الرقم ٦٢٠٣.
[2] سنن أبي داود – كتاب الأدب – باب ما جاء في الرجل يتكنى وليس له ولد، الرقم ٤٩٦٩.
[3] تأريخ الإسلام للذهبي، ج٦، ص١١٣.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٢٦.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٢٧.
[6] أسد الغابة، ج١، ص١٩٣.

ئیمامی ذەهەبیش هەمان رای هەیە و دەڵێت: ئەمە هەردوو بۆچوونەکە یەکدەخات.[1]

ئەنەسی کوڕی مالیک یەکێک بوو لە بەشداربووانی بەیعەتی ریضوان.[2]
هەروەها بەشداری کردووە لە غەزای موئتەدا.[3]

جارێک ئومموسولەیم داوای کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) نزا بکات بۆ ئەنەس، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (اللهم أكثر ماله وولده وبارك له فيما أعطيته)،[4] (خوایە سامان و منداڵی زۆر بکەو بەرەکەت بخەرە ئەوەوە بۆی کە پێی دەبەخشیت).

ئەنەسی کوڕی مالیک باخێکی هەبوو سالانە دووجار بەرهەمی میوەی دەبەخشی، هەروەها رەیحانەیەکی تێدابوو بۆنی خۆشی لێ دەردەهێنرا.[5]

ئەنەس خاتەمێکی لەدەست دەکرد کە وێنەی شێرێکی لەسەر بوو، بە زێڕیش دانەکانی پێکەوە دەبەستەوە،[6] بەڵام لە ریوایەتێکی تردا هاتووە ئەنەس لە خاتەمەکەیدا ئەوەی هەڵکۆڵیبوو (محمد رسول الله) کاتێک دەچوو بۆ ئاودەست خاتەمەکەی لە پەنجەی دادەکەند.[7]

پێغەمبەر(ﷺ) زۆر ئەنەسی خۆشدەویست و زۆرجاریش قسەی خۆش و بزەبەخشی هەبوو بۆی، جارێک پێغەمبەر(ﷺ) بۆ بزەبەخشی بە ئەنەسی فەرموو (يا ذا الأذنين)،[8] (ئەی دوو گوێ).

ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) هێندە ئەنەسی خۆشدەویست جار هەبوو بە کوڕی شیرینم بانگی دەکرد وەک خۆی دەگێڕێتەوە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) پێی

---

[1] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٣، ص٣٩٨.
[2] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٣، ص٣٩٧.
[3] سنن ابن ماجه - أبواب الجهاد - باب القتال في سبيل الله سبحانه وتعالى، الرقم ٢٧٩٣.
[4] صحيح البخاري - كتاب الدعوات - باب دعوة النبي(ﷺ) لخادمه بطول العمر وبكثرة ماله، الرقم ٦٣٤٤.
[5] أسد الغابة، ج١، ص١٩٣، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٢٧.
[6] أسد الغابة، ج١، ص١٩٤.
[7] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص٢٢ - ٢٣، سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٣، ص٤٠٤.
[8] مسند أحمد بن حنبل - مسند أنس بن مالك(ﷺ)، الرقم ١٢٤٧٩، جامع الترمذي - أبواب البر والصلة عن رسول الله(ﷺ) - باب ما جاء في المزاح، الرقم ١٩٩٢، حسنه شعيب الأرناؤوط، صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن أبي داود، الرقم٥٠٠٢.

فەرمووم (يا بني)،[1] (ئەی کوڕی شیرینم).

ئەنەس دەڵێت: دە ساڵ خزمەتی پێغەمبەری خوام(ﷺ) کرد چی کارێکی بەسەردا دابم، کردبێتم یان نا سەرکۆنەی نەکردوم، ئەگەریش کەسێک سەرکۆنەی بکردمایە دەیفەرموو وازی لێ بهێنن،[2] لەریوایەتێکی تردا هاتووە دەڵێت: دە ساڵ خزمەتی پێغەمبەرم(ﷺ) کرد هەرگیز لێی نەدام و قسەی پێ نەوتم و رووی لێ گرژ نەکردم.[3]

ئەنەس دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) باشترین رەوشت و ئاکاری هەبوو، رۆژێک ناردمی بۆ پێویستییەک، منیش وتم: بەخوا ناڕۆم، لە ناخی خۆیشمدا دەمویست بڕۆم لەبەرئەوەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانی پێکردوم، رۆیشتم هەتا گەیشتم بە هەندێ منداڵ لەنێو بازاڕدا گەمەیان دەکرد، هێندەم بینی پێغەمبەر(ﷺ) لە پشتەوە سەرشانەکانی گرتم، سەیرم کرد دەبینم پێدەکەنێت و فەرمووی: ئەی ئونەیس، ئەرێ چوویت بۆ ئەو ئیشەی پێم وتیت؟ منیش وتم: بەڵێ وا ئەچم ئەی پێغەمبەری خوا.[4]

هاوکات ئەنەس ئەمانەتی پێغەمبەری خوای(ﷺ) دەپاراست و بە هیچ بیانوویەک بۆ کەسی نەدەگێڕایەوە، تەنانەت دوای وەفاتی پێغەمبەریش(ﷺ)، وەک جارێک ئەنەس قسەی بۆ ثابت دەکرد و وتی: جارێک لەگەڵ منداڵان یاریم دەکرد پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ لام و سەلامی لێکردین و ناردمی بۆ ئیشێک، منیش دواکەوتم لە چوونەوەم بۆ لای دایکم، کە چوومەوە، دایکم وتی: بۆچی دواکەوتیت؟ وتم: پێغەمبەری خوا(ﷺ) ناردمی بۆ ئیشێک، وتی: چ ئیشێک؟ وتم: نهێنییە، ئەویش وتی: دەی نهێنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ هیچ کەس باس نەکەیت، ئەی ثابت ئەگەر بڕیار بوایە ئەو نهێنیەم بۆ

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص٢٠.

[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص١٧.

[3] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٣، ص٣٩٨.

[4] صحيح مسلم - كتاب الفضائل - باب كان رسول الله(ﷺ) أحسن الناس خلقا، الرقم ٢٣١٠.

کەسێک باس بکردایە ئەوە بۆ تۆم باس دەکرد.[1]

ئەمەش بەجێگەیاندنی فەرمانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو کە یەکەم وەسیەتی بۆ ئەنەس بریتی بوو لە (يا بُني، اكْتُمْ سِري تكُ مُؤْمِنا)، (کوڕی شیرینم، نهێنییەکانم بپارێزە کەسێکی باوەڕدار دەبیت)، ئەنەس دەڵێت: ئیتر دایکم و خودی خێزانەکانی پێغەمبەر(ﷺ) سەبارەت بە نهێنی پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاریان لێدەکردم هیچم پێ نەدەوتن.[2]

ئەنەس دەگێڕێتەوە جارێک پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆماڵی ئوممو سولەیم و ئەویش بڕێک رۆن و خورمای بۆ هێنا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: خورماکەتان بکەنەوە ناو قاپەکەتان و رۆنەکەش بکەنەوە ناو قاپەکەی چونکە من بەرۆژووم، پاشان چوویە کونجێکی ماڵەکەو نوێژی سوننەتی بە جەماعەت کرد بۆمان، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) نزای کرد بۆ ئومموسولەیم و منداڵەکانی.[3]

ئەنەس لەگەڵ پێغەمبەری خوادا(ﷺ) لە هەریەک لە حودەیبیەو خەیبەر و عومرەی قەضاء و فەتحی مەککەو غەزای حونەین و طائیف و غەزاکانی دواتریشدا بەشداری کرد.[4]

رۆژێک ئەنەس داوایەکی لە پێغەمبەر(ﷺ) هەبوو، خۆی دەڵێت: داوام لێکرد لە قیامەتدا شەفاعەتم بۆ بکات، فەرمووی: دەیکەم، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) جا لە رۆژی دواییدا لە کوێ بتدۆزمەوە؟ فەرمووی: یەکەمجار کە بۆم گەڕایت لای صیراط بۆم بگەڕێ، منیش وتم: ئەی ئەگەر لەوێ نەمبینیت؟ فەرمووی: دەی لای میزانم، وتم: ئەی ئەگەر لەوێیش نەمبینیت؟ فەرمووی: دەی لای حەوزم، لە رۆژی دواییدا لەو سێ شوێنە تێناپەڕم.[5]

---

[1] صحيح مسلم - كتاب فضائل الصحابة - باب من فضائل أنس بن مالك(ﷺ)، الرقم ٢٤٨٢.
[2] مسند أبي يعلى الموصلي - مسند أنس بن مالك - شريك عن أنس، الرقم ٨٦٩
[3] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٣، ص٣٩٩.
[4] البداية والنهاية لابن كثير، ج٥، ص٣٣٢.
[5] مسند أحمد بن حنبل - مسند أنس بن مالك(ﷺ)، الرقم ١٠٣٢٢، جامع الترمذي - أبواب صفة القيامة والرقائق والورع عن رسول الله(ﷺ) - باب ما جاء في شأن الصراط، الرقم و قال حسن غريب، صححه شعيب الأرناؤوط.

ئەنەس دەیوت: هیوام وایە لە ڕۆژی دواییدا بگەم بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) و پێی بڵێم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەمە خزمەتکارە بچکۆلەکەی خۆتە.[1]

ئەنەس خۆشەویستییەکی وای بۆ پێغەمبەر(ﷺ) هەبوو تەنانەت خوو و خواردنیشی وەک خۆشەویست لێدەکرد، بۆ نموونە:

ئەنەس دەڵێت: جارێک لەگەڵ پێغەمبەری خوا(ﷺ) چووم بۆ خوانێک، نان و شلەیەک خرایە بەردەم پێغەمبەر(ﷺ) کە کوولەکەی تێدابوو، پێغەمبەریش(ﷺ) بەناو قاپەکەدا بەدوای کوولەکەکەدا دەگەڕا، ئیتر لەو کاتەوە هەتا ئەمڕۆ حەزم لە کوولەکەیە.[2]

سولەیمانی تەمیمی دەڵێت: هەرکات وەرزی کوولەکە بوایە، هەرچی بچووینایە بۆ لای ئەنەس، سەیرمان دەکرد شلەکەی کوولەکەی تێدابوو.[3]

جارێک ئەنەس کوولەکەی دەخوارد و دەیوت: چ بەرێکیت! تەنها لەبەرئەوە حەزم لێتە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) حەزی لێت بوو.[4]

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی دوایی کرد تەمەنی ئەنەس بیست سالان بوو.[5]

دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر(ﷺ) ئەنەس لە مەدینە نیشتەجێ بوو، دواتر لە فتووحاتی ئیسلامیدا بەشداری کرد، دواجار چوو بۆ بەصرەو لەوێ نیشتەجێ بوو،[6] لە بەصرە کۆشکێکی هەبوو بە ناوی (الطف) کە لەوێ نیشتەجێ دەبوو و هەر لەوێیش کۆچی دوایی کرد.[7]

کاتێک ئەبووبەکری صدیق بوو بە خەلیفەی موسڵمانان، ویستی زەکات و صەدەقەی بەحرەین کۆبکاتەوە، لەو کاتەدا عومەری کوڕی خەتتاب لای

---

(1) مسند أحمد بن حنبل - مسند أنس بن مالك(ﷺ)، الرقم ١٣٥٢١، صححه شعيب الأرناؤوط.

(2) صحيح البخاري - كتاب البيوع - باب ذكر الخياط، الرقم ٢٠٩٢.

(3) مسند أحمد بن حنبل - مسند أنس بن مالك(ﷺ)، الرقم ١٣٥٦٣.

(4) جامع الترمذي - أبواب الأطعمة عن رسول الله(ﷺ) - باب ما جاء في أكل الدباء، الرقم ١٩٧٨.

(5) الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص٢٠.

(6) الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٢٧.

(7) أسد الغابة، ج١، ص١٩٥.

ئەبووبەکر بوو، پێی وت: ئەنەس بنێرە، ئەویش ئەنەسی نارد، ئەنەس چوو و تا گەڕایەوە ئەبووبەکر کۆچی دوایی کردبوو.[1]

ئەنەس دەگێڕێتەوەو دەڵێت: گەڕامەوە بۆ ناو مەدینەو ئەو کات ئەبووبەکری صدیق کۆچی دوایی کردبوو، عومەری کوڕی خەتابیش شوێنی گرتبوویەوە، منیش بە عومەرم وت: دەستت هەڵبڕە با بەیعەتت پێ بدەم لەسەر ئەو شتەی بەیعەتم دا بە هاوڕێکەت تا بتوانم بەیعەتەکەم ببەمەسەر.[2]

ئەنەس یەکێک بوو لە بەشداربوانی جەنگی قادسیە، چونکە لە گێڕانەوەیەکدا وەسفی بەشداریکردنی ئیبن ئوم مەکتووم دەکات لەو جەنگەدا و دەڵێت: رۆژی قادسییە بینیم ئاڵایەکی رەشی بەدەستەوە بوو.[3]

ئەنەس لە فەتحی توتستوردا بەشداری کرد و بەرپرسی توستور کە ناوی هورمزان بوو لەگەڵ ئەنەس هات بۆ لای عومەری خەلیفەو موسڵمان بوو و موسڵمان بوونەکەشی زۆر بەراستی و حەق بوو.[4]

ثابت دەڵێت: جارێک لەگەڵ ئەنەسی کوڕی مالیک بووم، قەهرەمانە هات بۆ لای و تی زەویەکەمان تەواو تینووە نزا بکە خوا باران ببارێنێت، ئەو کاتیش وەرزی هاوین بوو، ئەنەس هەستاو دەستنوێژی گرت و چوویە دەرەوەو دوو رکات نوێژی کرد و دواتر نزای کرد، باران داباری تا هەموو شتەکان تێر بوون، ئینجا باران وەستایەوە، ئەنەس بە یەکێک لەوانەی دەورەی خۆی وت: بڕۆ بزانە تا کوێ باران باریوە، ئەویش چوو سەیری کرد هەر لە دەوروبەری زەویەکەی ئەو باران باریوە.[5]

زۆر جار ئەنەسی کوڕی مالیک خەوی دەبینی بە پێغەمبەری خواوە(ﷺ)،

---

[1] تاريخ الإسلام للذهبي، ج٦، ص٢٩٣.

[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص٢١.

[3] مسند أحمد بن حنبل - مسند أنس بن مالك(ﷺ)، الرقم ١٢٥٣٨، حسنه شعيب الأرناؤوط.

[4] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٣، ص٤٠٢.

[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٢٨.

تەنانەت دەیوت چی شەو هەیە خەو دەبینم بە خۆشەویستمەوە، پاشان دەستی دەکرد بە گریان،[1] چونکە تەواو تاسەی ئەوەی هەبوو بگاتەوە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ).

هەرکات باسی پێغەمبەری خوای(ﷺ) بکردایە و بیویستایە فەرموودەیەکی بگێڕێتەوە، ڕەنگی دەگۆڕا.[2]

لەو ماوەی ئەنەس لە بەصرە بوو نەخۆشی طاعوون بڵاوبوویەوەو بەو نەخۆشیە ژمارەیەکی زۆر لە منداڵەکانی مردن،[3] تەنانەت دەوترێت نزیکەی حەفتا یان هەشتا نەوەی بەو نەخۆشیە مردن.[4]

دوای ئەوەی یەزید مرد ئیبن زوبەیر نامەی نووسی بۆ ئەنەسی کوڕی مالیک و داوای لێکرد لە بەصرە بەرنوێژی بکات بۆ موسڵمانان، ئەویش چل ڕۆژ لە بەصرە بەرنوێژی کرد بۆ موسڵمانان.[5]

ثومامە دەڵێت: ئەنەس هێندە نوێژی دەکرد جار هەبوو خوێن لە قاچەکانی دەهات.[6]

ئەنەس لە بەصرەدا چوار خانووی هەبوو، یەکێکیان لای مزگەوتی بەصرە بوو، یەکێکیشیان لە دووری دوو فەرسەخ لە بەصرەوە بوو،[7] لەمەیاندا کۆچی دوایی کرد.

ئەنەسی کوڕی مالیک جارجارە دەچوو بۆ وڵاتی شام و سەردانی ئەوێی دەکرد و دەگەڕایەوە.[8]

پەیوەندی نێوان ئەنەسی کوڕی مالیک و حەججاجی کوڕی یووسفی

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص٢٠، سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٣، ص٤٠٣.
[2] المختار من مناقب الأخيار، ج١، ص ١٨٩.
[3] ابن العماد الحنبلي: شذرات الذهب، ج١، ص٧٦.
[4] تأريخ الإسلام للذهبي، ج٥، ص٦٦.
[5] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٣، ص٤٠٢.
[6] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٣، ص٤٠٠.
[7] تاريخ مدينة دمشق، ج٩، ص٣٣٦.
[8] تاريخ مدينة دمشق، ج٩، ص٣٣٩.

ئەقەفی باش نەبوو و حەججاج بێڕێزی بەرامبەری دەنواند، تەنانەت حەججاج وەک سووکایەتیەک بەرامبەری، مۆرێکی خۆی بەزۆر هەڵواسیبوو بە ملی ئەنەسدا.[1]

جارێک ئەنەسی کوڕی مالیک لەگەڵ حەججاجی کوڕی یووسفی ئەقەفیدا کێشەیان هەبوو، کاتێک فیتنەکەی ئیبنولئەشعەث هەبوو حەججا ج ڕێی دەگرت لە گەڕانی خەڵک، جارێک ئەنەسی کوڕی مالیکی بینی، حەجاج پێی وت: ئەی پیس دەگەڕێیت و جارێ لەگەڵ عەلی و جارێ لەگەڵ ئیبن زوبەیر و جارێ لەگەڵ ئیبنولئەشعەثدایت، سوێند بەوەی گیانمی بەدەستە ریشەکێشت دەکەم وەک چۆن تووک ریشەکێش دەکرێت و داتدەماڵم وەک چۆن (ضب)[2] دادەماڵرێ، ئەنەسیش وتی: ئەی ئەمیر مەبەستت کێیە؟ ئەویش وتی: تۆم مەبەستە خوا کەڕت بکات، ئەنەسیش گەڕایەوەو حەججاجیش سەرقاڵ بوو، عەلی کوڕی زەید دەڵێت: چووین بە دوای ئەنەسدا بۆ رەحبە، ئەویش وتی: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە منداڵەکانم بیرکەوتەوەو ترسم نەبوایە دوای خۆم ئازاریان بدات قسەیەکم پێ دەوت: کە هەرگیز شەرمی لێم نەمایە، ئینجا نامەی نووسی بۆ خەلیفە عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان و سکاڵای کرد لە دژی حەجاج، لە دەقێکی نامەکەیدا هاتووە من نۆ ساڵ خزمەتی پێغەمبەری خوام(ﷺ) کرد، سوێند بەخوا ئەگەر مەسیحیەکان بگەیشتنایە بە کەسێک کە خزمەتی پێغەمبەرەکەیانی کردبێت ڕێزیان دەگرت،[3] عەبدولمەلیکیش نامەیەکی نووسی بۆ حەجاج و بە توندی حەججاجی شکاند و لەسەر ئەو هەڵوێستەی سەرکۆنەی کرد و فەرمانی پێکرد بچێت داوای پۆزش لە ئەنەس بکات، حەججاج بە نێردراوەکەی وت: ئەمیری باوەڕداران ئەمەی نووسی؟ وتی: ئەرێ بەخوا، تا ئێستاش هێندەی

---

[1] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ١١٠.

[2] جۆرێک گیاندارە لە ناوچە عەرەبیەکان کە لە بزنەمژەی خۆمان دەچێت و عەرەبەکان دەیخۆن.

[3] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٣، ص٤٠٢.

ئەمە بە هیچ توورە نەبووە، حەججاج وتی: گوێڕایەڵی فەرمانی دەبم، ئینجا چوو بۆ لای ئەنەس.[١]

جارێک ئەنەسی کوڕی مالیک هات بۆ مەدینە، ئەوکات عومەری کوڕی عەبدولعەزیز والی مەدینە بوو، خێرا نێردراوێکی نارد بۆ لای ئەنەس تا سەبارەت بە ڕەنگکردنی مووی قژ و هەڵوێستی پێغەمبەر(ﷺ) لەو بارەوە پرسیاری لێ بکات.[٢]

ئەبووهورەیرە دەڵێت: کەسم نەدیوە هێندەی کوڕی ئومموسەلەمە –واتە ئەنەس- نوێژی لە نوێژی پێغەمبەر(ﷺ) بچێت.[٣]

جارێک ئەنەس چوو بۆ مزگەوت و لە دوای عومەری کوڕی عەبدولعەزیزەوە نوێژی نەکرد، عومەر پێی وت: بۆچی واتکرد؟ ئەویش وتی: من پێغەمبەری خوام(ﷺ) بینیوە چۆن نوێژی دەکرد، هەرکات نوێژەکەت لەوەی ئەو بچێت ئەوە لە دواتەوە نوێژەکە ئەکەم، ئەگەرنا نوێژەکەی خۆم دەکەم و دەچمەوە بۆماڵەوە.[٤]

دیارە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بە وردی بەدوای ئەو بابەتەدا ڕۆیشتووەو شێوازی نوێژی پێغەمبەری خوای(ﷺ) وەرگرتووە، بۆیە دواتر ئەنەس وەسفی نوێژی عومەری دەکرد و دەویت: کەسم نەدیوە هێندەی ئەم پێشەوایەتان نوێژی لە نوێژی پێغەمبەر(ﷺ) بچێت، جا عادەتی عومەر وابوو نوێژی درێژ نەدەکردەوە.[٥]

ئەنەس لە کۆتاییەکانی تەمەنیدا تووشی نەخۆشی(بەڵەکی) بوو و تەواو جەستەی لاواز بوو بە جۆرێک نەیدەتوانی ڕۆژوو بگرێت،[٦] ماوەی یەک

---

[١] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٣، ص٤٠٤.

[٢] تاريخ الإسلام للذهبي، ج١، ص٤٢٥.

[٣] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص٢٠، سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٣، ص٤٠٠، البدايةو النهاية لابن كثير، ج٥، ص٣٣٢.

[٤] مسند أحمد بن حنبل – مسند أنس بن مالك(ﷺ)، الرقم ١٢٦٨٠.

[٥] مسند أحمد بن حنبل – مسند أنس بن مالك(ﷺ)، الرقم ١٢٦٠٣.

[٦] تاريخ الإسلام للذهبي، ج٦، ص٢٩٥.

ساڵ پێش مردنی نەیتوانی ڕۆژوو بگرێت،[1] بۆیە تەشتێکی گەورە تشریبی ئامادە دەکرد و ٣٠ هەژاری بانگ دەکرد و نانی پێ دەدان.[2]

ئەنەسی کوڕی مالیک ماوەیەک پێش مەرگی بەوانەی دەوروبەری دەوت: تەلقینی لا إلە إلا اللە م پێ دابدەن، بەردەوام ئەوەی دەوت: تا گیانی سپارد.[3]

ئیمامی ذەهەبی دەڵێت: کۆتا هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) کە کۆچی دوایی کرد ئەنەسی کوڕی مالیک بوو.[4]

ئەنەس وەسیەتی کردبوو کە موحەممەدی کوڕی سیرین تەرمەکەی بشوات، بەلام لەو کاتەدا موحەممەد لەبەر قەرزاریەک بەند کرابوو، بۆیە ئازاد کرا تا تەرمەکەی ئەنەسی شۆرد و دواتر چوویەوە بۆ بەندیخانە.[5]

سەبارەت بە کاتی وەفاتی چەند رایەک هەیە، رایەک دەڵێت: لە ساڵی نەوەدی کۆچیدا وەفاتی کردووە، رایەکی تر دەڵێت: لە ساڵی نەوەدو یەکی کۆچی بووە، رایەکی تر دەڵێت: لە ساڵی نەوەدو سێی کۆچی بووە،[6] کاتێک کۆچی دوایی کرد تەمەنی نەوەدو نۆ ساڵ بوو، رایەکی تر دەڵێت: بەڵکو تەمەنی سەدو یەک ساڵ بوو، رایەکی تر دەڵێت: بەڵکو سەدو حەوت ساڵ بوو،[7] یان دەوترێت نەوەدو شەش ساڵ بوو،[8] یان دەوترێ سەدو بیست ساڵ بوو، بەڵام ئیبن ئەثیر وەلامی ئەو قسانە دەداتەوەو دەڵێت: ئەو تەمەنە زۆرانەی دەوترێن ڕاست نین چونکە کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی کرد بۆ مەدینە ئەنەس تەمەنی دە ساڵان بوو، زیاترین ماوەش لەسەر ساڵی وەفاتی هاتووە ساڵی نەوەدو سێی کۆچی بووە، دەی بەو پێیە

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص١٩.

[2] تاريخ الإسلام للذهبي، ج٦، ص٢٩٦.

[3] تاريخ مدينة دمشق، ج٩، ص٣٧٨.

[4] تاريخ الإسلام للذهبي، ج٦، ص٢٨٩.

[5] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص٢٥.

[6] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١١٠، البدايةو النهاية لابن كثير، ج٥، ص٣٣٢.

[7] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٢٧- ١٢٨.

[8] البدايةو النهاية لابن كثير، ج٥، ص٣٣٢.

زۆرترین ئەگەر بۆ تەمەنی سەدو سێ ساڵە.[١]

ئیمامی ذەهەبی رای راستتر دێنێت کە تەمەنی سەدو سێ ساڵ بووەو لە ساڵی نەوەدو سێی کۆچی وەفاتی کردووە.[٢]

ئەنەس لە بەصرە لەناو کۆشکەکەی خۆیدا (الطف) کۆچی دوایی کردو هەر لە نزیک بەصرە ئەسپەردە کرا،[٣] ئەو کۆتا هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوو کە لە بەصرە کۆچی دوایی کرد.[٤]

قەطە نی کوڕی مودریکی کیلابی نوێژی مردووی لەسەر کرد.[٥]

کاتێک ئەسپەردە کرا موویەکی پێغەمبەری خوای(ﷺ) لابوو لەژێر زمانیدا بوو، چونکە خۆی داوای کردبوو کە مرد ئەو مووە بخەنە ژێر زمانی و لەگەڵیدا ئەسپەردەی بکەن.[٦]

هەروەها گاڵۆکێکی بچووکی پێغەمبەری خوای(ﷺ) لابوو داوای کرد لەگەڵیدا ئەو گاڵۆکەش بخەنە کفنەکەیەوە، بۆیە ئەو گاڵۆکەش خرایە ناو کفنەکەی و لەگەڵیدا ئەسپەردە کرا.[٧]

ئەنەس کاتێک وەفاتی کرد نزیکەی سەد منداڵ و نەوەی خۆی دیبوو،[٨] چونکە پێغەمبەر(ﷺ) نزای بۆ کردبوو،[٩] ئەنەس خۆی دەڵێت: بە جوانی شوێنەواری نزای پێغەمبەر(ﷺ) لە سامان و منداڵمدا بەدیدەکەم.[١٠]

جارێک ئەنەسی کوڕی مالیک وتی: دەڵێن خۆشەویستی عوثمان و عەلی لە یەک دڵدا جێی نابێتەوە، خۆشەویستی عوثمان و عەلی لە دڵی ئێمەدا

---

[١] أسد الغابة، ج١، ص١٩٤.
[٢] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٣، ص٤٠٦.
[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٢٨.
[٤] البدايةو النهاية لابن كثير، ج٥، ص٣٣٢.
[٥] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١١٠.
[٦] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٢٧.
[٧] أسد الغابة، ج١، ص١٩٤.
[٨] البدايةو النهاية لابن كثير، ج٥، ص٣٣٢.
[٩] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١١١.
[١٠] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص٢٠.

کۆبوەتـەوە.[1]

ئەنـەس نزیکـەی دوو هـەزار و دوو سـەد و هەشـتاو شـەش فەرمـوودەی پێغەمبـەری خـوای(ﷺ) لێوە گێردراوەتـەوە،[2] زیـاد لـە دوو سـەد و هەشـتاو پێنـج هـاوەڵ و تابعـی فەرمووودەیـان لـە ئەنەسـەوە گێڕاوەتـەوە.

جەریـری کـوڕی عەبـدوڵا ماوەیـەک هاودەمـی ئەنەسـی کـوڕی مالیکـی دەکـرد، ئەنـەس دەڵێـت: هاودەمـی جەریـری کـوڕی عەبـدوڵام کـردووەو ئـەو خزمەتی دەکردم و دەیوت مـن پشـتیوانانم دیـون، ئـەوان خزمەتـی پێغەمبـەری خوایـان کـردووە، بۆیـە هەرکامیـان ببینـم خزمەتـی دەکـەم.[3]

**چەند فەرموودەیەک کە ئەنەسی کوڕی مالیک دەیانگێڕێتەوە:**

عـن أنـس بـن مالـک عـن النبـي(ﷺ) قـال: **(ثلاث من كن فيه وجد حلاوة الإيمان: أن يكون الله ورسوله أحب إليه مما سواهما، وأن يحب المرء لا يحبه إلا لله، وأن يكره أن يعود في الكفر كما يكره أن يقذف في النار).**[4]

لـە ئەنەسـی کـوڕی مالیکـەوە لـە پێغەمبـەری خـواوە(ﷺ) دەفەرموێت:(سـێ شت هـەن هـەر کـەس تیایـدا بـن چێژی ئیمانـی بـەدی کـردووە، ئـەوەی خـواو پێغەمبـەری خـوای لـە هەمـوو کـەس خۆشـتر بوێـت، وە هـەر کەسـی خـۆش ویسـت تەنهـا لەبـەر خـوا خۆشـی بوێـت، وە حـەز نـەکات بگەڕێتـەوە بـۆ بێبـاوەڕی وەک چـۆن حـەز نـاکات فـڕێ درێتـە نـاو ئاگـر).

**عن أنس بن مالك عن النبي(ﷺ) قال:(يسروا ولا تعسروا، وبشروا، ولا تنفروا).**[5]

لـە ئەنەسـەوە لـە پێغەمبـەری خـواوە(ﷺ) دەفەرموێت:(ئاسـانکاری بکـەن و بـاری خەڵـک قـورس مەکـەن، موژدەبەخـش بـن و کـەس مەتۆرێنـن).

ئەمـە ئاکارو رەوشتی کەسی باوەڕدارە کە هەمیشـە لە بازنەی شـەریعەتی

---

[1] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٣، ص٤٠٥.
[2] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٣، ص٤٠٦.
[3] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٣، ص٤٠١.
[4] صحيح البخاري - كتاب الإيمان - باب حلاوة الإيمان، الرقم ١٦.
[5] صحيح البخاري - كتاب العلم - باب ما كان النبي(ﷺ) يتخولهم بالموعظة والعلم كي لا ينفروا، الرقم ٦٩.

خـوای گـەورەدا ئاسـانکاری و بـزەو رووخۆشـی و مـوژدەی هەبێـت نـەک بنەمـای تـرس و تۆرانـدن و قسـەزبری بگرێتەبـەر، هـاوکات ئـەم فەرمـوودە لەلایـەن کەسـانێکەوە کـراوە بـە بەڵگـە بـۆ بۆچوونێکـی ناراسـت کـە پێیـان وایە نابێت مەسـەلەکانی ترسـاندن (کـە خـوای گـەورە باسـی کـردون) بخرێنـە بەربـاس، چونکـە ئەوانـەش ترسـاندن دەگرنـەوە، بەڵکـو بانگـەوازی خـوای گەورە لەسـەر بنەمـای مـوژدەو ترسـاندنە (بشـيرا و نذيرا)، هـەر بانگەوازێکیش یەکێـک لـەو دوانـەی کـەم بـوو یـان نەبـوو یـان مافـی هەرکامیانـی کـەم کـردەوە سـەرکەوتوو نیـەو لای خـوای گـەورە ویسـتراو نیـە، موژدەبەخشـی هەنـگاوی یەکەمـەو دواتـر هەنـگاوی دووەم دێـت کـە ئاگادارکردنەوەیـە لـە سـزاکانی خـوای گـەورە.

هەندێکی تر ئـەم فەرمـوودەو هاوشـێوەکانی دەکەنـە بەڵگـە بـۆ شـلگیری لـە راستیەکان و چاوپۆشـی لـە سـنوورەکانی خـوای گـەورە کـە دووبـارە ئەمـەش نارەوایـەو سـنوورەکانی خـوا هـی بەزانـدن نیـن تەنانـەت هـی ئـەوەش نیـن لێیـان نزیـک بیتـەوە (تلك حدود الله فلا تقربوها).

عن أنس بن مالك قال : قال رسول الله(ﷺ):(إن من أشراط الساعة أن يرفع العلم ويثبت الجهل ويشرب الخمر ويظهر الزنا).[1]

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(لە نیشـانەکانی رۆژی دوایـی ئەوەیـە زانسـت هەڵدەگیرێـت و نەزانـی دەچەسـپێت و مـەی دەخورێتـەوەو زینـا و داوێـن پیسـی دەردەکەوێـت).

بـە داخـەوە ئەمـڕۆ ئـەو نیشـانانە دەرکەوتنیـان روو لـە زیادیـە، وەک لـە فەرمـودەی صەحیحـدا هاتـووە هەڵگیرانـی زانسـت بـە مەرگـی زانایـان دەبێـت، بـەدوای ئـەوەدا نەزانـی بـڵاو دەبێتـەوەو کەسـانێک دەردەکـەون کـە ئەرکـی بانگـەواز دەگرنـە ئەسـتۆ کـە هـەم خۆیـان گومـڕان و هـەم خەڵکیش گومـڕا دەکـەن، مـەی خواردنـەوەو زینـای بـە ئاشـکراش بـە داخـەوە زۆر بـڵاون، خـوای

[1] صحيح البخاري - كتاب العلم - باب رفع العلم وظهور الجهل، الرقم ٨٠

گەورە ئەو دەردانەمان لەسەر هەڵگرێت.

**عن أنس بن مالك عن النبي(ﷺ) قال:(اسمعوا وأطيعوا وإن استعمل عليكم عبد حبشي كأن رأسه زبيبة).[1]**

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەفەرموێت:(گوێگر و گوێڕایەڵ بن با تەنانەت کۆیلەیەکی حەبەشی بەرپرستان بێت کە سەری وەک مێوژ -رەش- بێت).

ئەم فەرموودە چەند پرسێک لەخۆ دەگرێت:

یەکەم: گوێڕایەڵی سەرکردەی موسڵمانان کە مەرجەکانی موسڵمانێتی تێدا بێت و بە شەریعەتی خوا حوکم بکات با ستەمە دنیاییەکانیشی هەبێت یان هەندێ لادانی هەبێت مادەم نەچێتە بازنەی چوونەدەرەوەی لە ئیسلام و دژایەتی نەکردنی شەریعەتی خوا، گوێڕایەڵی کردنی واجبە و دروست نیە دووبەرەکی لە نێوان موسڵماناندا هەبێت، هەرچەندە ئەم مەسەلە راجیایی لەسەرە کە ئایا ئەو گوێڕایەڵیە بۆ چ کەسێک دەبێت، وەک ئیجتیهادەکەی حوسەینی کوڕی عەلی کە گوێڕایەڵی بۆ یەزید بە رەوا نەزانی.

دووەم: رایەک پێی وایە ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دەکرێت خەلیفە ئەگەر قورەیشیش نەبوو بە خەلیفە دابنرێت و گوێڕایەڵی بۆی واجبە وک چۆن پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی با حەبەشیەکی سەررەشیش بێت، هەرچەندە دووبارە ئەم مەسەلەش راجیایی لەسەرە، هەر لەسەر بنەمای ئەم فەرموودە و هاوشێوەکانی ماوەی دەسەڵاتی مەملووکی و عوثمانی بە ماوەی دەسەڵاتی ئیسلامی دادەنرێت و دەسەلاتی سوڵتانە عوثمانیەکان وەک دەسەڵاتی ئومەوی و عەبباسیەکان سەیر دەکرێت لەلایەن بەشێک لە موسڵمانانەوە.

ئەنەسی کوڕی مالیک دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) دای بە لای ئافرەتێکدا کە لا گۆڕێ بوو و دەگریا، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: (لەخوا بترسە و صەبرت

[1] صحيح البخاري - كتاب الأحكام - باب السمع والطاعة للإمام ما لم تكن معصية، الرقم ٧١٤٢.

هەبێـت)، ئافرەتەکـە وتـی: وازم لـێ بهێنـە تـۆ دەردی منـت تـووش نەبـووە و نایزانیـت، بـە ئافرەتەکـە وتـرا ئـەوە پێغەمبـەری خوایـە، ئەویـش چوویـە بـەردەرگای ماڵـی پێغەمبـەر(ﷺ) و دەرگاوانـی بـەدی نەکـرد، بـە پێغەمبـەری خـوای(ﷺ) وت: نەمناسیت، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمـووی: (إنما الصبر عند الصدمة الأولى)،[1] (خۆڕاگـری لەیەکـەم بەرکەوتنداـیـە).

ئەمـە ئاگادارکردنەوەیەکـی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) بـوو بـۆ ئـەو ئافرەتـە تـا دوو وانـەی پەیوەسـت بـە یەکـی لـە دوو وشـەدا فێـر بـکات، لەخواترسـان: چونکـە بەراسـتی خـوای گـەورە هەنـدێ هێڵـی سـووری دانـاوە کـە بریتیـن لـە قەدەغەکـراوەکان، شـین و گریانـی لـە سـنووردەرچوو یەکێکـە لـەو قەدەغەکراوانـە، خۆڕاگـری: وەک ئـەوەی پێـی رابگەیەنێـت ئازارەکـە هەیـەو راسـتە بـەلام پێویسـتی بـە خۆڕاگرتـن هەیـە، چونکـە خۆڕاگـری لەبەرامبـەر ئازاردا دەبێت، ئەگەرنـا لـە هیچی هیـچ نەبوو خۆڕاگری رۆڵـی نابێت، بۆیـە هەرچەنـدە ئازارەکـە هەیـە بـەڵام خۆڕاگـری ویسـتی خوایـە تـا بەنـدەکان بیگرنەبـەر، وەک لـە چەندیـن ئایـەت و فەرمـوودەدا ئامـاژەی پێـدراوە.

عن أنس بن مالک قال قال النبی(ﷺ) :(تسحروا فإن في السحور بركة).[2]

لـە ئەنەسـی کـوڕی مالیکـەوە دەڵێـت: پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمووی:(پارشـێو بکـەن چونکـە لـە پارشـێودا بەرەکـەت هەیـە).

ئەمە هەم ڕێنماییەکی پێغەمبەری خوایە(ﷺ) بۆ موسڵمانان، هەم نیشـاندانی لووتکەی دڵسۆزی پێغەمبـەری خوایە کە چی چاکەیەکی پێ گەیەنرابێت بە تـەواوی و دروسـتی گەیاندوویەتـی، هەروەهـا موژدەیەکە بۆ موسڵمان کە کات و جۆرێکی بەرەکەت بزانێت تا بتوانێت لێی سوودمەند بێت، تەنانەت ئەو کەسـانەش کە رۆژو ناگرن واتە توانـای رۆژووگرتنیان نیە هـاودەم بە ئەندامانی رۆژووگری ماڵەوە هەستن بۆ پارشێو باشترە تا بەر ئەو بەرەکەتە

---

[1] صحیح البخاري - کتاب الجنائز - باب زیارة القبور، الرقم ١٢٨٣.

[2] صحیح البخاري - کتاب الصوم - باب برکة السحور من غیر إیجاب، الرقم ١٩٢٣.

بکەون، ئیدی ئەگەر بەرەکەتەکە پەیوەست بوو بە رۆژووەکەشیەوە ئەوە بەو پارشێوە زیانی بەرناکەوێت، ئەگەریش بەرەکەتەکە پەیوەست بوو بە خودی پارشێوەکەوە ئەوە ئەو بەرەکەتەی بەردەکەوێت.

عن أنس بن مالك قال :(كنا نسافر مع النبي(ﷺ) فلم يعب الصائم على المفطر، ولا المفطر على الصائم).[1]

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەڵێت: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) سەفەرمان دەکرد، ئەوەی بەڕۆژوو بوایە رەخنە و تانەی نەبوو بۆ ئەوەی رۆژووی دەشکاند، ئەوەش کە بەرۆژوو نەبوو رەخنەو تانەی نەبوو بۆ ئەوەی بەرۆژوو بوو)، جگە لە بوخاری ئەوانی تر هێناویانە کە سەفەرەکە لە رەمەزاندا بوو.

ئەمە رەوشتی بەرزی موسڵمانە کە لە هاوەڵانەوە فێر ببێت لە مەسەلە خیلافیەکاندا (کە هەردوو بۆچوونەکە بەڵگەی صەحیحیان لەسەرە)، یان لەو مەسەلانەدا کە روخصەت و عەزیمەتیان هەیە، پەیڕەوکردنی هەر دوو بۆچوونەکە بۆ یەکدی قبووڵ بکەن نەک ئەوەی بنەونە قسەکردن و لێدانی یەکدی، بەراستی ئاکاری موسڵمان ئەوە نیە لەسەر راجیاییەکی لاوەکی نێوانیان بنەوێتە لێدانی براکەی، زۆرجار هەردوو راکەش لە ئیسلامدا قبووڵ کراون، بە داخەوە لە چەند ماوەیەکی مێژووی ئیسلامیدا ئەو هەڵەیە تووشی موسڵمانان بووە کە ویستوویانە راسەپێنی مەزهەبییان هەبێت و لەو ئەنجامەشەوە خوێنێکی زۆری حەرامکراو رژاوەو سنووری ئەو برایەتییەی بە ئایەت و فەرمووده دانراوه بەزێنراوە، ئەمڕۆش یەکێکە لەو قۆناغە تاڵانەی کە دڵی موسڵمانان پێی ئازار دەچێژێت و لە خوای گەورە داواکارین دڵ و دەم و دەستی موسڵمانان لە یەکدی بپارێزێت.

عن أنس بن مالک قال قال رسول الله(ﷺ) قال :(ما من مسلم يغرس غرسا أو يزرع زرعا فيأكل منه طير أو إنسان أو بهيمة إلا كان له به صدقة).[2]

---

[1] صحيح البخاري - كتاب الصوم - باب لم يعب أصحاب النبي(ﷺ) بعضهم بعضا في الصوم والإفطار، الرقم ١٩٤٧.
[2] صحيح البخاري - كتاب الحرث والمزارعة - باب فضل الزرع والغرس إذا أكل منه، الرقم ٢٣٢٠.

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی:(هەر موسڵمانێک ڕوێنراوێک بڕوێنێت یان چێنراوی بچێنێ ئیتر باڵندەیەک یان مرۆڤێک یان گیانداریێک لێی بخوات ئەوە بەوە چاکەی بۆ هەیە).

ئەمە هاندانێکی گەورەی ئیسلامە بۆ سەوزکردنی سەرزەوی و ڕازاندنەوەی بە دار و درەخت بە تایبەت دارە بەردارەکان کە هەم سەوزی و جوانی دەبەخشن و هەم بەرهەمی خۆراکیش دەبەخشن بۆ هەریەک لە مرۆڤ و زیندەوەرانی تریش، هەروەها گوێدانی ئیسلامە بە گیاندار و زیندەوەرانی تر و دانانی پاداشتە بۆ هەر چاکە کردنێ لەگەڵیان، هەروەها ئاماژەیە بە پاداشتی کاری چاکەی موسڵمان با بە تایبەتیش نیەتی لێ نەهێنێت، مادەم موسڵمانەو کارێکی چاکە دەکات تەنها ڕووپامایی نەوێت ئەگەر نیەتیشی لێ نەهێنێ ئەوە هەر پاداشتی بۆ دەنووسرێت، چونکە بنەڕەتی باوەڕی موسڵمان و خۆ تەسلیم کردنی بە خوای گەورە واتای ئەوەیە چاکەکان دەکات بۆ ڕەزامەندی خوای گەورە و خۆی لە خراپە دەپارێزێت لەبەر خوای گەورە، وەک لە فەرمودەی تری صەحیحدا هاتووە پێغەمبەر(ﷺ) باس لەوە دەکات ژن و مێردی موسڵمان کاتێک دەچنە لای یەکتر پاداشتیان بۆ هەیە، کاتێک پرسیاری لێکرا ئەوان بۆ خۆشی خۆیانە ئیتر بۆچی پاداشت وەربگرن؟ فەرمووی: ئەگەر لە حەرامدا بێت گوناهیان بۆ نیە؟ دەی لە حەڵاڵیشدا پاداشتیان بۆ هەیە، ئەمە ڕوانینی بەرفراوانی ئیسلامەو ئەمەش ڕەحمی گەورەی خوایە بۆ موسڵمان.

## ١٥٧. ئەنەسی کوڕی مالیکی قوشەیری(رضي الله عنه):

ناوی ئەنەسی کوڕی مالیکی قوشەیری یان دەوترێت کەعبیە، کونیەکەی ئەبو ئومەییەیە،[١] یان دەوترێت ئەبوو ئومەیمە،[٢] ناوی لە هاوەڵانی

[١] أسد الغابة، ج١، ص ١٩٢.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٢٩.

نیشتەجێی بەصرەدا هاتووە.[1]

ئەنەس دەڵێت: جارێک وشترێکم برابوو، چوومە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، لەو کاتەدا کە چوومە خزمەتی سەرقاڵی خواردن بوو، بانگی کردم تا نانی لەگەڵ بخۆم، منیش وتم: بەرۆژووم، فەرمووی: نزیک بەرەوە، با قسەت بۆ بکەم (إن الله تعالى وضع عنِ الْمُسافِرِ الصوْم وشطْر الصلاةِ، وعنِ الْحامِلِ أوِ الْمُرْضِعِ الصوْم أوِ الصيام)، (خوای گەورە لەسەر گەشتیار رۆژوو و نیوەی نوێژی هەڵگرتووە، هەروەها لە سەر ئافرەتی سکپڕ و شیردەر رۆژووی هەڵگرتووە)، دواتر ئەنەس دەیوت خۆزگە لەو نانەم دەخوارد کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) بانگی کرد تا لێی بخۆم.[2]

شەوکانی لە (نيل الأوطار) دا سەبارەت بەم فەرموودەیە دەڵێت:(فەرموودەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەسی گەشتیار (موسافیر) هیچ رۆژووی لەسەر نیە... نوێژیش بە کورتکردنەوە دەکات...بۆ سکپڕ و شیردەریش دروستە رۆژوو بشکێنن، زانایان و فیقهناسان دەڵێن ئەگەر شیردەر لە ساواکەی و سکپڕ لە کۆرپەکەی ترسیان هەبوو زیانی پێ بگات دەتوانن رۆژوو بشکێنن، دەشڵێن بە حەتمی دەبێت رۆژوو بشکێنێت، ئەبوو طالیب دەڵێت: هیچ خیلافێک لەوەدا نیە کە دروستە ئەوانە رۆژوو بشکێنن،...هەندێ لە زانایان دەڵێن سکپڕ و شیردەر رۆژوو دەشکێنن و دواتر دەیگرنەوەو فیدیەکەشی دەدەن، سوفیان و مالیک و شافیعی و ئەحمەد ئەمە دەڵێن، هەندێ زانای تر دەڵێن رۆژوو دەشکێنن و فیدیەکەی دەدەنەوەو رۆژوو گرتنەوەیان لەسەر نیە، ئەگەریش ویستیان رۆژووەکە دەگرنەوەو فیدیەدانیان لەسەر نیە، ئیسحاق ئەم رایەی هەیە، هەریەک لە ئەوزاعی و زوهری و شافیعی (لە رایەکیدا) پێیان وایە پێویست ناکات لەگەڵ رۆژووگرتنەوەکەدا فیدیەکەی

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص ١٩٢، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٢٩.

[2] جامع الترمذي – أبواب الصوم عن رسول الله(ﷺ) – باب ما جاء في الرخصة في الإفطار للحبلى والمرضع، الرقم ٧١٥ وحسنه.

بدات، هەروەها مالیکو شافیعیش (لە رایەکیدا) پێیان وایە شیردەر هەم رۆژووگرتنەوەو هەم فیدیەکەشی لەسەرە، بەڵام سکپڕ ئەوەی لەسەر نیەو تەنها گرتنەوەی رۆژووەکەی لەسەرە چونکە وەک نەخۆش وایە.[1]

مەبەست بە کورتکردنەوەی نوێژەکان کە نیوەیان دەکەیت، یانی لە سەفەردا ئەو نوێژانەی چوار رکاتین دەکرێن بە دوو رکات،[2] واتە نوێژی نیوەڕۆ و عەسر و خەوتنان (عیشا) بە دوو رکات دەکرێن، ئەمەش ئاسانکاریەکە خوای گەورە دایناوە بۆ بەندەکانی وەک خوای گەورە خۆی بە بەندەکانی رادەگەیەنێت ئاسانکاری دەوێت بۆیان (يُرِيدُ اللهُ بِكُمُ الْيُسرْ ولا يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسرْ)،[3] (خوای گەورە ئاسانکاری دەوێت بۆتان و سەختی ناوێت بۆتان).

## ١٥٨. ئەنەسی کوڕی مەخاشن(ﷺ):

تەنها ئیبن حەجەر باسی کردووەو دەڵێت: دوو فەرموودەی پێغەمبەری خوای(ﷺ) لە موسنەدی بەقی کوڕی موخەلەددا گێڕاوەتەوە.[4]

## ١٥٩. ئەنەسی کوڕی مەرثەد(ﷺ):

ناوی ئەنەسی کوڕی ئەبی مەرثەدەو لە پشتیوانانە، بەڵام ئیبن مەندەو ئەبوو نوعەیم دەڵێن لە پشتیوانان نیە، دەوترێت بەڵکو ناوی ئونەیسە، خۆیشی و باوکیشی هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بون،[5] بەشدار بووە لە فەتحی مەککەدا، هەروەها لەغەزای حونەیندا بەشداری کردووە.[6]

---

[1] الشوكاني: نيل الاوطار، دار الجيل(بيروت- ١٩٧٣)، ج٤، ص٣١٣.
[2] محمد عبدالرحمن المباركفوري: تحفة الأحوذي، دار الكتب العلمية، بيروت، ج٣، ص٣٢٠.
[3] البقرة: ١٨٥.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٢٩.
[5] أسد الغابة، ج١، ص١٩٧.
[6] البدايةو النهاية لابن كثير، ج٦، ص٣٥٤.

دەوترێت بەڵکو ناوی ئونەیسی کوڕی مەرثەدەو ئەبی مەرثەد باپیریەتی و هەریەک لە ئونەیس و باوکی و باپیریشی هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بون، باوک و باپیری لە غەزای بەدردا بەشدار بون.[1]

شەوێک پێش جەنگی حونەین پێغەمبەر(ﷺ) بە هاوەڵانی فەرموو: کێ ئەمشەو پاسەوانیمان دەکات، ئەنەسی کوڕی ئەبی مەرثەد وتی: من ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئەویش فەرمووی: دەی سەرکەوە، ئەنەسیش سواری ئەسپێکی خۆی بوو، دواتر هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێی فەرموو: (استقبل هذا الشعب حتى تكون في أعلاه ولا تغرن من قبلك الليلة)، (برۆ بۆ ئەو شیوە تا دەچیتە بەرزاییەکەی، ئەمشەویش ئەوەی لەپێشتەوەیە هەڵتنەخڵەتێنێت و تەمات نەبات)، بۆ بەیانی پێغەمبەر(ﷺ) لەکاتی نوێژدا بە هاوەڵانی فەرموو: (أحسستم فارسكم)، (ئەرێ ئەوە سوارچاکەکەتان نەبینیوە؟)، وتیان: نا ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، پێغەمبەر(ﷺ) دەستی کرد بە نوێژو لەکاتی نوێژەکەشدا لای دەکردەوە بە لای شیوەکەدا، کە نوێژی تەواو کرد فەرمووی: (أبشروا فقد جاء فارسكم)، (موژدەتان لێ بێت وا سوارچاکەکەتان هات)، سەیرمان کرد دەبینین هات تا لای پێغەمبەر(ﷺ) وەستا، وتی: ئەمشەو لەبەرزایی ئەو شیوەوە بووم تا بەیانی، بۆ بەیانی سەیری هەردوو لای شیوەکەم کرد و کەسم نەدی، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئایا ئەمشەو دابەزیت؟) وتی: نا مەگەر بەس بۆ نوێژ یان پێویستی (دەست بەئاو گەیاندن)، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: (فقد أوجبت فلا عليك أن لا تعمل بعدها)،[2] (بەهەشتت بۆ خۆت واجب کرد ئیتر لەسەرت نیە دوای ئەمە کار بکەیت).

لەمانگی رەبیعولئەوەلی ساڵی بیستی کۆچیدا کۆچی دوایی کرد.[3]

[1] تاريخ الإسلام للذهبي، ج٣، ص٧٧ و ج٣، ص٢٠٧، البدايةو النهاية لابن كثير، ج٦، ص٣٥٤.

[2] سنن أبي داود - كتاب الجهاد - باب في فضل الحرس في سبيل الله عز وجل، الرقم ٢٤٩٧، المستدرك على الصحيحين - كتاب الجهاد - حرمت النار على عين دمعت من خشية الله حرمت النار على عين سهرت في سبيل الله، الرقم ٢٤٤٧، صححه ووافقه الذهبي في التلخيص، صححه الألباني في صحيح وضعيف سنن أبي داود، الرقم٢٥٠١.

[3] البدايةو النهاية لابن كثير، ج٧، ص١٠٢.

ئیبن حەجەر لە (فتح الباری) لە شەرحی صەحیحی بوخاریدا دەڵێت: لەوانەیە ئەمە کۆتا پاسەوانی بووبێت بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە لە غەزای حونەیندا ئەنەسی کوڕی مەرثەد پاسەوانی کردووەو ئیتر دوای ئەو جەنگە خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاندووە (واللهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ)،[1] واتە دوای غەزای حونەین پاسەوانی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) نەما.[2]

## ١٦٠. ئەنەسی کوڕی مودریک(رضي الله عنه):

ناوی ئەنەسی کوڕی مودریکی کوڕی کەعبی کوڕی عەمری کوڕی سەعدە، کونیەکەی ئەبوو سوفیانە، شاعیرێکی ناسراو بوو،[3] لە سەردەمی نەفامیدا گەورەو سوارچاکی خەثعەم بووە.[4]

دواتر موسڵمان بووەو بە موسڵمانی ژیا تا سەردەمی خەلیفە عەلی کوڕی ئەبوو طالیب و لە کووفە نیشتەجێ بوو، لە جەنگدا لە سوپاکەی عەلی کوڕی ئەبوو تالیبدا بەشدار بوو، دەوترێت تەمەنی زۆر بووەو نزیکەی سەدو پەنجاو چوار ساڵ ژیاوە.[5] بەڵام لە راستیدا ئەم قسەیە جێی گومانە، چونکە کەسێک لە تەمەنی ١٥٤ ساڵیدا چۆن توانای بەشداری جەنگی هەبووە تا لە جەنگدا بکوژرێت بەتایبەت جەنگێک کە لە نێوان موسڵماناندا بووبێت.

## ١٦١. ئەنەسی کوڕی موعاذ(رضي الله عنه):

ناوی ئەنەسی کوڕی موعاذی کوڕی ئەنەسی کوڕی قەیسە، دەشوترێ بەڵکو ناوی ئونەیسە،[6] برایەکی هەبوو بە ناوی ئوبەی.[7]

---

[1] المائدة: ٦٧.

[2] فتح الباري شرح صحيح البخاري لابن حجر العسقلاني، ج١٣، ص١٩.

[3] أسد الغابة، ج١، ص١٩٥.

[4] لإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٣٠.

[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٣٠.

[6] أسد الغابة، ج١، ص١٩٧.

[7] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٧٠، أسد الغابة، ج١، ص٨١

ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان لە بەنی نەجار، ئەنەس دوای خۆی هیچ نەوەیەکی جێ نەهێشتووە.[1]

ئەم دوو برایە هەردووکیان بەشداری هەردوو جەنگی بەدر و ئوحودیان کرد و لە خزمەتکردنی ئایینی ئیسلامدا بەردەوام بوون تا لە رۆژی بیئر مەعوونە هەردووکیان شەهید بوون.[2]

هەروەها هاتووە کە ئەنەس بەشدار بووە لە غەزای خەندەقیشدا، پاشان ژیا تا لە سەردەمی خیلافەتی عوثمانی کوڕی عەففاندا کۆچی دوایی کرد،[3] ئەم بۆچوونەیان راستترە چونکە ذەهەبیش ئەم رایەی هێناوە،[4] هەروەها ئیبن کەثیریش هەمان رای هێناوە کە لە سەردەمی عوثماندا مردووە.[5]

## ١٦٣. ئەنەسی کوڕی نەضر(ﷺ):

ناوی ئەنەسی کوڕی نەضری کوڕی ضەمضەمە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان، مامی ئەنەسی کوڕی مالیکە،[6] برای روبەیعی کچی نەضرە.[7]

جارێک روبەیعی خوشکی دانی دراوسێیەکیانی شکاندبوو، ئەنەس و کەسوکاری داوایان کرد بیانبوورن، بەلام ئەوان رازی نەبوون و داوای تۆڵەیان کرد، هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و ئەویش فەرمانی قیصاصی کرد، ئەنەس وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دانی روبەیع بشکێنن؟ نا سوێند بەوەی تۆی بە حەق ناردووە ئەوە ناکەن، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:

[1] أسد الغابة، ج١، ص١٩٧.
[2] أسد الغابة، ج١، ص٨١، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٠.
[3] أسد الغابة، ج١، ص١٩٧.
[4] تاريخ الإسلام للذهبي، ج٣، ص٣٣٧.
[5] البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص٢٢٠.
[6] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٠٨، أسد الغابة، ج١، ص١٩٨، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٣٢.
[7] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٦٤٢

ئەی ئەنەس کتێبی خوا بریتیە لە قیصاص_واتە ئەوەی داناوە-، ئەوەبوو بەرامبەرەکە رازی بوون و لێی خۆش بوون، پێغەمبەری خوایش(ﷺ) فەرموی (إن من عباد الله من لو أقسم على الله لأبره)،[1] (لە بەندەکانی خوا کەسانێ هەن کە ئەگەر سوێندی خوا بدەن خوا سوێندەکەیان ناشکێنێت).

ئەنەس نەیتوانی لە جەنگی بەدردا بەشدار بێت، بۆیە دوای جەنگی بەدر چوویە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە یەکەم جەنگدا کە دژ بە بێباوەڕان ئەنجامت دا من ئامادە نەبووم، سوێند بەخوا ئەگەر ئەمجار خوا دەرفەتم بدات جەنگی بێباوەڕان ببینم و بەشدار بم تیایدا خوای گەورە دەبینێت چی دەکەم، ئەوەبوو جەنگی ئوحود هات و تیایدا ئەنەسی کوڕی نەضریش بەشداری کرد، کاتێک موسڵمانان شکان و بڵاوەیان تێکەوت ئەنەس وتی: خوایە من پۆزش دێنمەوە لەوەی ئەوانە کردیان-واتە موسڵمانەکان- وە لەبەردەم تۆدا دوورەپەرێز دەبم و تەبەرا دەکەم لەوەی ئەوانە بۆی هاتون و دەیکەن-واتە بێباوەڕان-، دواتر لێنەوی، سەعدی کوڕی موعاذی بینی وتی: ئەی سەعد ئەوە بەهەشتە لە خواروو ئوحودەوە سوێند بەخوا بۆنی دەکەم، سەعد دەڵێت: ئەوەی ئەنەس کردی من نەمتوانی بیکەم، ئەوەبوو ئەنەس لەو جەنگەدا شەهید بوو، ئەنەسی کوڕی مالیک دەڵێت: ئەنەسی مامم نزیکەی هەشتاو ئەوەندە جار بەرکەوتبوو و تیر و شمشێر و ڕم بەر جەستەی کەوتبوو، دواتر چوون بۆ دۆزینەوەی تەرمەکەی، وا تەرمی شێوێنرا بوو کە نەدەناسرایەوە، روبەیعی خوشکی دەڵێت: تەنها بە سەرەپەنجەکەیدا زانیم ئەوە ئەنەسی برامە، ئەنەسی کوڕی مالیک دەڵێت: ئێمە وا دەمانزانی ئەم ئایەتە لەسەر ئەنەسی کوڕی نەضر و هاوشێوەکانی دابەزیوە (من المؤمنين رجال صدقوا ما عاهدوا الله عليه). [2]

[1] صحيح البخاري - كتاب الصلح - باب الصلح في الدية، الرقم ٢٧٠٣.

[2] صحيح البخاري - كتاب الجهاد والسير - باب قول الله تعالى من المؤمنين رجال صدقوا ما عاهدوا الله عليه، الرقم ٢٨٠٥.

الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٦٤٢.

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە کە موسڵمانان لە ئوحود شپرزە بوون و ئیبلیسی نەفرەتی هاواری کرد: موحەممەد کوژرا، ئەنەسی کوڕی نەضر بەردەوام دەجەنگا، عومەر و دەستەیەک لە موسڵمانانی بینی دەستیان هەڵگرتبوو، وتی: ئەوە بۆچی دانیشتون؟ وتیان پێغەمبەری خوا(ﷺ) کوژرا، ئەنەس وتی: ئەی دوای ئەو ژیانتان بۆ چیە؟ هەستن و ئێوەش لەسەر هەمان شت بمرن کە پێغەمبەر(ﷺ) لەسەری مرد، ئەنەس بە شمشێرەکەی دەستیەوە دەستی لە جەنگ هەڵنەگرت هەتا کوژرا.[1]

## ١٦٣. ئەنەسی کوڕی ئەرقەم(رضي الله عنه):

ناوی ئەنەسی کوڕی ئەرقەمی کوڕی زەیدەو لە هاوەڵە پشتیوانەکانە لە خەزرەجیەکان،[2] هیچ فەرمودەیەکی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) نەگێڕاوەتەوە، بەڵام لە جەنگ و غەزادا لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بەشداری کردووەو لە ساڵی سێیەمی کۆچی و لە جەنگی ئوحوددا شەهید بوو و پێغەمبەریش(ﷺ) شایەتی دا بۆ شەهید بوونەکەی.[3]

## ١٦٤. ئەنەسی کوڕی ئەوس(رضي الله عنه):

ناوی ئەنەسی کوڕی ئەوسی کوڕی عەتیکی کوڕی عەمرە، لە هاوەڵە پشتیوانیەکانە[4] لە بەنی عەبدولئەشهەل،[5] لە ئوحودو خەندەقدا بەشداری کرد، رایەک دەڵێت: لە خەندەقدا شەهید بوو، خالیدی کوڕی وەلید تیرێکی هاویشت و کوشتی.[6]

---

[1] المختار من مناقب الأخيار، ج١، ص ١٩١.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ١٢٠.
[3] أسد الغابة، ج١، ص ١٨٤.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٢١.
[5] تاريخ الإسلام للذهبي، ج٢، ص٣٠٥، البدايةو النهاية، ج٤، ص١١٥.
[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٢١.

لە جەنگی خەندەقدا ئەم هاوەڵانە شەهید بوون:(سەعدی کوڕی موعاذ، ئەنەسی کوڕی عەتیک، عەبدوڵای کوڕی سەهل، طوفەیلی کوڕی نوعمان، ثەعلەبەی کوڕی غەنەمە، کەعبی کوڕی زەیدی نەجاری).[1]

لە بێباوەڕەکانیش سێ کەس کوژران کە بریتی بوون لە مونەبهی کوڕی عوبەید کە بریندار بوو و لە مەککە مرد، نەوفەلی کوڕی عەبدوڵا کە دواتر بێباوەڕان بۆ وەرگرتنەوەی تەرمەکەی پارەیەکی زۆریان دیاری کرد، عەمری کوڕی عەبد وددی عامری کە عەلی کوڕی ئەبوو طالیب کوشتی.[2]

## ١٦٥. ئەنەسی کوڕی ئەوسی ئەنصاری(ﭬ):

ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانەو لە بەنی عەبدولئەشهەلە، جیایە لەو هاوەڵەی پێشوو هەرچەندە ئیبن فەتحوون بە یەکی زانیون بەلام هەڵەی کردووەو نەیپێکاوە، چونکە ئەم هاوەڵەیان لە سەردەمی ئەمیری باوەڕداران عومەری کوڕی خەططاب و لە جەنگی جسردا کوژرا.[3]

## ١٦٦. ئەنەسی کوڕی ئومموئەنەس(ﭬ):

ئەم هاوەڵە ناوی باوکی نازانرێت و تەنها لەرێی فەرموودەیەکەوە کە لەسەر دایکی هاتووە ناوی ئەمیش هاتووە، بەلام رایەک دەڵێت: بەڵکو ئوممو ئەنەس فەرموودەکەی گێراوەتەوەو ناوی ئەنەسی تێدا نیە.[4]

## ١٦٧. ئەنەسی مەولای پێغەمبەر(ﷺ):

ئەنەسی مەولای پێغەمبەر(ﷺ)لە سەردەمی خیلافەتی ئەبووبەکری

---

[1] ابن هشام: السیرة النبویة، ط١، دارالجیل(بیروت – ١٤١١ هجریة)، ج٤، ص٢١٤، البدایةو النهایة، ج٤، ص١١٥.

[2] البدایةو النهایة، ج٤، ص١١٦.

[3] الإصابة في تمییز الصحابة، ج١، ص١٢١.

[4] الإصابة في تمییز الصحابة، ج١، ص٢٥.

صدیقدا کۆچی دوایی کرد، ئەمە جیایە لەو ئەنەسەی کە بە ئەبوو ئونسەش ناسراوە.[1]

## ١٦٨. ئەنەسی هجەنی(رضي الله عنه):

ئەمە باوکی موعاذە، لەو هاوەڵانەیە کە لە شام نیشتەجێ بون، فەرموودەی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە، موعاذی کوڕی فەرموودەی لێوە گێڕاوەتەوە.[2]

## ١٦٩. ئەنجەشە(رضي الله عنه):

ئەنجەشەی رەش کە هاوەڵێکی پێغەمبەر(ﷺ) بوو و حەبەشی بوو و کونیەکەشی ئەبوو ماریە بوو، دەنگێکی خۆشی هەبوو، کاتێک ژنەکانی پێغەمبەر(ﷺ) سواری وڵاخ ببوونایە ئەنجەشە جڵەوی وڵاخەکەی دەگرت.[3]

لە فەرموودەیەکدا هاتووە جارێک ئەنجەشە جڵەوی ئەو سوارەی لەدەست بوو کە دایکی باوەڕدارانی لەسەر بوو، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: **(ويحك يا انجشه، رويدك سوقا بالقوارير)**،[4] (وریابە ئەی ئەنجەشە، لەسەرخۆ جڵەوی سواری شووشەییەکان بگرە)، لە ریوایەتێکی تردا هاتووە پێی فەرموو: **(لا تكسر القوارير)**،[5] (شووشەییەکان مەشکێنە).

ئیبن ئەثیر دەڵێت: ئەو رووداوە لە حەجیماڵئاواییدا روویداوە.[6]

ئیبن حەجەر لە شەرحی صەحیحی بوخاریدا سەبارەت بەم فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) هێناویەتی: (رامهرمزی دەڵێت: لەبری ئافرەتان وشەی

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ١٣٣.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ١٣٤.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١١٩.
[4] صحيح البخاري - كتاب الأدب - باب ما يجوز من الشعر والرجز والحداء وما يكره منه، الرقم ٦١٤٩.
[5] السنن الكبرى للنسائي - كتاب عمل اليوم والليلة - الحدو في السفر، الرقم ١٠٢٨٣.
[6] أسد الغابة، ج١، ص١٨٤.

شووشــەی بەکارهێنــاوە لەبــەر نەرمونیانــی ئافرەتــان و لاوازی جووڵەیــان، ئافرەتـان لـە نەرمونیانـی و جەستەلاوازیدا لـە شووشـە دەچـن، دەوتـرێ واتـە وەک چۆن شووشـە لەسـەر پشتی وشتر بێت بـە نەرمـی جڵەوەکـە دەگریـت بـۆ ئافرەتانیش وابـە).[1]

## ١٧٠. ئەهوەدی کوڕی عیاض(ﷺ):

نـاوی ئەهـوەدی کـوڕی عیاضـە و لـە ئەزدیەکانـە، کەسـێکی زۆر خواپەرسـت بـوو، هەواڵـی مەرگـی پێغەمبـەری خـوای(ﷺ) بـرد بـۆ حیمیەریـەکان، بـەڵام ئـەوان لەتـاو زۆر خەفـەت خواردنیـان بـۆ ئـەو هەواڵـە ئەهوەدیـان لەنـاو خۆیاندا دەرکرد و نەچـوون بـە لایدا، کاتێـک ئەهـوەد هەواڵەکـەی پـێ دان وتیـان: خـوا پارچەپارچـەت بـکات بـۆ خـۆت و هەواڵێـک هێنـات، درۆ دەکەیـت نەمـردووە، ئەویـش وتـی: بـا سـوێند بـەو خوایـەی ئـەوی بـە حـەق نـارد مـردووە سـوێند بـە خـوا منیـش لـە ئێـوە دڵگرانتـرم، ئەگـەر لـە ئێـوە دڵنـەرم تریـش ببینـم ئـەو هەواڵـەی پێدەدەم، ئەوانیـش دەریـان کـرد، ئەویـش وتـی: خوایـە مـن هەواڵـی مەرگـی پێغەمبەرەکەتـم پـێ دان تـا دوای ئـەو لەخشـتەنەبرێن و دڵنەوایـی منیـش بکـەن لـەو دڵگرانیـەدا، دواتـر کـە دڵنیـا بوونـەوە لـە وەفاتـی پێغەمبـەر(ﷺ) هێنایانـەوە.[2]

## ١٧١. ئمروئولقەیسی کوڕی عابس(ﷺ):

ئمروئولقەیسـی کـوڕی عابسـی کـوڕی مونذیـری کـوڕی ئمروئولقەیسـی کیندیـە، وەک وەفـد هاتووەتـە خزمـەت پێغەمبـەر(ﷺ) و موسـڵمان بـووەو بەردەوامیـش لەسـەر موسـڵمان بوونەکـەی ماوەتـەوە پـاش ئـەوەی بەشـێکی

---

[1] فتح الباري، ج١٠، ص٥٤٥.

[2] الإصابة في تمييز الصحاب، ج١، ص١٤٢.

بەرچاوی هۆزەکەی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە،[1] لە کووفە نیشتەجێ بوو،[2] شاعیرێکی دیار بووەو شیعری دەوت،[3] سەبارەت بە هەڵگەڕانەوەی خەڵکی لە ئیسلام شیعری نووسیوە.[4]

جارێک ئەم هاوەڵە لەسەر زەوی و زار لەگەڵ کەسێکی حەضرەمیدا کێشەی هەبوو، هەردوولا ڕێککەوتن کێشەکە ببەنەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، کاتێک چوونە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) بە کەسە حەضرەمیەکەی فەرموو: بەڵگەت پێیە یان دەبێت ئەو سوێند بخوات، کابرا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر ئەو ئامادە بێت سوێند بخوات من واز لە زەویەکە دێنم بۆی،[5] لە ریوایەتێکی تردا هاتووە کە کابرا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو گوێی لێ نیە سوێند بخوات،[6] ئەم گێڕانەوەشیان دروستترە چونکە لە کتێبەکانی فەرموودەدا زیاتر بەم جۆرە هاتووە، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: بەس ئەتوانیت ئەوەی پێ بکەیت، پاشان چوون تا سوێندەکە بخوات، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (من اقتطع أرضا ظالما، لقي الله وهو عليه غضبان)،[7] (هەر کەس بەستەم زەویەک دابڕ بکات بۆ خۆی ئەوە کە دەگاتەوە بە خوا، خوای گەورە زۆر لێی تووڕەیە)، ئمروئولقەیس وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەی ئەگەر ئەوەی بزانێت مافی خۆیەتی بەڵام دەستبەرداری ببێت چی بۆ هەیە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (الجنة) واتە بەهەشتی بۆ هەیە، ئمروئولقەیس وتی: دەی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من تۆ بە شایەت دەگرم کە وا دەستبەرداری بووم.[8]

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص ١٧٥.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ١، ص١١٢.
[3] أسد الغابة، ج١، ص ١٧٥.
[4] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٠٦.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ١، ص١١٢.
[6] صحيح مسلم - كتاب الإيمان - باب وعيد من اقتطع حق مسلم بيمين فاجرة بالنار، الرقم ١٣٩.
[7] صحيح مسلم - كتاب الإيمان - باب وعيد من اقتطع حق مسلم بيمين فاجرة بالنار، الرقم ١٣٩.
[8] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ١١٢.

ئـەو هاوەڵـەش کـە ئـەو کێشـەی هەبـوو لەگـەڵ ئمرئولقەیسـدا رەبیعـەی کـوڕی عەیـدان بـوو.[1]

ئمروئولقەیـس لـە جەنگـی یەرمووکیشـدا بەشـداری کـرد، هەروەهـا لـە گەمـارۆی قـەڵای (نجیر) یشـدا بەشـدار بـوو، کاتێـک لـە ئیسـلام هەڵگەڕاوەکان هاتنـە دەرەوە تـا لەگـەڵ موسـڵمانان بجەنگـن ئمروئولقەیـس مامـی خـۆی گـرت و ویسـتی بیکوژێـت، چونکـە مامـی یەکێـک بـوو لـە هەڵگـەڕاوەکان، مامـی پێـی وت: مـاڵ وێران مامی خۆت دەکوژیت؟ ئەویش وتـی: تۆ مامـی منیـت بـەڵام اللـە خوامـە، ئینجـا مامـی خـۆی کوشـت،[2] ئـەم ئاکارەش لای ژمارەیـەک لـە هاوەڵانـی تـر بینـراوە کـە لـە پێنـاو ئیسـلامدا بەرامبـەر کەسـە نزیکـە بێبـاوەڕە جەنـگاوەرەکان وەسـتاون، هەیانبـووە ئامـادە بـووە ئـەو کەسـە نزیکـەی بکوژێـت، هەیانبـووە خـۆی لـێ دوور گرتـووە چونکـە ناخـی ئـەوەی پـێ سـەخت بـووە و حـەزی کـردووە بـە دەسـتی موسـڵمانێکی تـر بکوژرێـت نـەک بـە دەسـتی خـۆی.

ئمروئولقەیـس یەکێـک بـوو لـەو کەسـانەی هـاودەم بـە پاڵپشـتانی ئیسـلام مایـەوەو دژی لـە ئیسـلام هەڵگـەڕاوەکان دەوەسـتایەوەو بانگـی دەکـردن تـا بگەڕێنـەوە نـاو ئیسـلام، بەتایبـەت زۆر لەگـەڵ هۆزەکـەی خۆیـدا هەوڵـی دەدا، هەروەهـا نامـەی نووسـی بۆ ئیمامـی ئەبووبەکر و تێـی گەیاند پەنـای کەسـێ نـادات لـە ئیسـلام هەڵگەڕابێتـەوە، ئەوەشـی لـەم شـیعرەدا دەربـڕی:

الا بلغ أبا بكر رسولا

وبلغها جميع المسلمينا

فليس بمجاورا بيتي بيوتا

بما قال النبي مكذبينا[3]

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص١٧٥.

[2] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٠٤، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١١٢.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١١٢.

**چەند گومانێک:**

ئـەم هاوەڵـە ویسـتوویەتی بەشـێک لـە زەوی هاوەڵێکـی تـر داگیـر بـکات، بۆیە ئەمە جۆرێک لە ستەم بووە لای ئەم هاوەڵەو هەوڵیداوە لەپێناو دنیادا فێڵ بەکاربهێنێت، هـەروەک دەبینیـن هاوەڵەکـەی تـر ی دەڵێـت: ئـەم کەسـە گوێی لێ نیە سوێندی بە ناهەق بخوات.

کاتێـک ئمروئولقەیـس زانـی ئەگـەر ئـەو سـوێندە بخـوات تووڕەیـی خـوای بەردەکەوێت ئینجا ئامادە نەبوو سوێند بخوات و پاشەکشەی کرد.

هـاوەڵان لـە پێنـاو دنیـادا بەرامبـەر بـە یەکدی وەسـتاون وەک چۆن لـەم نموونـەدا دیـارە.

**شرۆڤەی گومانەکان:**

خوای گەورە ئەوەی لە موسڵمان حەرام نەکردووە هەوڵ بدات بۆ ژیانی دنیا، بەڵکو خوای گەورە فەرمانی کردووە بە موسڵمان پشکی دنیای لەبیر نەکات، بۆیە حەزو ویستی دنیایی لای موسڵمان شتێکی عەیبەو حەرام نیە، حەرامی و عەیبیەکەی کاتێک دەست پێ دەکات ئەو کەسە دنیای لێ ببێتە شـوێنی مانـەوەی هەمیشـەیی و لـە پێنـاو دنیـادا هەنگاونـان بـۆ دەستکەوتی ڕۆژی دوایی لەبیر بکات یان سست بێت تیایدا، هەروەها یان ئەوەی هەوڵ بدات بە ڕێگەی نـاڕەوا بەدەسـتی بهێنێت وەک ئـەوەی بـە زۆر و سـتەم یان بە فێڵ مافێکی کەسێکی تر داگیر بکات، لە ئەزموونی هاوەڵاندا ئەمە بەدی ناکەین، چونکە دەبینین زۆر بە ئاسانی لە ماوەیەکی کەمدا لەیەکدی گەیشـتون و کێشـە ماددیەکانـی نێوانیـان چارەسـەر کـردون، هەیانبـووە بـۆ فەوتانی نوێژێکی باخێکی کردووە بە خێر، کەسی وەک ئیمامی ئەبووبەکر کە لەسـەر دارخورمایەک کێشـەی لەگـەڵ هاوەڵێـک دەبێت، زۆر بـە خێرایـی کێشـەکەیان لای پێغەمبـەر(ﷺ) چارەسـەر دەکـەن بـێ ئـەوەی کاتژمێرێـک بخایەنێت، هـەروا ئـەم هاوەڵـەش وەک دەبینین هێندە دڵنیایە کە مافی خۆیەتی ئامادەیە کێشەکە ببەنەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، ئەمەش فەرمانی خوایە کاتێک

کێشەیەک هەبوو بیبەینەوە بۆ لای فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی، خۆ ئەوان هەردووکیان دەیانزانی پێغەمبەر(ﷺ) لەلایەن خوای گەورەوە ڕێنموونی و زانیاری بۆ دێت، وەک چۆن خوای گەورە هەندێ کێشەی نهێنی هەڵماڵی بۆ پێغەمبەرەکەی و ڕووی ڕاستی ڕووداوەکانی بۆ خستەڕوو، ئەم دوو هاوەڵە دەیانزانی دەکرێ خوای گەورە ڕاستی ئەم مەسەلەی ئەمان بخاتە ڕوو، بۆیە هەرکامیان نیەتی خراپی هەبوایە ئامادەیی نەبوو کێشەکە بباتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، بەڵکو دوو ڕای جیاوازیان هەبووەو هەرکام خۆیان بە خاوەن ماف زانیوەو هەردووکیش ڕازی بون بە بڕیاری پێغەمبەری خوا(ﷺ)، بۆیە ئەمە بەڕاست زانینی ڕای هەردووکیان نیە لەمەدا، بەڵکو ئەو مافە هی یەکێکیان بووەو یەکێکیان هەڵە بووە، بەلام هەردووکیان لە نیەتدا خۆیان بەڕاست داناوە نەک ویستی داگیرکردنیان بێت بەو بەڵگەی خێرا کێشەکەیان بردەوە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و بە بڕیاری ئەویش ڕازی بوون.

هەروەها دەبینین ئەم دوو هاوەڵە کە کێشەکەیان هەیە پێکەوە دەچن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) بێ ئەوەی کەسێک بیانبات یان خەڵکێک بکەونە نێوانیانەوە، واتە هێندە مەسەلەکەیان لا ئاسان بووە، هەرچەندە دەمەقاڵە لەنێوانیاندا هەبووبێت، بەلام نەگەیشتوەتە ئاستێک لێدانی بەرامبەری تێدا بێت، بۆیە لە ماوەیەکی کەمدا دەچنە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و کێشەکەیان چارەسەر دەکەن.

دەبینین ئمروئولقەیس بە ڕاشکاوانە بە پێغەمبەری خوا(ﷺ)دەڵێت ئەو لەسەر هەقە، بەلام ئەگەر واز بێنێت لەو هەقەی لە بەرامبەردا چی پاداشتێکی دەست دەکەوێت؟ کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت بەهەشت، خێرا بێ بیر لێکردنەوە واز دێنێت لەو زەویەی کە ماوەیەک بوو کاری تێدا دەکرد، هەروەها ئەو هەرچەندە دڵنیا بوو ئەوە مافی خۆیەتی، بەلام

بە پێویستی نەدەزانی بۆ مەسەلەی زەویەک کاری بگەیەنێتە سوێندخواردن ئەگەرچی پاش ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) داوای کرد سوێند بخوات ئامادەیی هەبوو، بەڵام خێرا بیری کردەوە لە بەرامبەر وازهێنان لەوە بۆ قیامەتی چی دەست دەکەوێت.

دەبینین هاوەڵان کێشەیان هەبووەو ئەوەش جیاوازیەکە لەنێوان مەسەلەی عەدالەتی هاوەڵان و مەعصووم بوونیاندا، هەڵەو کەموکورتی کەم لەناو عەدالەتدا جێی دەبێتەوە، چونکە عەدالەت ئەوەیە کەسەکە لەسەر مەردایەتی و خواناسی و کاری چاکە راهاتبێت و ژیانی لەسەر ئەوە بباتەسەر، لەوەشدا هەر کەموکورتی و هەڵە و نەپێکان دەبێت، بەڵام ئامانجی سەرەکی رەزامەندی خوایەو ئەو کەموکورتی و هەڵە یان نەپێکانە جۆربەجۆرانەش نابنە هۆی لادانی ئەو هاوەڵە لە رێی راستی، بەڵام لە مەعصومیەتدا تاکە هەڵەیەک قبووڵ نیە، ئەمەش دوورە لە مەنهەجی ئەهلی سوننەوە.

## ١٧٢. ئمروئولقەیسی کوڕی ئەصبەغی کەلبی(رضي الله عنه):

چووەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و پێغەمبەری خوایش(ﷺ) وەک نوێنەر دایناوە لەسەر کەلب، واتە بە فەرمانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەمیری هۆزەکەی خۆی بووە و لەو پۆستەشدا مایەوە تا دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر(ﷺ)، کاتێکیش خەڵکی ناوچەکە لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە، ئەم هاوەڵە بە باوەڕداری مایەوە.[1]

ئیبن عەبدولبەر دەڵێت: وا گومان دەبەم ئەمروئولقەیس خاڵۆی ئەبووسەلەمەی کوڕی عەبدورەحمان بووبێ، چونکە دایکی ئەبوو سەلەمە ناوی تەماضوری کچی ئەصبەغ بووە.[2]

---

[1] أسد الغابة، ١، ص١٧٥، الإصابة في تمييز الصحابة، ١، ص١١١.

[2] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٠٦.

## ١٧٣. ئوبەی کوڕی ثابت(ﷺ):

ئـەم هاوەڵـەی پێغەمبـەر(ﷺ) لـە پشـتیوانانە و سـەر بـە خەزرەجیەکانـە، ناوی ئوبـەی کوڕی ثابتـی کوڕی مونذیری کوڕی حەرامـی کوڕی عەمرە.[١]

ئوبـەی بـرای دوو هاوەڵـی تـر بـوو کـە حەسسـان و ئـەوس بـوون،[٢] حەسسانیان شـاعیری پێغەمبـەر(ﷺ) بـوو و پێغەمبـەر(ﷺ) سـیرینی خوشـکی ماریـەی پێ بەخشـی،[٣] ئەوسـیش لـە جەنگـی ئوحوددا شـەهید بـوو.[٤]

ئوبـەی بـە ئەبووشـەیخ ناسـرابوو، بـەڵام رایەکـی تـر هەیـە دەڵێـت: ئـەو نازنـاوە هـی کوڕەکەیەتـی.[٥]

راجیایی هەیە لەسـەر ئوبەی، ئیبن ئیسـحاق پێی وایە ئوبەی لە سـەردەمی جاهیلیـدا مـردووە،[٦] ئیبـن مندەش پێـی وایـە ئـەوس بـووە بەشـداری بـەدری کردووەو لەئوحوددا شـەهید بووە،[٧]بـەڵام هەریـەک لـە ئیبنولکەلبی و واقیدی و ئیبـن حیبـان و مووسـای کوڕی عوقبـە و چەندێکـی تـر پێیـان وایـە ئوبـەی بەشـداری جەنگـی بـەدر بـووە.[٨]

## ١٧٤. ئوبەی کوڕی شەریق(ئەخنەس)(ﷺ):

نـاوی ئوبـەی کوڕی شـەریقی کوڕی عەمری کوڕی وەهبی کوڕی علاجی کوڕی ئەبی سـەلەمەی کوڕی عەبدولعوززای کوڕی غەیرەی کوڕی عەوفی کوڕی ثەقیفـی ثەقەفییـە.[٩]

[١] أسد الغابة، ج١ص٧٥.
[٢] أسد الغابة، ج١ص٧٥.
[٣] أسد الغابة ج١ص٦٢.
[٤] أسد الغابة، ج١ص٧٥.
[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٢٥.
[٦] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٢٥.
[٧] أسد الغابة، ج١ص٧٥.
[٨] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٢٥.
[٩] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٣٨.

کونیەکەی ئەبوو ثەعلەبەیە،[1] بەڵام زیاتر بە ئەخنەس ناسراوە، چونکە لە کاتی جەنگی بەدردا ئامۆژگاری بەنی زوهرەی کرد تا نەچنە جەنگی بەدر و پاشەکشە بکەن، ئەوانیش بە گوێیان کرد و گەڕانەوە، بۆیە بە ئەخنەس ناسرا،[2] واتە دووری خستنەوە لە جەنگەکە.

شەریقی باوکی ئوبەی کۆیلەیەکی کڕی کە ناوی عەددی کوڕی حەمرا بوو، شەریق ئەو کۆیلەی ئازاد کرد و دواتر کچەکەی خۆی لێ مارە کرد، ئەو کچەی دوو کوڕی هەبوو بە ناوەکانی عەبدوڵا و عومەر.[3]

ئوبەی کوڕی شەریقیش کۆیلەیەکی هەبوو بەناوی ثابت، ئەم کۆیلەیە زوو موسڵمان بوو و لە هاوەڵە کۆچەرەکان بوو، هەروەها بە موسڵمانی بەشداری جەنگی بەدری کرد،[4] دواتریش پاش وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) بەشداری فەتحی میصری کرد.[5]

ئوبەی هاوپەیمانی بەنی زوهرە بوو و گەورە و قسەڕۆیشتووی ناویان بوو، لە کاتی جەنگی بەدردا کاتێک موسڵمانان ڕێیان گرت بە کاروانی قورەیش بەنی زوهرەش لەگەڵ ئەبووسوفیان و دەستەکەیدا خۆیان ئامادە کرد بۆ جەنگی دژ بە موسڵمانان، چونکە ئەوانیش پشکیان هەبوو لە کاروانەکەدا، بەڵام کاتێک ئوبەی زانی کاروانەکە رزگاری بووە و ڕێی خۆی گۆڕیوە، چوو بۆ لای بەنی زوهرە و پێی وتن ئێوە بۆ کاروانەکەتان ئەچوون وا رزگاری بووە، ئیتر خۆ ئێوە نیازی جگە لەوەتان نەبووە، بۆیە پێشنیاری بۆ کردن تا نەچنە ئەو جەنگەوە، ئەوانیش بەگوێیان کرد، لەوەوە بە ئەخنەس ناسرا.[6]

---

[1] اسدالغابة، ج١،ص٧٦.
[2] اسدالغابة، ج١، ص٧٦.
[3] الاستيعاب في معرفة الأصحابة، ج٣، ص٩٤٨.
[4] اسد الغابة، ج١، ص٣٢٧.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٨٢.
[6] اسدالغابة، ج١، ص٧٦.

ئەخنەس لەگەڵ سەرانی قورەیشدا پەیوەندی بەتینی هەبوو، جارێکیان ئوبەی و ئەبوو جەهل و ئەبوو سوفیان بە شەو چوون تا گوێ بگرن لە قورئان خوێندنی پێغەمبەر(ﷺ)، هەرکامیان و لە شوێنێک دادەنیشت، بە یەکتریشیان نەئەزانی، کە بەرەبەیان دەهات بڵاوەیان لێ ئەکرد، لە رێدا بە یەک گەیشتن و بە یەکتریان وت: کە ئیتر واناکەن، تا سێ شەو وایانکرد، هەمتر لە رێدا بە یەک گەیشتن و وتیان: هەر دەبێ بەڵێن بەیەکتر بدەین کە ئیتر نەیەینەوە، بۆ بەیانی ئەخنەس چوو بۆ لای ئەبووسوفیان و پێی وت: ئەی ئەبوو حەنظەلە پێم بڵێ سەبارەت بەوەی لە موحەممەدت بیست چی دەڵێیت؟ ئەویش وتی: ئەی ئەبوو ثەعلەبە بەخوا ئەوەی بیستم برێکی ئەمزانی چیەو مەبەست پێیان چیە و هەندێکیشی مانا و مەبەستیم نەئەزانی، ئوبەی وتی: منیش هەروام سوێند بەوەی سوێندم پێ خوارد بۆی،[1] لە گێرانەوەیەکی تردا هاتووە وتی: من دەیزانم و بە حەقی ئەزانم.[2]

ئەخنەس جارێکیان چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمانبوونی خۆی راگەیاند و وتی: خوا ئەزانێت راست ئەکەم، دوای ئەوە رایکرد و چوو دای بە لای برێ موسڵماندا، کشتوکاڵێکی زۆرو برێ وشتری سووتاند، لەو بارەشەوە ئایەتی خوا دابەزی (ومن الناس من يعجبك قوله في الحياة الدنيا ويشهد الله على ما في قلبه وهو ألد الخصام... ولبئس المهاد). لێرەوە ئیبن عەطیەی گێرەرەوەی ئەم دەقە رای وایە ئوبەی هەرگیز موسڵمان نەبووبێت، بەڵام ئیبن حەجەر بەرپەرچی ئەو رایە دەداتەوە بە دوو بەڵگە:

**یەکەم:** کەسانی پێشوو کە باسیان کردووە سەلماندوویانە کە هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بووە.

**دووەم:** ئەگونجێت کەسێک موسڵمان بێت و دواتر مورتەد بێتەوەو دواتر موسڵمان ببێتەوە.[3]

---

[1] سيرة ابن إسحاق، ج٤ص ١٧٠.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٨.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٨٢.

ئوبەی لە جەنگی ئوحوددا لەگەڵ بێباوەڕاندا بەشداری جەنگی کرد و ئونەیسی کوڕی قەتادەی کوڕی رەبیعەی ئەنصاری شەهید کرد، ئونەیس یەکێک بوو لە بەشداربوانی بەدر، لە ئوحودیشدا بەشداری کرد و لەسەر دەستی ئەخنەس (ئوبەی) شەهید بوو.[1]

هەروەها ئوبەی یەکێک بوو لەو کەسانەی کە بەشدارییان کرد لە فرۆشتنی خوبەیبدا، عوقبەی کوڕی حارثی کوڕی نەوفەل خوبەیبی کڕی.

ئەخنەس دواتر موسڵمان بوو و لە (المؤلفة قلوبهم) دڵڕاگیرکراوان بوو، پێغەمبەر(ﷺ) بەخششی پێدەدا بەو بۆنەیەوە، لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەتتابدا کۆچی دوایی کرد.[2]

## ١٧٥. ئوبەی کوڕی عەجلان(رضي الله عنه):

زانیاری زۆر کەمە لەسەر ئەم هاوەڵە، بەڵام لە سەرچاوەکاندا هاوەڵبوونی چەسپاوە.

ئوبەی کوڕی عەجلانی باهیلی برای ئەبوو ئومامەیە.[3]

## ١٧٦. ئوبەی کوڕی عیمارە یان عومارە(رضي الله عنه):

ئەم هاوەڵەی پێغەمبەر(ﷺ) لە پشتیوانانە،[4] ناوی ئوبەی کوڕی عیمارەیە،[5] هەندێ دەڵێن عومارە ناوی باوکی بووە،[6] هەندێکی تر رایان وایە ناوی ئەبوو ئوبەی کوڕی ئوم حەرام بووە،[7] رایەکی تر دەڵێت:

---

[1] اسدالغابة، ج١، ص٢٠٣.

[2] اسدالغابة، ج١، ص٧٦.

[3] اسدالغابة، ج١، ص٧٦، الاصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٦،

[4] معجم الصحابة لابن قانع، ج١ص٤، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٧١٨.

[5] معجم الصحابة لابن قانع، ج١ص٤، اسدالغابة، ج١، ص٧٧.

[6] اسدالغابة، ج١، ص٧٧، الاصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٦.

[7] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٧٠، الاصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٦.

ئوبەی کوڕی عوبادەیە.[1]

پێغەمبەر(ﷺ) لە ماڵی ئەم هاوەڵەدا نوێژی دوو قیبلەی کردووە.[2]

ئوبەی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) لە ماڵەکەمدا نوێژی کرد، پرسیارم لێکرد وتم: ئەی پێغەمبەری خوا لەسەر دوو خوف مەسح بکەم؟ فەرمووی بەڵێ، وتم: یەک رۆژ؟ فەرمووی: بەڵێ، وتم: ئەی دوورۆژ؟ فەرمووی: بەڵێ، وتم: ئەی سێ رۆژ؟ فەرمووی: بەڵێ و چەندەت ویست، (نعم وما بدا لک)[3] بە دەقێکی تر (وتم ئەی پێغەمبەری خوا یەک رۆژ مەسح لەسەر دوو خوف بکەم؟ فەرمووی: بەڵێ دوو رۆژیش و چەندت ویست) (نعم ويومين وما شئت).[4]

## ١٧٧. ئوبەی کوڕی کەعبی کوڕی عەبدئەور(ﷺ):

ئەم هاوەڵە جیاوزاە لە ئوبەی کوڕی کەعبی کوڕی قەیس، ئەمەیان ناوی ئوبەی کوڕی کەعبی کوڕی عەبدئەوری موزەنیە،[5] موزەنیەکان دەگەڕێنەوە سەر موزەینەی کچی کەلب.[6]

کەسێکی خوزاعی بە ژمارەیەک کەسەوە هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، یەکێک لەوانەش ئوبەی کوڕی کەعبی کوڕی عەبدئەور بوو، هاتنە خزمەتی و بەیعەتیان پێدا.[7]

## ١٧٨. ئوبەی کوڕی کەعبی کوڕی قەیس(ﷺ):

یەکێکە لە هاوەڵانی زۆر نزیکی پێغەمبەر(ﷺ)، نووسەرەوەی سروش بووەو لەسەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) فەتوای داوە.

---

[1] الاصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٦.

[2] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٧٠، الاصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٦.

[3] اسدالغابة، ج١، ص٧٧.

[4] معجم الصحابة لابن قانع، ج١ص٦.

[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ٢٧.

[6] اللباب في تهذيب الأنساب لإبي الحسن الجزري، ج٣، ص٢٠٥.

[7] أسد الغابة، ج١، ص٧٨.

ناوی: ئوبەی کوڕی کەعبی کوڕی قەیسی کوڕی عوبەیدی کوڕی زەیدی کوڕی موعاویەی کوڕی عەمری کوڕی مالیکی کوڕی نەجارە.[٨]

ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە[٩] لە خەزرەجیەکان،[١٠] کونیەکەی ئەبوطوفەیلە،[١١] هەروەها ئەبوو مونذیریشی پێ ئەوترا،[١٢] پێغەمبەر(ﷺ) کونیەی ئەبوو مونذیری لێنا، کونیەی ئەبوو طوفەیلیش عومەری کوڕی خەطاب لێی نا.[١٣] هەروەها بە سەیدولقورراء ناسراوە،[١٤] عومەری کوڕی خەطاب نازناوی (سید المسلمین) یشی لێنا.[١٥]

ژنەکەی ناوی ئوم طوفەیلی کچی طوفەیلی کوڕی عەمر بوو[١٦] کە ئەویش هاوەڵێکی ناسراوی پێغەمبەر(ﷺ) بوو.[١٧]

لە گێڕانەوەیەکدا هاتووە حەبیبەی کچی سوهەیلیش هاوسەری ئوبەی بووە، حەبیبە ژنی ثابتی کوڕی قەیس بوو، دوای ثابت ئوبەی کوڕی کەعب بەهاوسەری گرت.[١٨]

ئوبەی چەند کوڕێکی هەبوو: طوفەیل کە کونیەکەی بەهۆی ئەمەوە وەرگرت، دەوترێ لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) لەدایک بووە،[١٩] موحەممەد لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) لەدایک بوو[٢٠] و لە ئوم طوفەیلی دایکی و لە

---

[٨] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٧.
[٩] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٦٥، أسد الغابة، ج١ص٧٨.
[١٠] أسدالغابة، ج٢، ص٨٥
[١١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٧.
[١٢] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٦٦.
[١٣] أسد الغابة، ج١ص٧٨.
[١٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٧.
[١٥] أبوالسعادات ابن الأثير الجزري: المختار من مناقب الأخيار، ط١، دار ابن كثير، بيروت، ٢٠٢١م، ج١، ص ١٨١.
[١٦] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٦ص٢٤٣.
[١٧] أسد الغابة، ج٧، ص٣٨٨، الإصابة في تمييز الصحابة، ج٨، ص٢٤٦.
[١٨] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٥٧٦.
[١٩] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٣، ص٥٥٠.
[٢٠] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٦، ص٢٤٣.

باوکیشی و لە عومەریشەوە فەرموودەی گێڕاوەتەوە،[1] هەروەها حەرامیش کوڕی بوو کە بە حەزمیش ناوی هاتووە.[2]

ئوبەی لە بەیعەی عەقەبەی دووەمدا بەشدار بوو و لەوێ گەیشت بە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ).[3]

ئوبەی ریشی سپی بوو و دەستکاری ئەو سپیبوونەی ریشیشی نەئەکرد.[4]

عومەری کوڕی خەطاب لە رۆژی مردنی ئوبەیدا بە سەیدولموسلیمین واتە گەورەی موسڵمانان ناوی دەبرد.[5]

ئوبەی لە جەنگی بەدردا بەشداری کرد.[6]

یەکەم نووسەرەوەی پێغەمبەر(ﷺ) بوو لە مەدینە، یەکەم کەسیش بوو لە کۆتایی نوسینەکەدا دەینووسی (وکتبە...)واتە ناوی خۆی دەنووسی.[7]

لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) شەش کەس لە پشتیوانان نووسەرەوەی سروش بوون،[8] چواریان لە خەزرەجیەکان بوون، یەکێک لەوانە ئوبەی کوڕی کەعب بوو. [9]

هەروەها ئوبەی یەکێک بوو لەو کەسانەی لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) فەتوایان دەدا.[10]

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) برایەتی خستە نێوان کۆچەران و پشتیوانان، برایەتی خستە نێوان ئوبەی کوڕی کەعب و سەعیدی کوڕی زەیدی زاوای (واتە

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٦ص٢٤٣.
[2] أسدالغابة، ج١، ص٥٧٨.
[3] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٦٦، أسد الغابة، ج١ص٧٨.
[4] أسد الغابة، ج١ص٨٠، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٢٧.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٢٧.
[6] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٦٦، أسد الغابة، ج١ص٧٨.
[7] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٢٧، الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٦٨.
[8] أسد الغابة، ج١ص٣٣٢.
[9] أسدالغابة، ج٢، ص٨٥.
[10] أسد الغابة، ج٥، ص٢٠٥، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٢٧.

مێردی خوشکەکەی) عومەری کوڕی خەططابەوە.[1]

پێغەمبەر(ﷺ) لە فەرموودەیەکدا باس لە فەزڵی هاوەڵانێکی دەکات و دەفەرموێت (أرحم أمتي بها ابو بكر وأقواهم في دين الله عمر وأصدقهم حياء عثمان وأقضاهم على بن أبي طالب وأفرضهم زيد وأقرؤهم لكتاب الله أبي بن كعب وأعلمهم بالحلال والحرام معاذ بن جبل وأمين هذه الأمة أبو عبيدة بن الجراح وأبو هريرة وعاء)[2] (بە رەحمترینی ئوممەتم بە ئوممەتەکەم ئەبوبەکرەو بەهێزترینیان لە ئایینی خوادا عومەرەو بە شەرمترینیان عوثمانە و دادوەرترینیان عەلی کوری ئەبووطالیبەو شارەزاترینیان بە فەرزەکان زەیدە و شارەزاترینیان بە قورئان خوێندنەوە ئوبەی کوڕی کەعبە و شارەزاترینیان بە حەڵاڵ و حەرام موعازی کوڕی جەبەلەو ئەمینداری ئەم ئوممەتەش ئەبوو عوبەیدەی کوڕی جەراحە و ئەبوو هورەیرەش قاپ و جامێکە).

لە فەرموودەیەکی تردا کە بە مورسەلی هاتووە (خذوا القرآن من أربعة من عبدالله بن مسعود وسالم مولى أبي حذيفة ومعاذ بن جبل وأبي بن كعب)[3] (قورئان لە چوار کەسەوە وەربگرن، لە عەبدوڵای کوڕی مەسعوود و سالمی مەولای ئەبووحوذەیفەو موعاذی کوڕی جەبەل و ئوبەی کوڕی کەعب).

ڕۆژێک ئەبووطەلحە برێ لە سامانەکەی خۆی کرد بە خێر و هێنای بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش دای بە کەسە نزیکەکانی خۆی، ئوبەی کوڕی کەعب و حەسانی کوڕی ثابت و شەدادی کوڕی ئەوس و چەندێکی تر، ئەوانیش نرخی بەشەکەی خۆیان دیاری کرد و حەسسان وەریگرتەوە، ئیتر بوو بە

---

[1] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهانی، الرقم ٥٢٦.

[2] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٧، ئیبن ماجە بە دەقێکی هاوشێوەی ئەمە کە هەمان ئەم واتایە دەبەخشێت هێناویەتی، سنن ابن ماجة، الرقم ١٥٤، صحیح. مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٢٧٠٧، صحيح، بەلام لای ئیبن ماجە و ئیمامی ئەحمەد باسی ئەبووهورەیرەی تێدا نیە، شێخی ئەلبانی ئەمەی بە صحيح داناوە (أرحم أمتي بأمتي أبو بكر و أشدهم في أمر الله عمر و أصدقهم حياء عثمان و أقرؤهم لكتاب الله أبي بن كعب و أفرضهم زيد بن ثابت و أعلمهم بالحلال و الحرام معاذ بن جبل و لكل أمة أمين و أمين هذه الأمة أبو عبيدة بن الجراح).الجامع الصغير و زيادته، ٨٩٧

[3] صحيح البخاري - كتاب مناقب الأنصار - باب مناقب أبي بن كعب(ﷺ)، الرقم ٣٨٠٨.

موڵکی حەسسان و ئەویش دواتر فرۆشتی بە موعاویە.[1]

ئوبەی بەو پێیەی یەکێک بوو لە نووسەرەوەکانی وەحی، کاتێک گوێی لە کەسێک بوو کە یەکێکیان قورئانی دەخوێند، سەری سوڕما لە خوێندنەوەکەی، پێی وت: کێ ئەمەی فێر کردیت؟ ئەویش وتی: پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئوبەی وتی: دەی وەرە با بچین بۆ لای، کە چووین پێم وت: ئەی پێغەمبەری(ﷺ) خوا بەم کابرا بڵێ با قورئانت بۆ بخوێنێتەوە، ئەویش فەرمانی پێکرد و کابرایش دەستیپێکرد، پێغەمبەر(ﷺ) دەستخۆشیی لێکرد، منیش وتم: مەگەر تۆ ئاوا و ئاوا بۆ منت نەخوێندەوە؟ فەرمووی: (بلى، وأنْتَ قدْ أحْسنْتَ)، (بەڵێ، تۆیش باشت کردووە)، منیش لەبەرخۆمەوە بە دەستەکانم ئاماژەم دەدا و دووجار دەموت: (قد أحسنت، قد أحسنت)[2] پێغەمبەریش(ﷺ) بە دەستی دای بەسەر سنگمدا و دواتر فەرمووی: (اللهُم أذْهِبْ عنْ أُبي الشك)، (خوایە گومان لای ئوبەی مەهێڵە)، کە وای فەرموو عەرەقم لێ دائەچۆڕی و خەریک بوو ناوکم ئەکەوت، ئینجا فەرمووی: (يا أُبي، إن ملكيْنِ أتيانِي، فقال أحدُهُما: اقْرأ على حرْفٍ. فقال الْآخرُ: زِدْهُ. فقُلْتُ : زِدْنِي. قال: اقْرأ على حرْفيْنِ. فقال الْآخرُ: زِدْهُ. قُلْتُ: زِدْنِي. قال : اقْرأ على ثلاثةٍ. فقال الْآخرُ: زِدْهُ. فقُلْتُ: زِدْنِي. قال: اقْرأ على أرْبعةِ أحْرُفٍ، قال الْآخرُ: زِدْهُ. قُلْتُ: زِدْنِي. قال: اقْرأ على خمْسةِ أحْرُفٍ، قال الْآخرُ: زِدْهُ. قُلْتُ: زِدْنِي. قال: اقْرأ على سِتةٍ، قال الْآخرُ: زِدْهُ. قال: اقْرأ على سبْعةِ أحْرُفٍ. فالْقُرْآنُ أُنْزِل على سبْعةِ أحْرُفٍ)،[3] (ئەی ئوبەی، دوو فریشتە هاتن بۆ لام، یەکێکیان وتی: لەسەر یەک (حرف) شێواز بخوێنە، ئەوی دی وتی: داوای زیاتری لێ بکە، منیش وتم زیاترم پێ بڵێ، ئەویش وتی: لەسەر دوو شێواز بخوێنە، فریشتەکەی دی وتی: داوای زیاتری لێ بکە، منیش وتم زیاترم پێ بڵێ، ئەویش وتی: لەسەر سێ شێواز بخوێنە، فریشتەکەی دی وتی: داوای زیاتری لێ بکە، منیش

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٣، ص٣٢٠.
[2] وەک جۆرێک لە نارازیبوون.
[3] مسند أحمد بن حنبل - مسند الأنصار(ﷺ) - حديث أبي المنذر أبي بن كعب(ﷺ)، الرقم ٢١٤٧٩، صححه شعيب الأرناؤوط.

وتم زیاترم پێ بڵێ، ئەویش وتی: لەسەر چوار شێواز بخوێنە، فریشتەکەی دی وتی: داوای زیاتری لێ بکە، منیش وتم زیاترم پێ بڵێ، ئەویش وتی: لەسەر پێنج شێواز بخوێنە، فریشتەکەی دی وتی: داوای زیاتری لێ بکە، منیش وتم زیاترم پێ بڵێ، ئەویش وتی: لەسەر شەش شێواز بخوێنە، فریشتەکەی دی وتی: داوای زیاتری لێ بکە، ئەویش وتی: لەسەر حەوت شێواز بخوێنە).

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە ئوبەی دەڵێت: گومانی ناڕاستبوونی پێغەمبەر(ﷺ) کەوتە ناو دەروونمەوە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە ئەو حاڵەتەی بینیم دای بەسەر سنگمدا.[1]

جارێکیان پێغەمبەر(ﷺ) بە ئوبەی کوڕی کەعبی فەرموو: خوا فەرمانی پێکردوم تا -ئەم ئایەتە- بەسەردا بخوێنمەوە (لَمْ يَكُنِ الَّذِين كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ) ئوبەی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئایا خودا ناوی منی برد بۆت؟ فەرمووی: بەڵێ، ئوبەی دەستی کرد بە گریان.[2]

ئوبەی لە جەنگی ئوحوددا بەشداری کرد و لە دەوری پێغەمبەر(ﷺ) بوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: کێ ئەچێت هەواڵی سەعدم بۆ بهێنێت؟ ئوبەی چوو تا سەعدی دۆزیەوەو بینی پێکراوە و لە سەرەمەرگیدایە، پەیامی سەعدی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) وەرگرت و هەواڵی سەعدی هێنایەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ).[3]

ئوبەی دەگێڕێتەوە جارێکیان پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری کرد لە ئوبەی وپێی فەرموو: (يا ابا المنذر أتدري أي آية من كتاب الله معك أعظم) (ئەی ئەبوومونذیر ئایا ئەزانی چ ئایەتێکی کتێبی خوات لەبەرە کە گەورەترین ئایەت بێت) ئوبەی دەڵێت: منیش وتم: (الله لا إله إلا هو الحي القيوم)، پێغەمبەریش(ﷺ) دای

[1] صحيح مسلم - كتاب صلاة المسافرين وقصرها - باب بيان أن القرآن على سبعة أحرف وبيان معناه، الرقم ٨٢٠.

[2] صحيح البخاري - كتاب مناقب الأنصار - باب مناقب أبي بن كعب(ﷺ)، الرقم ٣٨٠٩.

[3] أسدالغابة، ج٢، ص٤١٤.

بەسەر سنگمدا و فەرمووی: (و الله لیهنئک العلم ابا المنذر) یاخوا زانستت پیرۆز بێت ئەی ئەبوو مونذیر.[1] لە ریوایەتەکەی ئیمامی ئەحمەددا هاتووە پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری لێکرد، ئەویش لە وەڵامدا وتی: خواو پێغەمبەرەکەی زاناترن، چەند جارێ پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری لێکردەوە تا دواتر ئوبەی وتی: (آیة الکرسي).[2]

جارێک ئوبەی لە مزگەوتدا نوێژی دەکرد، پێغەمبەر(ﷺ) بانگی کرد، ئەویش کە لەنوێژەکە بوویەوە چوو بۆ لای، پێغەمبەر(ﷺ) دەستی خستە سەر دەستی ئوبەی و دەیویست لە مزگەوت بچێتە دەرەوە، فەرمووی: (إِنِّي لأَرْجُو أَنْ لا تَخْرُجَ مِن الْمَسْجِدِ حتى تعْلم سُورة، ما أُنْزِل فِي التوْراةِ، ولا فِي الإِنْجِيلِ، ولا فِي الْفُرْقانِ مِثْلُها)، (هیوام وایە لە مزگەوت نەچیتە دەرەوە هەتا سوورەتێک فێر ببیت کە لە تەورات و ئینجیل و فورقانیشدا نموونەی دانەبەزیوە) ئوبەی دەڵێت: منیش هەنگاوەکانم خاو هەڵدەنا بەو هیوایەی فێری ئەو سوورەتە ببم، ئینجا وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئەو سوورەتەی بەڵێنت پێدام، ئەویش فەرمووی:(ﷺ)، (کاتێک دەست دەکەیت بە نوێژ چۆن دەست دەکەیت بە قورئان خوێندن؟) منیش (الحمد لله رب العالمین) م دەستپێکرد هەتا کۆتایی، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەوە ئەو سوورەتەیە).[3]

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: کاتێک ئوبەی لە نوێژەکە بویەوەو چوویە خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، وتی: سەلامت لێ بێت ئەی پێغەمبەری خوا، ئەویش فەرمووی: علیک السلام، ئەی ئوبەی چی رێگری لێکردیت وەڵامم بدەیتەوە؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، لە نوێژدا بووم، ئەویش فەرمووی: (ولَيْس تجِدُ فِي كِتاب اللهِ أَنْ : { يا أَيها الذِين آمنُوا اسْتجِيبُوا لِلهِ ولِلرسُولِ إِذا دعاكُمْ لِما يُحْيِيكُمْ })، ئوبەی وتی: بە دایک و باوکمەوە بەقوربانت بم بەڵێ بیستوومە، ان شاء

---

[1] صحيح مسلم – كتاب صلاة المسافرين وقصرها – باب فضل سورة الكهف وآية الكرسي، الرقم ٨١٠

[2] مسند أحمد بن حنبل – مسند الأنصار(ﷺ) – حديث أبي المنذر أبي بن كعب(ﷺ)، الرقم ٢١٦٧٢، صححه الألباني في صحيح الترغيب و الترهيب، الرقم١٤٧١، و صححه في مختصر العلو.

[3] موطأ الإمام مالک – كتاب الصلاة – ما جاء في أم القرآن، الرقم ٢٧٥.

الله جارێکی تر شتی وا ناکەم.[١]

جارێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە نوێژی بەیانیدا بەرنوێژی دەکرد و لە قورئان خوێندنەکەیدا ئایەتێکی پەڕاند، کە لە نوێژەکەی بوویەوە فەرمووی: (ئەرێ لەناو خەڵکەکەدا ئوبەی کوڕی کەعبی لێیە؟) ئوبەیش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) فلانە ئایەت نەسخ بۆتەوە یان بیرت نەمابوو؟ ئەویش فەرمووی: بیرم نەمابوو.[٢]

هەندێ جار ئوبەی هاودەمی پێغەمبەر(ﷺ) بوو لە دەرچوونەکانیدا، وەک ئەو دەرچوونەی لە خزمەتیدا بوو هەتا مەسەلەی ئیبن صەیاد روون بکاتەوە.[٣]

هەروەها پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەندێ جار ئوبەی کوڕی کەعبی دەنارد بۆ کۆکردنەوەی زەکات.[٤]

جارێک ئوبەی کوڕی کەعب کە نەخۆش بوو، پێغەمبەر(ﷺ) پزیشکێکی نارد بۆ لای، ئەویش دەمارێکی ئوبەی بڕی و کەویەی بۆ کرد.[٥]

ئوبەی دەڵێت: یەکێک لە پشتیوانان ماڵی لەوپەڕی مەدینە بوو، یەک نوێژیش نەبوو لە مزگەوت لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) ئامادە نەبێت، پێم وت: فلانەکەس بۆچی گوێدرێژێک ناکڕیت بۆ ئەو ڕێیە لەو گەرمیەی زەوی و مارو مێروویش بتپارێزێت؟ ئەویش وتی: بەخوا حەز ناکەم ببمە هاودیواری موحەممەدیش(ﷺ)، منیش پەلیم گرت و هەتا لای پێغەمبەر(ﷺ) نەموەستاند و مەسەلەکەم بۆ باسکرد، ئەویش لای پێغەمبەر(ﷺ) هەمان

---

[١] صحيح ابن خزيمة - كتاب الصلاة - جماع أبواب الكلام المباح في الصلاة والدعاء والذكر - باب ذكر ما خص الله عز وجل به نبيه(ﷺ) من وجوب إجابته حتى في الصلاة.

[٢] مسند أحمد بن حنبل - مسند المكيين(ﷺ) - حديث عبد الرحمن بن أبزى الخزاعي(ﷺ)، الرقم ١٥٦٠١، صححه شعيب الأرناؤوط.

[٣] صحيح البخاري - كتاب الجهاد والسير - باب ما يجوز من الاحتيال والحذر، الرقم ٣٠٣٣.

[٤] صحيح ابن خزيمة - كتاب الزكاة - جماع أبواب صدقة المواشي من الإبل والبقر والغنم - باب ذكر الخبر المفسر للفظة المجملة التي ذكرتها، الرقم ٢٢٧٧.

[٥] صحيح مسلم - كتاب السلام - باب لكل داء دواء واستحباب التداوي، الرقم ٢٢٠٧.

شتی دووبارە کردەوەو باسی لەوە کرد هیوای وایە بەو پیادە ڕۆیشتنەی بۆ مزگەوت پاداشتی دەست بکەوێت، پێغەمبەریش(ﷺ) پێی فەرموو (إن لك ما احتسبت)،[1] (ئەوەی هەوڵی بۆ دەدەیت و چاوەڕێی دەکەیت دەستت دەکەوێت).

ئوبەی دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) ژیا و لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەططابدا کۆچی دوایی کرد،[2] خەلیفە عومەر دەیوت گەورەی باوەڕداران مرد،[3] رایەکی تر هەیە دەڵێت: لە سەردەمی خەلیفە عوثماندا مردووە،[4] بەڵام بۆچوونی زیاتر لەسەر ئەوەیە لە سەردەمی عومەردا کۆچی دوایی کردووە،[5] لەسەر ساڵەکەشی راجیایی هەیە، هەریەک لە ساڵانی ١٩ و ٢٠ و ٢٢ باسکراون.[6]

عیمرانی کوڕی عەبدوڵا دەڵێت: ئوبەی کوڕی کەعب بە عومەری کوڕی خەططابی وت: بۆچی پۆستێکم نادەیتە دەست؟ ئەویش وەڵامی دایەوە: ئەترسم دینارییەکەت چڵکن و لەکەدار ببێت.[7]

هاوکات کاتێک لە سەردەمی ئیمامی عومەردا خەڵکی هەرکەسەو بە تەنیا نوێژی تەراویحیان دەکرد، عومەری کوڕی خەتتاب ئەوەی بە گرفت زانی و بڕیاریدا هەموان پێکەوە نوێژەکە بکەن، بۆ ئەوەش ئوبەی کوڕی کەعبی کرد بە بەرنوێژیان.[8]

جارێک ئەبوومووسای ئەشعەری بە بێتاقەتی هات بۆ لای ژمارەیەک لە هاوەڵان، وتی: ویستم بچم بۆ لای عومەر و سێ جار داوای مۆڵەتم کرد

---

[1] صحيح مسلم - كتاب المساجد ومواضع الصلاة - باب فضل كثرة الخطا إلى المساجد، الرقم ٦٦٣.
[2] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٦٩.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٧.
[4] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٦٩، أسد الغابة، ج١ص٨٠.
[5] أسد الغابة، ج١ص٨٠.
[6] أسد الغابة، ج١، ص٨٠.
[7] المختار من مناقب الأخيار، ج١، ص١٨٥.
[8] صحيح البخاري - كتاب صلاة التراويح - باب فضل من قام رمضان، الرقم ٢٠١٠.

و وەڵامم نەدرایەوە، منیش گەڕامەوە، عومەر پێی وتم: بۆچی گەڕایتەوە؟ منیش وتم: سێ جار داوای مۆڵەتم کرد و مۆڵەت نەدرام، منیش گەڕامەوە، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو (إذا استأذن أحدُكُمْ ثلاثا، فلمْ يُؤْذنْ لهُ فلْيَرْجِعْ)، (ئەگەر یەکێکتان سێ جار داوای مۆڵەتی کرد و فەرمووی: لێ نەکرا، ئەوە با بگەڕێتەوە)، عومەر پێی وتم: بەخوا دەبێت بچیت بۆ ئەو فەرموودەیە بەڵگەیەک بهێنیت، جا کەس لە ئێوە هەیە ئەو فەرموودەی لە پێغەمبەر(ﷺ) بیستبێت؟ ئوبەی کوڕی کەعبیش کە لەنێو کۆڕەکەدا بوو، وتی: بەخوا ئەبێت کەمتەمەنترینی ئەمانە لەگەڵتدا بێت، ئەبووسەعیدی خوردی کەمتەمەنترینیان بوو، لەگەڵیدا رۆیشت و لای عومەر شایەتی دا کە پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەی فەرمووە.[1]

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە عومەر هەڕەشەی کرد ئەگەر بەڵگەیەک نەهێنێت ئاوا و ئاوا دەکات، ئەبوموسایش کە لە مزگەوتدا گەیشتەوە بە عومەر، وتی: ئوبەی کوڕی کەعب شایەتی ئەو فەرموودەیە، عومەر وتی: پیاوێکی دادپەروەرە، ئینجا وتی: ئەی ئەبوطوفەیل ئەمە چی دەڵێت؟ ئوبەیش وتی: ئەی کوڕی خەططاب، من بیستوومە لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) وای دەفەرموو، دەی مەبە بە هۆی ئازار و ناڕەحەتی بۆ سەر هاوەڵانی پێغەمبەر، عومەر وتی: سبحان الله، مەسەلە هەر ئەوەندە بوو شتێکم بیست حەزم کرد لێی دڵنیاببمەوە.[2]

ئوبەیکوڕی کەعب هەموو هەشت شەو جارێک خەتمی قورئانی دەکرد.[3]

هاوەڵان هێندە لە شارەزایی ئوبەی لە قورئاندا دڵنیابوون کە ئیبن عەبباسی موفەسیری قورئان لەو بارەیەوە پرسیاری لە ئوبەی دەکرد، وەک چۆن لە مەسەلەی (موسی و خضر) دا پرسیاری لێکرد و ئوبەیش بە

---

[1] صحيح البخاري - كتاب الاستئذان - باب التسليم والاستئذان ثلاثا، الرقم ٦٢٤٥.

[2] صحيح مسلم - كتاب الآداب - باب الاستئذان، الرقم ٢١٥٤.

[3] المختار من مناقب الأخيار، ج١، ص١٨٥.

فەرموودەیەک تەفسیرەکەی بۆ کرد.[١]

ئوبەی کوڕی کەعب یەکێکە لەو هاوەڵانەی کە شەوی بیست و حەوتی رەمەزانی بە شەوی قەدر زانیوەو سوێندیشی لەسەر خواردووە.[٢]

ئوبەی دەیوت: دەستگرتنەوە لە رێی خوا و لە سوننەتدا زۆر باشترە لە خۆماندووکردن لە شتێکدا پێچەوانەی رێی خوا و پەیامەکەی بێت، جا بڕواننە کردەوەکانتان، ئەگەر خۆماندووکردنە یان دەستگرتنەوەیە، با لەسەر رێباز و سوننەتی پێغەمبەران بێت.[٣]

## ١٧٩. ئوبەی کوڕی مالیک(ﷺ):

ناوی ئوبەی کوڕی مالیکی کوڕی سەلەمەی کوڕی قەیسی کوڕی رەبیعەی کوڕی عامری کوڕی صەعصەعەی عامریە،[٤] بە ئوبەی کوڕی مالیکی قوشەیری یان حەرشی ناوی هاتووە،[٥] حەریش و قوشەیر دوو برا بون کە هەردووکیان کوڕی کەعبی کوڕی رەبیعە بون،[٦] بۆیە هەرکام لەو دوانەی پێ بوترێت هەر بۆ یەک رەچەڵەک ئەگەرێتەوە.

ئەم هاوەڵە بەصریە،[٧] برای نوهەیکی کوڕی مالیکی شاعیرە کە شاعیرێکی ناسراو بوو.[٨]

فەرموودەیەکی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە کە دەفەرموێت (من أدرك والديه أو أحدهما ثم دخل النار فأبعده الله).[٩] (هەرکەس دەستی بگات بە دایک

---

[١] صحيح البخاري – كتاب العلم – باب ما ذكر في ذهاب موسى(ﷺ) في البحر إلى الخضر، الرقم ٧٤.

[٢] صحيح مسلم – كتاب الصيام – باب فضل ليلة القدر والحث على طلبها، الرقم ٧٦٢.

[٣] المختار من مناقب الأخيار، ج١، ص١٨٣.

[٤] معجم الصحابة لابن قانع، ج١، ص٧.

[٥] أسد الغابة، ج١، ص٨٠ الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٨.

[٦] أسد الغابة، ج١، ص٨٠.

[٧] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٧٠، أسد الغابة، ج١، ص٨٠ الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٨.

[٨] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٩.

[٩] أسد الغابة، ج١، ص٨١ صححه الألباني في السلسلة الصحيحة، الرقم٥١٥.

و باوکی یان به یەکێکیان و دواتر بچێته دۆزەخ، با هەر خوا دووری بخاتەوە).

یەحیای کوڕی مەعین بە هاوەڵی نازانێت و ئەڵێت ئەم فەرموودەیە هی عەمری کوڕی مالیکە،[1] بەڵام بوخاری پاش هێنانی مشتومڕ لەسەری بەهاوەڵی دەزانێت.[2]

## ١٨٠. ثوبەی کوڕی موعاذ(﵁):

ناوی ثوبەی کوڕی موعاذی کوڕی ئەنەسی کوڕی قەیسە،[3] برای ئەنەسی کوڕی موعاذە،[4] ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە.[5]لە ناو پشتیوانانیشدا لە خەزرەجیەکانە لە بەنی نەجار.[6]

ئەم دوو برایە هەردووکیان بەشداری هەردوو جەنگی بەدر و ئوحودیان کرد و لە رۆژی بیئر مەعوونە هەردووکیان شەهید بوون.[7]

بیئر مەعوونە ئەو رووداوە بوو کە کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) حەفتا هاوەڵی نارد کە پێیان دەوترا (القراء)، ئەمەش دوای ئەوەی رەعل و زەکوان و عصیە و بەنی لیحیان هاتن و داوایان کرد پێغەمبەر(ﷺ) یارمەتییان بدات، پێغەمبەریش(ﷺ) حەفتا هاوەڵی ناو پشتیوانانی بۆ ناردن، کەچی کاتێک گەیشتنە لای بیرێ بە ناوی مەعوونە ناپاکییان لێکردن و هاوەڵەکانیان شەهید کردن، پێغەمبەریش(ﷺ) یەک مانگ لە نوێژی بەیانیدا نزای لێکردن.[8]

---

[1] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٧٠.

[2] أسد الغابة، ج١، ص٨١ الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٩.

[3] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٧٠، أسد الغابة، ج١، ص٨١

[4] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٧٠.

[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٠.

[6] أسد الغابة، ج١، ص٨١

[7] أسد الغابة، ج١، ص٨١ الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٠.

[8] البداية والنهاية لإبن كثير، ج٤، ص٧١

## ١٨١. ئوبەی كوڕی ئومەییە(رضي الله عنه):

ئەم هاوەڵە لەگەڵ براكەیدا موسڵمان بوو، ناوی ئوبەی كوڕی ئومەییەی كوڕی حەرثانی كوڕی ئەسكەری كنانی لەیثیە،[1] لەگەڵ كەلبی برایدا موسڵمان بوون،[2] ئوبەی و كیلاب پێكەوە كۆچیان كرد بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)،[3] ئومەییەی باوكیشیان دواتر موسڵمان بوو.[4]

## ١٨٢. ئوبەی ئیبنولقیشب(رضي الله عنه):

ناوی ئوبەی ئیبنولقیشبی ئەزدیە،[5] ئەم هاوەڵە لە مەدینە نیشتەجێ بوو، جارێكیان پێغەمبەر(ﷺ) چوویە مزگەوت پاش ئەوەی قامەت كرا بۆ نوێژ، ئوبەی دوو ركات نوێژی ئەكرد، پێغەمبەر(ﷺ) بە دەستی دای بەسەر شانیدا و فەرمووی: (ابن القشب أتصلي أربعا)، (ئیبنوقیشب ئەرێ ئەوە چوار ركات نوێژ ئەكەیت- نوێژەكەت ئەكەیت بە چوار ركات؟).[6]

## ١٨٣. ئوثالی كوڕی نعمانی حەنەفی(رضي الله عنه):

ئوثال یەكێكە لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) كە زانیاری زۆر كەم لەسەر ژیانی هەیە.

تەنها گێڕانەوەیەك لەسەری هاتووە كە دەڵێت: من و فوراتی كوڕی حەییان چووین بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و سەلاممان لێكرد، ئەوكات هێشتا موسڵمان نەبووبووین، ئەویش وەڵامی سەلامەكەی داینەوە.[7]

---

[1] أسد الغابة، ج١ص٧٤، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٢٥.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٢٥.

[3] أسد الغابة، ج١ص٧٤.

[4] أسد الغابة، ج١ص٧٥.

[5] الإصابة في تميز الصحابة، ج١، ص٢٦.

[6] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٧٢٤، أسد الغابة، ج١، ص٧٧، الإصابة في تميز الصحابة، ج١، ص٢٦.

[7] أسد الغابة، ج١ص٨٢، الإصابة في تميزز الصحابة، ج١، ص٣٠.

ئوثـال كوڕێكـی هەیـە بـە نـاوی ثومامـە،[1] هەرچەنـدە ئیبـن حەجەرلـە وەڵامـی قسـەیەكی ئیبـن فەتحووندا دەڵێت: ثومامـە كـوڕی ئـەم نیـە چونكـە باوكـی ثومامـە نـاوی ئوثالـی كـوڕی سـەلەمەیە،[2] بـەڵام لەسـەرچاوەكاندا نـاوی ثومامـە و باوكـی واهاتـووە: ثومامـەی كـوڕی ئوثالـی كـوڕی نوعمانـی كـوڕی مەسـلەمە.[3]

## ١٨٤. ئوحەیحەی كوڕی جەلاح(ﭬ):

تەنها ئیبن حەجـەر وەک هـاوەڵ نـاوی هێنـاوە و پێی وایـە ئەمـە هاوەڵێكـە جیـا لـەو ئوحەیحـەی كـوڕی جەلاحـەی كـە لەسـەردەمی جاهیلیـدا هەبـووەو بـە بێبـاوەڕی مـردووە، ئـەو ئەگـەرەش دادەنێـت كـە لەوانەیـە نـەوەی ئـەو ئوحەیحەیـە بێـت و نـاوی خـۆی و باوكـی وەک ئـەو بێـت.[4]

## ١٨٥. ئوحەیحەی كوڕی ئومەییە(ﭬ):

هەریـەک لـە ئیبـن عەبدولبـەر و ئیبـن حەجـەر و ئیبـن ئەثیـر باسـیان كـردووە.[5]

نـاوی ئوحەیحـەی كوڕی ئومەییـەی كوڕی خەلەفی كوڕی وەهەبی كوڕی حوذافـەی كـوڕی جومـەحـی جومەحیـە، بـرای صەفوانـی كـوڕی ئومەییەیـە،[6] یەكێک بـوو لـە دڵڕاگیـر كراوان، واتـە (المؤلفة قلوبهم).[7]

---

[1] معجم الصحابة لابن قانع، ج١، ص١٣١، الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٥، ص٥٥٠.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٠.
[3] معجم الصحابة لابن قانع، ج١، ص١٣١.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٥-٣٦.
[5] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٣٧، أسدالغابة، ج١، ص٨٨ الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٤.
[6] أسدالغابة، ج١، ص٨٨.
[7] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٤.

## ١٨٦. ئوذەینەی عەبدی(رضي الله عنه):

هەریەک لە بوخاری و ئیبن عەبدولبەر و ئیبن ئەثیر و ئیبن حەجەر و ئیبن قانع و ئەبوونوعەیمی ئەصبەهانی ناویان هێناوە.[١]

سەبارەت بە ناوی باوکی و رەچەڵەکی راجیایی هەیە، رایەک دەڵێت: ناوی ئوذەینەی کوڕی حارثي کوڕی یەعمەری کوڕی عەوفی کوڕی کەعبی کوڕی مالیکی کوڕی لەیثی کوڕی بەکری کوڕی عەبدمەناتی کوڕی کینانەیە.[٢]

رایەکی تر دەڵێت، ناوی ئوذەینەی کوڕی سەلەمەی کوڕی حارثی کوڕی خالیدی کوڕی عائیدی کوڕی سەعدی کوڕی ثەعلەبەی کوڕی غەنەمی کوڕی مالیکی عەبدیە.[٣]

ئیبن ئەثیر دەڵێت: من پێم وایە ئەوەی دەڵێت: عەبدیە راستترە.[٤]

ئوذەینە فەرموودەیەکی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە کە دەفەرموێت (من حلف على يمين فرأى غيرها خيرا منها فليأت الذي هو خير وليكفر عن يمينه)،[٥] (هەرکەس سوێندی لەسەر شتێ خوارد و دواتر شتێکی باشتری لەوەی بەدیکرد کە سوێندی لەسەر خواردبوو، با باشترەکە بکات و کەفارەتی سوێندەکەی بدات).

هاوشێوەی ئەم فەرموودەیە لە کتێبەکانی فەرموودەدا بە گێڕانەوەی ئەبووهورەیرە هاتووە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت (من حلف على يمين فرأى غيرها خيرا منها فليكفر عن يمينه وليفعل).[٦]

---

[١] أسد الغابة، ج١، ص٩١، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٤٠.

[٢] أسد الغابة، ج١، ص٩١.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٤٠.

[٤] أسد الغابة، ج١، ص٩١.

[٥] معجم الصحابة لإبن قانع، ج١، ص٥٢، معرفة الصحابةلأبي نعيم الأصبهاني، الرقم١٠٣١، صححه الألباني في إرواء الغليل، الرقم ٢٠٤٠.

[٦] صحيح مسلم - كتاب الأيمان - باب ندب من حلف يمينا فرأى غيرها خيرا منها أن يأتي الذي هو خير

ئیبن تیمیە لەم بارەیەوە دەڵێت:(هەموو سوێندێ دەگرێتەوە با سوێندەکە هەرچۆنێ بێت، ئەگەر بینی شتێک بەدەر لەوەی سوێندی لەسەر خواردووە باشترە لەوەی سوێندی لەسەر خواردووە پێویستە لەسەری واز لەو سوێندەی بهێنێ بۆ چاکەیەک کە ئەنجامدانی بە باشتر بزانێ لە ئەنجام نەدانی، یان ئەنجامدانی خراپەیەک بێت کە نەکردنی باشتر بزانێ لە کردنی).[1]

ئوذەینە لە سەردەمی خیلافەتی عوثمانی کوڕی عەففاندا گەورەی عەبدولقەیس بوو، لە جەنگی جەمەلیشدا بەشداری کرد، دواتر تا سەردەمانی دەوڵەتی ئومەوی مایەوە تا لە سەردەمی حەجاجدا ماوەیەک دادوەری بەصرە بوو.[2]

## ١٨٧. ئوسامەی کوڕی زەید(ﭬ):

ناوی ئوسامەی کوڕی زەیدی کوڕی حارثەی کوڕی شەراحیلی کوڕی کەعبی کوڕی عەبدولعوززای کەلبیە.[3]

زەیدی باوکی یەکێک بوو لە هاوەڵانی خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ) کە لە جەنگی موئتەدا شەهید بوو.

ئوسامە کوڕێکی رەنگ رەش بوو و لووتی پان بوو.[4]

دایکی ناوی ئەیمەنە کە شیردەری پێغەمبەر(ﷺ) بوو.[5]

ئوسامە لە سەری دایکیەوە برایەکی هەبوو ناوی ئەیمەنی کوڕی عوبەید

---

ویکفر عن یمینه، الرقم ١٦٥٠.

[1] إقامة الدلیل علی إبطال التحلیل، ج٣، ص٣٢٢.

[2] أسد الغابة، ج١، ص٩١.

[3] الإستیعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٧٥، أسد الغابة، ج١، ص١٠١، الإصابة في تمییز الصحابة، ج١، ص٤٩، سیر أعلام النبلاء للذهبي، ج٢، ص٤٩٦.

[4] الإستیعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٧٥، أسد الغابة، ج١، ص١٠٣.

[5] الإصابة في تمییز الصحابة، ج١، ص٤٩.

بوو، عوبەید لە ڕۆژی جەنگی حونەیندا شەهید بوو.[١]

ژنەکەی ناوی زەینەبی کچی حەنظەلەی کوڕی قەسامەی کوڕی قەیس بوو کە دواتر تەڵاقی دا.[٢]

هەروەها فاطمەی کچی قەیسی بە هاوسەر گرت، ئەمەش دوای ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەو پێشنیارەی کرد، کاتێک فاطمە تەڵاق درا پێغەمبەر(ﷺ) داوای کرد لە فاطیمەی کچی قەیس تا ماوەی عیدەکەی (واتە ماوەی پاش تەڵاق) لە ماڵی ئیبن ئوم مەکتوم بێت،[٣] دواتر دوو کەس چوونە داوای فاطیمە، یەکێکیان ناوی موعاویە بوو، ئەمە موعاویەی کوڕی ئەبوو سوفیان نەبوو، چونکە بە هەڵە هەندێ وادەزانن ئەم موعاویە بووە،[٤] ئەوی تریشیان ئەبوو جەهم بوو، فاطمە هات و پرسی کرد بە پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش فەرمووی: (أما أبوجهم فلا يضع عصاه عن عاتقه، أما معاوية فصعلوك لا مال له)، (سەبارەت بە ئەبووجەهم ئەوە هەر داردەسەکەی لەسەرشانی داناگرێ، موعاویەش گیرفان بەتاڵەو هیچ سامانێکی نیە)، پاشان ڕێنمایی کرد شوو بکات بە ئوسامەی کوڕی زەید، فاطمەش شووی پێکرد.[٥]

ئوسامە دوو کوڕی هەبوو بە ناوی موحەممەد و حەسەن کە فەرموودەیان لە باوکیانەوە گێڕاوەتەوە.[٦]

ئوسامە لە سەردەمی ئیسلامدا لەدایکبوو، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد تەمەنی ٢٠ ساڵ بوو، دەوترێ بەڵکو هەژدە ساڵ بوو،[٧] دەشوترێ بەڵکو نۆزدە ساڵ بوو،[٨] ئەمە واتە لە ساڵی سێی پێغەمبەرایەتی یان ساڵی

---

[١] أسد الغابة، ج١،ص٢٤٢.

[٢] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٤، ص١٨٥٢، الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٦٧١.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٨، ص٦٩.

[٤] الإصابة في تمييز الصحابة،ج٦، ص٣٠٣.

[٥] صحيح مسلم، الرقم ٢٨٠١.

[٦] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٢، ص٤٩٧.

[٧] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٤٩.

[٨] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٧٥.

چوار یان پێنجی پێغەمبەرایەتی لەدایک بووە.

کونیەکەی ئەبوومحەممەدە، دەوترێ بەڵکو کونیەکەی ئەبووزەیدە، یان دەوترێ ئەبوو یەزید، یان ئەبوو خارجە،[1] ناسراوە بە (الحب بن الحب) واتە (خۆشەویستی کوڕی خۆشەویست)،[2] هەروەها ناسراوە بە خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ) (حب رسول الله)، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژەی داوە بە خۆشەویستی زۆری بۆی وەک دەفەرموێت (إن أسامة بن زيد لأحب الناس إلي أو من أحب الناس إلي وأنا أرجو أن يكون من صالحيكم فاستوصوا به خيرا)[3] (ئوسامەی کوڕی زەید خۆشەویسترین کەسە لەلام یان لە خۆشەوسترین کەسانە لەلام منیش هیوام وایە لە کەسە چاکەکانتان بێت، دەی چاک بن لەگەڵیدا).

جارێک ئوسامە و زەیدی باوکی لە پەنا یەکدا راکشابوون،[4] موجەززەز کە کەسێکی شارەزا بوو بە رەچەڵەکی خەڵک، هات و سەیرێکی کردن، وتی: ئەم قاچانە لە یەکن، پێغەمبەریش(ﷺ) زۆر دڵخۆش بوو بەو قسەیە،[5] لەبەرئەوەی زەید کەسێکی سپی پێست بوو و ئوم ئەیمەنیش رەش پێست بوو، ئوسامەیش رەشپێست بوو، گومانێک ورووژێنرابوو کە ئوسامە لە زەید نەبێت.

هەروەها فاتیمەی کچی قەیس دەڵێت: بیستبووم پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووبووی (مَنْ أحبنِي فليُحِب أُسامة)[6] (هەرکەس منی خۆشدەوێ با ئوسامەی خۆش بوێت).

پێغەمبەر(ﷺ) ئوسامە و حەسەنی کچەزای خۆی دەگرتە کۆش و یەکێکیانی لەسەر رانێکی و ئەوی تری لەسەر رانەکەی تری دادەنا

---

[1] أسدالغابة، ج١، ص١٠٢.

[2] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٧٥، البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص٢٥٤.

[3] مصنف ابن أبي شيبة - كتاب الفضائل - ما جاء في أسامة وأبيه(رضي الله عنهما)، الرقم ٣٢٩٧١.

[4] صحيح البخاري - كتاب فضائل الصحابة - باب مناقب زيد بن حارثة مولى النبي، الرقم ٣٧٣١.

[5] صحيح البخاري - كتاب الفرائض - باب القائف، الرقم ٦٧٧٠.

[6] صحيح مسلم - كتاب الفتن وأشراط الساعة - باب في خروج الدجال ومكثه في الأرض ونزول عيسى وقتله إياه، الرقم ٢٩٤٢.

و دەیفەرمــوو (اللهم إني أحبهما فأحبهما)[1] (خوایــە مــن ئــەم دوانــەم خــۆش ئەویـن دەی تۆیـش خۆشـت بویـن)، لـە ریوایەتێکی تـردا هاتـووە دەیفەرمـو (خوایـە رەحمیـان پـێ بکـە چونکـە مـن رەحمـم هەیـە بۆیـان)، (اللهم ارحمهما فإني أرحمهما).[2]

پێغەمبـەر(ﷺ) زۆر نـازی ئوسـامەی رادەگـرت و گرنگـی پێـدەدا، دایکمـان عائیشـە لـەو بـارەوە دەگێڕێتـەوە جارێکیـان ئوسـامەی کوڕی زەیـد لەبـەردەرگا بـوو، سـەری بـەر لاتەنیشـتی دەرگاکـە کـەوت و سـەری بریـندار بـوو، پێغەمبـەر(ﷺ) بـە منـی فەرمـوو: بـۆی بسـڕە، بـەڵام مـن بێـزم لێکـردەوەو نەمتوانـی بۆی پاکراگرم، پێغەمبـەر(ﷺ) خـۆی بـۆی سـڕی و پاکـی کـردەوەو فەرمـووی: (لو كان أسامة جارية لكسوته وحليته حتى أنفقه)،[3] (ئەگـەر ئوسـامە کیژۆڵەیـەک بوایـە، جلـم دەکـردە بـەر هەتـا خەرجیشـم دەکێشـا).

دیارە ئەمـە وانەیـەک بـووە بۆ دایکە عائیشـە بۆ جارەکانی دی، هـەروەک خـۆی دەڵێـت: جارێـک پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) ویسـتی چڵمـی ئوسـامە بسـڕێت، منیـش وتـم: رێ بـدە مـن ئـەوە بکـەم، پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمووی: ئـەی عائیشـە، خۆشـت بوێت چونکـە مـن خۆشـم دەوێـت.[4]

ئەویـش هـەردەم هاودەمـی خۆشـی و نارەحەتیەکانـی پێغەمبـەر(ﷺ) بـوو، ئەوەتـا کاتێـک ئیبراهیمـی کوڕی پێغەمبـەر(ﷺ) وەفاتـی کـرد و ئەسـپەردەیان کـرد یەکێ لـەو کەسـانەی دابەزیـە نـاو گۆڕەکـەی ئیبراهیـم ئوسـامەی کـوڕی زەیـد بـوو، پێغەمبەریـش(ﷺ) لەکەنـاری گۆڕەکـەوە دانیشـتبوو،[5] هـەروەهـا لەپێش ئەسـپەردەکردنیدا کاتێـک بینی پێغەمبـەر(ﷺ) دەگری ئوسـامە هـاواری

---

[1] صحيح البخاري - كتاب فضائل الصحابة - باب مناقب الحسن والحسين، الرقم ٣٧٤٧.

[2] صحيح البخاري - كتاب الأدب - باب وضع الصبي على الفخذ، الرقم ٦٠٠٣.

[3] مسند أحمد بن حنبل - مسند عائشة(ﭫ)، الرقم ٢٦٥٠١، حسنه شعيب الأرناؤوط، صححه الألباني في الجامع الصغير و زيادته، الرقم ٩٤١٠.

[4] جامع الترمذي - أبواب المناقب عن رسول الله(ﷺ) - باب مناقب أسامة بن زيد(ﭫ) الرقم ٣٨١٨ و قال حسن صحيح.

[5] أسد الغابة، ج١، ص٦٤.

کرد، پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگری لێکرد، ئوسامە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) تۆم بینی دەگریایت، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: گریان لە سۆزەوەیە و هاواریش لە شەیتانەوەیە.[1]

هەر وەک بۆ ئەسپەردەکردنی تەرمی ئوم کلثومی کچی پێغەمبەریش(ﷺ) یەکێک لەوانەی دابەزیە ناو گۆڕەکەی ئوسامەی کوڕی زەید بوو،[2] پێغەمبەریش(ﷺ) فرمێسک بە چاوانیەوە بوو.[3]

ڕۆژێک پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر وڵاخێ بوو، دەچوو بۆ سەردانی سەعدی کوڕی عوبادە، ئوسامەی کوڕی زەیدیش لەدوایەوە لەگەڵیدا سەرکەوتبوو، ئەمەش لەپێش جەنگی بەدردا بوو، دای بەلای کۆڕێکدا کە موسڵمان و جوولەکە و بتپەرستیشی تێدابوو، عەبدوڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلولیش لەوێ بوو، هەروەها عەبدوڵای کوڕی ڕەواحەش لەوێ بوو، کاتێک تەپوتۆزی وڵاخەکە بەر کۆڕەکە کەوت، عەبدوڵای کوڕی ئوبەی لووتی خۆی بە عەباکەی داپۆشی، ئینجا وتی: تۆزمان بەسەردا مەکەن، پێغەمبەر(ﷺ) سەلامی بۆ کردن و دواتر وەستا و بانگی کردن بۆ لای خوا و قورئانی بەسەریاندا خوێندەوە، عەبدوڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول وتی: هۆ کابرا، ئەوەی تۆ دەیڵێیت ئەگەر حەق بێت لەوە باشتر نیە، دەی ئیتر لە مەجلیسەکانماندا بێزارمان مەکە و بڕۆرەوە بۆ شوێنی خۆت، هەرکامان هات بۆ لات بۆی بخوێنەرەوە و قسەی خۆتی بۆ بکە، عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) وەرە مەجلیسمان ئێمە دڵخۆشین بەوە، موسڵمان و بێباوەڕ و جوولەکەکان بەینیان شلۆق بوو، خەریک بوو بدەن بە یەکدا، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) ئارامی کردنەوە، ئینجا سواری وڵاخەکەی بوویەوە و چوو بۆ لای سەعدی کوڕی عوبادە.[4]

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص١٣٩.

[2] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٤، ص١٩٥٢، الإصابة في تمييز الصحابة، ج٨، ص٢٨٩.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٨، ص٢٨٩.

[4] صحيح البخاري - كتاب تفسير القرآن - سورة آل عمران - باب ولتسمعن من الذين أوتوا الكتاب من

لە جەنگی بەدردا ئوسامە نەچوو بۆ جەنگەکە و لەگەڵ عوثمانی کوڕی عەففاندا مایەوە،[1] بە فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) هەریەک لە عوثمان و ئوسامە لای روقییە مانەوە،[2] کاتێک روقییەی کچی پێغەمبەر(ﷺ) و خێزانی عوثمانی کوڕی عەففان وەفاتی کرد، ئوسامە لەگەڵ عوثماندا سەرقاڵ بوو بە ئەسپەردەکردنی تەرمی روقییەوە، لەو کاتەدا عوثمان دەنگی الله أکبری بیست، وتی: ئوسامە ئەوە چیە؟ کە چوون سەیریان کرد زەیدی باوکی ئوسامەیە موژدەی شکستی بێباوەرانی هێناوە.[3]

لە جەنگی ئوحوددا ئوسامە چوو تا بەشداری جەنگەکە بێت، بەڵام لەبەر کەمی تەمەنی، پێغەمبەر(ﷺ) رێی نەدا بەشدار بێت، وەک چۆن چەند هاوەڵێکی تریشی گێڕایەوە کە ئەوانیش تەمەنیان کەم بوو.[4]

جارێک پێغەمبەر(ﷺ) لە عەرەفە ئیفاضەی دواخست و چاوەڕێی ئوسامەی کوڕی زەیدی کرد، کاتێک هات رەنگ رەشێکی لووت پان بوو خەڵکی یەمەن وتیان: لەبەر ئەمە ئاوا دواخراین؟[5]

لە حەجکردنی پێغەمبەردا(ﷺ) ئوسامە بەشداری کرد و بە جلەکەی سێبەری دەکرد بۆ پێغەمبەر(ﷺ) تا لە گەرما بیپارێزێ[6]

جارێک پێغەمبەر(ﷺ) و ئوسامە چوون بۆ لای ثابتی کوڕی رەبیع کە لە سەرەمەرگدا بوو، پێغەمبەر(ﷺ) کە حاڵی بینی بە خەڵکەکەی راگەیاند ثابت خەریکە دەمرێت، ژنەکانی ناو ماڵەکە گریان، خێرا ئوسامە کەوتە رێگریکردن لە گریانیان، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (دعهن يبكين ما دام بين

---

قبلكم ومن الذين أشركوا أذى كثيرا، الرقم ٤٥٦٦.

[1] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٤، ص١٨٤٢، الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٦٤٩.

[2] البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص٣٠٤.

[3] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٤، ص١٨٤٢، الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٦٤٩.

[4] البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص١٥.

[5] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٧٥.

[6] البداية والنهاية لابن كثير، ج٥، ص١٩٦.

أظهرهن فإذا وجب فلا أسمَعن صوت باكية)،[1] (وازیان لێ بهێنە تا لەناویاندایە با بگرین، کاتێک گیانی دەرچوو ئیتر هیچ دەنگی گریانێ نەبیستم).

کاتێک فاطیمەی کچی ئەبیلئەسەد دزی کرد و بڕیار درا دەستی ببڕدرێت، کەس و کارو هۆزەکەی هاتن بۆ لای ئوسامە تا لای پێغەمبەر(ﷺ) سکاڵایان بۆ بکات، کاتێک ئوسامە ویستی قسەی لەسەر بکات، پێغەمبەر(ﷺ) ڕێی پێ نەدا و تێیگەیاند ئەوە سنووری خوایە و ئەگەر بۆ فاطمەی کچی خۆیشی بێ جێبەجێی دەکات.[2]

جارێک حەکیمی کوڕی حیزام جلوبەرگی (ذي يزن)ی بە دیاری هێنا بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ)لێی وەرنەگرت و فەرمووی: من دیاری کەسی بێباوەڕ وەرناگرم، دوایی کە فرۆشتی پێغەمبەر(ﷺ) لەو کەسەی وەرگرتەوە کە کڕیبووی (کڕیەوە) و کردیەبەری، دواتر پێغەمبەر(ﷺ) کردیە بەری ئوسامەی کوڕی زەید، حەکیم کە ئەوەی دی وتی: بەخ بەخ ئەی ئوسامە جلوبەرگەکەی (ذي يزن)ت لەبەرە، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: تۆش پێی بڵێ بۆ چی تیایە، خۆ من لەو باشترم و باوکیشم لە باوکی ئەو باشترە.[3]

ئوسامە بەشداری ئەو سریەیە بوو کە پێغەمبەر(ﷺ) ناردنی بۆ حرقە و تیایدا ئوسامە میرداسی کوڕی عەمری فەدەکی کوشت،[4]چونکە میرداس ئەو نێردراوەی پێغەمبەری خوای(ﷺ) کوشت کە ناوی غالبی کوڕی عەبدوڵا بوو،[5] ئەمەش هەمان ئەو کەسە بوو کە کاتێک ئوسامە ویستی بیکوژێت شایەتومانی هێنا، بەڵام ئوسامە کوشتی و لەسەر ئەوەش پێغەمبەر(ﷺ) سەرکۆنەی کرد.[6]

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص٣١١.

[2] صحيح البخاري - كتاب أحاديث الأنبياء - باب حدثنا أبو اليمان، الرقم ٣٤٧٥.

[3] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٢، ص٥٠٤.

[4] الاستيعاب، ج٣، ص١٣٨٦.

[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٥، ص٣١٧.

[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٦، ص٥١٤.

ئوسامەی کوڕی زەید دەڵێت: ڕۆژێک لە جەنگێکدا لەگەڵ موسڵمانێکدا گەیشتین بە بێباوەڕێک، کە شمشێرمان لێهەڵکرد وتی: أشهد أن لا إله إلا الله، بەڵام ئێمە وازمان لێنەهێنا و کوشتمان، کاتێک هاتینەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) مەسەلەکەمان بۆ باسکرد، فەرمووی: ئەی ئوسامەی ئەی چی ئەکەیت بە لا إله إلا الله (یا أسامة من لك بلا إله إلا الله)، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو لەبەر پەنادان و لە ترسان وای وت: تا نەیکوژین، فەرمووی: ئەی ئوسامە ئەی چی ئەکەیت بە لا إله إلا الله، سوێند بەوەی گیانمی بەدەستە هێندە وتیەوە حەزم دەکرد چی ماوەی موسڵمانبوونم هەیە نەبوایە و ئەو ڕۆژە موسڵمان بوومایە، وتم: بەڵێن ئەدەم بەخوا هەرگیز کەسێ نەکوژم کە بڵێت لا إلە إلا الله.[1]

لە دەقێکی تردا هاتووە پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: (ألا شققت قلبه فتعلم صادق هو أم كاذب)[2] (ئەرێ دڵیت لەت کرد تا بزانیت راست ئەکات یان درۆ دەکات).

لە ڕووداوی ئیفکدا کە تیایدا دووڕوان بوختانیان دروستکرد بۆ دایکی باوەڕداران عائیشە و دواتر خوا بە دەقی ئایەت پاکی عائیشەی سەلماند و دووڕوویی دوروەکان دەرکەوت، لەو ماوەدا پێغەمبەر(ﷺ) ئوسامەی کوڕی زەید و عەلی کوڕی ئەبوو طالیبی بانگکرد تا سەبارەت بە دوورکەوتنەوەی لە عائیشە راوێژیان پێ بکات، ئوسامە شایەتی پاکی بۆ دا و وتی: تەنها خێر و چاکەمان لێ دیوە، عەلیش پێی وت: خوا بارت سەخت ناکات و ئافرەتی تریش جگە لەو زۆرن جا ئافرەتێ بانگ بکە تا راستیەکەت بۆ تەئکید بکاتەوە، پێغەمبەریش(ﷺ) بورەیرەی بانگ کرد و لێی پرسی ئەی بورەیرە هیچت دیوە کە گومانت لا دروست بکات، وتی: نا سوێند بەوەی تۆی بە حەق ناردووە.. هتد.[3]

---

[1] دلائل النبوة للبيهقي، الرقم ١٦٣٨، أسد الغابة، ج١، ص١٠٣.

[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص١٩.

[3] صحيح البخاري - كتاب تفسير القرآن - سورة النور - باب لولا إذ سمعتموه ظن المؤمنون والمؤمنات بأنفسهم خيرا إلى قوله الكاذبون، الرقم ٤٧٥٠.

له فەتحی مەککەدا کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) چوویە ناو کەعبە یەکێک لەوانەی لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) چوونە ژوورەوە ئوسامەی کوڕی زەید بوو.[1]

ئوسامە دەڵێت: وتم ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەتەمایت لە مەککە لە کوێ بمێنیتەوە؟ ئەویش فەرمووی: بۆ مەگەر عوقەیل هیچ ماڵ و حاڵێکی بۆ هێشتووینەتەوە؟[2]

لە جەنگی حونەیندا کاتێک سەرەتا موسڵمانان شکستیان خوارد بڕێ لە هاوەڵان لە دەوری پێغەمبەر(ﷺ) مانەوە، یەکێک لەوانە ئوسامەی کوڕی زەید بوو.[3]

لە چەندین حاڵەتی جیاوازدا دەبینین پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە بە وڵاخەکەی دەڕۆیشت، ئوسامەی کوڕی زەیدی لەدوای خۆیەوە دادەنا، لەوانەش:

لە سەردانی بۆ لای سەعدی کوڕی عوبادە لە پێش غەزای بەدر.[4]

لە فەتحی مەککەدا.[5]

لە حەجی ماڵئاواییدا.[6]

پێغەمبەر(ﷺ) لەپێش وەفاتیدا بڕیاری دا هێرش بنێرێت بۆ سەر ڕۆمەکان، بۆ ئەوەش سوپایەکی پێکهێنا کە گەورە هاوەڵانی وەک عومەری کوڕی خەطابیشی تێدابوو،[7] ئوسامەی بانگ کرد و پێی فەرموو: (بڕۆ بۆ شوێنی کوژرانی باوکت و بیانخەرە ژێر پێی ئەسپەکان، وا من تۆم کردە بەرپرسی ئەم سوپایە).[8]

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤، ص٤٥٠.

[2] صحيح البخاري - كتاب الحج - باب توريث دور مكة وبيعها وشرائها، الرقم ١٥٨٨.

[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص١٥١.

[4] صحيح البخاري - كتاب تفسير القرآن - سورة آل عمران - باب ولتسمعن من الذين أوتوا الكتاب من قبلكم ومن الذين أشركوا أذى كثيرا، الرقم ٤٥٦٦.

[5] صحيح البخاري - كتاب الجهاد والسير - باب الردف على الحمار، الرقم ٢٩٨٨.

[6] صحيح البخاري - كتاب الحج - باب التلبية والتكبير غداة النحر حين يرمي، الرقم ١٦٨٧.

[7] أسد الغابة، ج١، ص١٠٤.

[8] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص١٩٠.

رۆژی چوارشـەممە تـاو نارەحەتـی پێغەمبـەری خـوای(ﷺ) داگـرت، بـەڵام رۆژی پێنـج شـەممە خۆی چوو ئاڵاکەی دایە دەست ئوسامەی کوڕی زەید، لەنێو سـوپاکەیدا ئەبووبەکری صدیق و عومـەری کـوڕی خەطـاب و ئەبـوو عوبەیدەی کوڕی جـەراح و سـەعدی کـوڕی ئەبی وەقاص و چەندین هاوەڵـی تـری گـەورە هەبـوون، لەسـەر ئـەوە کەسـانێ نارەزاییـان دەربـڕی، بۆیـە پێغەمبـەر(ﷺ) تـەواو توورەبـوو و لەتـاو ئازاریـش سـەری بەسـتبوو، چوویـە سـەر مینبـەر و سـوپاس و ستایشـی خـوای کـرد و دواتـر فەرمـووی: (ئـەی خەڵکینـە ئـەو قسـەو باسـە چیـە لـە هەندێکتانـەوە پێـم گەیشـتوەتەوە سـەبارەت بـەوەی ئوسـامەم بـە ئەمیـر دانـاوە، ئەگـەر تانـە دەدەن لـە ئەمیرایەتـی ئوسـامە پێشـتریش تانەتـان دا لـەوەی باوکیـم بـە ئەمیـر دانـا، ئـەرێ بەخـوا ئـەو کەسـە بـۆ ئەمیرایەتـی دروسـت کرابـووو دوای خۆیشـی کوڕەکەشـی بـۆ ئەمیرایەتـی دروسـت کـراوە...).[1]

لـەو دەقـەی بوخـاری هێناویەتـی پێغەمبـەر(ﷺ) لـە وتارەکەیدا فەرمـووی: (أنْ تطْعنُوا فِي إمارتِهِ، فقدْ كُنتُمْ تطْعنُون فِي إمارةِ أبِيهِ مِنْ قبْلُ، وايْمُ اللهِ إنْ كان لخلِيقا لِلْإِمارةِ، وإِنْ كان لمِنْ أحبِ الناسِ إلي، وإِن هذا لمِنْ أحبِ الناسِ إلي بعْدهُ)،[2] (ئەگـەر ئێسـتا تانـە دەدەن لـە ئیمارەتەکـەی ئوسـامە، ئـەوە پێشـتریش تانەتـان دەدا لـە ئیمارەتەکەی باوکـی، بەخـوا ئـەو پیـاوە بـۆ ئیمـارەت دروسـت کرابـوو، لـە خۆشەویسـترینی خەڵکیـش بـوو لـەلام، دوای خۆیشـی ئـەم کوڕەی لـە خۆشەویسـترینی خەڵکـە لەلام).

بـەڵام ئوسـامە خێـرا نەچـوو چونکـە هەواڵـی نەخۆشـی پێغەمبـەری(ﷺ) بیسـت، ئەوەبـوو پێغەمبـەر(ﷺ) کۆچـی دوایـی کـرد، لـەو کاتـەدا ئوسـامە لـە ناوچـەی (ذي خشـب) بـوو،[3] دواتـر لەسـەردەمی ئەبووبەکـری صدیقـدا ئـەو

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص١٩٠.
[2] صحيح البخاري - كتاب فضائل الصحابة - باب مناقب زيد بن حارثة مولى النبي، الرقم ٣٧٣٠.
[3] البداية والنهاية لابن كثير، ج٦، ص٣٠٥.

سوپایە بە سەرکردایەتی ئوسامە بەڕێکەوت، هەرچەندە داوا کرا تا خەلیفە ئەبووبەکر جاریّ ئەو سوپایە نەنێریّ بەڵام ئەو رازی نەبوو سوپایەک بوەستێنیّ کە پێغەمبەر(ﷺ) بەڕێی کردبوو، ئامادەش نەبوو ئەو سەرکردەی لا ببات کە پێغەمبەر(ﷺ) دایناوبوو، تەنها داوای لە ئوسامە کرد ریّ بدات عومەر نەچێت تا یارمەتی بدات، چونکە ئەوکات زۆرێک لە عەرەبەکان لە ئیسلام هەڵگەرابوونەوە، ئوسامەش ریّی پێدا، ئوسامە چوو و هێرشی برد و سەرکەوتنی بەدەستهێنا.[١]

لە سەردەمی ئەبووبەکری صدیقدا ئوسامە رۆڵێکی کارای هەبوو، لەوانە لە جەنگی هەڵگەراوەکاندا رۆڵی بینی، کاتێک عەباسی کوڕی ئەبی رەبیعە ویستی عەبدوڵای کوڕی وەهب بکوژێ ئوسامە ریّی پێنەدا، چونکە موسەیلەمە کاتێک گەیشتبوو بە ئەو عەبدوڵایە و هاوڕێیەکی و داوای کردبوو بکەونە شوێنی، ئەوان رازی نەبوون، بۆیە هاوڕێکەیان خستە ناو ئاگر و سووتاندیان، ناچار عەبدوڵاش بە رووکەش کەوتە شوێن موسەیلەمە، کاتی جەنگی یەمامە لەگەڵ موسەیلەمە کەوتە بەردەستی عەبباس و ویستی بیکوژێت ئوسامە ریّی پیّ نەدا و پیّ وت: ئەو سووتاندنی هاوڕێکەی ترساندوویەتی، وا ئێستا هاودەم بە موسڵمانان دەجەنگێت.[٢]

کاتێک عومەری کوڕی خەطاب مووچەی بڕیەوە بۆ خەڵکی، بڕی پێنج هەزاری بۆ ئوسامەی کوڕی زەید دیاری کرد، بەڵام دوو هەزاری بڕیەوە بۆ عەبدوڵای کوڕی عومەر، عەبدوڵا وتی: فەزڵی ئوسامەت دا بەسەرمدا لەکاتێکدا من لە جەنگ و رووداوەکاندا بەشداریەکی وام هەبووە کە ئەو نەیبووە، عومەر وتی: ئوسامە لای پێغەمبەر(ﷺ) لە تۆ خۆشەویستتر بوو و باوکی ئوسامەش لە باوکی تۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) خۆشەویستتر بوو.[٣]

---

[١] الطبقات الکبری لابن سعد، ج٢، ص١٩٠-١٩١.

[٢] الإصابة في تمییز الصحابة، ج٤، ص٢٦٥.

[٣] الإستیعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٧٦، أسد الغابة، ج١، ص١٠٢-١٠٣.

هەرکات ئیمامی عومەر ئوسامەی ببینیایە، پێی دەوت: سەلامت لێ بێت ئەی ئەمیر، ئەمیرێک کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) کردی بە ئەمیر، هەتا مرد هەردەم وا سەلامی لێ دەکرد.[1]

لەکاتی فیتنەی نێوان هاوەڵاندا ئوسامە یەکێک بوو لەوانەی کەناری گرت و بەشداری ناو فیتنەکە نەبوو،[2] ئوسامە پێشتر بەڵێنی دابوو بەخوا هیچ کەسێک نەکوژێت کە وشەی لا إلە إلا اللەی وتبێ،[3] واتە بەرامبەر هیچ موسڵمانێ نەجەنگێ.

ئوسامە لە کۆتاییەکانی تەمەنیدا چوو بۆ ناوچەی (المزة) لە دەورووبەری دیمەشق، دواتر گەڕایەوە بۆ وادیلقورا، دواتر چوو بۆ ناوچەی جەرف لە نزیک مەدینە،[4] ئەو ماوەی لە ناوچەی وادیلقورا بوو ماوەی سەردەمی خیلافەتی ئەبووبەکری صدیق بوو.[5]

ئوسامە رۆژانی دووشەممە و پێنج شەممە بەڕۆژوو دەبوو، خزمەتکارەکەی پێی دەوت: تۆ کە تەمەنت کردووەو لاواز بویت بۆچی لە سەفەردا رۆژوو دەگریت؟ ئەویش وتی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) رۆژانی دووشەممە و پێنج شەممە رۆژووی دەگرت، منیش لێم پرسی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆچی دووشەممەو پێنج شەممان بەڕۆژوو دەبیت؟ فەرمووی: (إن الأعمال تُعْرضُ يوْم الِاثنيْنِ ويوْم الخمِيسِ)،[6] (رۆژانی دووشەممە و پێنج شەممان کردەوەکان دەخرێنەڕوو).

ئوسامە لە کۆتا رۆژانی سەردەمی موعاویەی کوڕی ئەبوو سوفیاندا وەفاتی کرد، لە ساڵی پەنجا و نۆی کۆچی یان دەوترێ ساڵی پەنجا

---

[1] تاریخ دمشق لابن عساکر، ج٨، ص ٦٩.

[2] أسدالغابة، ج٥، ص١١٨.

[3] دلائل النبوة للبيهقي، الرقم ١٦٣٨، أسد الغابة، ج١، ص١٠٣.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٤٩.

[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص٥٦.

[6] مسند أحمد بن حنبل – مسند الأنصار(ﷺ) – حديث أسامة بن زيد حب رسول الله(ﷺ)، الرقم ٢٢١٩٥.

و چـواری کۆچـی،[1] دەشـوترێ بەڵکـو دوای شـەهیدبوونی عوثمانـی کـوڕی عەففان لـە ناوچـەی الجرف وەفاتـی کـرد و تەرمەکـەی برایـەوە بۆ مـەدینە،[2] دەشـوترێ بەڵکـو لـە وادیلقورا کۆچـی دوایـی کـردووە.[3]

هەریـەک لـە ئەبووهورەیرەو ئیبن عەبـاس و ئەبـوو وائیل و ئەبوو عوثمانی نەهدی و عـوروەی کـوڕی زوبەیـر و ئەبووسـەلەمە و ئەبـوو سـەعید و عامـری کـوری سـەعد و ئەبـوو ظبیـان و عەطائـی کـوڕی ئەبـی رەبـاح و حەسـەن و موحەممـەدی کـوڕی فەرموودەیـان لێوە گێڕاوەتـەوە.[4]

سـەبارەت رە شـێوەی ئوسـامە ئـەوەی هاتـووە ئەوەیـە کـە کەسـێکی رەشپێسـتی لـووت پـان بـوو[5] و ورگـی هەبـوو.[6]

**پەند و وانە:**

⌘ گەیاندنـی پەیامـی خـوا و هەوڵـدان بـۆ رزگارکردنـی کۆمەڵگـە لـە سـزای دۆزەخ ئەرکێکـی لەبیرنەکـراوە، بـۆ ئەمـەش رووگیـری و لۆمـەی لۆمـەکاران نابنـە بەربەسـت، هەرچەنـدە عەبدوڵای کـوڕی ئوبـەی زامندرێژی کـرد، بـەڵام پێغەمبـەر(ﷺ) بـەردەوام لـە کۆڕەکاندا بانگـەوازی دەگەیاند، لەگـەڵ ئەوەشـدا نەرمونیان بـوو و رێگـری لـەو هەوڵانـە دەکـرد کـە دەیانویسـت ئـەو بانگـەوازە بشـێوێنن تـا وا لێکدانـەوەی بـۆ بکـرێ کـە هەوڵـی گێرەشـێوێنیە، زۆر گرنگـە بەربگیرێـت بـەو پروپاگەندانـە.

⌘ کاتێک لـە پرسـێکی گرنگدا پرسیارت لێکرا تـا راو بۆچوونـت وەرگیرێـت، پێویسـتە ئەوپـەڕی راسـتگۆیی و دڵسـۆزی و لێزانـی بەکاربهێنیت، کاتێک فاطمە

[1] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٧٧.
[2] أسد الغابة، ج١، ص١٠٣.
[3] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٢، ص٤٩٧.
[4] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٢، ص٤٩٧.
[5] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٧٥.
[6] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ٥٣.

سەبارەت بە شووکردنی پرسیاری لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد، پێغەمبەر(ﷺ) راستی مەسەلەکەی پێ فەرموو، دڵسۆزی خۆی بۆ نیشاندا و لەبری دوو کەسی تر کە چووبوونە داوای فاطیمە پێشنیاری ئوسامەی بۆ کرد.

⌘ پێغەمبەر(ﷺ) تواناکانی لە کاتی پێویستدا خستۆتەکار و گرنگی زۆری داوە بە خستنە مەیدانی گەنجان تا ئەسپی خۆیان تاو بدەن و خزمەت بەو ئیسلامە بکەن، هەرچەند کەسانێکی زۆر هەبوون لە رووی تەمەن و ئاستی کۆمەڵایەتی و بواری ئیمانداریشەوە لەپێش ئوسامەوە بوون، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) ئوسامەی کردە سەرکردەی سوپاکە.

⌘ دەست پاراستن لە کوشتاری موسڵمان، ئەوبەسەرهاتەی ئوسامە سەبارەت بە کوشتنی کەسێ کە وتبووی (لا إله إلا الله) هەرچەند لە مەیدانی جەنگدا بوو، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) سەرکۆنەی کرد، ئەمە بەڵگەیەکی بەهێزە بۆ دەستگرتنەوە لە خوێنی کەسی موسڵمان، هەرچەندە لێکدانەوەی عەقڵی ئوسامە بە نیازی خزمەتکردن بە ئیسلام بوو، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ)بە فەرمایشتی (ئەی چی دەکەیت بە لا اله الا الله) تێیگەیاند هەڵەی کردووە.

⌘ نەرمونیانی و لەسەرخۆیی پێغەمبەر(ﷺ) لە رووداوی ئیفکدا، دوورووانی سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) بوختانیان کرد بۆ دایکمان عائیشە و دوورووانی ئەمڕۆش هەمان شت ئەڵێنەوە، پێغەمبەر(ﷺ) شتێکی ناهەقی نەوت و ئازاری دڵی عائیشەشی نەدا، هاوکات راوێژی کەسانی دەوروبەرەکەی وەرگرت بەتایبەت رای گەنجانی لا گرنگ بوو، دەبینین رای عەلی و ئوسامەی وەرگرتووە کە هەردووکیان لە تەمەنی گەنجیدا بوون، ئەگەر پێغەمبەر(ﷺ) کە لە هەموان پایەبەرزتر و خاوەن ئابڕووتر بووە بەوجۆرە پرسێکی چارەسەر کردبێت، چۆن ئێمە دەتوانین بێباک بین لە ئەزموون و راوێژی گەنجان.

## ١٨٨. ئوسامەی کوڕی شەریک(ﷺ):

ناوی ئوسامەی کوڕی شەریکی ثەعلەبیە، لە بەنی ثەعلەبەیە،[1] ئیبن قانع دەڵێت: عامریە و لە بەنی عامرە،[2] ناوی لەناو هاوەڵانی کووفەدا هاتووە.[3]

ئوسامە دەڵێت: چوومە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵانی لە دەوری بوون دەتوت باڵندە بەسەر سەریانەوە نیشتوەتەوە، (واتە هێندە بێدەنگ و بە ڕێزەوە وەستابوون)، ئەعرابیەکان لە چەند لایەکەوە دەهاتن بۆ لای و سەبارەت بە هەندێ مەسەلەی ئاسایی پرسیاریان لێدەکرد،[4] دەیانوت ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە و ئەوە بۆمان بوەتە نارەحەتی و کێشە، ئەویش فەرمووی: (عباد الله وضع الله الحرج) (بەندەکانی خوا، خوا نارەحەتی هەڵگرتووە)... سەبارەت بە دەرمان پرسیاریان لێکرد، فەرمووی: (عباد الله تداووا فإن الله لم يضع داء إلا وضع له دواء إلا الهرم) (بەندەکانی خوا چارەسەر وەرگرن چونکە خوا چی دەردێکی دانابێ دەرمانێکی بۆ داناوە جگە لە پیری و بەساڵاچوون)، پرسیاریان لێکرد چاکترین شتێ بەخشرابێ بە کەسێک چیە؟ فەرمووی: (ئاکاری جوان).[5]

ئەمە بەڵگەیەکی زۆر بەهێزە تا موسڵمانان لێرەوە بنەمایەک دابنێن (چارەی هەموو دەردێک دەدۆزینەوە)، ئیبن قەیمی جەوزی دەڵێت:(خوای گەورە بۆ هەموو دەردێ دەرمانێکی داناوەو لەرووی شەرع و قەدەریشەوە ئاسانکاری کردووە بۆ گەیشتن بەو دەرمانکردنە (چارەسەردۆزینەوەیە)، جا هەر کەس بیەوێ بەو پێیەی خوا بۆی داناوە چارەسەر بدۆزێتەوەو بەکاری بهێنێ و

---

[1] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٧٨، أسدالغابة، ج١، ص١٠٤، الإصابة في معرفة الصحابة، ج١، ص١٣٩.

[2] معجم الصحابة لابن قانع، ج١، ص١٣.

[3] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٧٨، أسدالغابة، ج١، ص١٠٤.

[4] سنن أبي داود - كتاب الطب - باب الرجل يتداوى، الرقم ٣٨٥٥.

[5] صحيح ابن حبان - كتاب الطب - ذكر الأمر بالتداوي إذ الله جل وعلا لم يخلق داء إلا خلق له دواء خلا شيئين، الرقم ٦٠٦١والحديث صحيح.

پشت بە خوا ببەستێ و لە شوێنی خۆیەوە بچێ بۆ کارەکە ڕێی دەکەوێتە شیفا و چارەسەر، هەرکەسیش لەڕێی ناشەرعیەوە بۆ چارەسەر بگەڕێ با قەدەریش تاقی بکاتەوە، ئەوا ڕێگەی چارەسەرکردنی نەپێکاوەو وەک ئەو کەسە وایە چارەی دەردێ بە دەردێکی گەورەتر بکات).[1]

ئوسامە باس لەوە دەکات کە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) حەجی کردووە، خەڵکی دەهاتن و پرسیاریان لێدەکرد، هەبوو دەیوت پێش تەواف سەعیم کردووە، یان شتێکم پێش خستووە یان دوام خستووە، پێغەمبەر(ﷺ) بۆ هەموو ئەوانە ئەیفەرموو کێشە نیە.[2]

هەروەها فەرموودەیەکی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە کە دەفەرموێت (يد الله على الجماعة، فإذا شذ الشاذ اختطفه الشيطان كما يختطف الذئب الشاة من الغنم)،[3] (دەستی خوا بەسەر کۆمەڵەوەیە، ئەگەر کەسێ خۆی جیاکردەوە شەیتان دەیڕفێنێ وەک چۆن گورگ مەڕ لە ڕانەمەڕ دەرفێنێ).

ئوسامە دەڵێت: لە سەفەرێکدا لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بووین بۆ کارێکی پێویست خوفمان کردبووە پێ، سێ شەو و ڕۆژمان پێ چوو ئەو سێ ڕۆژ و شەوە خوفەکانمان دانەکەند.[4]

## ١٨٩. ئوسامەی کوڕی عومەیر(رضي الله عنه):

ناوی ئوسامەی کوڕی عومەیری کوڕی عامری کوڕی (ئوقەیشەر) عومەیری کوڕی عەبدوڵای کوڕی حەبیبی هوزەلیە.[5]

کوڕێکی هەبوو بە ناوی عامری کوڕی ئوسامە کە بە ئەبولمەلیح

---

[1] روضة المحبين، ص٢١٢.

[2] صحيح ابن خزيمة - كتاب المناسک - باب ذكر إسقاط الحرج عن الساعي بين الصفا والمروة قبل الطواف بالبيت جهلا بأن الطواف بالبيت قبل السعي، الرقم ٢٧٧٤.

[3] معجم الصحابة لابن قانع، ج١، ص١٣، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم٧٣٢.

[4] المطالب العالية لابن حجر، الرقم ١١٢،

[5] أسدالغابة، ج١، ص١٠٥، الإصابة في معرفة الصحابة، ج١، ص٥٠.

ناسـراوه،[1] ئـەم کـوڕەی فەرمـوودەی لـە باوکیـەوە گێڕاوەتـەوە.

ئوسـامە دەڵێـت: ڕۆژی حونەیـن ڕۆژێکـی بارانـاوی بـوو، پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمانی کرد بە بانگەوازکەرەکانی تا هاوار بکەن لە ماڵەوە (شوێن و حاڵی خۆتان) نوێژ بکەن.[2]

لـە گێڕانەوەکـەی نـاو (المعجـم الأوسـط) ی طەبەرانیـدا هاتـووە ئوسـامە دەڵێـت: ئـەو ڕۆژەی حونەیـن ڕۆژی هەینـی بـوو کـە بـاران بـاری، ئینجـا فەرموودەکـە وەک خـۆی دێنـێ.[3]

ئوسـامەی کـوڕی عومەیـر لەگـەڵ پێغەمبـەردا(ﷺ) بەشـداری غـەزای حونەینـی کـردووە.[4]

ئوسـامە دەڵێـت: ڕۆژانـی حودەیبیە لەگـەڵ پێغەمبـەر(ﷺ) بوویـن کـە بارانـێ بـاری خوارووی نەعلەکەمانی تەڕ نەکردبوو، بانگەوازکەرەکەی پێغەمبەر(ﷺ) هـاواری کرد (صلوا فی رحالکم)[5] (لـە شـوێن و حاڵـی خۆتانـدا نوێژ بکـەن) واتە مەیەن بۆ جەماعەت.

بە گێڕانەوەیەکی تر هەمان شت بۆ غەزای خەیبەر دێنێ.[6]

ئوسـامە دەڵێـت: جارێـک لـەدوای پێغەمبـەرەوە(ﷺ) لەسـەر وشـترێ سـوار بـووم، وشـترەکە وەسـتا، منیـش وتـم: شـەیتان بەدبەخـت بـێ، پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمـووی: (لا تقُلْ تعِس الشيْطانُ فإنهُ يعْظُمُ حتى يصِير مِثْل البيْتِ ويقُولُ: بِقُوتِي، ولكِنْ قُلْ: بِاسْمِ اللهِ فإنهُ يصْغُرُ حتى يصِير مِثْل الذبابِ) [7] (مەڵـێ شـەیتان بەدبەخـت بـێ،

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص٢١٩، أسدالغابة، ج٦، ص٢٢٥، سيرأعلام النبلاء، ج٥، ص٩٤.

[2] صحيح ابن حبان - كتاب الصلاة - باب فرض الجماعة والأعذار التي تبيح تركها - ذكر الخبر المدحض قول من نفى جواز قبول خبر الواحد، الرقم ٢٠٨١.

[3] المعجم الأوسط للطبراني، الرقم، ٥٥٢.

[4] السنن الكبرى للنسائي - كتاب المساجد - ذكر الإمامة والجماعة - العذر في ترك الجماعة، الرقم ٩٢٩.

[5] صحيح ابن حبان - كتاب الصلاة - باب فرض الجماعة والأعذار التي تبيح تركها - ذكر الأمر بالصلاة في الرحال عند وجود المطر وإن لم يكن مؤذيا، الرقم ٢٠٧٩.

[6] معجم الصحابة لابن قانع، ج١، ص١٢.

[7] السنن الكبرى للنسائي - كتاب عمل اليوم والليلة - ما يقول إذا عثرت به دابته، الرقم ١٠٣١٣، صححه الألباني في صحيح الترغيب و الترهيب، الرقم ٣١٢٨ و في الجامع الصغير و زيادته، الرقم ١٣٣٥٨.

چونکە بەوە گەورە ئەبێت تا وەک ماڵێکی لێ دێت و دەڵێت: بە هێزی من بوو، بەڵام بڵێ بسم الله چونکە بەوە بچووک ئەبێتەوە تا وەک مێشێکی لێ دێ).

## ١٩٠. ئوسامەی کوڕی ئەخدەری(ﷺ):

ناوی ئوسامەی کوڕی ئەخدەری شەقەریە،[١] لە بەصرە نیشتەجێ بووە.[٢]

ئوسامە فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوە سەبارەت بە سەردانی خەڵکێ لە شەقیرە کە چوونەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، دەڵێت: کەسێکی گەورەیان تێدابوو کە ناوی ئەصرەم بوو، کۆیلەیەکی حەبەشی کڕیبوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ناوی بنێ و نزای خێری بۆ بکە، فەرمووی: ناوت چیە؟ وتی: ئەصرەم، فەرمووی: بەڵکو ناوت زەرعەیە، فەرمووی: دەتەوێ چی بێ؟وتی شوان بێ، پێغەمبەر(ﷺ) پەنجەکانی کۆکردەوە و فەرمووی: (هو عاصم، هو عاصم).[٣]

گێڕانەوەی فەرموودەکە بەڵگەیە بۆ ئامادەبوونی لە خزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ)، هەروەک ئیبن حیببان دەڵێت: بە موسڵمانی چووەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ).[٤]

## ١٩١. ئەوسی کوڕی خالید(ﷺ)

ناوی ئەوسی کوڕی خالیدی کوڕی عوبەیدی کوڕی ئومەییەیە، لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان،[٥] دوای وەفاتی پێغەمبەریش(ﷺ) ژیاو بەشدار

[١] أسدالغابة، ج١، ص١٠١.
[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٤٨.
[٣] أسدالغابة، ج١، ص١٠١.
[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٤٨.
[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٥١.

بـوو لـە جەنگـی یەرمووکـدا.[1]

## ۱۹۲. ئەوسی کوڕی خالیدی کوڕی قرط(ﷺ)

نـاوی ئەوسـی کوڕی خالیـدی کوڕی قرطی کوڕی قەیسـی نەجاریـە، لـە پشتیوانانە لـە بەنـی نەجار، هەرچەندە زۆرێک وەک هـاوەڵ ناویـان نەهێناوە، بـەڵام ئیبـن حەجـەر بـە چەنـد بەڵگەیـەک دەیسـەلمێنێت کـە هـاوەڵ بـووە:

یەکـەم: کوڕێکی هەبـوو بـە نـاوی صەفوان کـە تابعیەکی ناسـراو بـوو، دەی ئەگـەر کوڕەکـەی تابعـی بوبێـت ئـەوا دەکرێـت خـۆی هـاوەڵ بووبێـت.

دووەم: ئەگـەر پێـش سـەردەمی ئیسـلام کۆچـی دوایـی بکردایـە ئـەوا کوڕەکـەی هـاوەڵ دەبـوو، بۆیـە دیـارە لـە دوای هاتنـی ئیسـلام و بەڵکـو پـاش وەفاتـی پێغەمبـەر(ﷺ) وەفاتـی کـردووە.

سـێیەم: خێزانەکەشـی کـە ئـوم صەفـوان بـوو یەکێـک بـوو لـەو ئافرەتانـەی بەیعەتیـان دا بـە پێغەمبـەر(ﷺ)، ئەمـەش بەڵگەیـە لەسـەر بـاوەڕداری مێردەکەشـی.

چـوارەم: کاتێـک پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) وەفاتـی کـرد هیـچ کەسـێکی پشـتیوانی بـە بێبـاوەڕی نەمابـوو و هەمـوو موسـڵمان بووبـوون.[2]

ئەمـەش ئاماژەیـە بـە وردبینـی ئیبـن حەجـەر لـە کتێبەکەیـدا نـەک ئـەوەی تەنهـا نەقڵـی زانیـاری کردبێـت و بـەس.

## ۱۹۳. ئەوسی کوڕی ثابت(ﷺ)

نـاوی ئەوسـی کوڕی ثابتـی کوڕی مونذیری کوڕی حەرامـە، ئـەم هاوەڵـە لـە پشـتیوانانە لـە خەزرەجیـەکان،[3] دایکـی نـاوی سـەخطای کچـی حارثـەی

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص٢١٧.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٥١.

[3] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١١٧، أسد الغابة، ج١، ص٢١١.

کوڕی لەوذان بوو.[1]

برایەکی ناوی حەسان بوو کە شاعیری پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو،[2] حەسان و ئەوس لە باوکەوە برا بوون و دایکیان جیا بوو.

برایەکی تری هەبوو بە ناوی ئوبەی کە لە دایک وباوکیشەوە برا بوون.[3]

ژنەکەی ئەوس ناوی صورەیمە یان صەرمە بوو.[4]

ئەوس کوڕێکی هەبوو بە ناوی شەداد کە هاوەڵێکی زۆر دیاری پێغەمبەر(ﷺ) بوو و چەندین فەموودەی گێڕاوەتەوە.[5]

ئەوس لە بەیعەتی عقەبەی دووەمدا بەشداری کرد،[6] هەروەها لە غەزای بەدرو ئوحودیشدا بەشدار بوو و لە غەزای ئوحوددا شەهید بوو.[7]

واقیدی دەڵێت: لە خەندەق و غەزاکانی تریشدا بەشدار بووەو دواتریش ژیاوە تا دوای پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە سەردەمی خیلافەتی عوثمانی کوڕی عەففاندا کۆچی دوایی کردووە،[8] بەڵام رای یەکەم راستترە چونکە کاتێک لە ئوحوددا شەهید بوو حەسانی برای شیعرێکی لەسەر وت: کە دەڵێت:

ومنا قتيل الشعب أوس بن ثابت

شهيدا واسنى الذكر منه المشاهد[9]

هەریەک لە ئیبن عەبدولبەر و ئیبن ئەثیر وئیبن حەجەریش ئەو رایەیان پێ راستە کە لە جەنگی ئوحوددا شەهید بووە.

کاتێک موسڵمانان کۆچیان کرد بۆ مەدینە عوثمانی کوڕی عەففان لە

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٤٤.
[2] أسد الغابة، ج١، ص٢١١.
[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٥٠٤.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٣، ص٣١٩.
[5] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١١٧.
[6] البدايةو النهاية لابن كثير، ج٣، ص١٦٦.
[7] أسد الغابة، ج١، ص٢١١.
[8] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١١٧.
[9] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٤٤.

ماڵی ئەوس دابەزی و لەوێ مایەوە،[1] دواتریش پێغەمبەر(ﷺ) برایەتی خستە نێوان ئەو دوانەوە.[2]

رایەک هەیە دەڵێت: ئەم ئایەتەی قورئان سەبارەت بە ئەوس و خێزانەکەی دابەزی (للرجال نصيب مما ترك الوالدان والأقربون)،[3] بەڵام ئەمە سەبارەت بە ئەوسی کوڕی ثابتی ئەنصاری برای خالید و عورفوطەیە.

## ١٩٤. ئەوسی کوڕی ثابت(رضي الله عنه)

ئەم هاوەڵەش جیایە لەو دوو هاوەڵەی تر، ئەمیش لە پشتیوانانە.

ئیبن عومەر دەگێڕێتەوە کە لە غەزای ئوحوددا ویستم بەشداری بکەم، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) بە بچووکی زانیم و منی وەک پاسەوان لە مەدینە دانا، چەند کەسی تریش لەگەڵمدا بوون پاسەوانی مەدینەیان دەکرد، لەوانە ئەوسی کوڕی ثابت و ئەوسی کوڕی عرابەو رافعی کوڕ خدیج.[4]

ئایا ئەم هاوەڵە یەکێک نیە لەو دوو ئەوسەی تر کە ناوی خۆیان و باوکیشیان وەک یەکە؟

ئێمە دەزانین ئەو دوو هاوەڵەی تر کە هەردووکیان ناویان ئەوسی کوڕی ثابت بوو و هەردووکیشیان لە پشتیوانان بوون هەردووکیان لە غەزای ئوحوددا کوژراون و مردون، بەڵام ئەمەیان لە مەدینە ماوەتەوە، یەکەمیان کە برای حەسسان بوو لە ئوحوددا شەهید بوو، دووەمیشیان دەزانین سێ منداڵی هەبووەو مردووە، بەڵام ئەمەیان لەبەر کەمی تەمەنی لە مەدینەدا ماوەتەوە تا پاسەوانی بکات، خۆ نەگونجاوە کەسێک کە هێندە بچووک بووبێت کە پێغەمبەر(ﷺ) نەیهێشتبێت بەشداری ئوحود بکات ژنێک و سێ منداڵی هەبووبێت، هەروەها غەزای ئوحودیش وەک غەزای بەدر

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٥٥، البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص١٧٤.

[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٥٠٣.

[3] أسد الغابة، ج١، ص٢١١.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٤٥.

نەبوو تا بڵێین بەشێکی زۆری موسڵمانان لە مەدینە مابنەوە، بەڵکو لە بەدردا زۆر موسڵمانی گەورەو بەتواناش هەبوون نەچووبوون، بەڵام لە ئوحوددا موسڵمانان هەموو بەشدار بوون، بۆیە لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت ئەم ئەوسی کوڕی ثابتە جیایە لەو دوانەی پێشوو، دەشبینین ئیبن حەجەر لە (الإصابة)دا جیا لەو دوانەی پێشوو هێناویەتی.

## ١٩٥. ئەوسی کوڕی ثابتی ئەنصاری(ﷺ)

ئەم هاوەڵە جیایە لە ئەوسی کوڕی ثابتی کوڕی مونذیر، ئەمیش ناوی ئەوسەو لە پشتیوانانە، ژنەکەی ناوی ئوم کوججە بوو کە ئەمیش ژنە هاوەڵێکی پشتیوانی بوو،[1] دوو کچ و کوڕێکیشی هەبوو، لە رۆژی ئوحوددا وەفاتی کرد و ئەو سێ منداڵەی جێهێشت.[2]

لە سەردەمی نەفامیدا میرات نەدەدرا بە کچ و بە منداڵی بچووکی کوڕ یان کچ، ئەو نەریتەش هەر مابوویەوە، ئەوەبوو کاتێک ئەوس مرد دوو برای هاتن و میراتەکەیان برد، ژنەکەی ئەوس چوو بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) و مەسەلەکەی بۆ باس کرد، ئەوەبوو ئەم ئایەتە دابەزی (للرجال نصيب مما ترك الوالدان والأقربون)، پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی نارد بۆ مامەکانی تا هیچ دەستکاری ئەو میراتە نەکەن.[3]

بە داخەوە تا ئێستاش باوێکی خراپ ماوە کە میرات لە ئافرەتان حەرام دەکرێت، بۆ ئەمەش چەند هەنگاوێک دەنرێ، کۆمەڵێک هەن هەر بە زۆر ئەو مافەیان لێ زەوت دەکەن، هەندێک بە کردار ئەو مەرجەیان داناوە هەرکات ئەو مافە وەربگرن ئەوا پەیوەندییان لەگەڵ بپچڕن واتە ناچاریان دەکەن واز لەو مافە بهێنن، یان جار هەیە لە کاتی خۆیدا مافەکەیان نادەن

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٨، ص٢٨٤.

[2] أسد الغابة، ج٢، ص١٢٨.

[3] أسد الغابة، ج٢، ص١٢٨، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٤٤.

و دوای دەخەن کە بەوە زیانیان پێ دەگەیەنن.

## ١٩٦. ئەوسی کوڕی ثەعلەبە(رضي الله عنه)

ناوی ئەوسی کوڕی ثەعلەبەی تەمیمیە،[١] کەسێکی شاعیر بوو.[٢]

حاکم ئەبوو عەبدولا ناوی لەو هاوەڵانەدا هێناوە کە لە نەیسابوور نیشتەجێ بون.[٣]

ئیبن حەجەر هێناویەتی لە بەصرە نیشتەجێ بووەو کۆشکی ئەوس لە بەصرە هی ئەو بووە، لەگەڵ طەلحە کێشەیەکیان لەنێواندا بوو، بۆیە ئەوس چوو بەرەو شام بۆ لای موعاویەی کوڕی ئەبوو سوفیان.

سەبارەت بە هاوەڵبوونی گومان هەیە، تەنانەت ئیبن حەجەر دەڵێت: ئەگەر حاکم نەیوتایە لە هاوەڵانە لێرەدا ناویم نەدەهێنا.[٤]

## ١٩٧. ئەوسی کوڕی ثەعلەبەی ئەنصاری(رضي الله عنه)

ناوی ئەوسی کوڕی ثەعلەبەیە و لە پشتیوانانە،[٥] یەکێکە لەو چوار کەسەی کە لە جەنگی تەبووکدا لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) نەچوون بۆ غەزا، ئەوەبوو خوای گەورە سزای دانا بۆیان تا دواتر خوا لێیان خۆش بوو و ئایەتیان لەسەر دابەزی.[٦]

سەبارەت بە ناو و ژمارەی ئەو کەسانەی لە غەزای تەبووکدا دواکەوتن راجیایی هەیە، رایەک دەڵێت: دە کەس بون، بۆچوونێک دەڵێت: حەوت کەس بوون و چوار کەسیان خۆیان بەستبوویەوە بە پایەکانی مزگەوتی

---

[١] أسد الغابة، ج١، ص٢١٢.
[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٤٦.
[٣] أسد الغابة، ج١، ص٢١٢.
[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٤٦.
[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٤٦
[٦] أسد الغابة، ج٥، ص ٤٥٧.

پێغەمبەرەوە(ﷺ) تا ئەو کاتەی خوا لێیان خۆش دەبێت، بۆچوونێک ناوی سێ کەس دێنێت،[1] رایەکیش ناوی شەش کەس دێنێت کە بریتین لە (ئەوسی کوڕی خیذام، ئەبوولبابە، ثەعلەبەی کوڕی وەدیعە، کەعبی کوڕی مالیک، مرارەی کوڕی رەبیع، هیلالی کوڕی ئومەییە).[2]

زۆرجار بە جیا لە سەرچاوەکاندا ناوی یەکێک لەو شەش هاوەڵە دێت کە خۆی بەستوەتەوە بە پایەکانی مزگەوتەوە تا تەوبەیەک بێت لەو کارەی و خوای گەورە لێی خۆش بێت، بەڵام لەو شەش کەسە ئەوانەی خۆیان بەستەوە بە پایەکانی مزگەوتی پێغەمبەری خواوە(ﷺ) سێ کەس بوون و بریتی بوون لە ئەوس و ئەبوو لبابە و ثەعلەبە.[3]

سەبارەت بەو کەسانەی کە نەچون بۆ غەزای تەبووک ئیبن کەثیر دەڵێت: ئەوانەی نەچوون بۆ غەزای تەبووک چوار بەش بوون، بەشێک فەرمانیان پێکرابوو لەلایەن پێغەمبەرەوە(ﷺ) تا نەچن و پاداشتیان بۆ هەیە وەک عەلی کوڕی ئەبووطالیب و موحەممەدی کوڕی مەسلەمەو ئیبن ئوم کلثوم، دەستەیەکی تر بیانوویان هەبوو لەبەرئەوەی لاواز و نەخۆش بوون، دەستەیەکیش ئەوانە بوون کە لە خەفەتی نەچوونەکەیان دەگریان، ئەمانە تاوانبارەکان بوون و بریتی بوون لە ئەبوولوبابەو هاوەڵەکانی، دەستەی چوارەمیش سەرکۆنەکراوان بوون کە بریتی بوون لە دووروەکان.[4]

## ١٩٨. ئەوسی کوڕی جەهیش(رضي الله عنه)

ئەوسی کوڕی جەهیشی کوڕی یەزید لە نەخەعیەکانە، بە ئەرقەمیش ناسراوە،

---

[1] صحيح البخاري – كتاب المغازي – باب حديث كعب بن مالك وقول الله عز وجل وعلى الثلاثة الذين خلفوا، الرقم ٤٤١٨.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٥٢، أسد الغابة، ج١، ص٢١٧.

[3] -الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٥٢.

[4] البداية والنهاية لابن كثير، ج٥، ص٢٧.

وەک وەفدی نەخەعیەکان هاتووەتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ).[1]

دەوترێت ناوی ئەوسی کوڕی جەهیشی کوڕی یەزیدە و لە نەخەعیەکانە.[2]

بەڵام ئیبن سەعد وا ناوی دێنێ، ئەرقەمی کوڕی یەزیدی کوڕی مالیکی کوڕی عەبدولا.[3]

ئیبن حەجەریش بۆچوونێکی تر دێنێ کە دەڵێت: ناوی ئەرقەمی کوڕی عەبدولای کوڕی حارثە.[4]

ئیبن سەعد گێڕانەوەیەکی هێناوە کە نەخەعیەکان دوو کەسیان نارد بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) تا موسڵمان بوونی خۆیان بگەیەننە پێغەمبەر(ﷺ)، ئەرطەئەی کوڕی شەراحیل لە بەنی حارثە و ئەرقەم لە بەنی بەکر، ئەم دوو کەسە شێوەو روخسارو کەسایەتییەکی باشیان هەبوو، چوونە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و پێغەمبەری خوایش(ﷺ) پێشنیازی موسڵمان بوونی بۆ کردن، ئەوانیش قبوولیان کرد و بەیعەتی خۆیان و هۆزەکانی خۆیانیشیان دا بە پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەری خواش(ﷺ) سەرسام بوو بە قەد و باڵاو کەسایەتییان، فەرمووی: ئەرێ هۆزەکانتان کەسی تریان وەک ئێوە تێدایە؟ وتیان: بەڵێ لەپشت خۆمانەوە لەناو هۆزەکانماندا حەفتا کەسمان جێهێشتووە کە هەموویان لە ئێمە باشترن و کاروبارەکان بەڕێوە دەبەن، پێغەمبەر(ﷺ) نزای کرد بۆ هەردووکیان و بۆ هۆزەکانی هەردووکیان و فەرمووی: (اللهم بارك في النخع)، ئینجا ئاڵایەکی دایە دەست ئەرطەئە تا رێبەری هۆزەکەی بکات، ئەویش ئاڵاکەی هێشتەوە تا لە رۆژی فەتحی مەککەدا ئەو ئاڵایەی لەگەڵ خۆی هێنا، لە رۆژی قادسیەشدا ئەو ئاڵایەی پێ بوو، بەڵام لە قادسیەدا شەهید بوو، ئینجا دورەیدی برای ئاڵاکەی گرتەدەست.[5]

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص٢١٢.

[2] أسدالغابة، ج١، ص٩٦.

[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٥، ص٥٣.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٤٥.

[5] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص٣٤٦.

## ١٩٩. ئەوسی کوڕی جوبەیر(رضي الله عنه)

ئەوسی کوڕی جوبەیر لە هاوەڵە پشتیوانەکانە، لە غەزای خەیبەردا شەهید بووە.[1]

جوولەکەکان لە خەیبەردا لە هەر کاتێکی تر زیاتر خۆیان گرت و ژمارەیەک هاوەڵیش تیایدا شەهید بوون، تا ئەوەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئاڵاکەی دایە دەست عەلی کوڕی ئەبوو طالیب و خوای گەورە سەرکەوتنی بەخشی بە موسڵمانان و ژمارەیەکیش لە موسڵمانان کە زیاترینیان لە پشتیوانان بوون فەزڵی شەهیدییان بەرکەوت، یەکێکیش لەوانە ئەم هاوەڵە پشتیوانیە بوو.

## ٢٠٠. ئەوسی کوڕی حەبیب(رضي الله عنه)

ئەوسی کوڕی حەبیب لە هاوەڵە پشتیوانەکانەو لە غەزای خەیبەردا شەهید بوو، دەوترێت ئەم هاوەڵە و ئەوسی کوڕی جوبەیر هەر یەک کەسایەتین.[2]

## ٢٠١. ئەوسی کوڕی حەدەثان(رضي الله عنه)

ناوی ئەوسی کوڕی حەدەثانی کوڕی عەوفی کوڕی رەبیعەیە، لە هاوەڵانی دانیشتووی مەدینەدا ناوی هاتووە،[3]ئەم هاوەڵە لە بەنی نەصیر بوو.[4]

ئەوس کوڕێکی هەبوو بە ناوی مالیک کە فەرموودەی گێڕاوەتەوە لە هاوەڵانی وەک عومەری کوڕی خەتتاب و ئەبووذەر،[5] هەروەها فەرموودەی

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٤٧، أسد الغابة، ج١، ص٢١٢.

[2] أسد الغابة، ج١، ص٢١٢، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٤٩.

[3] -أسد الغابة، ج١، ص٢١٣.

[4] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١١٩.

[5] صحيح البخاري - كتاب البيوع - باب بيع التمر بالتمر، الرقم ٢١٧٠.

گێڕاوەتەوە لە باوکیەوە،[1] سەبارەت بە هاوەڵبوونی مالیکی کوڕی ئەوس ڕاجیایی هەیە.[2]

لە ڕۆژی (مینا) دا پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوسی کوڕی حەدەثان و کەعبی کوڕی مالیکی نارد و داوای لێکردن بەناو خەڵکدا هاوار بکەن (بەهەشت تەنها باوەڕداری دەچێتە ناو و ڕۆژانی (مینا) یش ڕۆژانی خواردن و خواردنەوەن).[3]

دەشوترێت بەڵکو بیشری کوڕی سوحەیم بووە ئەو ڕۆژە ئەو هاوارەی کردووە.[4]

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە پێغەمبەر(ﷺ) لە حەجیماڵئاواییدا بودەیلی کوڕی وەرقائی بە وشترەکەیەوە نارد تا لە ڕۆژی مینادا بەناو خەڵکدا هاوار بکات ئەم ڕۆژانە ڕۆژانی خواردن و خواردنەوەن.[5]

بۆیە دەردەکەوێت پێغەمبەری خوا(ﷺ) تەنها یەک هاوەڵی ڕانەسپاردووە بۆ ئەو کارەو چەند هاوەڵێکی ڕاسپاردووە تا لە شوێنە جیاجیاکاندا بەناو خەڵکدا هاوار بکەن و ئەوە بڵێن، بەڵام لەوانەیە هەریەکە لە ئەوس و کەعب پێکەوە چووبنە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و ئەو فەرمانەی پێ کردبن، یان لەکاتی هاوارکردندا ئەو دوانە بەیەک گەیشتبن.

## ٢٠٢. ئەوسی کوڕی حەوشەب(ﷺ)

ئەوسی کوڕی حەوشەب لە هاوەڵە پشتیوانەکانە،[6] نوقەیر کە یەکێکە لە هاوەڵان دەگێڕێتەوە لە ماڵی ئەوس پێغەمبەری خوای(ﷺ) بینیوە، پێغەمبەر(ﷺ)

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص٢١٣.
[2] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٣، ص١٣٤٦.
[3] صحيح مسلم - كتاب الصيام - باب تحريم صوم أيام التشريق، الرقم ١١٤٢.
[4] صحيح ابن خزيمة - كتاب المناسك - باب النهي عن صيام أيام التشريق، الرقم ٢٩٦٠.
[5] مصنف ابن أبي شيبة - كتاب المناسك - من قال أيام التشريق أيام أكل وشرب، الرقم ١٥٤٩٧.
[6] أسد الغابة، ج١، ص٢١٦، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٥٠.

چووە بۆ ماڵی ئەوس و لەوێ دانیشتووە و سەردانی کردووە، ئەوسیش بڕێک تریێی هێناوەو خستویەتیە دەستی پێغەمبەری خواوە(ﷺ)،[1] ئەم فەرموودە بەم جۆرەش هاتووە کە تێکەڵەیەک هێنرا بۆی، فەرمووی: ئەوە چیە؟ وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوە شیر و هەنگوینە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (**هذان شرابان لا نشربه ولا نحرمه فمن تواضع لله رفعه الله ومن تجبر قصمه الله ومن أحسن تدبير معيشته رزقه الله تعالى**)،[2] (ئەوانە دوو خواردنەوەن کە ئێمە بەم جۆرە تێکەڵە نایخۆین و بە حەرامیشی نازانین، هەر کەس لەبەر خوا تەوازوعی هەبێت خوای گەورە پلەوپایەی بەرز دەکاتەوە، هەرکەسیش خۆبەزلزان بێت خوا دەیشکێنێت، هەرکەس بەجوانی بژێوی ڕێکبخات خوای گەورە ڕۆزی دەدات).

لەم فەرموودەدا ئاماژە بەوە دراوە پێغەمبەر(ﷺ) حەز و تاسەی خۆی بۆ خواردنەکان جیا داناوە لە بڕیاری حەڵاڵ و حەرام، بۆیە ئەوەی خۆی حەزی پێ کردبێت یان ڕقی لێ بووبێت نەیکردووە بە بنەما بۆ حەڵاڵی و حەرامی، چونکە ئەوە بەشێک بووە لە سروشتی مرۆیی هەر کەسێک، سیفەتی پێغەمبەر(ﷺ) وابوو (**ما عاب النبي صلى اللهُ عليْهِ وسلم طعاما قط إنِ اشْتهاهُ أكلهُ وإلا تركهُ**) (پێغەمبەر(ﷺ) هەرگیز ڕەخنەی نەدەگرت لە خواردن، ئەگەر حەزی لێ بکردایە دەیخوارد و ئەگەریش حەزی لێ نەکردایە جێی دەهێشت)،[3] لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە (ئەگەر حەزی پێ نەکردایە بێدەنگ دەبوو).[4]

## ٢٠٣. ئەوسی کوڕی خەولی(ﷺ)

ناوی ئەوسی کوڕی خەولی کوڕی عەبدوڵای کوڕی حارثە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان،[5] دایکی ناوی جەمیلەی کچی ئوبەی کوڕی

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٥٠.
[2] أسد الغابة، ج١، ص٢١٦.
[3] صحيح البخاري – كتاب المناقب – باب صفة النبي(ﷺ)، الرقم ٣٥٦٣.
[4] مسند أحمد بن حنبل – مسند أبي هريرة(ﷺ)، الرقم ٩٦٣٨.
[5] أسد الغابة، ج١، ص٢١٧.

مالیک بوو، عەبدوڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول خاڵۆی بوو.[1]

ئەوس خوشکێکی هەبوو بە ناوی خەولە کە ئەویش هاوەڵ بوو.[2]

کچێکی هەبوو بە ناوی فەسحوم[3] کە هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوو و بەیعەتی پێ دابوو،[4] بەڵام ئەو کچەشی بێ بوونی هیچ منداڵێک مرد، واتە ئەوس هیچ نەوەیەکی لە دوای خۆی جێنەهێشت،[5] ئەوس ناسراوە بە ئەبوو لەیلا.[6]

کاتێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) برایەتی خستە نێوان کۆچەران و پشتیوانان هەریەک لە ئەوسی کوڕی خەولی و شوجاعی کوڕی وەهبی کرد بە برای یەک.[7]

ئەوسی کوڕی خەولی بەشدار بوو لە جەنگی بەدر و ئوحود و هەموو غەزاکانی تریش کە پێغەمبەر(ﷺ) بەشدار بوو تیایاندا.[8]

ئیبن سەعد هێناویەتی ئەوس یەکەم موسڵمان بووە بە زمانی عەرەبی بە جوانی شتی نووسیوە، هەروەها لە تیرهاوێژیدا زۆر هەڵکەوتە بووە.[9]

پێغەمبەر(ﷺ) پێش دەرچوونی لە مەدینەوە بۆ مەککەبە نیازی عومرە، هەریەک لە ئەبوو رافع و ئەوسی کوڕی خەولی نارد بۆ لای عەبباس تا داوای مەیمونەی بۆ بکەن، عەبباسیش رازی بوو مەیموونە بدات بە پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئەو دوو هاوەڵەش گەڕانەوە بەڵام وشترەکانیان ون بوون، بۆیە چەند رۆژێک لە (بطن رابغ) مانەوە تا پێغەمبەر(ﷺ) لە

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٥٤٢.
[2] الطبقات الكبري لابن سعد، ج٨، ص٣٨٤.
[3] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١١٧.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٨، ص٧٥.
[5] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٥٤٢.
[6] البدايةو النهاية لابن كثير، ج٥، ص٢٦٧، أسد الغابة، ج١، ص٢١٧.
[7] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١١٧، تاريخ الإسلام للذهبي، ج٣، ص٥٨.
[8] أسد الغابة، ١، ص٢١٧.
[9] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٥٤٢.

ناوچەی (قدید) گەیشت پێیان کە وشترەکانیان دۆزیبوونەوە، ئیتر لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) چوون بۆ مەککە.[1]

هەروەها کاتێک چوون بۆ عومرەی پاش ڕێککەوتنی حودەیبیە، لەوێ پێغەمبەر(ﷺ) چەکەکانی لە ناوچەیەک دانا و ئەوسی کوڕی خەولی هاودەم بە سەد هاوەڵەوە لای ئەو چەک و شمەکانە دانا[2] تا ئاگاداریان بن و نەبادا قورەیش ناپاکی بنوێنن.

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد ئەوس چوو بۆ لای عەلی کوڕی ئەبوو طالیب و پێی وت: سوێندت دەدەم بە خوا لە شۆردن و کفنکردنی پێغەمبەری خوادا ڕێ بدە پشکی بەشداریمان هەبێت، بۆیە عەلی کوڕی ئەبوو طالیب ڕێی دا بەشدار بێت لە شۆردنی تەرمی پێغەمبەری خوادا(ﷺ).[3]

ئەوەبوو عەلی کوڕی ئەبوو طالیب تەرمەکەی دەشۆرد و فەضلیش جلەکەی پێغەمبەری خوای(ﷺ) گرتبوو تا لەبەری لانەچێت و ئەوسیش ئاوی دەکرد بەسەر تەرمەکەیدا.[4]

سەبارەت بەوانەی چوونە ناو گۆڕەکەوە تا پێغەمبەر(ﷺ) ئەسپەردە بکەن دەوترێت ئەوسی کوڕی خەولیش دابەزیوەتە ناو گۆڕەکەوە، ئەویش کاتێک تەرمەکەی پێغەمبەر(ﷺ) لە ژوورەوە بوو، پشتیوانان لەبەر دەرگا کۆبوونەوەو وتیان: اللە اللە ئێمە خاڵوانی پێغەمبەری خواین، دەی با یەکێکمان بەشدار بێت، بۆیە هەموویان ڕێککەوتن لەسەر ئەوسی کوڕی خەولی، ئەویش بەشدار بوو لە شۆردنی تەرمی پێغەمبەر(ﷺ) و دابەزاندنی تەرمەکەی بۆ ناو گۆڕەکەی.[5]

ئەوسی کوڕی خەولی لەگەڵ عومەری کوڕی خەططابدا زۆر برایەتییان

---

[1] الطبقات الکبری لابن سعد، ج٨، ص١٣٢، الإصابة في تميز الصحابة، ج٨، ص١٢٧.

[2] الطبقات الکبری لابن سعد، ج٢، ص١٢١.

[3] أسد الغابة، ج١، ص٢١٧، ضعفه الألباني في صحيح و ضعيف سنن إبن ماجة، الرقم ١٦٢٨.

[4] الطبقات الکبری لابن سعد، ج٢، ص٢٨٠.

[5] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١١٨.

خۆش بوو و هیچیان لەیەکدی نەدەشاردەوەو تا بکرایە هەرکامیان شتێکی بزانیایە دەیوت بەوی تریان، ئیتر نهێنی نێوانیان زۆر کەم بوو.[1]

ئەوس لە سەردەمی خیلافەتی عوثمانی کوڕی عەففاندا لە مەدینە کۆچی دوایی کرد.[2]

## ٢٠٤. ئەوسی کوڕی خیذام(رضي الله عنه)

ئەوسی کوڕی خیذام لە غەزای تەبووکدا دواکەوت و بەشداری نەکرد و لەسەر ئەوەش سزا درا.[3]

سەبارەت بە ناو و ژمارەی ئەو کەسانەی لە غەزای تەبووکدا دواکەوتن راجیایی هەیە، رایەک دەڵێت: دە کەس بون، بۆچوونێک دەڵێت: حەوت کەس بوون و چوار کەسیان خۆیان بەستبوویەوە بە پایەکانی مزگەوتی پێغەمبەرەوە(ﷺ) تا ئەو کاتەی خوا لێیان خۆش دەبێت، بۆچوونێک ناوی سێ کەس دێنێت،[4] رایەکیش ناوی شەش کەس دێنێت کە بریتین لە (ئەوسی کوڕی خیذام، ئەبوولبابە، ثەعلەبەی کوڕی وەدیعە، کەعبی کوڕی مالیک، مرارەی کوڕی رەبیع، هیلالی کوڕی ئومەییە).[5]

ئەوس وەک تەوبە و پەشیمانی لەو کارەی خۆی بەستەوە بە پایەکەی مزگەوتی پێغەمبەری خواوە(ﷺ)، ئەوەبوو دواتر خوای گەورە ئایەتی لێخۆشبوونی سەبارەت بەو کەسانە دابەزاند.[6]

زۆرجار بە جیا لە سەرچاوەکاندا ناوی یەکێک لەو شەش هاوەڵە دێت کە خۆی بەستوەتەوە بە پایەکانی مزگەوتەوە تا تەوبەیەک بێت لەو کارەی

---

[1] الطبات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص١٩٠.
[2] أسد الغابة، ج١، ص٢١٨، الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١١٨.
[3] أسد الغابة، ج١، ص٢١٧.
[4] صحيح البخاري - كتاب المغازي - باب حديث كعب بن مالك وقول الله عز وجل وعلى الثلاثة الذين خلفوا، الرقم ٤٤١٨.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٥٢.
[6] أسد الغابة، ج١، ص٢١٧.

و خوای گەورە لێی خۆش بێت، بەڵام لەو شەش کەسە ئەوانەی خۆیان بەستەوە بە پایەکانی مزگەوتی پێغەمبەری خواوە(ﷺ) سێ کەس بوون و بریتی بوون لە ئەوس و ئەبوو لبابە و ثەعلەبە.[1]

ئەم ڕووداوە بەڵگەیە لەسەر چەند شتێک: لەوانە:

ئەوانەی پێغەمبەر(ﷺ) سزای دان لەوانە بوون کە لە ناخەوە باوەڕدار بوون، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) بۆ دووڕووەکان هیچ سزایەکی دنیایی دیاری نەکرد، ئەوە بوو خوای گەورەش ئایەتی دابەزاند بۆ لێخۆشبوون لە باوەڕداران.

لادان لە فەرمانی خواو پێغەمبەری خوا(ﷺ) مەسەلەیەکی گاڵتە نیە و هێڵی سوورەو پێویستە خۆمان بپارێزین لێی، ئەگەریش تووش بووین تەوبەی تەواوی لێ بکەین، مەرجیش نیە تەنها بە وتنی چەند وشەیەکی داوای لێخۆشبوون خوای گەورە لێمان خۆش بێت.

لێبوردەیی پێغەمبەر(ﷺ) بەرامبەر هەموو تاوانێک وەک یەک نەبووەو لەم مەسەلەدا پێغەمبەر(ﷺ) بە سۆزداری هەڵوێستی نەنواند، بەڵکو هەرچەندە هەندێکیان خۆیان بەستبوویەوە بە پایەکانی مزگەوتەوە کە ئەوپەڕی پەشیمانییان بوو لەو تاوانە، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) لێیان خۆش نەبوو و سزای دان و لێخۆشبوونەکەی دانا تا خوای گەورە بڕیاری لەسەر دەدات.

## ٢٠٥. ئەوسی کوڕی ساعیدە(ﷺ)

ناوی ئەوسی کوڕی ساعیدەیە و لە پشتیوانانە.[2]

لە بەسەرهاتێکدا ناوی هاتووە کە گێڕانەوەی ئەو فەرموودەیە لاوازە، تیایدا هاتووە ئەوسی کوڕی ساعیدە چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و دەموچاوی شڵەژاو و بێزار دیار بوو، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: ئەی ئیبن ساعیدە ئەو

[1] -الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٥٢.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٥٤.

بێزاریە چیە بە دەموچاوتەوە دەیبینم؟ ئەوس وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من بڕێک کچم هەیە و نزای مەرگیان لێ دەکەم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: نزایان لێ مەکە، کچان جوانی کاتی بەخشش و نیعمەتی کاتی موصیبەتن.[1]

## ٢٠٦. ئەوسی کوڕی سەعد(رضي الله عنه)

ئەم هاوەڵە لە ئومەویەکانە، ناوی ئەوسی کوڕی سەعدەو کونیەکەی ئەبووزەیدە.[2] کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد تەمەنی پەنجاو هەشت ساڵ بوو.[3]

لە سەردەمی خەلیفە عومەری کوڕی خەتتابدا والی هەندێ ناوچەی شام بوو.[4]

لە ساڵی شانزەی کۆچی و لە تەمەنی شەست و چوار ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.[5]

## ٢٠٧. ئەوسی کوڕی سەعد(رضي الله عنه)

ناوی ئەوسی کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی سەرحی عامریە، کوڕێکی هەبوو بە ناوی خالید.[6]

لە موسڵمانبوانی فەتحی مەککە بوو، موسڵمان بوو، دواتر چوو بۆ مەدینەو لەوێ نیشتەجێ بوو.

ئەوس دوای سەردەمی پێغەمبەری خوایش(ﷺ) ژیا، ئیبن حەجەر باس لەوە دەکات ئەوس تا سەردەمی ئومەویەکانیش ژیاوەو لە سەردەمی

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص٢١٨.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٥٤.
[3] أسد الغابة، ج١، ص٢١٨.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٥٤.
[5] أسد الغابة، ج١، ص٢١٨.
[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٥٤.

والیەتی عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان لەسەر مەدینە یان تەنانەت لە ماوەی خیلافەتیدا ژیاوە.[1]

## ٢٠٨. ئەوسی کوڕی سەعید(رضي الله عنه)

ئەوسی کوڕی سەعید کە یەکێکە لە هاوەڵە پشتیوانەکان، کوڕێکی هەبوو بە ناوی سەعید کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە.[2]

سەعید فەرموودەیەکی لە ئەوسی باوکیەوە گێڕاوەتەوە کە ئەوس دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (إذا كان يوم العيد وقفت الملائكة على أبواب الطريق فنادوا اغدوا يا معشر المسلمين إلى رب كريم...)،[3] (کاتێک ڕۆژی جەژن دێت فریشتەکان لەسەرە ڕێگەکاندا دەوەستن و هاوار دەکەن ئەی کۆمەڵی موسڵمانان بڕۆن بەرەو لای خوایەکی بەخشندە...).

ئەبوو ئیسحاقی حوەینی ئەم فەرموودەی بە تەواو لاواز و شێوە مەوضووع داناوە.

## ٢٠٩. ئەوسی کوڕی سەلامە(رضي الله عنه)

ناوی ئەوسی کوڕی سەلامەی کوڕی وەقشە، برای هەریەک لە سەلەمەو سەعد و ئەبی نائیلەیە، لەجەنگی ئوحوددا شەهید بوو.[4]

## ٢١٠. ئەوسی کوڕی سەمعان(رضي الله عنه)

ئەوسی کوڕی سەمعان لە هاوەڵە پشتیوانیەکانە و کونیەکەشی ئەبوو عەبدوڵایە.[5]

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٥٤.

[2] أسد الغابة، ج١، ص٢١٩.

[3] المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٦١٦، أسد الغابة، ج١، ص٢١٩.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٥٥.

[5] أسد الغابة، ج١، ص٢١٩.

لە فەرمووودەیەکدا کە ئەنەسی کوڕی مالیکی کوڕی نەضر گێڕاویەتیەوە هاتووە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بعثني الله عز وجل هدى ورحمة للعالمين وبعثني لأمحو المزامير والمعازف والأوثان وأمر الجاهلية وحلف ربي بعزته لا يشرب عبد الخمر في الدنيا إلا حرمتها عليه يوم القيامة ولا يتركها عبد في الدنيا إلا سقاه الله إياها في حظيرة القدس)، (خوای گەورە منی ناردووە بە ڕێنموون و ڕەحمەت بۆ هەموو جیهانیان و ناردوومی تا مۆسیقا و بتەکان و باری جاهیلیەت بسڕمەوە، وە پەروەردگارم سوێندی خواردووە بە شکۆ و عیززەتی خۆی هەر بەندەیەک لە دنیادا مەی بخواتەوە ئەوا لە ڕۆژی دواییدا لێی حەرام دەکەم، وە هەر بەندەیەکیش نەیخواتەوە لە دنیادا ئەوا خوای گەورە لە (حظيرة القدس)دا مەی دەرخوارد دەداتەوە)، ئەوسی کوڕی سەمعان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا سوێند بەوەی تۆی بە حەق ناردووە من ئەوانەم لە تەوراتدا خوێندووەتەوە.[1]

ئەگەر چی ئەم فەرمووودەیە لە کتێبەکانی فەرمووودەدا نەهاتووە بەڵام واتاکانی ئەم فەرمووودەیە بە فەرمووودەی صەحیح و جیاجیا لە کتێبەکانی فەرمووودەدا هاتون، واتە ئەو شتانەی لێرەدا باس کراون وەک حەرامی مۆسیقا و دوورگیری لە بتەکان و باری دەمارگیری و نەفامی سەردەمی جاهیلیەت و دوورگرتن لە مەی خواردنەوە، هەموو ئەمانە لە کتێبەکانی فەرمووودەدا فەرمووودەی صەحیحیان لەسەر هاتووە، بەڵام ئەم فەرمووەدەی ئەوسی کوڕی سەمعان سەنەدەکەی لاوازە.

## ٣١١. ئەوسی کوڕی سومید(رضي الله عنه)

ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە، دەوترێت ئەم ئایەتە سەبارەت بەم هاوەڵە دابەزیوە (للرجال نصيب مما ترك الوالدان والأقربون).[2]

[1] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٩٣٨، أسد الغابة، ج١، ص٢١٩.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٥٥.

## ٢١٢. ئەوسی کوڕی شورەحبیل(رضي الله عنه)

ئەم هاوەڵە بە ئەوسی کوڕی شورەحبیل و هەروەها بە پێچەوانەشەوە بە شورەحبیلی کوڕی ئەوس ناوی هاتووە، بەڵام زیاتر ناوی بە ئەوسی کوڕی شورەحبیل هاتووە، لەو هاوەڵانەیە کە چوونەتە شام و لەوێ نیشتەجێ بون.

فەرموودەیەکی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە کە لە پێغەمبەری خوای(ﷺ) بیستووە فەرموویەتی (من مشى مع ظالم ليعينه وهو يعلم أنه ظالم فقد خرج من الإسلام)،[1] (هەرکەس لەگەڵ ستەمکارێک ڕێ بکات و پاڵپشتی بێ و بشزانێت ستەمکارە، ئەوا لە ئیسلام دەرچووە).

پشتگیری ستەمکار لە ئیسلامدا شتێکی قەدەغەکراوە، هەروەها پشتگیری کردنی ستەمکار جیایە لە سەرخستنی ستەمکار، چونکە لە ئیسلامدا سەرخستن بۆ ستەمکاریش واتای تایبەتی خۆی هەیە، وەک لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت (انْصرُ أَخَاكَ ظَالِمًا أَوْ مَظْلُومًا فَقَالَ رَجُلٌ : يَا رَسُولَ اللهِ، أَنْصرُهُ إِذَا كَانَ مَظْلُومًا، أَفَرَأَيْت إِذَا كَانَ ظَالِمًا كَيْفَ أَنْصرُهُ؟ قَالَ: تَحْجُزُهُ أَوْ تَمْنَعُهُ مِنَ الظُّلْمِ فَإِنَّ ذَلِكَ نَصرُهُ)،[2] (براکەت سەر بخە ستەم لێکراو بێت یان ستەمکار بێت، کەسێک وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر ستەم لێکراو بێت سەری دەخەم، بەڵام ئەگەر ستەمکار بێت چۆن سەری بخەم؟ فەرمووی: (بەری پێ بگریت یان ڕێی نەدەیت ستەمەکە بکات ئەوە سەرخستنیەتی).

## ٢١٣. ئەوسی کوڕی صامت(رضي الله عنه)

ناوی ئەوسی کوڕی صامتی کوڕی قەیسی کوڕی ئەصرەمە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان.[3]

---

[1] المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٦١٨، شعب الإيمان للبيهقي، الرقم ٧٣٨٩، ضعفه الألباني في السلسلة الضعيفة، الرقم ٥٣٦٧.

[2] صحيح البخاري - كتاب الإكراه - باب يمين الرجل لصاحبه إنه أخوه إذا خاف عليه القتل، الرقم ٦٩٥٢.

[3] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ١١٨.

دایکی ناوی قوررەتولعەینی کچی عوبادە بووە.[1]

برایەکی هەبوو بە ناوی عوبادەی کوڕی صامت کە هاوەڵێکی زۆر ناسراوی پێغەمبەری خوایە(ﷺ).[2]

سەبارەت بە ناوی ژنەکەی دوو بۆچوون هاتووە، رایەک دەڵێت: ژنەکەی ناوی جەمیلە بووەو رووداوی ظیهاری لەگەڵ ئەمدا ئەنجام داوە،[3] رایەکی تریش دەڵێت: ئەو رووداوە لەگەڵ خوەیلەی ژنیدا بووە کە ئامۆزای خۆی بووەو بە هاوسەری گرتووە،[4] بەڵام ئەوەی دووەم راسترەو زیاتر هاتووە.

کاتێک کۆچەران کۆچیان کرد بۆ مەدینەو پێغەمبەریش(ﷺ) برایەتی خستە نێوان کۆچەران و پشتیوانان، پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەریەک لە ئەوسی کوڕی صامت و مەرثەدی کوڕی ئەبی مەرثەدی کرد بە برای یەک.[5]

ئەوس لە غەزای بەدر و ئوحود و هەموو غەزاکانی تریشدا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بەشداری کرد.[6]

ئەوسی کوڕی صامت یەکێک بووە لە شاعیرە بەهێز و ناسراوەکان و شیعری وتووە.[7]

چەند گێڕانەوەیەک هاتووە سەبارەت بەوەی ئەوس یەکەم کەس بووە لە سەردەمی ئیسلامدا ظیهاری بەکارهێناوە،[8] واتە پیاو بە خێزانەکەی بڵێت وەک دایکم وابیت بۆم یان بڵێت وەک خوشکم وابیت بۆم، ئەم نەریتە لە پێش ئیسلامدا لە ناو عەرەبەکاندا زۆر باو بوو، بەڵام کە ئیسلام هات ئەمەی حەرام کرد.

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٥٤٧.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ١، ص١٥٦.

[3] سنن أبي داود - كتاب الطلاق - باب في الظهار، الرقم ٢٢١٩.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ١، ص١٥٦.

[5] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٤٨، تاريخ الإسلام للذهبي، ج٣، ص٢٣٧.

[6] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ١١٨.

[7] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ١١٨.

[8] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٥٤٧، الإصابة في تمييز الصحابة، ١، ص١٥٦.

ئـەوس ئـەو ظیهـارەی بەرامبـەر بـە ژنەکـەی بەکارهێنـا و دواتریش پێش ئـەوەی کەفارەتەکـەی بـدات لەگـەڵ ژنەکـەی سـەرجێی کـرد، پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمانـی پێکـرد پانـزە صـاع جـۆ ببەخشـێت بـە شەسـت هـەژار.[1]

ئـەوس کەسـێکی بـە تەمـەن و پیـر بـوو،[2] هـاوکات جۆرێـک لـە فێـی لەگـەڵ بوو، بۆیـە لەکاتـی تووشـبوونی بـە فێ جارێکیـان خوەیلـەی ژنـی ئـەو بێزاریـەی دەربڕی و ئەویش ظیهـاری بەرامبـەری بەکارهێنـا.[3]

خوەیلـە دەڵێـت: ئـەوس کەسـێکی بـە تەمـەن بـوو و کەسـێکی تـووڕەو ئازاربەخـش بـوو، رۆژێـک هاتـەوە مـاڵ و منیش لەسـەر شـتێک قسـەم لەگـەڵ کـرد، ئەویـش تـووڕە بـوو و وتـی: تـۆ وەک پشـتی دایکـم بیـت بـۆم، ئینجـا چوویـە دەرەوە، پاشـان لـەوێ لەگـەڵ خەڵکیـدا ماوەیـەک دانیشـت و دواتـر هاتـەوە ماڵـەوە، دەیویسـت سـەرجێم لەگـەڵ بکات، منیش وتم: نا سوێند بەوەی گیانی خوەیلـەی بەدەسـتە دەسـتت پێـم نـاگات، قسـەش هـەر ئەوەیـە کـە وتـم: تـا ئـەو کاتـەی خـوا و پێغەمبـەری خـوا بڕیارمـان لەسـەر دەدەن، بـەڵام ئـەو هـەر هەڵمەتـی بـۆ بـردم، بـەڵام مـن رێـم پـێ نـەدەدا تـا چـۆن ژنێـک زاڵ دەبێـت بەسـەر پیرەپیاوێکدا خستمەژێرەوەو چوومـە دەرەوە بـۆ لای دراوسـێیەکمان و داوای جلێکـم لـێ کـردو چوومـەدەرەوە تـا چوومـە خزمـەت پێغەمبـەری خـوا(ﷺ)، مەسـەلەکەم بـۆ بـاس کـرد و سکاڵام کـرد لەسـەر خراپـی رەوشـت و هەڵسوکەوتی ئـەوس لەگەڵمـدا، پێغەمبـەری خوایش(ﷺ) دەیفەرموو:(یـا خویلـة ابـن عمـك شـيخ كبيـر فاتقـي اللـه فيـه)، (ئـەی خوەیلـە ئامۆزاکـەت پیرێکـی بەتەمەنـە، دەی لـە ئاسـتیدا لەخـوا بترسـە)، خوەیلـە دەڵێـت: سـوێند بەخـوا نەچـووم تـا سـرووش دابـەزی و پێغەمبـەر(ﷺ) ئـەو بـارەی بەسـەریدا هـات کـە لـە کاتـی سروشـدا بەسـەریدا دەهـات، پاشـان بـاری ئاسـایی بوویـەوە،

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص٢٢٠.

[2] مسند أحمد بن حنبل - من مسند القبائل - حديث خولة بنت ثعلبة(ﭫ)، الرقم ٢٧٩٦٠.

[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٥٤٧.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی خوەیلە خوای گەورە لەسەر تۆ و هاوەڵەکەت ئایەتی دابەزاند، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە بەسەرمدا (قد سمع الله قول التي تجادلك في زوجها وتشتكي إلى الله..... وللكافرين عذاب أليم)، پاشان فەرمووی: بڵێ بە مێردەکەت با کۆیلەیەک رزگار بکات، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا هێندەی نیە بتوانێت کۆیلەیەک ئازاد بکات، فەرمووی: دەی با دوو مانگ بەسەر یەکەوە رۆژوو بگرێت، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەو پیرێکی بەتەمەنەو توانای رۆژووگرتنی نیە، فەرمووی: دەی با کۆڵێک خورما ببەخشێت بە شەست هەژار، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوەشی نیە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: دەی ئێمە یارمەتی دەدەین بە کۆڵە خورمایەک، خوەیلە وتی: دەی منیش کۆڵە خورمایەکی پێ دەدەم بۆ ئەوە، پێغەمبەری خوایش(ﷺ) فەرمووی: (أصبت و أحسنت، فاذهبي فتصدقي به عنه، ثم استوصي بابن عمك خيرا)، (پێکات و چاکت کرد، دەی بڕۆ و بەوە صەدەقەکەی بۆ بدە، دواتر لەگەڵ ئامۆزاکەت چاک بە و چاکە بنوێنە)، خوەیلە دەڵێت: منیش چووم و وامکرد.[1]

لە ریوایەتی ئەبوو داووددا هاتووە لەو کاتەدا کۆڵە خورمایەک(عرق)- شەست صاع دەکات- هات بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئەویش ئەوەی دانا بۆ یارمەتی ئەوس.[2]

ئەوسی کوڕی صامت لەگەڵ شدادی کوڕی ئەوسدا (کە هەردووکیان لە پشتیوانان بوون) چوون لە بەیتولمەقدیس دانیشتن، دواتر لە ناوچەی رەملە لە خاکی فەلەستین کۆچی دوایی کردووە، هەروەک عوبادەی برایشی لە

[1] مسند أحمد بن حنبل - من مسند القبائل - حديث خولة بنت ثعلبة(ﷺ)، الرقم ٢٧٩٦٠، صحيح ابن حبان - كتاب الطلاق - باب الظهار - ذكر وصف الحكم للمظاهر من امرأته وما يلزمه عند ذلك من الكفارة، الرقم ٤٢٧٩، و أخرجه مختصرا أبي داوود في سننه، - كتاب الطلاق - باب في الظهار، الرقم ٢٢١٤، و حسنه الألباني في صحيح و ضعيف سنن أبي داوود، الرقم ٢٢١٤.

[2] سنن أبي داود - كتاب الطلاق - باب في الظهار، الرقم ٢٢١٤.

خاکی فەلەستین کۆچی دوایی کرد.[1]

سەبارەت بە مردنی ئەوس چەند رایەک هەیە، رایەک پێی وایە لە سەردەمی خەلیفە عوثمانی کوڕی عەففاندا لە تەمەنی هەشتا و پێنج ساڵیدا وەفاتی کردووە، رایەکی تر دەڵێت: لە ساڵی سی و چواری کۆچی لە ناوچەی رەملە و لە تەمەنی حەفتاو دوو ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە،[2] رایەکیش هەیە دەڵێت: لە ساڵی سی و دووی کۆچیدا وەفاتی کردووە.[3]

بەو پێیەی باسکراوە ئەوس لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بەتەمەن و پیر بووە، بۆیە پێ دەچێت رای راستتر ئەوە بێت لە تەمەنی هەشتاو پێنج ساڵیدا وەفاتی کردبێت.

**پەند و وانە:**

هاوەڵان بەدوور نەبون لە بوونی هەڵە و کەموکورتی، بەڵام بەو واتایە نا کەسانی خراپ بووبن، بەڵکو لە ڕێڕەوی گشتیدا راست بوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەڵەو کەموکورتییان هەبووە وەک چۆن پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژەی پێ داوە هەموو مرۆڤێک هەڵە دەکات و چاکترینی هەڵەکارانیش تەوبەکارانن، دەبینین ئەم هاوەڵە سیفەتی توندی و رەقی لە هەڵسوکەوتیدا بەرامبەر بە خێزانی هەبووەو ژنەکەی سکاڵای بردوەتە لای پێغەمبەری خوا(ﷺ)، بەڵام ئەمەش هاودەم بووە بە بوونی دوو کێشە، یەکەمیان ئەوەیە ئەم هاوەڵە تەمەنی زۆر بووەو خوای گەورەش ئاماژەی بەوە داوە (ومن نعمره ننكسه في الخلق)، بۆیە سیفەتەکانی کەموکورتی و بێزارکەریەکانی تەمەنی پیری لەم هاوەڵەشدا دەرکەوتون، دووەمیش بریتیە لە بوونی ئەو نەخۆشیەی کە لەگەڵی بووەو کاتێک فێی تووشبووە حاڵی تێکچووە.

وردی هەڵوێستی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەر کێشەو چارەسەرەکەی

[1] أسد الغابة، ج١، ص٢٢٠.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ١، ص١٥٦.
[3] تاريخ الإسلام للذهبي، ج٣، ص٣٧١.

دەبینین پێغەمبەر(ﷺ) پاش بیستنی سکاڵای خوەیلە ئامۆژگاری کرد لەگەڵ ئەوس باش بێت و لەخوا بترسێت بەرامبەری، ئەمەش بەو واتایە نا کە خوەیلە هەقی سکاڵاکەی نەبووبێت و ناهەق بووبێت، بەڵکو لەخواترسان بۆ چاکەنواندن لەگەڵی لەبەر چەند هۆکارێک، لەوانە: پیربوونی ئەو پیاوە کە چاکە لەگەڵ پیردا ڕەزامەندی خوای لەسەرە، بوونی نەخۆشی لەو پیاوەدا، هەژاری ئەوس، بوونی خزمایەتی لەنێوانیاندا، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) هەوڵیدا بەو ئامۆژگاریە جڵەوی چاکەنواندنەکە بداتە دەست خوەیلە چونکە ئەو سیفەتی بەهێزی لە پیاوەکەی زیاتر بوو، هەروەها حەزی تۆڵەی لا نەهێڵێت.

ئیسلام ئاسانکاری دەوێت و سەختی ناوێت، ئەمە پەیامی خوایە بۆ بەندەکانی وەک دەفەرموێت (يُرِيدُ اللهُ بِكُمُ الْيُسرَ ولا يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسرْ)، بۆیە کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) بێتوانایی ئەوسی بۆ کەفارەتی ئەو کارەی بەدیکرد چارەسەری تری بۆ دانا، تا دواجار خۆی بوو بە هاوکاری بۆ ئەو کەفارەتە، بەڵام کەفارەتەکەی لەسەر هەڵنەگرت.

## ٣١٤. ئەوسی کوڕی عابید(رضي الله عنه)

ناوی ئەوسی کوڕی عابیدە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە، لە غەزای خەیبەردا شەهید بوو.[١]

## ٣١٥. ئەوسی کوڕی عەبدولا(رضي الله عنه)

ناوی ئەوسی کوڕی عەبدوڵای کوڕی حوجری ئەسلەمیە، لەکاتی کۆچی پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبووبەکری صدیقدا ئەوانی دیوەو خزمەتی کردون.[٢]

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبووبەکری صدیق بەرەو مەدینە کۆچیان دەکرد

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٥٧.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٥٧.

ئەوسیان بینی، ئەویش کۆیلەیەکی هەبوو بە ناوی مەسعوود، پێغەمبەری خوا و ئەبووبەکری صدیقی سواری وشترەکەی خۆی کرد و مەسعوودی لەگەڵیاندا نارد و داوای کرد بیانگەیەنێتە مەدینەو تا ئەویش لێیان جیا نەبێتەوە، ئەویش تا مەدینە هاودەمی کردن و دواتر گەڕایەوە، پێغەمبەر(ﷺ) پێی ڕاسپارد فەرمان بگەیەنێت بە ئەوس تا وەک ئەسپ ڕەشۆی وشتر بکات.[1]

دەوترێت دوای کۆچی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ مەدینە موسڵمان بوو.[2]

کاتێک بێباوەڕان بەرەو جەنگی ئوحود هاتن ئەوس لەڕێی مەسعوودەوە هەواڵی هاتنی بێباوەڕانی نارد بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، ئەمەش ئاماژەیە بە موسڵمانبوونی ئەوس لەو کاتەدا.

**وەستانێک:**

سەبارەت بە هاوەڵ بوونی ئەوس پێویستە کەمێک وردبینەوە، چونکە وا باس کراوە ئەوس دوای کۆچی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ مەدینە موسڵمان بووە، واتە کاتێک پێغەمبەری خوای(ﷺ) بینیوە لە ڕێی کۆچکردنیدا ئەو کات موسڵمان نەبووە و دواتر بینیویەتی، ئەوکات پێویستە ئاگاداری ئەم چەند خاڵە بین:

یەکەم: سەرچاوەکان هەموو بە هاوەڵ ناویان هێناوەو هیچکام گومانیان نەهێناوە لەسەر هاوەڵبوونی، دەی مەرجی هاوەڵ بوونیش ئەوەیە کە بە موسڵمانی گەیشتبێتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ)، موسڵمان بوونی ئەوسیش پاش کۆچ بووە.

دوەم: دەشێت مەبەست لەوەی دوای کۆچی پێغەمبەر(ﷺ) موسڵمان بووە ئەوە بێت کە کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) مەککەی جێهێشتووەو لە ڕێدا ئەوسی بینیوە لەو کاتەدا ئەوس موسڵمان بووبێت، چونکە دەبینین بە دڵسۆزی هەوڵ دەدات خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبووبەکری صدیق بکات

---

[1] المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٦١٠، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٩٢٩.

[2] أسد الغابة، ج١، ص٢٢١.

و بەندەکەی خۆیشی و وشترەکەشی دەخاتە خزمەتیان و فەرمانیش دەکات بە کۆیلەکەی تا نەیانگەیەنێتە مەککە لێیان جیا نەبێتەوە، پاشان کاتێک دەگەنە ئەوێ پێغەمبەر(ﷺ) بە مەسعووددا بە دەربڕینی فەرمان کردن بڕێک ئامۆژگاری و راسپاردە دەنێرێت بۆ ئەوسی کوڕی عەبدوڵا، بۆیە ئەگەر ئەوس موسڵمان نەبوایە فەرمانی بۆ نەدەنارد.

سێیەم: دەکرێت ئەگەر ئەوکاتیش موسڵمان نەبووبێت ئەوس دواتر چووبێتە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ)، چونکە دەزانین ئەوس هەواڵی دوژمنانی ناردووە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و ئاگاداری کردوەتەوە، رای تەواویش هاتووە کە موسڵمان بووە، شوێنی نیشتەجێ بوونیشی لەسەر رێی مەدینە بووەو دوور نەبووە تا دەستی نەگاتە لای پێغەمبەر(ﷺ)، بۆیە هەر بووە بچێتە خزمەتی.

بۆیە لە روانگەی ئەو چەند خاڵەوە دەتوانین بڵێین هیچ گومانێک نامێنێت لەسەر هاوەڵ بوونی ئەوسی کوڕی عەبدوڵا.

## ٢١٦. ئەوسی کوڕی عەتیک(رضي الله عنه)

ناوی ئەوسی کوڕی عەتیکە،[١] یان دەوترێت ناوی ئونەیسە،[٢] بەڵام ئیبن حەجەر دەڵێت: لەوانەیە ئەو دوو ناوە جیاواز بن و برای یەک بن نەک یەک کەس بن،[٣] ئەوس کوڕێکی هەبوو بە ناوی ئەنەس کە لە جەنگی ئوحوددا بەشداری کرد، دواتریش لە غەزای خەندەقدا بەشداری کرد و لەو جەنگەشدا شەهید بوو.[٤]

ئەوس لە جەنگی (جسر ئەبووعوبەید) دا کوژرا.[٥]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٥٨.

[٢] أسد الغابة، ج١، ص٢٠١.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٣٧.

[٤] أسد الغابة، ج١، ص١٨٦.

[٥] أسد الغابة، ج١، ص٢٠١.

## ٢١٧. ئەوسی کوڕی عەرابە(رضي الله عنه)

ئەوسی کوڕی عەرابە لە هاوەڵە پشتیوانیەکانە، لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) مێردمنداڵ بووە، لە غەزای ئوحوددا ئەو و چەند مێردمنداڵێکی تر داوایان کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) تا بەشداری غەزاکە بکەن، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) رێی پێ نەدان و ئەوانی گەڕاندەوە،[1] دەوترێت ناوە راستەکەی بریتیە لە عەرابەی کوڕی ئەوس و عەرابە هاوەڵ بووەو ئەوسی باوکی لە کەسە دیارەکانی مونافیقەکان بووە،[2] ئیبن حەجەریش رای دووەمی پێ راستترە کە ناوی ئەو هاوەڵە عەرابەی کوڕی ئەوس بووە.[3]

## ٢١٨. ئەوسی کوڕی عەمر(رضي الله عنه)

ئەوسی کوڕی عەمری کوڕی عەبدولقاری، دواتر چووە لە خاکی میصر نیشتەجێ بوو.[4]

## ٢١٩. ئەوسی کوڕی عەمر(رضي الله عنه)

ئەوسی کوڕی عەمر لە پشتیوانانەو لە غەزای ئوحوددا شەهید بوو.[5]

## ٢٢٠. ئەوسی کوڕی عەوف(رضي الله عنه)

ناوی ئەوسی کوڕی عەوفی کوڕی جابری کوڕی سوفیانە، لە ثەقەفیەکانە،[6] لە ناوچەی طائیف نیشتەجێ بوو،[7] وەک وەفدی ثەقەفیەکان

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٤٥، أسد الغابة، ج١، ص٢٢٢.

[2] أسد الغابة، ج٤، ص٢١.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٦٠.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٥٨.

[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٥٨.

[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٥٨.

[7] أسد الغابة، ج١، ص٢٢٢.

هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ)،[1] کاتێک ئەو وەفدە موسڵمان بوون هەموو هۆزی ثەقیفیش بە جارێک موسڵمان بوون.

بەسەرهاتێکی پەیوەست بە ئەوسی کوڕی عەوف پێش موسڵمان بوونی هەیە کە ئەویش بریتیە لەوەی کاتێک عوروەی کوڕی مەسعوود موسڵمان بوو داوای کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) مۆڵەتی بدات بانگەوازی هۆزەکەی بکات، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: (دەی ئەوان جەنگت لەگەڵ دەکەن)، بەڵام عورووە وازی نەهێنا و سێ جار داوای کرد تا دواجار پێغەمبەر(ﷺ) مۆڵەتی پێدا، کاتێک چوویەوە بۆ لایان بانگی کردن بۆ لای ئیسلام، ئەوەبوو ئەوانیش کەوتنە دژایەتی کردنی و دواجار دانیشتن بۆی، ئەوسی کوڕی عەوف تیرێکی بۆ وەشاند و بەری کەوت بەڵام خوێنی لێ نەڕژاند...[2]

ئەوسی کوڕی عەوف دوای پێغەمبەریش(ﷺ) ژیاوە، پاشان لە سەردەمی خیلافەتی خەلیفە راشیدیەکانیشدا ژیاو دواجار لە سەردەمی دەوڵەتی ئومەوی و لە ساڵی پەنجاو نۆی کۆچیدا وەفاتی کرد.[3]

## ٢٣١. ئەوسی کوڕی فائید(رضي الله عنه)

ئەوسی کوڕی فائید یان کوڕی فاکیە یان کوڕی فاتیک، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان.[4]

ئەوسی کوڕی فائید لە غەزای خەیبەردا بەشداری کرد و تیایدا شەهید بوو.[5]

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٥٨.
[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص٣١٢.
[3] أسد الغابة، ج١، ص٢٢٢.
[4] أسد الغابة، ج١، ص٢٢٣.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٥٩.

## ٢٢٢. ئەوسی کوڕی قەتادە(رضي الله عنه)

لە پشتیوانانەو لە غەزای خەیبەردا بەشداری کردو تیایدا شەهید بوو.[١]

## ٢٢٣. ئەوسی کوڕی مالیک(رضي الله عنه)

ئەوسی کوڕی مالیکی کوڕی قەیسی مازنی کە ناسراوە بە ئەبووسائیب، لە غەزای ئوحوددا بەشداری کردووە.[٢]

## ٢٢٤. ئەوسی کوڕی مالیک(رضي الله عنه)

ئەوسی کوڕی مالیکی ئەشجەعی لە فەرموودەیەکدا باسی هاتووە.[٣]

## ٢٢٥. ئەوسی کوڕی مغراء(رضي الله عنه)

ئەم هاوەڵەش ژیاوە تا دوای سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) و دواتر لە جەنگی یەمامەدا شەهید بووە.[٤]

## ٢٢٦. ئەوسی کوڕی موعاذ(رضي الله عنه)

ئەم هاوەڵە یەکێکە لە بەشداربوانی غەزای بەدر،[٥] دواتر لە غەزای بیئر مەعونەشدا بەشدار بوو.[٦]

## ٢٢٧. ئەوسی کوڕی مونذیر(رضي الله عنه)

ئەوسی کوڕی مونذیر لە پشتیوانانە لە بەنی نەجار، لە غەزای ئوحوددا بەشداری کردو تیایدا شەهید بوو.[٧]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٥٩.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٦٠.

[٣] أسد الغابة، ج١، ص٢٢٥.

[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٦١.

[٥] أسد الغابة، ج١، ص٢٢٦.

[٦] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٦٠.

[٧] أسد الغابة، ج١، ص٢٢٧.

## ٢٢٨. ئەوسی کوڕی میعیەر(رضي الله عنه)

ناوی ئەوسی کوڕی میعیەری کوڕی لەوذانی قورەیشی جومەحیە، کونیەکەی ئەبوو مەحذورەیە و زیاتریش بە کونیەکەی ناسراوە.[١]

لە کتێبی (زاد المعاد) دا بە ئەوسی کوڕی موغیرە ناوی هاتووە.[٢]

بوخاری بە سەمورەی کوڕی میعیەر ناوی هێناوە.[٣]

ذەهەبی دەڵێت: دەشوترێت ناوی سەمیری کوڕی عومەیرە.[٤]

دەوترێت بەڵکو ناوی سەمورەیەو ئەوس برای ئەبوو مەحذورە بووە، بەڵام ئیبن ئەثیر دەڵێت: راستتر وایە کە براکەی ناوی ئونەیس بووەو لە رۆژی بەدردا بە بێباوەڕی کوژراوە.[٥]

ئەوسی کوڕی میعیەر کوڕێکی هەبوو بە ناوی عەبدولمەلیک، ئەو کوڕەی و ژنەکەشی فەرموودەیان لێوە گێڕاوەتەوە.[٦]

بەڵام ئیبن هیشام لە باسی بەدردا باس لەوە دەکات ئەوسی کوڕی میعیەر بێباوەڕ بووەو بە دەستی عەلی کوڕی ئەبووطالیب کوژراوە،[٧] ئەمەش واتە ئەبوومەحذورەی بە ئەوسی کوڕی میعیەر دانەناوە، بەڵام زۆرینەی راکان پێچەوانەی ئەمەن.

ذەهەبیش پێی وایە رای راستتر ئەوەیە ناوی ئەوسی کوڕی میعیەرە.[٨]

لە دوای فەتحی مەککە بانگبێژی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بووە لە مەککە.[٩]

---

[١] أسد الغابة، ج١، ص٢٢٦.

[٢] زاد المعاد في هدي خير العباد، ج١، ص١٢٤.

[٣] التاريخ الكبير للبخاري، ج٤، ص١٧٧.

[٤] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص١١٧.

[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٦١.

[٦] سير أعلام النبلاء، ج٣، ص١١٧.

[٧] السيرة النبوية لابن هشام، ج٣، ص٢٦٩.

[٨] تأريخ السلام للذهبي، ج٤، ص٣٤٤.

[٩] أسد الغابة، ج١، ص٢٢٦.

لە فەتحی مەککەدا موسڵمان بووەو لەوێ ماوەتەوەو کۆچی نەکردووە بۆ مەدینە.[1]

کاتێک موسڵمان بوو چووە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بانگ بدەم؟ ئەویش فەرمووی: بانگ بدە، ئیتر لەگەڵ بیلالدا بانگیان دەفەرموو، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) گەڕایەوە بۆ مەدینەو بیلالیش لەگەڵیدا گەڕایەوە، پێغەمبەر(ﷺ) ئەبوو مەحذورەی راسپارد تا لە مەککەدا بانگ بدات، ئیتر ئەویش لەوێ مایەوەو کۆچی نەکرد بۆ هیچ شوێنێک و دوای خۆیشی کوڕ و کوڕەزاکانی ئەو بانگدانەیان بۆ مایەوە.[2]

ئەبوومەحذوورە دەڵێت: لەگەڵ چەند کەسێک لە رێی حونەیندا بووین کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) لەوێوە دەگەڕایەوە، لە نیوەی رێدا پێی گەیشتین، بانگبێژ بانگی دا و گوێمان لێبوو، ئێمەش لێی بێزاربووین و بە رابواردنەوە دەمانوتەوە، پێغەمبەر(ﷺ) گوێی لە دەنگام بوو، ناردی بە شوێنماندا و چووینە خزمەتی، فەرمووی: دەنگی کامتان بوو بیستم وا دەنگی بەرزبوو؟ ئەوانیش ئاماژەیان بە من دا، راستیشیان ئەوت، پێغەمبەر(ﷺ) وازی لەوان هێنا و منی هێشتەوە، پاشان فەرمووی: هەستە و بانگ بدە بۆ نوێژ، هەستام و پێغەمبەر(ﷺ) بانگدانی فێرکردم.. دواتر کیسێکی پێدام کە بڕێک زیوی تێدابوو، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بمکە بە بانگبێژی مەککە، ئەویش وایکرد، منیش چووم بۆ لای عەتتابی کوڕی ئوسەید کە کاربەدەستی پێغەمبەر(ﷺ) بوو لە مەککە، لەوێ بانگی نوێژم بۆ دەدا.[3]

ئەبوو مەحذوورە یەکێک بووە لە هەرە دەنگ خۆشەکانی ناو مەککە.[4]

ئیبن سەعد گێڕانەوەیەکی هێناوە کە سەرەی بانگدانەکە روون دەکاتەوە، دەڵێت: کاتێک بیلال ئامادە بوایە بانگی دەفەرموو، ئەگەر بیلال ئامادە

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٥، ص٤٥٠.
[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٥، ص٤٥٠.
[3] سنن النسائي – كتاب الأذان – باب كيف الأذان، الرقم ٦٣٢.
[4] شذرات الذهب لابن العماد الحنبلي، ج١، ص٦٥.

نەبوایە ئەوە ئەبوو مەحذورە بانگی دەدا.[1]

لە سەردەمی خیلافەتی ئەمیری باوەڕداران عومەری کوڕی خەتتابدا جارێک عومەری کوڕی خەتتاب هات و ئەبوو مەحذورە بانگی دەفەرموو، عومەر سەلامی کرد و پاشان وتی: ئەریَ ناترسیت قورقوڕاگەت بتەقێت هێندە دەنگ بەرز دەکەیتەوە؟ ئەویش وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران بینیم دێیت حەزم کرد دەنگی خۆم بدەمە بەرگوێت، عومەر وتی: ئەی ئەبوو مەحذورە تۆ لە ناوچەیەکی زۆر گەرمدایت، بۆیە نوێژ دوابخە تا تاویَ فێنک دەکات.[2]

مەسەلەی دەنگ بەرزکردنەوە بۆ بانگ لەو سەردەمەدا پێویستی بووە تا زۆرترینی موسڵمانان گوێیان لە بانگ بێت، بەڵام لەم سەردەمەدا کە پێشکەوتنی بەرچاو دەبینرێت و بڵندگۆکان هاتوونەتە ئاراوە، ئیتر پێویست ناکات بە دەنگ بەرزکردنەوەو فشارخستنەسەر خۆ، چونکە بە بوونی بڵندگۆکان ئامانجەکە دێتەدی.

هەروەها سەبارەت بە فێنک کردنەوەی کاتی نوێژ لەبەرئەوە بووە کە سەردەمانی زوو پێشکەوتنی ماددی نەبووەو لەبەر زۆری گەرمای رۆژ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کردووە لەو کاتی گەرما زۆرانەدا نوێژ بخەنە دەمەو فێنکی تا تاوێک گەرماکە کەم بکات، بەڵام لەم سەردەمەی نوێدا کە پشکەوتنی بەرچاو هەیە، بە هۆی بوونی فێنککەرەوەکانەوە هۆکاری دواخستنەکە نامێنێت و ئیتر پێویسَت ناکات نوێژ دوابخرێت، بۆیە دەبینین لە هەردوو حەرەمی مەککەو مەدینەش و لە شوێنانی تری جیهانیش لە مزگەوتەکاندا نوێژ دواناخرێت و سوود وەردەگیرێت لە پێناوەکانی فێنک کردنەوە.

ئیبن موحەیریز دەڵێت: ئەبوو مەحذورەی ئامۆزامم بینی قژی زۆر

[1] الطبقات الکبری لابن سعد، ج٣، ص٢٣٤.

[2] سیر أعلام النبلاء، ج٣، ص١١٩.

هاتبوو، وتم: ئامۆزا بۆچی قژت کورت ناکەیتەوە؟ وتی: چۆن قژێک کورت بکەمەوە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەستی هێناوە بەسەردا و نزای بەرەکەتی بەسەردا خوێندووە.[1]

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە وتی: تا مردن نایبڕم، ئەوەبوو تا مرد ئەو بەشەی قژی نەبڕی.[2]

بەڵام ئەمە جێی قەناعەت نیە، چونکە فەرموودەیەکی صەحیحی لەسەر نیە تا دڵنیا بین لەوە، پاشان ئەوەش لەگەڵ عەقڵدا ناگونجێت، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) لە ساڵی یانزەی کۆچیدا وەفاتی کردووەو ئەبوو مەحذوورەش لە ساڵی پەنجاو نۆی کۆچیدا وەفاتی کردووە، ئەگەر ئەو رووداوە هەر لە ساڵی یانزەشدا بووبێت ئەوە نزیکەی چل و هەشت ساڵ دەکات، جا چۆن گونجاوە چل و هەشت ساڵ قژ نەبڕێت، بۆیە لەبەر نەبوونی بەڵگەیەکی صەحیحی نەقڵی لەسەری و نەگونجانیشی لەگەڵ عەقڵ، ئەمە لە راستیەوە دوورە، خۆ ئەگەر بەڵگەیەکی نەقڵی صەحیحی لەسەر بوایە کە بێ گومان هاوەڵان شایەتی ئەوەیان بدایە ئەوە قسەمان نەبوو لەسەری با لەگەڵ عەقڵیشدا نەگونجایە، بەڵام هیچ بەڵگەیەکی صەحیحی نەقڵی لەسەر نیەو تەنها گێڕانەوەیەکە کە بوخاری لە (التاریخ الکبیر) دا هێناویەتی و خۆیشی بەوە رازی نەبووە لە صەحیحەکەیدا بیهێنێت و وەک گێڕانەوەیەک لە مێژووەکەیدا تۆماری کردووە.

لەوانەشە وەک موعجیزەیەکی پێغەمبەر(ﷺ) بووبێت کە بە دەستهێنانی بە قژیدا سنوورێکی دانابێت بۆ درێژبوونی قژی و لە ئاستێکدا زیاتر درێژ نەبووبێت، بەڵام بۆ ئەمەش بەڵگەمان بەدەستەوە نیە.

ئەوسی کوڕی خالید دەڵێت: هەرکات دەچووم بۆ لای ئەبوو مەحذورە هەواڵی سەمورەی دەپرسی، هەرکاتیش دەچووم بۆ لای سەمورە هەواڵی

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص٢٢٧.

[2] التاریخ الکبیر للبخاري، ج٤، ص١٧٧.

ئەبوو مەحذورەی دەپرسی، رۆژێک وتم: بە ئەبوو مەحذورە بۆچی دەچم بۆ لای سەمورە هەواڵی تۆ دەپرسێت و دێم بۆ لای تۆیش هەواڵی ئەو دەپرسیت، ئەویش وتی: جارێک من و سەمورە و ئەبووهورەیرە پێکەوە بووین، پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاتەژوورەوە بۆ لامان و فەرمووی: ئەوەتان کە کۆتا کەس دەمرێت لە دۆزەخدایە، ئەوسی کوڕی خالید دەڵێت: ئەوەبوو یەکەمجار ئەبووهورەیرە مرد، دواتر ئەبوو مەحذورە مرد، دواتر ئەویش مرد.[1]

لەراستیدا ئەم فەرموودەیە قسەو باسی زۆری لەسەرەو جێی مشتومڕێکی زۆرە، هەندێک لەسەر ئەوە قسە دەکەن ئایا ئەم فەرموودە صەحیحە یان لاوازە یان هەڵبەستراوە، هەندێکیش کاری پێ دەکەن، بەتایبەت شیعە زۆر دڵیان خۆشە بەم فەرموودەیە، نەک لەبەر بڕوابوونیان بە فەرموودەکانی ناو کتێبەکانی ئەهلی سوننە یان رازی بوونیان لە ئەبوهورەیرەو ئەبوو مەحذوورە، بەڵکو لەبەر ئەوەی دەبێتە بەڵگە بۆ چوونەدۆزەخی سەمورەی کوڕی جوندوب کە رۆڵێکی هاریکاری گەورەی بینیوە لە سەرەدەمی موعاویەی کوڕی ئەبووسوفیاندا.

ئەوانەی کار ناکەن بەم فەرموودەیە لەسەر ئەم بەڵگانە دەجووڵێنەوە:

یەکەم: فەرموودەکە لە زۆربەی هەرەزۆری کتێبەکانی فەرموودەدا نەهاتووە وەک بوخاری و موسلیم و نەسائی و ترمذی و ئەبووداوود و....

دووەم: شیکاری سەنەدەکە دەکەن و دەیسەلمێنن کە مەرجی صەحیحی تێدا نیە.

سێیەم: دەڵێن هیچ کات سیفەتی پێغەمبەر(ﷺ) نەبووە ترس و بیم و مژدەی خراپ بدات بە چەند کەسێک کە پێکەوەن تا ئەوەی هەموو تەمەنیان بەو ترسەوە بژین، دەبینین پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەگەڵ ئەوەی هەموو دووڕووەکانی دەناسی و دەیزانی کێ و کێن، کەچی ناوی ئەوانی

[1] مسند ابن أبي شيبة، الرقم ٨٣١، البداية والنهاية لابن كثير، ج٦، ص٢٦.

نەدەدرکاند تا وەفاتیشی کرد تەنها لای یەک هاوەڵ ناوەکانی دەوت: و نەیهێشت هاوەڵانی تر ناویان بزانن.

بە گشتی ئەم مەسەلەیە وردەکاری و باس و خواسی زۆری دەوێت و پشت بە خوا لە ژیانی سەمورەی کوڕی جوندوبدا بە وردی باسی دەکەین و هەموو لایەنەکانی دەخەینە بەرباس.

ئەوسی کوڕی میعیەر دوای پێغەمبەر(ﷺ) ژیا تا لە مەککەو لە ساڵی پەنجاو نۆی کۆچیدا وەفاتی کرد،[1] واتە سەردەمی خەلیفە راشیدینەکانیش ژیاوەو هەر بانگبێژ بووە و دواتر لە سەردەمی ئومەویدا وەفاتی کردووە.

ئیبنولعیمادی حەنبەلی پێی وایە ئەوسی کوڕی میعیەر لە ساڵی پەنجا و نۆی کۆچیدا وەفاتی کردووە.[2]

موجاهید دەڵێت: ئێمە لای خەڵک شانازیمان دەکرد بە چوار کەسەوە، بە فیقهناسەکەمانەوە ئیبن عەبباس، بە بانگ بێژەکەمانەوە ئەبوو مەحذورە....[3]

## ٢٢٩. ئەوسی کوڕی ئەبی ئەوس(ﷺ)

هەندێک ئەم هاوەڵە لەگەڵ ئەوسی کوڕی ئەوس بە یەک کەسایەتی دەزانن،[4] وەک دەبینین ئەو فەرموودەی کە سەبارەت بە ئەوسی کوڕی ئەوس هێنامان ئیمامی ئەحمەد بە ناوی ئەوسی کوڕی ئەبوو ئەوس هێناویەتی.

ئەوسی کوڕی ئەبی ئەوس دەڵێت: نیو مانگ لای پێغەمبەر(ﷺ) ماینەوە، دەمبینی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لای دەکردەوە (بۆ تف و بەلغەم) بەلای راستیدا، جاریش هەبوو دەمبینی لای دەکردەوە بەلای چەپیدا، دەمبینی نوێژی دەکرد و نەعلەکانی لەپێدا بوو.[5]

---

[1] تأريخ السلام للذهبي، ج٤، ص١٦٥.

[2] شذرات الذهب لابن العماد الحنبلي، ج١، ص٦٤-٦٥.

[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٥، ص٤٤٥.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٤٣.

[5] المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٥٩٥.

## ٢٣٠. ئەوسی کوڕی ئەرقەم(ﷺ)

ناوی ئەوسی کوڕی ئەرقەمی کوڕی زەیدی کوڕی قەیسە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان.[١]

براکەی ناوی زەیدی کوڕی ئەرقەم بوو،[٢] زەید ئەو هاوەڵە بوو کە گوێی لە قسەکەی عەبدوڵای کوڕی ئوبەی بوو کە دەیوت (ليخرجن الأعز منها الأذل).[٣]

ئەوس بەشدار بوو لە غەزای ئوحوددا و لەو غەزایەشدا شەهید بوو،[٤] زەیدی برایشی ویستی بەشداری بکات و لەگەڵ ئەوسی برایدا چوو، بەڵام لەبەر کەمی تەمەنی، پێغەمبەر(ﷺ) ڕێی نەدا زەید بەشداری بکات.[٥]

ئەوسی کوڕی ئەرقەم لەلایەن صەفوانی کوڕی ئومەییەوە کوژرا، صەفوان باسی شانازی خۆی دەکات کە داخی کوژرانی باوکی (ئومەییەی کوڕی خەلەف) لە جەنگی بەدردا بە کوشتنی هەریەک لە ئیبن قەوقەل و خاریجەی کوڕی زەید و ئەوسی کوڕی ئەرقەم لە ئوحوددا ڕشتووە.[٦]

دوای شەهید بوونی ئەوس زەیدی برای لەلایەن عەبدوڵای کوڕی ڕەواحەوە سەرپەرشتی دەکرا، ئەمە واتای ئەوەیە پێشتر ئەوس سەرپەرشتی کردووە، چونکە زەید خۆی دەڵێت: من هەتیو بووم و لای عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە بووم کە لەگەڵ خۆی بردمی بۆ موئتە.[٧]

---

[١] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١١٨، أسد الغابة، ج١، ص٢٠٨.
[٢] تأريخ الإسلام للذهبي، ج٢، ص٢٠٢.
[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص٥٨٩.
[٤] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١١٨، أسد الغابة، ج١، ص٢٠٨.
[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص٥٨٩.
[٦] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٥٢٤.
[٧] تاريخ الإسلام للذهبي، ج٥، ص١١٨.

## ٢٣١. ئەوسی کوڕی یەزید(رضي الله عنه)

ناوی ئەوسی کوڕی یەزیدی کوڕی ئەصرەمە، لە بەیعەتی عەقەبەدا بەشداری کرد، واتە ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە چونکە بەیعەتی عەقەبە لەنێوان پێغەمبەر(ﷺ) و پشتیوانانداندا بوو.[١]

## ٢٣٢. ئەوسی کوڕی ئەعوەر(رضي الله عنه)

ناوی ئەوسی کوڕی ئەعوەری کوڕی جەوشەنە،[٢] دەوترێ بەڵکو ناوی ذیلجەوشەنە، ئەم هاوەڵە باوکی شیمری کوڕی ذیلجەوشەنە کە باس وخواسی لە ڕووداوی شۆڕشەکەی حوسەینی کوڕی عەلیدا هەیە،[٣] ئەم ڕایەش نزیکترە لە ڕاستیەوە.

## ٢٣٣. ئەوسی کوڕی ئەوس(رضي الله عنه)

ناوی ئەوسی کوڕی ئەوسی ثەقەفیە، ئەم هاوەڵە لای هەندێک لەگەڵ ئەوسی کوڕی ئەبی ئەوس وەک یەک کەس باسکراوە، بەڵام دوو کەسایەتی جیاوازن.[٤]

ئەوس لەگەڵ وەفدی ثەقیفدا هاتە بۆ خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و ماوەیەک لای مایەوە، پێغەمبەر(ﷺ) لە مزگەوتی مەدینەدا خەیمەیەکی بۆ هەڵدان تا بەشێکی ئەو وەفدە کە مالیکیەکان بوون لەوێ ماوەیەک بمێننەوە، ئیتر شەوانە پێغەمبەر(ﷺ) دەچوو بۆ لایان و سەردانی دەکردن و قسەی دەکرد بۆیان، ئەوەی دەوترێت ئەوس لە ئەهلی صوففە بووە ڕاست نیە[٥] بەڵکو

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٦١.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٤٣.

[٣] أسد الغابة، ج١، ص ٢٠٩.

[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٤٣.

[٥] حلية الأولياء لأبي نعيم الأصبهاني، ج١، ص٣٤٨.

لەبەر ئەو مانەوەی لە مزگەوتی مەدینە هەندێک لەگەڵ ئەهلی صوففەدا تێکەڵی دەکەن.

ئەوس دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرمووم:(إن من أفضل أيامكم يوم الجمعة، فيه خلق آدم، وفيه قبض، وفيه النفخة، وفيه الصعقة، فأكثروا علي من الصلاة فيه، فإن صلاتكم معروضة علي)، (لە چاکترین رۆژەکانتان رۆژی هەینیە، تیایدا ئادەم دروست کراوەو تیایدا گیانی کێشراوەو تیایدا فووی کەڕەنا دەبێت و تیایدا دەنگە گەورەکە دەبێت، دەی تیایدا زۆر صەلەوات بدەن لەسەر من، چونکە صەلەواتەکانتان دەخرێنەروو بۆم)، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) چۆن صەلەواتدانمان دەگات بە تۆ لەکاتێکدا تۆ نەماویت و بویت بە خۆڵ؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (إن الله عز وجل حرم على الأرض أن تأكل أجساد الأنبياء)،[1] (خوای گەورە حەرامی کردووە لەسەر زەوی جەستەی پێغەمبەران بخوات).

سەبارەت بە صەلەوات دان لەسەر پێغەمبەر(ﷺ) لە رۆژی هەینیدا و فەزڵ و گەورەیی صەلەوات لەو رۆژەدا ژمارەیەک فەرموودە هەن کە جەخت لەوە دەکەنەوە، سەبارەت بە مەسەلەی خرانەرووی صەلەوات بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوە قسەوباسی زۆر هەڵدەگرێت و پێویستی بە بەدواداچوون هەیە، چونکە پێویستی بە روونکردنەوەی فەرموودەکانی تر هەیە لەو بارەیەوە کە ئایا مەبەست چیە بە گێڕانەوەی رۆح بۆ پێغەمبەر(ﷺ) بۆ وەڵامدانەوەی صەلەواتەکان.

## ٢٣٤. ئەوسی کیلابی(رضي الله عنه)

ئەوسی کیلابی چوەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و بەیعەتی پێداوە،[2] کوڕێکی هەبوو بە ناوی حاجیب کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە،

[1] سنن ابن ماجه - أبواب الجنائز - باب ذكر وفاته ودفنه(ﷺ)، الرقم ١٦٣٦، صححه شعيب الأرناؤوط، وصححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن ابن ماجة، الرقم ١٠٨٥.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٦٢.

لە گێڕانەوەیەکدا لە باوکیەوە هێناویەتی کە باوکی دەڵێت: چوومە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و خەڵکی لەسەر چی بەیعەتیان پێدەدا منیشبەیعەتم پێدا..

## ٢٣٥. ئەوسی مەرئی(ﷺ)

ئەوی مەرئی لە بەنی ئیمریئولقەیسە، لە فەرموودەیەکدا باسی هاتووە کە چوەتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ)، کچەکەشی ناوی جەمیلە بووە.[١]

## ٢٣٦. ئەوسی ئەنصاری(ﷺ)

ناوی ئەوسە و لە پشتیوانانە، بەڵام ناوی باوکی و هۆزەکەی نازانرێت.

کاتێک غەزای بەنیلموصتەلەق روویدا، یەکێک لە موسڵمانان بە ناوی هیشامی کوڕی صبابە چوو بەدوای دوژمناندا و لە کەشێکی رەشەبای زۆر سەختدا گەڕایەوە، یەکێک لە ئەندامانی دەستەو تاقمەکەی عوبادەی کوڕی صامت کە هاوەڵێک بوو بە ناوی ئەوسی ئەنصاری، وایزانی هیشام لە دوژمنانە و هەڵمەتی بۆ برد و کوشتی، دواتر کە زانی موسڵمان بووە چووە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و مەسەلەکەی بۆ باس کرد و پێی وت: چۆن بە هەڵە هیشامی کوشتووەو وایزانیوە دوژمنە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد خوێن باییەکەی بدات.[٢]

ئەوەبوو برایەکی هیشام لە مەککە کە ناوی میقیەس بوو و موسڵمان نەبوو هات و داوای خوێن بایی کرد و پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمانی کرد خوێن باییەکەی پێدرا، بەڵام میقیەس بەوەوە نەوەستا و چاوەڕێی کرد تا دەرفەتی دەست کەوت وهەڵمەتی بردە سەر بکوژەکەی هیشامی برای و کوشتی و بەرەو مەککە گەڕایەوە، هەر بۆیە میقیەس یەکێک بوو لەوانەی کە پێغەمبەر(ﷺ) کوشتنی رەوا کرد.[٣]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٦٢.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٦١.

[٣] البدايةو النهاية لابن كثير، ج٤، ص١٥٦.

## ٢٣٧. ئەوفای کوڕی عورفوطه(ﷺ)

هەریەک لە ئەوفا و عورفوطەی باوکیشی هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوون، باوکی لە جەنگی طائیفدا شەهید بوو.[١]

## ٢٣٨. ئەوفای کوڕی مەوله(ﷺ)

ئەوفای کوڕی مەولەی تەمیمی، چوەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)،[٢] لەو هاوەڵانە ئەژمار دەکرێت کە لە بەصرە نیشتەجێ بوون.[٣]

فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوە کە چوەتە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) بەڵام ئیبن عەبدولبەر دەڵێت: سەنەدەکەی بەهێز نیە.[٤]

## ٢٣٩. ئەیسەر(ﷺ)

ئەمە نازناوی ئەبوولەیلای ئەنصاری بوو،[٥] ئەم هاوەڵە لە پشتیوانان بوو، سەبارەت بە ناوەکەی راجیایی هەیە، بە هەریەک لە داود و ئەوس و یەسار و یوسر و بیلال هاتووە، لە هەریەک لە غەزای ئوحود و غەزاکانی دواتریشدا بەشداری کرد، دواتر چوویە کووفە و لەوێ نیشتەجێ بوو، سەر بە سوپای عەلی کوڕی ئەبوو تالیب بوو، بۆچوونێ دەڵێت: لە جەنگی صفیندا کوژراوە.[٦]

ئیبن ئەثیر سەبارەت بە هاتنی ئەم هاوەڵە گێڕانەوەیەک دێنێت: کاتێک موسڵمانانی حەبەشە زانییان پێغەمبەر(ﷺ)و موسڵمانان لە جەنگی

---

[١] أسد الغابة، ج١، ص٢٢٧.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٦٢.

[٣] أسد الغابة، ج١، ص٢٢٧.

[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٦٢.

[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ١٦٨.

[٦] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٣٥٢.

بەدردا سەرکەوتن، داوای مۆڵەتیان کرد لە نەجاشی تا بچنەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، ژمارەیەک لەوانەی لای نەجاشی بوون و بڕوایان هێنابوو بە نەجاشییان وت: مۆڵەت بدە بە ئێمەش با بچین بۆ لای ئەو پێغەمبەرەو بزانین ئەو کەسەیە کە لە کتێبەکەماندا باسی کراوە؟ ئەوەبوو چوون بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و لەگەڵیدا بەشداری غەزای ئوحود بوون، ریوایەتێ لە موقاتیل و کەسانی تریشەوە دێنێ کە وتویانە ئەوانە ٤٠ کەس بوون، سی و دوو کەسیان لە گەڵ جەعفەری طەیاردا هاتن، هەشت کەسیشیان لە شامەوە هاتن (بوحەیراو ئەبرەهەو ئەشرەف و تەمام و ئیدریس و ئەیمەن و نافع و تەمیم)، ئەمە گێڕانەوەی ئەبوو مووسا بوو کە ئیبن ئەثیر هێناویەتی، ئیبن ئەثیر دەڵێت: ئەگەر مەبەستی بە بوحەیرا یەکێکی تری جیا لەو بوحەیرایە بێت کە پێغەمبەر(ﷺ) بە منداڵی بینی، ئەوە ئەگەری هەیە ئەم هاتنی وەفدە راست بێت.[1]

ئیبن حەجەر دەڵێت: وادیارە ئەمە بوحەیرایەکی ترە، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) ئەوی لە خاکی شام دیوە، بەڵام ئەم بوحەیرایەیان لە حەبەشە بووە، باکووری وڵات لەکوێ و باشووری لەکوێ، ئاساییە دوو کەس یەک ناویان هەبێ.[2]

بەڵام بەپێی هەموو سەرچاوەکان جەعفەری طەیار(ﷺ) و موسڵمانان لە فەتحی خەیبەردا هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)،[3] دیاریشە غەزای ئوحود لەپێش فەتحی خەیبەر روویداوە، بۆیە هاتنی ئەو کەسانە لەگەڵ جەعفەری طەیار بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و بەشداری کردنیان لە غەزای ئوحوددا، بەپێی سەرچاوەکان هەڵەیەو راستی تێدا نیە، دەشکرێ ئەو ئەگەرە دابنێین ئەو کەسانەی تر (واتە ئەو ٤٠ کەسە) بەجیا و بەبێ جەعفەر هاتبن، وەک چۆن ئیبن حەجەر باس لەوە ناکات هاتنی ئەو کەسانە لەگەڵ جەعفەردا بووبێت.[4]

[1] أسد الغابة، ج١ص٧١.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٢٢.
[3] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١ص٢٤٢، أسد الغابة، ج١ص٤٢١، سير أعلام النبلاء للذهبي، ج١ص٢٠٦.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٢٢.

## ٢٤٠. ئەیمەنی کوڕی خورەیم(رضي الله عنه)

ناوی ئەیمەنی کوڕی خورەیمی کوڕی فاتیکی ئەسەدیە، دایکی ناوی صەمائی کچی ثەعلەبەیە، ئەیمەن لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا موسڵمان بوو، ئەوکات گەنجێکی تازە پێگەیشتوو بووە.[١]

ئەیمەن فەرموودەی پێغەمبەری خوای(ﷺ) لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە.[٢]

فەرموودەیەکی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوەو دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) وتاری دەدا فەرمووی: (يا أيها الناس عدلت شهادةُ الزور إشراكا بالله)، (ئەی خەڵکینە شایەتی دانی درۆ هاوتای هاوەڵدانانە بۆ خوای گەورە)، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە (فاجتنبوا الرجس من الأوثان واجتنبوا قول الزور).[٣]

ئەیمەن لای خەلیفەکان زۆر خۆشەویست بوو بەتایبەت لای مەڕوانی کوڕی حەکەم، تەنانەت کاتێک مەڕوانی کوڕی حەکەم دژ بە ضوحاکی کوڕی قەیس جەنگا، بە ئەیمەنی وت: حەز دەکەین لەم جەنگەدا لەگەڵماندا بیت، ئەویش وتی: باوکم و مامم بەشداری جەنگی بەدر بوون و رایانسپاردوم هەرگیز لەگەڵ کەسێک نەجەنگم کە موسڵمانەو شایەتی دەدات هیچ پەرستراوێ نیە جگە لە خودا، ئەگەر بەڵێننامەیەکم بۆ دەنووسیت کە نەچمە دۆزەخ ئەوە لەگەڵت دێم و دەجەنگم، ئەوەبوو مەڕوان چەند قسەیەکی پێ وت، ئەیمەنیش لە وەڵامدا بە شیعر پێی وت: ناجەنگم دژ بە موسڵمان بۆ کەسێ کە دەسەڵات بۆ ئەوە و تاوانەکەش بۆ من.[٤]

کەسانێکی وا هەن هەموو تاوانەکان لەیەک ئاستدا سەیر دەکەن،

---

[١] أسد الغابة، ج١، ص٢٤١.

[٢] المعجم الأوسط للطبراني، الرقم ٣٥٨٤.

[٣] مسند أحمد بن حنبل - مسند الشاميين(رضي الله عنهم) - حديث أيمن بن خريم(رضي الله عنه)، الرقم ١٨٣٢٩، جامع الترمذي - أبواب الشهادات عن رسول الله(ﷺ) - باب ما جاء في شهادة الزور، الرقم ٢٢٩٩، ضعفه الألباني في تحقيق كتاب الإيمان لابن سلام، باب ذكر الذنوب التي تلحق بالكبائر بلا خروج من الإيمان و قال و استغربه الترمذي.

[٤] -أسد الغابة، ج١، ص٢٤١.

بەڵام ئەوە لای من هیچ راستیەکی نیە، چونکە خوای گەورە هەندێ تاوانی لە هەندێکی تر گەورەتر داناوە، ئەوەی من بۆی دەروانم ئەوەیە خوای گەورە رێگری کردووە لە ئەنجامدانی هەموو تاوانەکان هەرچەندە هەندێکیان گەورەترن لە هەندێکی تریان، هەرکەس شتێ لەو تاوانانە بکات ئەوا گەیشتووە بە تاوانباران وەک چۆن خەڵکێکی تر بە تاوانی تر پێی گەیشتون، چونکە هەرکامیان بەپێی تاوانەکەی ناوی تاوانباری لێ دەنرێ با تاوانی هەندێکیان لەوی تریان گەورەتر بێت، لەم فەرموودەدا (شایەتی دانی درۆ هاوتای هاوەڵدانانە بۆ خوای گەورە) بۆمان روون دەبێتەوە هاوەڵ دانان و شایەتی دانی درۆ لە نەهیدا یەکسانن و خوا لە یەک کاتدا دوورەپەرێزی کردووە لە هەردووکیان، بۆیە هەردووکیان لە نەهی و تاواندا یەکسانن.. نابینیت دز دەستی دەبڕدرێت لە روبعە دینارێکدا و ئەگەر نەگەیشتە ئەو رێژەیە دەستی نابردرێت؟ دەکرێت بوترێت ئەوە دزەو هەردووکیان (دەست بڕاو و دەستە نەبڕاوەکەش) پێیان بوترێت دز و هەردووکیان تاوانیان کردبێت، بەڵام لە سزادا بەپێی رێژەی زیاتری تاوانەکە جیاوازن.[1]

موحەممەد موبارەکفوری لە شەرحی جامیعی ترمذیدا دەڵێت: (شایەتی دانی درۆ هاوتای هاوەڵدانانە بۆ خوای گەورە) واتە شایەتی دانی درۆی هاوشێوەی هاوەڵ دانان بۆ خوا داناوە لە تاوانکاریدا، چونکە هاوەڵ دانان بۆ خوا درۆیە لە ئاست خوادا کە دروست نیە، شایەتی دانی درۆیش درۆیە لە ئاست بەندەدا کە ئەمیش دروست نیە، لە واقیعدا هەردووکیشیان ناواقیعین.[2]

---

[1] في تحقيق الألباني لكتاب الإيمان لابن سلام، باب ذكر الذنوب التي تلحق بالكبائر بلا خروج من الإيمان.

[2] تحفة الأحوذي بشرح جامع الترمذي للمباركفوري، دار الكتب العلمية، بيروت، ج٦، ص٤٨١.

## ٢٤١. ئەیمەنی کوڕی ئوم ئەیمەن(ﷺ)

ناوی ئەیمەنی کوڕی عوبەیدی کوڕی زەیدی کوڕی عەمرە، دایکی ناوی ئوم ئەیمەنە، ئوم ئەیمەنی دایکی لە سەردەمی نەفامیدا لە مەککە لەگەڵ عوبەید هاوسەرگیری کرد، عوبەیدە ماوەیەکی کەم هاتە مەککەو لەوێ مایەوە، دواتر ئوم ئەیمەنی برد بۆ مەدینەو لەوێ لە مەدینە ئەیمەن لەدایک بوو، دواتر عوبەید مرد، ئینجا ئوم ئەیمەن گەڕایەوە بۆ مەککەو لەوێ شووی کرد بە زەیدی کوڕی حارثە.[١]

ئوممو ئەیمەنی دایەنی پێغەمبەر(ﷺ) بوو،[٢] ئەیمەن لە دایکەوە برای ئوسامەی کوڕی زەید بوو، واتە ئوم ئەیمەن دایکی ئوسامە و ئەیمەنیش بوو.[٣]

کە پێغەمبەر(ﷺ) دەچوو بۆ دەستنوێژ گرتن و دەست بە ئاو گەیاندن ئەیمەن لەگەڵیدا بوو و پێویستیەکانی بۆ بەجێدەگەیاند.[٤]

ئەیمەن کوڕێکی هەبوو بە ناوی حەججاج.[٥]

هەندێ کەس وەک ئیبن عەبدولبەر هەریەک لە ئەیمەنی کوڕی ئوم ئەیمەن و ئەیمەنی کوڕی عوبەیدی حەبەشی بە یەک هاوەڵ دەزانن،[٦] بەڵام ئیبن ئەثیر دەڵێت: راستتر وایە ئەو دوانە لەیەک جیان.[٧]

ئیبن ئیسحاق دەڵێت: ئەم ئایەتە لەسەر ئەیمەن و هاوەڵەکانی دابەزی (فمن كان يرجو لقاء ربه فليعمل عملا صالحا ولا يشرك بعبادة ربه أحدا).[٨]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٧٠.

[٢] أسد الغابة، ج١، ص٢٤٢.

[٣] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٢٨، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٧٠.

[٤] أسد الغابة، ج١، ص٢٤٢.

[٥] البداية و النهاية لابن كثير، ج٥، ص٣١٤.

[٦] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٢٨.

[٧] تاريخ الإسلام للذهبي، ج٢، ص٥٨٩.

[٨] البداية و النهاية لابن كثير، ج٥، ص٣١٣.

ئەیمەن لە غەزای حونەیندا شەهید بوو.[1]

## ٢٤٢. ئەییوبی کوڕی موکرز(ﷺ)

هیچ زانیاریەک لەسەر ژیانی نەهاتووە، تەنها ئەوە هەیە هاوەڵ بووەو ناوی لە کتێبەکانی تایبەت بە ژیانی هاوەڵاندا هاتووە.[2]

## ٢٤٣. ئوسەیدی کوڕی ثەعلەبە(ﷺ):

ئەم هاوەڵەش لە پشتیوانانە، بەشدار بوو لە جەنگی بەدردا، دوای وەفاتی پێغەمبەریش(ﷺ) ژیاو لە سەردەمی عەلی کوڕی ئەبووطالیبدا بەشداری جەنگی صفین بوو.[3]

## ٢٤٤. ئوسەیدی کوڕی حوضەیر(ﷺ):

لە هاوەڵە پشتیوانەکانە لە ئەوسیەکان لە بەنی عەبدولئەشهەل،[4] ناوی ئوسەیدی کوڕی حوضەیری کوڕی سەمماکی کوڕی عوتەیکە،[5] حوضەیری باوکی سوارچاکی ئەوسیەکان بوو لە جەنگەکانیاندا، واتە پێگەیەکی دیاری هەبوو و قەڵایەکیشی هەبوو، لە جەنگی بوعاثدا کە پێش هاتنی پێغەمبەر(ﷺ) روویدا باوکی ئوسەید گەورەی ئەوسیەکان بوو،[6] بەڵام بە بێباوەڕی مرد.[7]

دایکی ناسراوە بە ئوم ئوسەید، ئوسەید منداڵێکی هەبوو بە ناوی یەحیا کە لەگەڵ ئوسەیدی باوکیدا بەشداری حودەیبیە بوو.[8]

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص٢٤٢.

[2] أسد الغابة، ج١، ص٢٤٤.

[3] أسد الغابة، ج١، ص١٤٢.

[4] أسد الغابة، ج١، ص١٤٣.

[5] معجم الصحابة لابن قانع، ج١، ص٣٨

[6] أسد الغابة، ج١، ص١٤٢- ١٤٣.

[7] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٩٤.

[8] الإصابة في معرفة الصحابة، ج٦، ص ٦٤٣.

سەبارەت بە کونیەکەی چەند بۆچوونێ هاتووە، ئیبن عەبدولبەر دەڵێت: پێنج کونیەی لەسەر هاتووە (ئەبوو عیسا، ئەبوو یەحیا، ئەبوو حوضەیر، ئەبوو عتیک، ئەبولحوصەین)،[1] هەندێ کونیەی شەشەمی بە ئەبووعەتیق دێنن.[2]

ئوسەید یەکێک بوو لەو هاوەڵە پشتیوانیانەی زۆر زوو موسڵمان بوو، موسڵمانبوونی لە پێش موسڵمانبوونی سەعدی کوڕی موعاذ بوو، موسڵمان بوونیشی لەسەر دەستی موصعەبی کوڕی عومەیر بوو.[3]

جارێک ئەسعەد موصعەبی برد بۆ لای بەنی عەبدولئەشهەل تا لەسەر ئیسلام قسەیان بۆ بکات، گەیشتنە ناو باخێکی بنی ظفر و لای بیرێ دانیشتن، بڕێ لە خەڵکی هۆزی ئەسلەم لە دەوریان کۆبوونەوە، هێشتا سەعدی کوڕی موعاذ و ئوسەیدی کوڕی حوضەیر کە گەورەی هۆزەکانیان بوون موسڵمان نەبووبوون، کاتێک قسەکانی ئەسعەدو موصعەبیان بیست سەعد بە ئوسەیدی وت: هەی بێباوک بڕۆ بۆیان، سەیرکە چۆن هاتوونەتە خاکمان تا هەرزەکارەکانمان لەخشتەبەرن، بڕۆ بەریان پێ بگرە و مەهێڵە بێنە ناوچەی ئێمە، ئوسەیدیش بە خەنجەرێکەوە هات، ئەسعەد بە موصعەبی وت: ئەمە گەورەی هۆزەکەیەتی، دێت بۆ لات، راست پەیامی خوای پێ بڵێ، موصعەب وتی: ئەگەر دابنیشێ قسەی لەگەڵ ئەکەم، ئوسەید بە قسەوتنەوە هاتەبەردەمیان، وتی: بۆچی هاتون بۆ لامان تا هەرزەکارەکانمان لەخشتەبەرن، ئەگەر گیانی خۆتانتان لا خۆشەویستە دووربگرن لێمان، موصعەب پێی وت: بۆچی دانانیشیت تا گوێمان لێ بگریت، ئەگەر بەدڵت نەبوو وازدێنین، ئەویش وتی: قسەکەت جوانە، خەنجەرەکەی دەستی داچەقاند بەناو زەویدا و لەبەردەمیاندا دانیشت، موصعەب باسی ئیسلامی بۆ

[1] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٩٢.

[2] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٩٣.

[3] الإصابة في معرفة الصحابة،، ج١، ص٨٣ الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٩٣.

کرد و قورئانی بۆ خوێندەوە، خێرا ئومێدی موسڵمانبوونیان لە روخساریدا بەدیکرد، ئوسەید وتی: چەند جوان و چاک ئەڵێن، باشە ئەگەر بتانەوێ بچنە ناوئەم ئاینە چی دەکەن؟ ئەوانیش پێیان وت: خۆت بشۆ و جلەکانت بشۆ و دواتر شایەتومانی حەق بهێنە و دواتر نوێژ بکە، ئەویش وایکرد، دواتر ئوسەید وتی: من کەسێکم لەدوای خۆم جێهێشتووە ئەگەر ئەویش شوێنتان بکەوێ چی کەسی ناو هۆزەکەی هەیە شوێنتان ئەکەون، ئێستا ئەینێرم بۆ لاتان، ئەویش سەعدی کوڕی موعاذە، ئینجا ئوسەید خەنجەرەکەی هەڵگرت و چوو بۆ لای سەعد و هۆزەکەشی چاوەڕوان بوون، سەعد پێی وت: چیت کرد؟ ئوسەید وتی: من قسەم لەگەڵ کردن بەخوا وای نابینم خراپ بن، ڕێم لێگرتن، ئەوانیش وتیان: چیت پێ خۆشە وادەکەین، بەنی حارثە ویستیان بچن ئەسعەدی کوڕی زورارە بکوژن، ئەشزانن پوورزای تۆیە، وادەکەن وەک سووکایەتی بە تۆ، سەعد بە توورەیی و خێرایی هەستا و چوو بۆ لایان، کە چوو بینی هەردووکیان بێخەم دانیشتون زانی ئوسەید ویستوویەتی گوێیان لێ بگرێ، بە قسەوتنەوە (جنێودانەوە) لەبەردەمیاندا راوەستا، بە ئەسعەدی کوڕی زرارەی وت: بەخوا لەبەر خزمایەتی نێوانمان نەبوایە ئەمەت بەسەردا تێنەئەپەڕی، موصعەب پێی وت: بۆچی دانانیشیت گوێمان لێ بگریت، ئەگەر بەدڵت بوو باشە، ئەگەر بەدڵت نەبوو لێت دووردەکەوینەوە، سەعد وتی: قسەکەت جوانە، دانیشت و خەنجەرەکەی داچەقاند بە زەویداو گوێی لێگرتن، هەمان شتیش بۆ ئەم روویدا، کە سەعد گەڕایەوە، هۆزەکەی وتیان: بەوخوایە سەعد بەدەموچاوێکی ترەوە هاتوەتەوە، کاتێک سەعد گەیشتە لایان وتی: ئەی بەنی عەبدولئەشهەل منتان لا چۆنە؟ وتیان: گەورەو شارەاز و بەڕێزترینی ئێمەیت، ئەویش وتی: دەی دەنگم لە ژن و پیاوتان هەڵدەگرم تا کاتێک باوەر دێنن بە خوا و پێغەمبەرەکەی، بەوە هەرهەموو بەنی عەبدولئەشهەل موسڵمان بوون جگە

لە چەند کەسێ، پاشان ئەسعەد موصعەبی بردەوە بۆ ماڵی خۆیان.[1]

ئەم هاوەڵە لە بەیعەتی عەقەبەدا بەشدار بوو و یەکێک بوو لە نەقیبەکان.[2]

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی کرد بۆ مەدینەو برایەتی خستە نێوان پشتیوانان و کۆچەران، برایەتی خستە نێوان ئوسەیدی کوڕی حوضەیرو زەیدی کوڕی حارثەوە.[3]

ئەبووهورەیرە دەگێڕێتەوە پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو (نِعم الرجل أبو بكر، نِعم الرجل عمر، نِعم الرجل أبو عبيدة بن الجراح، نِعم الرجل أسيد بن حضير، نِعم الرجل ثابت بن قيس، نِعم الرجل معاذ بن جبل، نِعم الرجل معاذ بن عمرو بن الجموح)،[4] (ئەبووبەکر پیاوێکی باشە، عومەر پیاوێکی باشە، ئەبووعوبەیدەی کوڕی جەراح پیاوێکی باشە، ئوسەیدی کوڕی حوضەیر پیاوێکی باشە، ثابتی کوڕی قەیس پیاوێکی باشە، موعاذی کوڕی جەبەل پیاوێکی باشە، موعاذی کوڕی عەمری کوڕی جەمووح پیاوێکی باشە).

سەبارەت بە بەشداربوونی لە غەزای بەدردا راجیایی هەیە، هەندێ دەڵێن بەشدار بووەو هەندێ ناوی لە بەشداربواندا ناهێنن،[5] چونکە هاوەڵان نەیاندەزانی جەنگی بەدر روودەدات.[6]

لە جەنگی ئوحوددا ئوسەید بەشداری کرد و لەو جەنگەدا حەوت جار بریندار کرا،[7] ئوسەید دواتر بەشداری غەزای خەندەق و هەموو غەزاکانی تری کرد.[8]

---

[1] البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص١٥٢-١٥٣.

[2] الإصابة في معرفة الصحابة، ج١، ص ٨٣.

[3] أسد الغابة، ج١، ص١٤٣.

[4] مسند أحمد بن حنبل - مسند أبي هريرة(ﷺ)، الرقم ٩٥٥٦، جامع الترمذي - أبواب المناقب عن رسول الله(ﷺ) - باب مناقب معاذ بن جبل وزيد بن ثابت وأبي وأبي عبيدة بن الجراح(ﷺ)، الرقم ٣٧٩٥ و حسنه، قال شعيب الارناؤوط اسناده قوي، صححه الألباني في السلسلة الصحيحة، الرقم ٨٧٥.

[5] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٩٣.

[6] المستدرک على الصحيحين، الرقم ٥٢٢٤.

[7] الإصابة في معرفة الصحابة، ج١، ص ٨٣.

[8] المستدرک على الصحيحين، الرقم ٥٢٢٤.

لە ڕووداوی ئیفکدا کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) وردەکاری تەواوی کرد بۆ ئەو ڕووداوە، دواتر لەناو هاوەڵە پشتیوانەکانیدا بوو ویستی پۆزشی عەبدوڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول وەربگرێ، بە هاوەڵانی فەرموو: (من يعذرني من رجل بلغني أذاه في أهلي، فوالله ما علمت على أهلي إلا خيرا، وقد ذكروا رجلا ما علمت عليه إلا خيرا، وما كان يدخل على أهلي إلا معي)، (کێ پۆزشم بۆ وەردەگرێ لە کەسێ کە بیستوومەتەوە بە خراپە باسی خێزانەکەمی کردووە، دەی سوێند بەخوا من هەر چاکەی خێزانەکەم دەزانم-واتە چاکەم لێ دیوە- ئەوانە باسی پیاوێکیان کردووە کە بەس خێرو چاکەی لەبارەوە دەزانم، بەتەنها لەگەڵ خۆیشمدا هاتووە بۆ لای خێزانەکانم) سەعدی کوڕی موعاذ هەستاو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بەخوا من ئەوەت بۆ دەکەم، ئەگەر لە ئەوسیەکان بێت ئێمە دەدەین لە ملی، ئەگەریش لەناو برا خەزرەجیەکانماندا بێت فەرمانمان پێبکەیت فەرمانت بەجێدەگەیەنین، سەعدی کوڕی عوبادە کە گەورەی خەزرەجیەکان بوو و پیاوێکی چاک بوو دەمارگیری گرتی، هەستاو وتی: سوێند بەخوا درۆ دەکەیت نایکوژیت و ئەوەشت پێ ناکرێت، ئوسەیدی کوڕی حوضەیریش هەستا و وتی: بەخوا تۆ درۆ دەکەیت، ئێمە دەیکوژین، تۆ دووڕوویت و سەبارەت بە دووڕوان مشتومڕ دەکەیت، هەردوو دەستەی ئەوس و خەزرەج هەستان و خەریک بوو بکەونە وێزەی یەک، پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر مینبەر دابەزی و هێوری کردنەوە..).[1]

جارێک دایکی باوەڕداران عائیشە گەردن بەندێکی لە ئەسماء بە ئیستیعارە وەرگرت، کەچی گەردن بەندەکەی لێ ون بوو، ئەوەبوو پێغەمبەر(ﷺ) هاوەڵێکی خۆی نارد تا بیدۆزێتەوە، ئوسەیدیش یەکێ بوو لەو هاوەڵانە، لەو کاتەدا کاتی نوێژ بوو، ئاویان پێ نەبوو، بۆیە بێ دەستنوێژگرتن نوێژیان کرد، کاتێک گەڕانەوە باسەکەیان گێڕایەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، ئەوەبوو ئایەتی تەیەممووم دابەزی، ئوسەید بە دایکی باوەڕداران عائیشەی

[1] صحيح البخاري - كتاب الشهادات - باب تعديل النساء بعضهن بعضا، الرقم ٢٦٦١.

وت: خوا پاداشتی خێرت بداتەوە، سوێند بەخوا تووشی هەر حاڵێ دەبیت خوای گەورە دەروو لە تۆ دەکاتەوەو دەشیکاتە بەرەکەتێ بۆ موسڵمانان.[1]

لە غەزای طائیفدا کاتێک یەکێک لە کۆیلەکان بە ناوی ئیبراهیمی کوڕی جابر موسڵمان بوو، پێغەمبەر(ﷺ) سپاردیە دەست ئوسەید و رایسپارد تا هاوکاری ماددی بکات و پێویستیەکانی بۆ دابین بکات و زانست و زانیاریشی فێر بکات.[2]

ئەنەسی کوڕی مالیک دەڵێت: لە شەوێکی تاریکدا دوو کەس لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) چوونە دەرو لە بەردەمی ئەو دوو کەسەوە رووناکیەک هەبوو تا ئەو شوێنەی لەیەک جیابوونەوە، کە جیابوونەوە رووناکیەکەش لە نێوانیاندا دابەش بوو و هەر بەشێکی لەگەڵ یەکێکیاندا بوو،[3] هەر لە فەرموودەکەدا هاتووە ئەو دوو کەسە بریتی بوون لە ئوسەیدی کوڕی حوضەیرو عەببادی کوڕی بیشر.[4]

ئیبن عەبدولبەر باس لەوە دەکات عامری کوڕی طوفەیل و زەید چوون بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) تا بڕێک دارخورمایان پێ ببەخشێ، بەڵام ئوسەید رمێکی هەڵگرت و چوو بۆیان و وتی: بڕۆن هەی دوو رێوییەکە، عامر وتی: تۆ کێیت؟ وتی: من ئوسەیدی کوڕی حوضەیرم، وتی: حوضەیری کاتب؟ وتی: بەڵێ، عامر وتی: باوکت لە خۆت باشتر بوو، ئوسەید وتی: من لە تۆیش و لە باوکیشم باشترم، باوکم بە بێباوەڕی مرد.[5]

ئەنەسی کوڕی مالیک دەڵێت: جوولەکەکان کاتێک ئافرەتیان دەکەوتە حەیزەوە نانیان لەگەڵ نەدەخواردن و لە ماڵدا لەگەڵیان دانەدەنیشتن، هاوەڵانی

---

[1] صحيح البخاري - كتاب التيمم - باب إذا لم يجد ماء ولا ترابا، الرقم ٣٣٦.

[2] الإصابة في معرفة الصحابة، ج١، ص١٩.

[3] صحيح البخاري - كتاب المناقب - باب حدثني محمد بن المثنى، الرقم ٣٦٣٩.

[4] صحيح ابن حبان - كتاب الصلاة - فصل في القنوت - ذكر اسم الأنصاري الذي كان مع أسيد بن حضير حيث أضاءت عصاهما لهما، الرقم ٢٠٣٢.

[5] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٩٤.

پێغەمبەر(ﷺ) لەو بارەوە پرسیاریان کرد لە پێغەمبەر(ﷺ)، ئەوەبوو خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند(ويسألونك عن المحيض قل هو أذى فاعتزلوا النساء في المحيض...)، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (اصنعوا كل شيء إلا النكاح)، (هەموو شتێک بکەن جگە لە جووتبوون)، جوولەکەکان ئەمەیان بیست، وتیان: ئەم کابرایە چیەتی، هەرچی ئێمە بیکەین پێچەوانەی ئێمە دەکات، ئوسەیدی کوڕی حوضەیر و عەببادی کوڕی بیشر هاتن و وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا جوولەکە ئاواو ئاوا دەڵێن بۆیە ئێمە لەگەڵ ئافرەتان کۆنابینەوە، پێغەمبەر(ﷺ) ڕەنگی گۆڕا تا ئاستێ وتمان: رقی لەو دوانە هەڵگرتووەو لێیان تووڕە دەبێت، ئەو دوانە چوونە دەرەوەو لەو کاتەدا بڕێ شیر بە دیاری هات بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەریش(ﷺ) ناردی بە شوێنیاندا و ئەوانیش گەڕانەوەو پێغەمبەر(ﷺ) لە شیرەکەی پێدان تا بیخۆنەوە، ئیتر بەوەدا زانیان رقی لێ هەڵنەگرتون.[1]

جارێک ئوسەید هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و باسی هەژاری ماڵێکی پشتیوانانی بۆ کرد، ئەوکات پێغەمبەر(ﷺ) چی خواردنی لابوو دابەشی کردبوو، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: (تركتنا حتى ذهب ما في أيدينا، فإذا سمعت بشيء قد جاءنا فاذكر لي أهل البيت)، (پێت نەوتین تا چی لە دەستماندا هەبوو نەما، ئەمجار بیستت شتێکمان بۆ هاتووە وەرە و ئەو ماڵەم بیربخەرەوە)، دوای ماوەیەک بڕێ خواردن هات بۆ پێغەمبەر(ﷺ) کە گەنم و خورما بوو لە خەیبەرەوە بۆی هاتبوو، زۆربەی کەسەکانی ئەو ماڵە هەژارەش ئافرەت بوون، پێغەمبەر(ﷺ) خواردنەکەی بەسەر خەڵکدا دابەش کرد و بەشی زۆر باشی بۆ ئەو ماڵە دانا، ئوسەید سوپاسی پێغەمبەری(ﷺ) کرد و وتی: (ئەی پێغەمبەری خوا خوای گەورە لەبری ئێمە چاکترین-یان پاکترین- پاداشتت بداتەوە)، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (وأنتم معشر الأنصار فجزاكم الله أطيب الجزاء - أو قال : خيرا - ما علمتكم أعفة صبر، وسترون بعدي أثرة في الأمر والعيش،

[1] صحيح مسلم - كتاب الحيض - باب جواز غسل الحائض رأس زوجها وترجيله وطهارة سؤرها، الرقم ٣٠٢.

فاصبروا حتى تلقوني على الحوض)، (ئێوەش ئەی کۆمەڵی پشتیوانان خوای گەورە چاکترین-یان پاکترین- پاداشتتان بداتەوە، هێندەی من لەسەر ئێوەی بزانم زۆر پاک و خۆڕاگرن، جا دوای من لە دەسەڵات و ژیاندا خۆکاری و بێبەشکردن دەبینن، دەی خۆڕاگر بن تا لەسەر حەوز- حەوزی کەوثەر- پێم دەگەنەوە).[1]

دایکی باوەڕداران عائیشە دەڵێت: جارێک لە گەشتێکەوە دەگەڕاینەوە، کە گەیشتینە زیلحولەیفە، لەوێ منداڵانی پشتیوانان بەخێرهاتنەوەی خەڵکەکەیان دەکرد، کاتێک ئوسەیدیان بینی هەواڵی مەرگی ژنەکەیان پێدا، ئەویش بەکوڵ گریا، منیش پێم وت: سوبحانەڵا، تۆ لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوایت و لەوانەیت زوو موسڵمان بوویت، بۆچی بۆ ژنێک دەگریت؟ ئەویش سەری خۆی رووتکرد و وتی: راست دەکەیت، سوێند بەخوا حەقە دوای مەرگی سەعدی کوڕی موعاذ بۆ مەرگی کەس نەگریم، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) سەبارەت بە سەعد ئەوەی فەرموو کە فەرمووی، عائیشە وتی: بۆ چی فەرمووی؟ وتی: فەرمووی (لقد اهتز العرش لوفاة سعد بن معاذ)، (بەراستی بۆ مەرگی سەعدی کوڕی موعاذ عەرش لەریەوە)، عائیشە وتی: جار هەبوو سەعد لەنێوان من و پێغەمبەردا(ﷺ) رێی دەکرد.[2]

ئوسەید زۆرجار لە خزمەتی پێغەمبەردا(ﷺ) بوو و گوێبیستی فەرموودەکانی بوو و فەرموودەشی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە، زۆرجار لای پێغەمبەر(ﷺ) دەبوو و هاوەڵانی تر دەهاتنە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و پرسیاریان لێدەکرد، ئەوەتا لە گێڕانەوەیەکیدا باس دەکات کاتێک لە

---

[1] السنن الكبرى للنسائي - كتاب المناقب - ذكر خير دور الأنصار(ﷺ)، الرقم ٨٢٨٧، المستدرك على الصحيحين - كتاب معرفة الصحابة(ﷺ) - ذكر فضائل القبائل - ذكر فضائل الأنصار(ﷺ) - سلام النبي على الأنصار عند وفاته، الرقم ٧٠٦٦ وصححه ووافقه الذهبي في التلخيص، حسنه شعيب الأرناؤوط، صححه الألباني في السلسلة الصحيحة، الرقم ٣٠٩٦.

[2] المستدرك على الصحيحين - كتاب معرفة الصحابة(ﷺ) - ذكر مناقب سعد بن معاذ بن النعمان النعمان بن امرئ القيس بن زيد بن عبد الأشهل - قول المنافقين في جنازة سعد وجواب رسول الله، الرقم ٤٩٥٦، صححه و وافقه الذهبي في التلخيص.

خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) بوو یەکێک لە هاوەڵە پشتیوانیەکان هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بۆچی کارێکم پێ ناسپێریت وەک چۆن ئەرک و پلەیەکت سپاردووە بە فلانە کەس؟ پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (ستلقون بعدي أثرة، فاصبروا حتى تلقوني على الحوض)، (دوای من خۆکاری و بێبەشکردن دەبینن، دەی خۆڕابگرن تا لەسەر حەوز پێم دەگەنەوە).[1]

شەوێک ئوسەید لەماڵەوە بوو قورئانی دەخوێند، سەرقاڵ بوو بە خوێندنی سوورەتی بەقەرەوە، ئەسپەکەشی لەنزیکیەوە بەسترابوویەوە، کاتێک قورئانی دەخوێند ئەسپەکەی حیلاندی و بەرز بوویەوە، ئوسەید دەڵێت: منیش لە قورئان خوێندنەکە وەستام، ئەویش بێدەنگ بوو، دووبارە ئوسەید دەستی کردەوە بە قورئان خوێندنەکەی و ئەسپەکەش هەمدی حیلاندی و بەرز بوویەوە، هەمدی ئوسەید بێدەنگ بوو و ئەسپەکەش دامرکایەوەو بێدەنگ بوو، بۆ جاری سێیەم کە قورئانی خوێند ئەسپەکە هەمدی حیلاندی و بەرز بوویەوەو بڕێ جووڵا، یەحیای کوڕی ئوسەیدیش لە نزیک ئەسپەکەوە بوو، ئوسەید ترسا ئەسپەکە یەحیا بشێلێ، کاتێک ئەسپەکەی هیورکردەوە سەری بەرەو ئاسمان بەرزکردەوە و شتێکی بینی، بۆ بەیانی ئوسەید چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و باس وخواسەکەی بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: (اقرأ يا ابن حضير، اقرأ يا ابن حضير)، (بتخوێندایە ئەی ئیبن حوضەیر، بتخوێندایە ئەی ئیبن حوضەیر)، ئوسەید وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ترسام یەحیا بشێلێ، چونکە یەحیا نزیک بوو لە ئەسپەکەوە، کاتێک سەرم بەرز کردەوەو چووم بۆ لای، سەرم بەرەو ئاسمان بەرزکردەوە دەبینم وەک بڵێی سێبەرێ هەبێ شتانێ وەک چراخان دیاربوون، منیش چوومەدەر تا نەیبینم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (دەشتزانی ئەوە چیە؟)، ئوسەید وتی: نا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (تلك الملائكة دنت

[1] صحيح البخاري - كتاب مناقب الأنصار - باب قول النبي للأنصار اصبروا حتى تلقوني على الحوض، الرقم ٣٧٩٢.

لصوتك، ولو قرأت لأصبحت ينظر الناس إليها لا تتوارى منهم)، (ئەوانە فریشتەکان بوون نزیک بووبوونەوە بۆ بیستنی دەنگی تۆ، ئەگەر لە قورئان خوێندنەکەت بەردەوام بوویتایە بەیانیت دەکردەوەو خەڵکی سەیری فریشتەکەیان دەکردو لەبەرچاویان ون نەدەبوون).[1]

ئیبن حوضەیر پیاوچاکێکی رووخۆش و خوێن گەرم و ئێسک سووک بوو، زۆرجار هاوەڵانی بە قسەخۆشەکانی دڵخۆش دەکرد، جارێک ئوسەید لە خزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بوو کە قسەی خۆشی بۆ دەکردن، پێغەمبەر(ﷺ) دای بە کەلەکەیدا، ئەویش وتی: ئازارت دام، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: تۆڵەی خۆت وەرگرەوە، ئوسەید وتی: ئەی پێغەمبەری خوا جا تۆ کراسێکت لەبەرە، بەڵام تۆ کە دات لە من بەسەر کراسەوە لێت نەدام، پێغەمبەریش(ﷺ) کراسەکەی هەڵکرد، ئوسەیدیش باوەشی کرد بە پێغەمبەردا(ﷺ) و ورگی ماچ دەکرد و دەیوت بە دایک و باوکمەوە بەقوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا، ئا ئەمەم ویست.[2]

جارێک ئوسەید نەخۆش بوو، ئەو خۆی بەرنوێژی دەکرد بۆ موسڵمانانی ناوچەکەیان، ماوەیەک نەخۆش کەوت و لەو ماوەی نەخۆشیەیدا بە دانیشتنەوە بەرنوێژی دەکرد بۆ هاوەڵانی، پێغەمبەر(ﷺ) بۆ سەردانی نەخۆشیەکەی چوو بۆ لای، هاوەڵان وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئوسەید پێشەوامانەو نەخۆشیشەو بە دانیشتنەوە بەرنوێژیمان بۆ دەکات، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (فصلوا وراءه قعودا، فإن الإمام ليؤتم به، فإذا صلى قاعدا فصلوا خلفه قعودا)، (دەی ئێوەش بە دانیشتنەوە لە دوایەوە نوێژ بکەن، چونکە پێش نوێژ پێشەنگی پێوە دەکرێت، ئەگەر بە دانیشتنەوە نوێژی کرد ئێوەش بە دانیشتنەوە لە دوایەوە نوێژ بکەن).[3]

---

[1] صحيح البخاري - كتاب فضائل القرآن - باب نزول السكينة والملائكة عند قراءة القرآن، الرقم ٥٠١٨.

[2] سنن أبي داود - كتاب الأدب - أبواب السلام - باب في قبلة الجسد، الرقم ٥٢٢٤، صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن أبي داود، الرقم ٥٢٢٤.

[3] المستدرك على الصحيحين - كتاب معرفة الصحابة(رضي الله عنهم) - ذكر أسيد بن حضير الأنصاري(رضي الله عنه) - إن

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد و لە کەپری بەنی ساعیدەدا قسە دەکرا لەسەر دیاریکردنی خەلیفەیەک، ئوسەید رۆڵێکی دیاری هەبوو لە دەستنیشان کردنی ئەبووبەکری صدیقدا.[1]

ئوسەید لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەططابدا بەشدار بوو لە فەتحی بەیتولموقەددەسدا.[2]

ئوسەید لە سەردەمی خەلیفە عومەری کوڕی خەططابدا وەفاتی کرد،[3] ئەوەش لە ساڵی بیستی کۆچیدا بوو، دەشوترێ بەڵکو لە ساڵی بیست و یەکی کۆچیدا وەفاتی کردووە،[4] عومەری کوڕی خەتتاب خۆی نوێژی لەسەر کرد و لە گۆڕستانی بەقیع ئەسپەردە کرا،[5] ئوسەید پێش مردنی وەسیەتی کرد بۆ خەلیفە عومەری کوڕی خەططاب سەرپەرشتی ئیش و کاری بکات، خەلیفەش دارخورماکانی ئوسەیدی بە چوار ساڵ فرۆشت بە چوار هەزار دینار و قەرزەکانی پێ دایەوە.[6]

دایکی باوەڕداران عائیشە دەڵێت: ئوسەیدی کوڕی حوضەیر یەکێک بوو لە کەسە چاک و هەڵکەوتەکان، ئوسەید دەیوت: ئەگەر من هەمیشە وەک ئەو سێ حاڵەتە دەبووم کە جارجارە هەمە، بە دڵنیاییەوە لە ئەهلی بەهەشت دەبووم، گومانیشم لەوە نەدەبوو، کاتێک قورئان دەخوێنم و کاتێک گوێی لێدەگرم، کاتێک گوێ لە وتاری پێغەمبەر(ﷺ) دەگرم، کاتێک لەگەڵ تەرمێکدا دەچم، چی جار لەگەڵ تەرمێکدا چووبم بە دەروونی خۆمم وتووە ئەرێ ئەمە چی پێ دەکرێ و چی بەسەر دێ.[7]

---

الإمام ليؤتم به، الرقم ٥٣٠٠، صححه ووافقه الذهبي في التلخيص.

[1] أسد الغابة، ج١، ص١٤٣.

[2] أسد الغابة، ج١، ص١٤٣.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٨٣

[4] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٩٤.

[5] المستدرک على الصحيحين، الرقم ٥٢٢٣.

[6] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٩٤.

[7] شعب الإيمان للبيهقي، الرقم ٨٩٤٠، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٨٣٤.

**پەند و وانە:**

⌘ گەشبینی سیفەتێکی جوانە و پێویستە تاکی موسڵمان بەو جۆرە بیر بکاتەوە، زۆرن کەسانێ هەمیشە بە رەشبینی دەڕواننە ژیان و هەردەم وادەزانن رێڕەوی ژیان دژ بە ئەوانە، بەڵام وەک لە نموونەی گەردن بەندەکەوە دەبینین ئەو ونبوونە بوو بە مایەی خێر تا رێژۆشنی زیاتر ببەخشێ بە موسڵمانان، ئەوەش هێمای گەشبینی ئوسەیدە کە خێرا بە دیدی خێرو بەرەکەت سەیری رووداوەکەی کرد.

⌘ نەرمونیانی سەرکردەی موسڵمانان پێویستیەکی زۆر گرنگەو پێشەوای مرۆڤایەتیش لەوەدا نموونەی باڵا بووە، خوای گەورەش لەو بارەیەوە دەفەرموێت (ولو كنت فظا غليظ القلب لانفظوا من حولك فاعف عنهم واستغفر لهم و شاورهم في الأمر)،[1] دەبینین بە قەناعەتی ئەو خەڵکە بوایە دەبوو پێغەمبەر(ﷺ) لەو دوو هاوەڵە توورە بێت کاتێک بڕیارێکیان دا نەیار بە بڕیاری پێغەمبەر(ﷺ)، کەچی پێغەمبەر(ﷺ) نەک هەر لێیان توورە نەبوو، بەڵکو بانگی کردنەوە تا بەشداریان بکات لە خواردنەوەی شیردا، هەم لەو خۆشیەدا بەشدار بن، هەم بزانن پێغەمبەری خوا(ﷺ) دڵسۆزی ئەوانە، هەم ئاکاری نەرمونیانی و چاوپۆشی و لێبوردەیی فێری هاوەڵانی بکات.

⌘ نەرمونیانی لە بانگەوازدا هۆکارێکی گرنگی سەرخستنی بانگەوازە نەک هۆکاری تەنازول و دەستبەرداری، ئەگەر نەرمونیانی و لەسەرخۆیی موصعەب و ئەسعەد بەرامبەر بە سەعد و ئوسەید نەبوایە، ئەو سەرکەوتنە گەورەی موسڵمانبوونی خۆیان و هۆزەکەشیان نەدەهاتەدی، بۆیە کاتێک زۆر بە نەرمی وەڵامی رەقی ئەوانیان دایەوە، زبری نابەجێی ئەوانیشیان نەهێشت و بوونە هۆکاری رێنمووونیشیان.

---

[1] آل عمران: ١٥٩.

⌘ رای دروست و هەنگاوی پێویست لەوەدایە ئاگاداری نارەحەتی و ئازاری هەژاران و خاوەن نەهامەتیەکان بین و کارئاسانییان بۆ بکەین، وەک چۆن ئوسەید پاش زانینی حاڵی سەختی ئەو خێزانە پشتیوانیە وازی نەهێنا تا بوویە هۆکاریٚ بۆ کارئاسانی بۆیان.

⌘ ڕووخۆشی و وتەی بزەبەخش لەلایەن کەسی موسڵمانەوە ئاکارێکی جوان و باڵایەو ئەو گومانە نارەواش بەرپەرچ دەداتەوە گوایە موسڵمان روانینێکی رەشبینی هەیە بۆ ژیان، وا وێنا دەکرێت موسڵمان هەمیشە دەبێت لە نارەحەتی و ناخۆشیدا بێت، نەخێر ئەوە روانینی ئیسلام نیە، کاتێک بەراوردی نێوان ئایینەکان دەکەین ئەو جیاوازیە بەروونی دەبینین، جولەکایەتی تەنها دنیای لەبەرچاوەو روانینێکی ماددی و دنیاپەرستی هەیەو بڕوای نیە بە رۆژی دوایی، مەسیحیەت تەنها بیری لای رۆحەو هەموو خۆشیەکانی دنیا بە نارەواو حەرام دەزانێت، جەستە هیچەو دەبیٚ سزا بدریٚ چونکە جەستە ڕێگری خۆشبەختی گیانە، گیان تاکە ئامانجە، جەستەو گیان پێکەوە نایانکریٚ، بۆ مانەوەی یەکێکیان دەبیٚ ئازاری ئەوی تریان بدەیت، بۆیە ئازاردانی جەستە مەرجە بۆ حەسانەوەی ڕۆح، ژیانی دنیا هیچ نرخێکی نیەو تەنها ژیانی ڕۆژی دوایی گرنگە، چێژوەرگرتن لە دنیا تاوانە، هەموو مرۆڤیٚ بە تاوانباری دێتە دنیاو کەسیش ناتوانیٚ ڕاستەوخۆ خوا بدوێنیٚ، بەڵام ئیسلام خۆشی دنیاو قیامەتی پێکەوە پەیوەست کردووەو ڕووخۆشی و نەرمونیانی و قسەخۆشی بە ئاکاری پەسەند داناوە، نابێت جەستە و رۆح مافی یەکدی بخۆن و هەردووکیان خوازراون، دنیا و دوارۆژ هەردووکیان جێی حەسانەوەی مرۆڤن، دنیا حەسانەوەی کاتی و رۆژی دواییش حەسانەوەی هەمیشەییە، بۆیە دەبینین هاوەڵان قسەی خۆش و خەندەیان هەبووەو پێغەمبەریش(ﷺ) خۆی بەشداری کردووە لەگەڵیاندا، نموونەی لەم جۆرەش لە ژیانی هاوەڵاندا زۆرزۆرە.

⌘ ئـەم هەنـگاوەی پێغەمبـەر(ﷺ) کـە ئیبراهیمـی کۆیلـەی تـازە موسـڵمان بووی دایە دەست ئوسـەید تـا هـەم پێویستی دابین بکات و هـەم زانستی پێ ببەخشێت، دوو لایەنی گرنگی لەخۆگرت، ئەویش بریتیە لە دڵخۆشی و پاڵپشتی ماددی بۆ برا موسڵمانەکەت، هاوکات تێرکردنی بە زانیاریە پێویستیەکانی ئیسلام، واتە دڵنیاکردنی پێویستیە دنیاییەکان بۆ تاکی تازەموسڵمان بوو و لەگەڵ ئەوەشدا شارەزاکردنی بە ئیسلام، هەرچەندە حاڵەکە حاڵەتی جەنگ بوو، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) ئەو بەرنامەی پشتگوێ نەخست، ئەمەش سیفەتی سەرکردەیە کە دەبێت بیری لای دنیا و قیامەتی تاکەکانی ناو کۆمەڵگە بێت و بە کردەیی وانەی برایەتی ئیمانییان پێ پەیڕەو بکات تا تێبگەن خوای گەورە ئەم برایەتیەی لا لەپێشترە، برایەتیەک نا کە لە زار و دڵەکان زیاتر هیچ نەبێت، بەڵکو زار و دڵ و کرداریشی لەخۆگرتووە.

⌘ بڕوابوونی تەواومان بە بوونی فریشتەکان بەشێکە لە بیروباوەڕی تاکی موسڵمان و بە حاشاکردن یان گومان بوونمان لەوە لە ئیسلام دەچینە دەرەوە، فریشتەکان دروستکراوی خوان کە لە رووناکی دروستکراون و لە فەرمانی خوا دەرناچن و دڵسۆزو پاڵپشتی موسڵمانانن، ئەوان لە نزای خێردا موسڵمانان لەبیر ناکەن، هەربەشێک لە فریشتەکان ئەرکێکیان پێ سپێردراوە، بەشێک لە فریشتەکان گەڕۆکن و بەسەر زەویدا دەگەڕێن و کۆڕەکانی پەرستش بەسەر دەکەنەوە، بینینی فریشتەکانیش لە سەردەمی هاوەڵاندا چەندین نموونەی لەسەرە، وەک بینینی جبرەئیل(علیه السلام)، ئەمەش نموونەیەکە کە فریشتەکان هاتون تا گوێ بگرن لە قورئان خوێندنی هاوەڵێکی پێغەمبەر(ﷺ).

⌘ ژیان لەگەڵ قورئاندا جوانی و چێژی ژیانە، هێندە بەسە ساتەکانی ژیانت لەگەڵ فەرمایشتی خوادا بەسەر بەریت، خوێندن و گوێگرتن لە قورئان جگە لەوەی پاداشتی زۆری رۆژی دوایی لێ بەدەست دێت، زانستێکی

زۆری بێگومـان دەبەخشـێ، هـاوكات سـوكنایی بـە دڵەكانیش دەدات وەک خـوا دەفەرموێـت (ألا بذكر الله تطمئن القلوب)،[1] هەروەهـا مایـەی خۆشـبوونی ژیانـی ئـەو كەسـەیە، وەک خـوا دەفەرموێت (من عمل صلحا من ذكر أو أنثى فلنحيينه حيوة طيبة ولنجزينهم أجرهم بأحسن ما كانوا يعملون)،[2] بـە دڵنیاییـەوە قورئـان خوێنـدن و گـوێ گرتـن لـە قورئانـی پیرۆزیـش ئەوپـەڕی كاری چاكەیـە، دەكرێ ئـەو فەرموودەیـە بكەینـە بەڵگـە كـە پێغەمبـەر(ﷺ) دەفەرموێـت (خيركم من تعلم القرآن وعلمـه).[3]

⌘ بیركردنـەوە لـە مـردن و هەوڵـدان بـۆ خۆئامادەكردن بـۆ مـردن و ژیانـی پـاش مـەرگ كارێكـە پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمانـی پـێ كـردووە وەک دەفەرموێـت (أكثروا من ذكر هاذم اللذات)،[4] زۆر بیـری لەناوبـەری چێـژەكان بكەنـەوە كـە مەبەسـتی پێـی مردنـە، هەروەهـا كاتێـک لـە لێواری گۆڕێكدا بـوو بـە هاوەڵانـی فەرمـوو: (لمثل هذا اليوم فأعدوا)،[5] (بـۆ ڕۆژێكـی ئـاوا خۆتـان ئامـادە بكـەن)، مـادەم مـەرگ دێتـە ڕێـی هەموومـان و سـەرەتای چوونـە نـاو ژیانێكـی نوێیـە بۆیـە زۆر پێویسـتە بەجوانـی لێـی ڕامێنیـن و خۆمـان ئامـادە بكەیـن، چونكـە بـە هاتنـی ئیـدی دەرگای كاركـردن و هەوڵـدان بـۆ ژیانـی ڕۆژی دوایـی دادەخرێـت، چاكتریـن كاریـش ئەوەیـە بنەوینـە ئـەو كارانـەی بەرهەمەكەیـان (صدقـة جاريـة) پاداشـتی نەبڕاوەیـە، ئەمـەش لـە فەرمایشـتی پێغەمبـەردا(ﷺ) باسـی كـراوە.

---

[1] الرعد: ٢٨.

[2] النحل: ٩٧.

[3] صحيح البخاري - كتاب فضائل القرآن - باب خيركم من تعلم القرآن وعلمه، الرقم ٥٠٢٧.

[4] جامع الترمذي - أبواب صفة القيامة والرقائق والورع عن رسول الله(ﷺ) - الرقم ٢٤٦٠، صحيح ابن حبان - كتاب الجنائز وما يتعلق بها مقدما أو مؤخرا - فصل في ذكر الموت - ذكر إكثار المصطفى(ﷺ) في القول لما وصفنا، الرقم ٢٩٩٥، حسنه شعيب الأرناؤوط، حكم عليه الألباني في صحيح و ضعيف سنن الترمذي ٢٣٠٧ ب(حسن صحيح).

[5] مسند أحمد بن حنبل - أول مسند الكوفيين(ﷺ) - حديث البراء بن عازب(ﷺ)، الرقم ١٨٨٣٤، حسنه الألباني في صحيح و ضعيف الجامع الصغير، الرقم ١٣٨٠٢.

## ٢٤٥. ئوسەیدی کوڕی یەعمور(رضي الله عنه):

راجیایی هەیە ئایا ناوی ئوسەیدە یان ناوی ئەسەدە،[1] کوڕی یەعموری کوڕی وەهیبی کوڕی ئەصرەمەو لە خوزاعەیە، ناسراوە بە نعیت، لە فەتحی مەککەدا چەند دێرە شیعرێکی سەبارەت بە پێغەمبەر(ﷺ) وتووە.[2]

## ٢٤٦. ئوسەیدی جەعفی(رضي الله عنه):

ئیبن حببان پێی وایە لە تابعینە و دەڵێت: ئەو فەرموودەی گێڕاویەتیەوە لە هاوەڵێکی بیستووە نەک خۆی هاوەڵ بێت، بەڵام ئیبن حەجەر پێی وایە هاوەڵە چونکە لە گێڕانەوەی فەرموودەکەدا دەڵێت: (كنت عند النبي) من لای پێغەمبەر(ﷺ) بووم، پێغەمبەر(ﷺ) نامەی نووسی بۆ خەڵکی طائیف کە خواردنەوەی (غبیراء) حەرامە،[3] راکەی ئیبن حەجەریش راستترە.

## ٢٤٧. ئوسەیدی کوڕی ساعیدە(رضي الله عنه):

ناوی ئوسەیدی کوڕی ساعیدەی کوڕی عامرە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە، بەشداری کرد لە جەنگی ئوحوددا.[4]

ئوسەید کوڕێکی هەبوو بە ناوی یەزید کە لەگەڵ خۆیدا لە غەزای ئوحوددا بەشداری پێکرد.[5]

ئوسەید برایەکیشی هەبوو ناسرابوو بە ئەبی حەثمە، ئەم برایەشی لە غەزای ئوحوددا بەشداری کرد.[6]

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٨٥.

[2] الإصابة في معرفة الصحابة، ج٦، ص٤٥٥.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٨٥.

[4] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٩٥، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٨٤.

[5] أسدالغابة، ج٥، ص ٤٩٢.

[6] أسدالغابة، ج٥، ص ٤٩٢.

ژنەکەی ناوی حەبابە بوو و ناسرابوو بە ئوم عامر، ئەم ژنەی موسڵمان بووو بەیعەتی دا بە پێغەمبەر(ﷺ).[1]

## ٢٤٨. ئوسەیدی کوڕی ظهیر(رضي الله عنه):

ناوی ئوسەیدی کوڕی ظهیری کوڕی رافعە و لە پشتیوانانە،[2] کونیەکەی ئەبوو ثابتە،[3] باوکی یەکێک بوو لە بەشداربوانی بەیعەتی عەقەبەی دووەم،[4] خۆیشی و باوکیشی هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوون،[5] لە جەنگی ئوحوددا ویستی بەشداری بکات بەڵام تەمەنی کەم بوو و رێی پێنەدرا بەشداری بکات، لە جەنگی خەندەقدا بەشداری کرد،[6] لە سەردەمی خیلافەتی عەبدولمەلیکی کوڕی مەرواندا کۆچی دوایی کرد.[7]

دایکی ناوی فاطیمەی کچی بیشرە، ئوسەید چەند منداڵێکی لە چەند ژنێکی هەبوو، لە ئومامەی ژنی کە کچی خودەیج بوو ئەم مندالانەی هەبوو (ثابت، موحەممەد، ئوم کلثوم، ئوممولحەسەن)، لە زەینەبی ژنی کە کچی وەبرە بوو ئەم مندالانەی هەبوو (سەعد، عەبدورەحمان، عوثمان، ئوم رافع)، هەروەها عوبەیدوڵای کوڕی کە دایکی ئوم وەلەد بوو، واتە کەنیزەکی ئوسەید بوو، لە ئوم سەلەمەی ژنی کە کچی عەبدوڵای کوڕی ئەبوو مەعقەل بوو عەبدوڵای هەبوو.[8]

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج ٨، ص٣٢٩.
[2] معجم الصحابة لابن قانع، ج١، ص ٤٠.
[3] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٩٥
[4] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج ٨، ص٣٢٩، الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٢، ص٧٧٨
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٨٤
[6] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص٣٦٩.
[7] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٨٤.
[8] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص٣٦٩.

## ٢٤٩. ئوسەیدی کوڕی کەعب(ﷺ):

ناوی ئوسەیدی کوڕی ئەسەدی کوڕی کەعبی قورەیضیە،[١] برای ئەسەدی کوڕی کەعبی قورەیضیە، واتە جوولەکە بوو، لە کاتی گەمارۆدانی بەنو قورەیضەدا ئەسەدی کوڕی کەعب لەگەڵ چەند کەسێکی تردا موسڵمان بوون، ئوسەیدیش لەگەڵ براکەیدا موسڵمان بوو.[٢]

## ٢٥٠. ئوسەیدی کوڕی یەربووع(ﷺ):

ناوی ئوسەیدی کوڕی یەربووعی کوڕی بەدری کوڕی عامری کوڕی عەوفە، لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان،[٣] ئیبن ئەثیر ئەگەرێک دادەنێت کە لەگەڵ ئەسعەدی کوڕی یەربووعدا برا بن.[٤]

لە جەنگی ئوحوددا بەشدار بوو،[٥] لە دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) ژیاوە تا لە جەنگی یەمامەدا شەهید بوو.[٦]

## ٢٥١. ئوسەیر(ﷺ):

ناوی ئوسەیری کوڕی عەمری کیندیە،[٧] فەرموودەیەکی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە کە دەفەرموێت (لا يأتيك من الحياء إلا خير)،[٨] (شەرم و حەیا تەنها خێرت دێنێتەڕێ).

کاتێک یەزیدی کوڕی موعاویە دەسەڵاتی گرتەدەست، بڕێ لە موسڵمانان

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٨٤

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٥٣.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٨٥.

[٤] أسد الغابة، ج١، ص ١١٤.

[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٨٥.

[٦] البداية والنهاية، ج٦، ص٣٤٠.

[٧] معجم الصحابة لابن قانع، ج١، ص ٥٤.

[٨] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٨٥.

چوون بۆ لای ئوسەیر، ئوسەیر پێی وتن: خەڵکی دەڵێت: یەزید چاکترین و زاناترین و خانەدان ترین کەسی ئوممەتی موحەممەد(ﷺ) نیە، منیش هەر وا دەڵێم، بەڵام سوێند بەخوا ئەگەر ئوممەتی پێغەمبەر(ﷺ) یەکدەنگ بن زۆر لام خۆشترە لەوەی دووبەرەکی لەنێویاندا رووبدات، ئەگەر دەرگایەک ئوممەتی موحەممەد(ﷺ) پیایدا بچنەژوورەوە رێ هەبێت پیایدا بچنە ژوورەوە ئایا رێی نابێت بۆ چوونەژوورەوەی یەک کەس بە تەنها؟ وتمان، نا، وتی: ئەی ئەگەر هەموو ئوممەتی موحەممەد(ﷺ) یەک یەک بڵێن من خوێنی براکەم نارژم و سامانی نابەم، ئایا بۆیان گونجاو نیە؟ وتیان: بەڵێ، وتی: دەی منیش ئەوەتان پێ دەڵێم، پاشان وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (لا يأتيك من الحياء إلا خير)، (شەرم و حەیا تەنها خێرت دێنێتەرێ)، یەکێک لە ئامادەبوان وتی: لە چیرۆک و بەسەرهاتی لوقماندا هاتووە شەرم و حەیا هەندێکی لاوازی و هەندێکی چاکەو نەرمونیانیە، ئوسەیر تووڕە بوو و راپەڕی و بە تووڕەییەوە وتی: لە ماڵەکەم بچنە دەرەوە، لە ماڵەکەم بچنەدەرەوە، بۆچی هاتون بۆ لام؟ حەمید کە ئامادەبووی ئەو کۆڕە بوو دەڵێت: زۆر هەوڵم دا لەگەڵی تا ئارام بوویەوە، دواتر ئێمەش چووینە دەرەوە.[1]

## ٢٥٢. ئوسەیر(ﷺ):

راجیایی هەیە سەبارەت بە ناوی، ئیبن حەجەر بە ئوسەیری کوڕی جابری کوڕی سەلیمی کوڕی حەیانی تەمیمی ناوی دێنێ،[2] ئیبن عەبدولبەر بە ئوسەیری کوڕی عەمری کوڕی جابری موحاریبی هێناویەتی و دەڵێت: بە ئوسەیری کوڕی جابر و یەسیری کوڕی جابریش ناوی هاتووە، کونیەکەشی بە ئەبولخیار دێنێ،[3] لە سەروبەندی کۆچکردنی پێغەمبەر(ﷺ)

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص ٦٧.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٨٦.

[3] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٠٠.

بۆ مەدینە لەدایک بوو، لە تەمەنی هەشتاو پێنجساڵیدا کۆچی دوایی کرد.[1]

ئەبوونوعەیم و ئیبن مندە ئوسەیری کوڕی جابرو ئوسەیری کوڕی عەمر بە دوو کەسی جیا دەزانن.[2]

## ٢٥٣. ئوسەیری کوڕی عەمر(رضي الله عنه):

ناوی ئوسەیری کوڕی عەمری کوڕی قەیسی کوڕی مالیکی کوڕی عەددیە، لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان لە بەنی نەججار،[3] باوکی ناسراوە بە ئەبوو خاریجە، دایکیشی ناوی ئامینەی کچی عەجرەیە.[4]

دەشوترێ ناوی ئوسەیدە یان ئەنەس یان ئونەیس یان سیبرە، بەڵام زیاتر بە کونیەکەی ناسراوە کە ئەبوو سولەیطە.[5]

کوڕێکی هەبوو بە ناوی عەبدوڵا کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە.[6]

ئوسەیر بەشدار بوو لە غەزای بەدردا،[7] لە غەزاکانی تریشدا لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) بەشداری کرد.[8]

## ٢٥٤. ئوسەیری کوڕی عەمری کوڕی سەیار(رضي الله عنه):

ناوی ئوسەیر یان یەسیری کوڕی عەمری کوڕی سەیاری کوڕی دەرمەکەیە، ئیبن حەجەر ئەم هاوەڵە بە جیا دادەنێت لەگەڵ ئوسەیری کوڕی عەمردا کە پێشتر هێنامان، دەشڵێت هەندێ ئەو دوانە تێکەڵ دەکەن.[9]

---

[1] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٠١.
[2] أسد الغابة، ج١، ص١٤٨
[3] أسد الغابة، ج١، ص١٤٨.
[4] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٤، ص١٦٨٣.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص١٨٩.
[6] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٤، ص١٦٨٣.
[7] أسد الغابة، ج١، ص١٤٨.
[8] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٤، ص١٦٨٣.
[9] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٦، ص٦٨٣.

## ٢٥٥. ئوسەیری كوڕی عوروە(رضي الله عنه):

ناوی ئوسەیری كوڕی عوروەی كوڕی سوادی كوڕی هەیثەمی ئەنصاریە،[1] دەشوترێ ناوی باوكی عەمر بووە، كەسێكی زمان پاراوو رەوانبێژ بوو.[2]

ژنەكەی ناوی حەبیبەی كچی موعەتەبە، بە ئوم حەبیب ناسراوە، حەبیبە موسڵمان بوو و بەیعەتی دا بە پێغەمبەر(ﷺ)، كوڕێكیان هەبوو بە ناوی ئەبووبوردە.[3]

لە پشتیوانانە لە ئەوسیەكان،[4] بەشداری كرد لە غەزای ئوحود و غەزاكانی دواتریشدا، لە جەنگی نەهاوەندا كوژرا.[5]

بەپێی گێڕانەوەیەک ئایەتی (إنا أنزلنا إليك الكتاب بالحق لتحكم بين الناس بما أراك الله ولا تكن للخائنين خصيما... إن الله لا يحب من كان خوانا أثيما) لەسەر ئوسەیر دابەزیوە، ئیبن عەبدولبەر دەڵێت: دوای دابەزینی ئایەت لەسەری ئوسەیر تۆمەتبار كرا بە دووروویی. [6]

لە تەفسیری ئیبن كەثیردا سەبارەت بە ئایەتی (لهمت طائفة منهم أن يضلوك وما يضلون إلا أنفسهم وما يضرونك من شيء) هاتووە دەڵێت: واتە ئوسەیری كوڕی عوروەو هاوەڵانی كاتێک دژ بە قەتادەی كوڕی نوعمان ستایشی بەنو ئوبەیرقیان كرد و سەركۆنەی قەتادەی كوڕی نوعمانیان كرد، تۆمەتباركردنی قەتادەش لەلایەن بەنوئوبەیرقەوە وا نەبوو كە لای پێغەمبەر(ﷺ) باسیان كرد.[7]

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٨٦.

[2] أسد الغابة، ج١،ص ١٤٧.

[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٣٤٣.

[4] أسد الغابة، ج١،ص ١٤٧.

[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٨٦.

[6] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٩٩-١٠٠.

[7] تفسير ابن كثير: ج١، ص٥٥٥.

ڕووداوەکەش بەمجۆرە بوو: بەنی ئوبەیرق ماڵێک بوون لە نزیک ماڵی قەتادەی کوڕی نوعمانەوە، بەنی ئوبەیرق بریتی بوون لە بیشر و بەشیر و موبەشیر، بەشیر کەسێکی دووڕوو بوو و شیعری دژ بە هاوەڵان دەوت: و دواتر شیعرەکەی دەدایەوە پاڵ کەسێکی تر، زۆر دەستڕۆیش نەبوون و هەژار بوون،...ڕەفاعەی کوڕی زەید کە مامی قەتادە بوو لە کاروانێکی شام بڕێ خواردنی کڕی و لەناو گۆزەیەکدا داینا و بڕێ چەکیشی لەگەڵدا بوو، شەو خواردن و چەکەکان برابوون، بۆ بەیانی ڕفاعە هات و و وتی: برازاکەم ئەمشەو شتەکانمان براون، دوای پرسیارکردن وتیان: بینیمان ئەمشەو بەنی ئوبەیرق ئاگریان کردبوویەوەو وادەزانین خواردنەکەی ئێوەیان بردبوو، بەنوئوبەیرق وتیان: بەخوا ئێمە لوبەیدی کوڕی سەهل شک ئەبەین کە پیاوچاک و ئیماندار بێت، با مەسەلەکە ببەینەوە لای ئەو، چونکە گومان بەو نابرێت، لوبەید کە ئەوەی بیست شمشێری هەڵکردو وتی: من دزی بکەم؟ بەخوا دەبێت ئەو دزە دەربکەوێت یان ئەم شمشێرە خوێنتان تێکەڵ دەکات، ئەوانیش بێباکی خۆیان نیشان دا، دواتر ڕفاعە بە قەتادەی وت: برازا بڕۆ بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش چوو و بەسەرهاتەکەی گێڕایەوە کە دزی لە ڕەفاعەی مامی کراوە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا گوێمان لە خواردنەکە نیە، بەڵام با چەکەکانمان بۆ بگێڕنەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: فەرمان دەکەم بەوە، کاتێک بەنو ئوبەیرق ئەوەیان بیست چوون بۆ لای کەسێک کە ناسرابوو بە ئوسەیدی کوڕی عوروە (ئوسەیری کوڕی عوروە)، لەوبارەیەوە قسەیان لەگەڵ کرد و چەند کەسێ لەسەر ئەوە ڕێککەوتن و چوون بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا قەتادە و ڕفاعەی مامی کەسێکی ئێمەیان تۆمەتبار کردووە کە پیاوچاک و باوەڕدارە و بێ بەڵگە تۆمەتی دزی دەدەنە پاڵ، قەتادە چوویەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و ئەویش پێی فەرموو: ڕووت کردوەتە کەسانێک کە

باسی چاکەو باوەڕدارییان دەکرێت، تۆمەتی دزییان دەدەیتە پاڵ بێ هیچ بەڵگەیەک، قەتادە گەڕایەوەو وتی: خۆزگە برێ لە سامانم بفەوتایە بەڵام لای پێغەمبەر(ﷺ) قسەم نەکردایە، رەفاعەی مامی هات و وتی: برازا چیت کرد، ئەویش بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە، رفاعە وتی: خواپشت و پەنایە، ئەوەبوو هێندەی نەبرد ئایەت دابەزی (إنا أنزلنا إليک الكتاب بالحق لتحكم بين الناس بما أراک الله ولا تكن للخائنين خصيما....)، دوای ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) چەکەکەی لەوانە سەندەوەو گەڕاندیەوە بۆ رفاعە.[1]

هەرچەندە ئیبن عەبدولبەر دەڵێت: بەهۆی ئەو تاوانەوە تۆمەتبارکراوە بە دووڕوویی، بەڵام ئیبن حەجەر وتەی ئیبن قەداحی هێناوە کە لە هەموو غەزاکاندا بەشداری کردووەو دوای سەردەمی پێغەمبەریش(ﷺ) بەشدار بووە تا لە جەنگی نەهاوەندا شەهید بووە،[2] هاوکات بەپێی گێڕانەوەکە سەرکۆنەی سەختی خوا بەرامبەری دابەزیوە، بەڵام بڕیاردان لەسەر ئەوەی دووڕووە سەختە، چونکە تەنها لەسەر ئەو رووداوە ئەو تۆمەتەی بەرەو رووکراوەتەوە.

**پەند و وانە:**

⌘ خۆپاراستن لە پشتگیریکردنی هەر ناهەقیەک، چونکە لە ئیسلامدا هەواداری و پاڵپشتی تەنها بۆ حەقە نەک بۆ خوێن یان رەگەز یان هەر رێڕەوێکی تر وەک خوای گەورە دەفەرموێت (يا أيها الذِين آمنُواْ كُونُواْ قوامِين لِلهِ شُهداء بِالْقِسْطِ ولا يجْرِمنكُمْ شنآنُ قوْمٍ على ألا تعْدِلُواْ اعْدِلُواْ هُو أقْربُ لِلتقْوى واتقُواْ الله إن الله خبِيرٌ بِما تعْملُون)،[3] بۆیە پشتگیریکردنی ناڕەوای ئوسەیر بۆ کەسانێکی ناپاک تەنها لەبەر بوونی خزمایەتی، بوویە هۆی ئەوەی خوای گەورە

---

[1] جامع الترمذي - أبواب تفسير القرآن عن رسول الله(ﷺ) - باب ومن سورة النساء، الرقم ٣٠٣٦، حسنه الألباني في صحيح و ضعيف سنن الترمذي، الرقم ٣٠٣٦، تأريخ المدينة لابن شبة، الرقم ٧١٥، تفسير ابن كثير: ج١، ص٥٥٣.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٨٦

[3] المائدة : ٨

سەرزەنشتی بکات، ئەگەرچی لەم رۆژگارەدا نموونەی لەم جۆرە زۆرزۆر بووە و خەڵکانێکیش ئەوە بە سادە تەماشا دەکەن، دەبێت بزانین خوای گەورە لەسەر رووداوێکی وا ئایەتی دابەزاند، پشتگیریکردنی براکەت واجبە چی لەسەر هەق بێت یان ناهەق وەک پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی (**انصر أخاك ظالما أو مظلوما**)، بەڵام تێگەیشتن لێی گرنگە، براکەت سەربخە ئەگەر ستەم لێکراو بوو، ئەگەریش ستەمکار بوو سەری بخە بە نیشاندانی رێی حەق و راستی و دوورخستنەوەی لەو ستەمە، واتە هەق پێوەرو بنەڕەتە بۆ پشتگیری تاک و کۆمەڵەکانیش بۆ یەکدی.

⌘ هەموو بڕیارە دنیاییەکان راست نین و زۆرجار کارتێکەرە جۆراوجۆرەکان دەبنە هۆکار تا راستیەکان ون بن، بەتایبەت بەهێزی لە قسەکردن و زمانپاراوی یەکێک لە دوو لایەنەکە، دەبینین پێغەمبەر(ﷺ) خەریک بوو بە فێڵ و پیلانی بەنو ئوبەیرق بڕیارێ بدات کە هەقیقەتی تیادا دەرنەکەوێت چونکە پێغەمبەر(ﷺ) ئاگاداری نهێنیەکان نەبوو و نهێنیەکان تەنها لای خودان، بەنو ئوبەیرقیش بە فێڵ و پیلان راستیەکەیان شاردبوویەوە، بۆیە خوای گەورە راستیەکەی ئاشکراکرد و حەق گەڕایەوە بۆ خاوەن حەق، پێغەمبەریش(ﷺ) خۆی لە فەرموودەی تردا ئاماژەی بەوە داوە قسەزانی کەسەکان کاردەکاتە سەر راستی رووداوەکان وبڕیاردان لەسەریان وەک دەفەرموێت (**إنكم تختصمون إلي ولعل بعضكم ألحن بحجته من بعض فمن قضيت له بحق أخيه شيئا بقوله فإنما أقطع له قطعة من النار فلا يأخذها**)،[1] (ئێوە بۆ دادوەری کێشەکانتان دێنە لام، لەوانەیە یەکێکتان لە بەڵگەهێنانەوەدا قسەزانتر بێت لەوی ترتان، جا هەر کەس بەرامبەر بە براکەی لەسەر قسەی ئەو بڕیارێکم بۆ دا، ئەوە من پارچەیەک ئاگرم بۆ بڕیوەتەوە، دەی با وەری نەگرێت).

---

[1] صحيح البخاري، الرقم ٢٥٥٥ و ٦٧٦٨، صحيح مسلم، الرقم ٣٣١٧، سنن الترمذي، الرقم ١٢٩٦، سنن ابن ماجة، الرقم ٢٣١٤، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٥٧٩٧.

## ٢٥٦. ئوشەیم(رضي الله عنه):

ئوشەیمی ضیبانی لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) بە هەڵە کوژرا.[١]

ضەحاکی کوڕی سوفیان دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) نامەی بۆ نووسیم تا لە خوێن بایی ئوشەیمی ضیبابی میرات بدەم بە ژنەکەی ئوشەیم... پێشتر ئوشەیم بە هەڵە کوژرابوو.[٢]

ئەم فەرموودەیە لەگەڵ فەرموودەیەکی تردا کە لە سونەنی ئەبووداووددا هاتووە بەڵگەن لەسەر ئەوەی خوێن بایی کەسێک وەک میراتی دابەش دەکرێت بەسەر ئەوانەدا کە میراتی دەیانگرێتەوە، بۆ نموونە ئەگەر کەسێک بە رووداوی هاتووچۆ کوژرا، دواتر خوێن بایی لەبری وەرگیرا، ئەوکات ئەم هەنگاوانە دەگیرێتەبەر: چی قەرزی هەیە دەدرێتەوە، چی لێ مایەوە بەشی وەسیەتی شەرعی کەسە کوژراوەکە جیا دەکرێتەوە، پاشان ئەوەی مایەوە وەک دابەشکردنی میراتی دابەش دەکرێت بەسەر ئەو کەسانەدا کە پشکی میراتییان بەردەکەوێت.[٣]

## ٢٥٧. ئوشەیم(رضي الله عنه):

تەنها زانیاریەک کە لەسەری هاتووە ئەوەیە کە ئیبن حەجەر هێناویەتی عومەری کوری خەتتاب لەگەڵ چەند کەسێکی تردا لە وادیلقورا بەشی بۆ بڕیەوە.[٤]

---

[١] أسد الغابة، ج١، ص١٥٢.

[٢] سنن أبي داود - كتاب الفرائض - باب في المرأة ترث من دية زوجها، الرقم ٢٩٢٧، صححه الألباني في صحيح وضعيف سنن أبي داود، الرقم ٢٩٢٧.

[٣] بۆ وەرگرتنی فەتوا لەم بارەیەوە دەتوانیت بڕوانیت بۆ (فتاوى اللجنة الدائمة، (٤٣٥/١٦).

[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٩٠.

## ٢٥٨. ئوصەیلی کوڕی صەفوان(ﷺ):

ناوی ئوصەیلی کوڕی سوفیانی هوذەلیە، دەشوترێ کوڕی عەبدوڵای هوذەلیە، یان دەوترێ بەڵکو خوزاعیە، دەشوترێ غیفاریە.[1]

پێش ئەوەی پەردە لەسەر خێزانەکانی پێغەمبەر(ﷺ) فەرز بێت، ئوصەیل لە مەککەوە هات بەرەو مەدینە و موسڵمانیش بووبوو، کاتێک هات دایکی باوەڕداران عائیشە هەواڵی مەککەی لێ پرسی و وتی: ئەی ئوصەیل کە هاتیت مەککە چۆن بوو؟ ئوصەیلیش باسی مەککەی بۆ کرد، عائیشەش وتی: هەستە تا پێغەمبەر(ﷺ) دێتەوە، هێندەی نەبرد پێغەمبەر(ﷺ) هاتەوەو هەمان پرسیاری کرد لە ئوصەیل، ئەویش لە وەڵامی پێغەمبەردا(ﷺ) وەسف و باسی مەککەی بۆ دەگێڕایەوە، لە نێوەندی قسەکانیدا پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: (حسبک یا أصیل لا تحزنا)،[2] (بەسە ئیتر ئەی ئوصەیل، دڵتەنگمان مەکە)، لە ریوایەتێکی تردا هاتووە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ویها یا أصیل دع القلوب تقر)،[3] (ئیتر بەسە ئەی ئوصەیل وازبێنە دڵان ئارام بگرن)،[4] لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (لا تشوقنا)،[5] (تاسەمان مەورووژێنە)، واتە بە بیستنی باس و وەسفی مەککە پێغەمبەر(ﷺ) بیری مەککەی کرد.

بەو پێیەی هاتنی ئوصەیل بۆ مەدینە پێش دابەزینی ئایەتی حیجاب بووە کە تایبەت بوو بە خێزانەکانی پێغەمبەر(ﷺ)، دابەزینی ئەو ئایەتەش لە کاتی هاوسەرگیری پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ زەینەبی کچی جەحشدا بووە

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٩٢.
[2] أسدالغابة، ج١، ص١٥٥-١٥٦.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٩٢.
[4] أخبار مكة للأزرقي، دار الأندلس، بيروت ١٩٩٦، ج٢، ص١٥٥.
[5] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج ١، ص١٣٧.

لە ساڵی سێی کۆچی یان رایەک دەڵێت: لە ساڵی پێنجی کۆچیدا،[1] واتە هاتنی ئوصەیل بۆ مەدینە لە پێش ساڵی پێنجەمی کۆچیدا بووە.

خۆشەویستی خاک و شوێنی لەدایکبوون بەشێکی نەبڕاوەیە لە ناخی مرۆڤ، ئیسلامیش رەچاوی ئەو بارەی کردووەو نەک بەری پێ نەگرتووە بەڵکو رێی پێداوەو پێغەمبەریش(ﷺ) لە پێش هەموانەوە ئاماژەی پێداوە، وەک چۆن لەکاتی کۆچکردنی بۆ مەدینە تاسەی خۆی بۆ مەککە نیشاندا و رووی کردە مەککە و فەرمووی: (علمت أنك خير أرض الله، وأحب الأرض إلى الله عز وجل، ولولا أن أهلك أخرجوني منك ما خرجت)،[2] (دەزانم چاکترین زەوی خوایت و لای خوا خۆشەویستترین زەویت، وە ئەگەر خەڵکەکەت منیان لەناو تۆدا دەرنەکردایە دەرنەدەچووم)، کاتێکیش چوونە مەککە بە نەخۆشکەوتنی ئیمامی ئەبووبەکر ئاماژەی بەوەدا تاو گەرمی لەشی لەبەر دووریەتی لە مەککە، هەروەها لێرەشدا دەبینین هەر بە بینینی هاتنی کەسێک لە مەککەوە خێرا هەواڵی مەککە دەپرسێت و کاتێکیش هەواڵی مەککە دەبیستێت خێرا پێی دڵتەنگ دەبێت و بیری دەکات، هاوکات ئەمە ئاماژەیەکی گەورەیە بەو راستیەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە دەفەرموێت (لو سلك الناس واديا وسلكت الأنصار واديا - أو شعبا - لسلكت وادي الأنصار- أو شعب الأنصار)،[3] (ئەگەر خەڵکی دۆڵێ یان شیوێ بگرنەبەر و پشتیوانانیش دۆڵێ یان شیوێ بگرنەبەر بەدڵنیاییەوە من دۆڵ یان شیوی پشتیوانان دەگرمەبەر)، چونکە بەم هەموو خۆشەویستیەی بۆ مەککە و بیرکردنی، کەچی کاتێک فەتحی مەککە کرا پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ پشتیوانان گەڕایەوە بۆ مەدینەو لەوێ نیشتەجێ بوو تا هەر لەوێ کۆچی دوایی کرد.

[1] أسد الغابة، ج٧، ص١٣٧.

[2] مسند أحمد بن حنبل - أول مسند الكوفيين(ﭫ) - حديث عبد الله بن عدي بن الحمراء الزهري(ﷺ)، الرقم ١٩٠١٩، صححه الألباني.

[3] صحيح البخاري - كتاب المغازي - باب غزوة الطائف، الرقم ٤٣٣٤.

## ٢٥٩. ئوکەیمە(رضي الله عنه)

ناوی ئوکەیمەی کوڕی عوبادەی لەیثی یان دەوترێ بەڵکو زوهریە،[١] کوڕێکی هەبوو بە ناوی سولەیم کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە.[٢]

فەرموودەیەکی لێوە گێڕاوەتەوە کە ئیبن ئەثیر لە کتێبەکەیدا (أسد الغابة) و ئیبن حەجەریش لە کتێبەکەیدا (الإصابة) هێناویانە، بەڵام لە کتێبەکانی تایبەت بە فەرموودەدا نەهاتووە، فەرموودەکە ئەوەیە کە ئوکەیمە دەڵێت: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئێمە جاری وا هەیە فەرموودەت لێ دەبیستین بەڵام ناتوانین وەک خۆی بیڵێینەوە و بیگەیەنین، ئەویش فەرمووی (لا بأس زدت أو نقصت إذا لم تحل حراما أو تحرم حلالا وأصبت المعنى)، (کێشە نیە کەم و زیادی لێ بکەیت بە مەرجێ حەرامێک حەڵاڵ نەکەیت یان حەڵاڵێک حەرام نەکەیت و واتاکە بپێکیت).[٣]

هەروەها فەرموودەیەکی تری لێوە هاتووە کە ئیبن حەجەر هێناویەتی و دووبارە بەو سەنەدە ئەو فەرموودەیە لە کتێبەکانی فەرموودەدا نەهاتووە بەڵام بە سەنەدی تر لە هاوەڵی ترەوە بە هەمان واتا هاتووە، فەرموودەکەش ئەوەیە کە ئوکەیمە دەڵێت: پێغەمبەری خوام(ﷺ) بینی لە شانی ئاژەڵی خوارد و نوێژی کرد و دەستنوێژیشی نەگرتەوە.[٤]

ئەم فەرموودەیە بە هەمان واتا ئەوە لە کتێبەکانی فەرموودەدا لە چەند هاوەڵێکی پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێردراوەتەوە وەک ئوم سەلەمەو ئیبن عەبباس و ضوباعەی کچی زوبەیر و عەمری کوڕی عوبەیدوڵای حەضرەمی و ئوممو هانیئ و مەیموونەو ئەبوو رافیع.

---

(١) الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٠٨.

(٢) أسد الغابة، ج٢، ص٥١٥.

(٣) أسد الغابة، ج١، ص١٧٣، الإصابة في تمييز الصحابة، ج٣، ص١٦٦.

(٤) الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٠٨.

## ٣٦٠. ئومەییەی کوڕی ثەعلەبە(رضي الله عنه):

زانیاری زۆری لەسەر نیە، هێندە هەیە ئیبن حەجەر ناوی هێناوەو دەڵێت: دوو فەرموودەی لێوە گێردراوەتەوە.[1]

## ٣٦١. ئومەییەی کوڕی خومیلید(رضي الله عنه):

ناوی ئومەییەی کوڕی خوەیلیدی ضەمریە، یان دەوترێت کوڕی عەمرە، کوڕێکی هەبوو بە ناوی عەمر کە ئەویش هاوەڵی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بوو، دانیشتووی خاکی حیجاز بوو.

عەمر فەرموودەیەکی باوکی گێڕاوەتەوە دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بە تەنها منی نارد بۆ وەرگرتنی زانیاری و هەواڵگری لەسەر قورەیش، لەوێ چووم بۆ لای ئەو دارەی خوبەیبی پێدا هەڵواسرابوو، سەرکەوتم و خوبەیبم داگرت و کەمێک دوورکەوتمەوە، ئینجا لامکردەوە خوبەیب دیار نەمابوو دەتوت زەوی قووتی داوە، ئیتر تا ئەمڕۆ تەرمی خوبەیب نەبینرایەوە.[2]

عەمر فەرموودەیەکی تری لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە کە دەڵێت: پێغەمبەری خوام(صلى الله عليه وسلم) بینی خواردنی خوارد و دواتر هەستا نوێژی کرد و دەستنوێژی نەگرت.[3]

بەڵام ئەم فەرموودەیە لە کتێبەکانی فەرموودەدا بە دەقی جۆراوجۆر لە عەمرەوە هاتووە نەک لە ئومەییەی باوکیەوە.

خوبەیبی کوڕی عەددی هاوەڵێکی خۆشەویستی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بوو، لە ڕۆژی ڕەجیعدا لەگەڵ چەند هاوەڵێکی تر لەلایەن بەنولیحیانەوە ناپاکییان بەرامبەر ئەنجام درا و خوبەیب بەدیل گیراو درایە دەست قورەیش لە مەککە، قورەیشیەکانیش ئەویان لەخاچ دا.[4]

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ١١٨.

[2] أسد الغابة، ج١، ص١٧٨، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٤٨.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٤٨.

[4] أسد الغابة، ج٢، ص١٤٩-١٥١.

## ٣٦٢. ئومەییەی کوڕی ضوفارە(رضي الله عنه):

کاتێک وەفدی جذام هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) ئومەییەش لەگەڵ رفاعەی کوڕی زەیددا چوویە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ).[1]

## ٣٦٣. ئومەییەی کوڕی لەوذان(رضي الله عنه):

ناوی ئومەییەی کوڕی لەوذانی کوڕی سالمی کوڕی مالیکە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان.

ئەم هاوەڵە لە جەنگی بەدردا هاودەم بە پێغەمبەر(ﷺ) بەشداری کرد، بەڵام هیچ فەرموودەیەکی لێوە نەگێردراوەتەوە.[2]

## ٣٦٤. ئومەییەی کوڕی مەخشی(رضي الله عنه):

ناوی ئومەییەی کوڕی مەخشی خوزاعیە یان دەوترێت ئەزدیە، هاوەڵی پێغەمبەری خوای(ﷺ) کردووەو فەرموودەیەکیشی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە، دواتر نیشتەجێی بەصرە بوو و هەر لەوێ مایەوە،[3]

کوڕێکی هەبوو بە ناوی عەبدورەحمان، کوڕەزاکەشی ناوی موثەننا بوو کە فەرموودەی لە باپیریەوە گێڕاوەتەوە.[4]

ئومەییە دەگێڕێتەوە جارێک کەسێک نانی دەخوارد و پێغەمبەریش(ﷺ) تەماشای دەکرد، کەسەکە بۆ سەرەتای نانخواردنەکەی (بسم الله)ی نەکرد تا لە کۆتایی نان خواردنەکەیدا وتی: (بسم الله أوله وآخره)، پێغەمبەر(ﷺ)

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص١٧٩، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١١٨.

[2] أسد الغابة، ج١، ص ١٨٣، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١١٩.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١١٩.

[4] المستدرک علی الصحيحين، الرقم ٧١٥٢.

فەرمووی: (ما زال الشيطان يأكل معه حتى سمى فما بقي في بطنه شيء إلا قاءه)،[1] (بەردەوام شەیتان نانی لەگەڵ دەخوارد تا ئەوکاتەی بسم الله ی کرد ئیتر چی لەناو سکی شەیتاندا مابوو هەمووی هەڵهێنایەوە.

ئیبن حەجەر لە فتح الباری لە شەرحی صەحیحی بوخاریدا سەبارەت بە وتنی بسم الله لە سەرەتاو کاتی نانخواردندا دەڵێت: مەبەست بە بسم الله کردن لەسەر خواردن ئەوەیە لە سەرەتای خواردندا بڵێیت بسم الله، راشکاوانەترین دەقیش لە جۆری وتنەکەیدا ئەوەیە کە ئەبوو داوود و ترمذی لە رێی ئوممو کلثومەوە لە عائیشەوە بە مەرفووعی هێناویانە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی (هەرکامتان خواردنێکی خوارد با بڵێت بسم الله، ئەگەریش لەسەرەتاوە بیری چوو با بڵێت بسم الله في اوله وآخره، ئەم فەرموودە شاهیدێکی تری هەیە لە فەرموودەکەی ئومەییەی کوڕی مەخشیەوە کە ئەبوداود و نەسائی هێناویانە، سەبارەت بەوەش نەوەوی لە ذیکری ئەدەبی خواردندا بەشی پێویست سیفەتی بسم الله ی هێناوە و دەشڵێت چاکتر وایە بڵێیت بسم الله الرحمن الرحيم، ئەوا ئەگەر بەس بڵێت بسم الله بەسە بۆی و سوننەتی پەیڕەو کردووە، من بەڵگەیەکی تایبەت نابینم بۆ ئەو قسەی نەوەوی کە وتنی بسم الله الرحمن الرحيم باشتر بێت، ئەوەش کە غەزالی لە کتێبی (إحياء علوم الدين) دا سەبارەت بە ئەدەبی خواردن هێناویەتی ئەگەر بۆ هەر پاروویەک بڵێیت بسم الله باشە و سوننەتە بۆ یەکەم پاروو بڵێیت بسم الله و بۆ دووەم پاروو بڵێیت بسم الله الرحمن و بۆ سێیەم پاروو بڵێیت بسم الله الرحمن الرحيم، من هیچ بەڵگەیەک بۆ سوننەتی ئەو شتە بەدی ناکەم..).[2]

---

[1] المستدرك على الصحيحين - كتاب الأطعمة - إذا أكل أحدكم طعاما فليقل بسم الله، الرقم ٧١٨١، صححه ووافقه الذهبي في التلخيص، ضعفه شعيب الأرناؤوط، ضعفه الألباني في ضعيف الترغيب والترهيب، الرقم ١٢٨٣.

[2] فتح الباري، ج٩، ص٥٢١.

## ٣٦٥. ئومەییەی کوڕی ئەبووعوبەیدە(رضي الله عنه):

ناوی ئومەییەی کوڕی ئەبووعوبەیدەی کوڕی هەمامی کوڕی حارثی تەمیمیە، کوڕێکی هەبوو بە ناوی یەعلا کە ئەویش هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، ژنەکەشی ناوی مونیە بوو کە ئەویش موسڵمان بوو و هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوو.[١]

یەعلای کوڕی لە فەتحی مەککەدا موسڵمان بوو، دواتریش بەشدار بوو لە غەزای حونەین و طائیف و تەبووکدا،[٢] بۆیە یەعلا هەوڵی دا باوکیشی ڕێنموونی بکات بۆ ئیسلام.

یەعلا دەڵێت: لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا باوکم لەگەڵ خۆم برد بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەیعەتی هیجرەت لە باوکم وەربگرە، پێغەمبەری خوایش(ﷺ) فەرمووی: (لا هجرة بعد الفتح)،[٣] (دوای فەتحی مەککە هیچ هیجرەتێک نیە)، لە ریوایەتێکی تردا هاتووە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بل أبايعه على الجهاد، وقد انقطعت الهجرة)،[٤] (بەڵکو لەسەر جیهاد بەیعەتی لێ وەردەگرم، چونکە ئیتر هیجرەت دابڕاو تەواو بوو).

ئیبن ئەثیر هێناویەتی کە ئومەییە خۆی داوای کردووە لە پێغەمبەر(ﷺ) تا لەسەر هیجرەت بەیعەتی پێ بدات، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (لا هجرة بعد الفتح ولكن جهاد ونية)،[٥] (دوای فەتح هیچ هیجرەتێک نیە بەڵکو جیهاد و نیازپاکی هەیە).

ئیبن حەجەر لە کتێبی (فتح الباری) دا سەبارەت بە فەرموودەی (لا هجرة

---

[١] أسد الغابة، ج١، ص١٨١.

[٢] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٤، ص١٥٨٥.

[٣] أسد الغابة، ج١، ص ١٨١.

[٤] السنن الكبرى للنسائي - كتاب السير - البيعة على الهجرة، الرقم ٨٦٤٢، حسنه شعيب الأرناؤوط، ضعفه الألباني في صحيح و ضعيف سنن النسائي، الرقم ٤١٦٨.

[٥] أسد الغابة، ج١، ص١٨١.

بعد الفتح) دەڵێت: (لە سەرەتای ئیسلامدا کۆچکردن بۆ مەدینە فەرز بوو، ئەمەش لەبەر کەمی موسڵمانان لە مەدینەو پێویستییان بە کۆبوونەوە، کاتێک خوای گەورە فەتحی مەککەی بەخشی خەڵکی دەستە بە دەستە موسڵمان دەبوون، ئیتر فەرزێتی کۆچکردن بۆ مەدینە نەما و جیهاد و نیازی ئەنجامدانی جیهاد بە فەرزی مایەوە... هەروەها حیکمەتی کۆچکردن بۆ موسڵمان لەوەدا بوو تا لە ئازاری بێباوەڕان پارێزراو بێت چونکە بێباوەڕان ئازاری موسڵمانانیان دەدا تا وازبهێنن لە ئیسلام، ئەو ئایەتەی خوای گەورەش لەو بارەیەوە دابەزی (ان الذین توفاهم الملائکة ظالمي أنفسهم قالوا فیم کنتم قالوا کنا مستضعفین في الأرض قالوا ألم تکن أرض الله واسعة فتهاجروا فیها...) ئەو کۆچەش حوکمەکەی بەردەوام دەمێنێتەوە بۆ کەسێ لە خاکی بێباوەڕان موسڵمان دەبێت و توانای ئەوەی هەیە جێی بهێڵێت... ئەو کۆچەی کە جێهێشتنی نیشتیمانە کە لەسەریان بوو کۆچ بکەن بۆ مەدینە نەما، بەڵام جێهێشتن لەبەر جیهاد بەردەوامە، هەروەها جێهێشتن لەبەر نیازی چاکە بەردەوامە وەک راکردن لە دارولکوفر و دەرچوون لە پێناو زانست و راکردن لەپێناو خۆپاراستن لە فیتنە.. ئیبنولعەرەبی دەڵێت: کۆچکردن دەرچوونە لە دارولحەربەوە بۆ دارولئیسلام کە لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) فەرز بوو و دوای ئەوەش هەر بەردەوامە بۆ کەسێ کە ترسی هەبێت لە گیانی، لە راستیدا ئەوەی کۆتایی پێهات بریتی بوو لە کۆچکردن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) لە هەر کوێ بێت، هەروەک ئەم فەرموودە مژدەی ئەوەشی تێدایە کە مەککە بە هەمیشەیی بە دارولئیسلام دەمێنێتەوە).[1]

ئیمامی نەوەوی لە شەرحی صەحیحی موسلیمدا دەڵێت: (زانایان دەڵێن کۆچکردن لە دارولحەربەوە بۆ دارولئیسلام تا رۆژی دوایی بەردەوامە، لە واتای ئەو فەرموودەشدا دوو را هەیە، یەکەمیان ئەوەیە دوای فەتحی مەککە کۆچکردن لە مەککەوە نیە چونکە بووە بە دارولئیسلام، کۆچکردنیش لە

[1] فتح الباري، دار المعرفة، بیروت، ج٦، ص٣٩.

دارولحەربەوە دەبێت، ئەمەش موعجیزەی پێغەمبەر(ﷺ) لەخۆدەگرێت کە مەککە بەردەوام بە دارولئیسلام دەمێنێتەوە و کۆچ بە خۆوە نابینێت، دووەمیش ئەوەیە کۆچی پاش فەتح پاداشتی وەک کۆچی پێش فەتح نیە وەک خوا دەفەرموێت (لا يستوي منكم من أنفق من قبل الفتح وقاتل)، سەبارەت بە واتای (ولكن جهاد ونية) واتای ئەوەیە بەڵام ڕێگەیەکتان بۆ هەیە تا بگەنە ئەو خێرو چاکانەی وەک کۆچکردن پاداشتیان هەیە کە ئەویش بە جیهاد کردن و نیازچاکیە لە هەموو شتێکدا).[1]

قورطوبی دەڵێت: (کۆچکردن چەند جۆرێکە، لەوانە کۆچکردن بۆ مەدینە بۆ سەرخستنی پێغەمبەر(ﷺ) کە ئەوە لە سەرەتای ئیسلامدا واجب بوو تا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (لا هجرة بعد الفتح)، هەروەها کۆچکردنی دووروان لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) لە غەزاکاندا، کۆچکردنی کەسێ کە لە دارولحەربدا موسڵمان دەبێت ئەوە واجبە لەسەری کۆچ بکات، کۆچکردنی موسڵمان لەوەی خوا حەرامی کردووە وەک پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت (والمهاجر من هجر ما حرم الله عليه) ئەو دوو کۆچە ئێستا چەسپاون، هەروەها کۆچکردن و تۆراندنی تاوانباران تا بگەڕێنەوە وەک تەمبێ کردنیان کە دەبێت قسەیان لەگەڵ نەکرێت و تێکەڵییان نەکرێت تا ئەو کاتەی تەوبە دەکەن وەک مامەڵەی پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ کەعب و دوو هاوڕێکەیدا).[2]

## ٣٦٦. ئونەیس(ئەبووفاطمە)(ﷺ):

ناوی ئونەیسە، دەشوترێت بەڵکو ناوی ئیاسە، پاش فەتحی میصر نیشتەجێی میصر بوو، کوڕێکی هەبوو بە ناوی عەبدوڵا کە فەرموودەیەکی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە،[3] بەڵام فەرموودەکە لە کتێبەکانی تایبەت بە

[1] شرح النووي على صحيح مسلم، ط٢، دار إحياء التراث العربي(بيروت-١٣٩٢هجرية)، ج٩، ص١٢٣.
[2] تفسير القرطبي، دار الشعب، القاهرة، ج٥، ص٣٠٨.
[3] أسد الغابة، ج١، ص٢٠٢.

فەرمـودەدا نەهاتـووە.

دەوترێ بەڵکو ئەم هاوەڵە ئونەیسی کوڕی ضحاکی ئەسلەمیە.[1]

## ٢٦٧. ئونەیسی کوڕی جەنادە(ﷺ):

ناوی ئونەیسی کوڕی جەنادەی کوڕی سوفیانی کوڕی عوبەیدی غیفاریە، برا گەورەی ئەبووذەر بوو،[2] ئونەیس شاعیر بوو،[3] دایکی ناوی رەملەی کچی وەقیعەی غیفاری بوو.[4]

ئەم هاوەڵە سەر بە هۆزی غیفارە،[5] غیفاریش لە پێش موسڵمان بوونیاندا ناوبانگێکی باشیان لە ناوچەکەدا نەبوو چونکە کەسانێکیان تێدا بوون کە بە چەتەو رێگر ناسرابوون،[6] بەڵام برێ کەسی زۆر مەرد و چاکیان تێدا بوو، یەکێک لەوانەش ئونەیسی کوڕی جەنادە بوو.

ئونەیس لەگەڵ ئەبووذەری برای و دایکیدا پێکەوە دەژیان، دواتر نەبوونی و وشکە ساڵی ناچاری کردن شوێنی خۆیان جێ بهێڵن و بچن بۆ لای خاڵوانیان لە نەجد، دواتریش ئەوێیان جێهێشت بەرەو لای مەککە، ئەبووذەر چوویە مەککەو هەواڵی هاتنی پێغەمبەری خوای(ﷺ) بیست و دواتر چوویە خزمەتی و موسڵمان بوو، دواتر گەڕایەوە بۆ لای ئونەیسی برای و دایکی وبانگی کردن بۆ ئیسلام، ئەوانیش موسڵمان بوون و گەڕانەوە بۆ لای هۆزەکەیان تا پەیامی ئیسلام بگەیەنن بەهۆزەکەشیان و لەوەشا سەرکەوتوو بوون.[7]

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٣٩.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٣٦.
[3] المستدرک على الصحيحين، الرقم ٥٤٣٠.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٦، ص١٠٧.
[5] الطبقات لابن خياط ج١ ص٣٢، أسد الغابة ج١ص٥٧، الإصابة في تمييز الصحابة ج١ص١٥.
[6] المعجم الكبير للطبراني - باب العين - من اسمه عبد الله - أحاديث عبد الله بن العباس بن عبد المطلب - وما أسند عبد الله بن عباس(ﷺ) - عكرمة عن ابن عباس، الرقم ١١٦٤٥.
[7] المستدرک على الصحيحين، الرقم ٥٤٣٠، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٧٧٢.

بەڵام لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە ئەبووزەر کاتێک هەواڵی هاتنی پێغەمبەری خوای(ﷺ) بیست، ئونەیسی برای نارد بۆ مەککە تا هەواڵی پێغەمبەر(ﷺ) بزانێت، ئەویش چوو و هەواڵی وەرگرت و گەڕایەوە بۆ لای ئەبووزەر و بەسەرهاتەکەی بۆ باس کرد و وتی: بینیم فەرمانی دەکرد بە کاری چاکەو شتێکی دەوت: کە شیعر نەبوو، بەڵام ئەبووزەر دڵی ئارامی نەگرت و خۆی چوو بۆ مەککەو لەوێ وردەکاری وەرگرت و چوویە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمان بوو.[١]

## ٣٦٨. ئونەیسی کوڕی عەتیک(رضي الله عنه):

ناوی ئونەیسی کوڕی عەتیکە، یان دەوترێت ناوی ئەوسە،[٢] بەڵام ئیبن حەجەر دەڵێت: لەوانەیە ئەو دوو ناوە جیاواز بن و برای یەک بن نەک یەک کەس بن.[٣]

ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە لە بەنی عەبدولئەشهەل،[٤] لە جەنگی (جیسر ئەبووعوبەید) دا کوژرا.[٥]

## ٣٦٩. ئونەیسی ئەسلەمی(رضي الله عنه):

ئەم هاوەڵە لە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) ژیاوەو فەرمانی پێغەمبەری خوای(ﷺ) پەیڕەو کردووە و پێغەمبەر(ﷺ) وەک نێردراو ناردوویەتی بۆ چارەسەری کێشە،[٦] فەرموودەیەکی لەبارەوە گێردراوەتەوە کە کاتێک کێشەیەکی کۆمەڵایەتی هەبوو پەیوەست بە زیناکردنی پیاو و ژنێک،

[١] صحيح البخاري – كتاب المناقب – باب قصة زمزم، الرقم ٣٥٢٢.
[٢] أسد الغابة، ج١، ص٢٠١.
[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٣٧.
[٤] أسد الغابة، ج١، ص٢٠١، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٣٧.
[٥] أسد الغابة، ج١، ص٢٠١.
[٦] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٣٨.

پێغەمبەر(ﷺ) ئونەیسی ئەسلەمی نارد تا بزانێت ئافرەتەکە دان بەوەدا دەنێت؟ ئەگەر دانی پێدا نا رەجمی بکات، ئەویش چوو بۆ لای ژنەکەو ژنەکەش دانی نا بەوەدا، بۆیە رەجمی کرد.[1]

## ٢٧٠. ئونەیفی کوڕی جوشەم(ﷺ):

ناوی ئونەیفی کوڕی جوشەمی کوڕی عەوذولاهی قوضاعیە، هاوپەیمانی پشتیوانانە، بەشدار بوو لە غەزای بەدردا، بەڵام هیچ فەرموودەیەکی لێوە نەگێردراوەتەوە.[2]

## ٢٧١. ئونەیفی کوڕی حەبیب(ﷺ):

ئونەیف لە جەنگی خەیبەردا بەشداری کردو تیایدا شەهید بوو.[3]

## ٢٧٢. ئونەیفی کوڕی مەللە(ﷺ):

ناوی ئونەیفی کوڕی مەللەی یەمامیە،[4] یان دەوترێت جوذامیە،[5] براکەی ناوی حەییان بوو کە ئەویش هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوو،[6] لەگەڵ براکەی و چواردە کەسی تردا وەک وەفد هاتنە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، دواتر گەڕانەوە بۆ لای هۆزەکەیان، خەڵکەکە پرسیاریان کرد ئەی ئونەیف پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانی چی پێ کردن؟ وتی: فەرمانی پێ کردین تا کاتێک ئاژەڵ سەردەبڕین بەلای چەپیدا بیخەین و دواتر سەری ببڕین و خوێنی بڕژین و بیخۆین، دواتر سوپاسی خوا بکەین.[7]

---

(1) صحيح البخاري - كتاب الأيمان والنذور - باب كيف كانت يمين النبي، الرقم ٦٦٣٣.
(2) أسد الغابة، ج١، ص٢٠٥.
(3) الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١١٥.
(4) أسد الغابة، ج١، ص٢٠٥.
(5) الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ١٤٠.
(6) التاريخ الكبير للبخاري، ج٣، ص٥٣.
(7) أسد الغابة، ج١، ص٢٠٥.

لەوانەیە وەفدی ئەو هۆزە یەکەم جاری نەبووبێت چووبێتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، چونکە دەبینین پێغەمبەر(ﷺ) سەبارەت بە مەسەلە فیقهیەکان زانیاری پێ بەخشیون کە ئەمەش بە دڵنیاییەوە پاش بیروباوەڕ دێت، هەروەها کاتێک ئەوان دەچنەوە دەپرسن پێغەمبەری خوا(ﷺ) چی پێ وتن بەو واتایەی موسڵمان بووبن و داوای ڕێنمایی زیاتریان کردبێت، هەروەها ئاماژەیە بەوەی ئونەیف پێشڕەو بووبێت لەبەرئەوەی لە نێو هەموویاندا پرسیاریان لە ئونەیف کرد.

ئونەیفی کوڕی مەللە لە ناوچەی ڕەملە نیشتەجێ بوو و دواتر چوو بۆ ناوچەی بەیت جبرین لە فەلەستین و لەوێ کۆچی دوایی کرد.[١]

## ٢٧٣. ئونەیفی کوڕی واثلە(رضي الله عنه):

سەبارەت بە ناوی باوکی دوو ڕا هەیە، هەندێ بە وایلە هێناویانە، هەندێکیش بە واثلە هێناویانە،[٢] یەکێکە لە بەشداربوانی غەزای خەیبەر و تیایدا شەهید بوو.[٣]

## ٢٧٤. ئوهبانی کوڕی صەیفی(رضي الله عنه):

ناوی ئوهبانە یان دەوترێت وەهبان، کوڕی صەیفی غیفاریە، کونیەکەی ئەبوو موسلیمە، لە هاوەڵانی نیشتەجێی بەصرەدا ناوی هاتووە، کچێکی هەبوو بە ناوی عودەیسە کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە.[٤]

تا سەردەمی خەلیفەی ڕاشیدی چوارەم عەلی کوڕی ئەبوو تالیبیش ژیاوە، جارێک عەلی کوڕی ئەبوو تالیب چوو بۆ لای و وتی: ئەی ئەبو موسلیم بۆچی لەم مەسەلەدا پشک و جێدەستی خۆتت نابێت؟-

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ١٤٠.
[٢] أسد الغابة، ج١، ص٢٠٥.
[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ١٤٠.
[٤] أسد الغابة، ج١، ص ٢٠٧.

ئەو کێشەی کە ئەوکات لە نێوان هاوەڵاندا هەبوو- ئەویش وتی: لەبەر بەڵێنێک کە خۆشەویستی من و ئامۆزاکەی تۆ-پێغەمبەری خوا(ﷺ)- لێی وەرگرتم، هەرکات فیتنە هەبوو شمشێرێکی تەختە دروست بکە، منیش وا درووستمکردووەو هەڵمواسیوە).[1]

ئوهبان لە بەصرەش کۆچی دوایی کرد،[2]واقیدی هێناویەتی ئوهبان داوای کرد لە دوو بەرگدا کفنی بکەن، بەڵام ئەوان لە سێ بەرگدا کفنیان کرد، بەیانی کە هەستان کفنی سێیەم لەسەر جێگەکەی بوو.[3]

## ٢٧٥. ئوهبانی کوڕی ئەکوەع(رضي الله عنه):

ناوی ئوهبانی کوڕی ئەکوەعی کوڕی عیاذی کوڕی رەبیعەی خوزاعیە، دەشوترێت باوکی ناوی عیاذ بووە نەک ئەکوەع.[4]

ئەم هاوەڵە یەکێکە لە بەشداربوانی بەیعەتی ریضوان، رایەک دەڵێت: ئەو فەرموودەی سەبارەت بە قسەکردنی گورگەکە لەگەڵ شوانەکە هاتووە تایبەت بووە بەم ئوهبانەوە، واتە ئوهبان شوانەکە بووە، بەڵام رایەکی تر دەڵێت: بەڵکو ئوهبانی کوڕی ئەوس بووە.[5]

فەرموودەکەش ئەمەیە: شوانێک لای مەڕەکانی بوو بینی گورگێک هات و مەڕێکی برد و شوانەکەش مەڕەکەی لێ سەند، گورگەکە پێی وت: ئەرێ لە خوا ناترسیت رێ دەگریت لە رۆزیەک کە خوا پێی بەخشیوم؟ شوانەکە وتی: وای چەند سەرسوڕهێنەرە گورگ وەک مرۆڤ قسەم لەگەڵ دەکات، گورگەکە بە شوانەکەی وت: لەوە سەرسوڕهێنەرترت پێ بڵێم، وا پێغەمبەری خوا لە نێوان دوو حەررەدا دەرکەوتووەو هەواڵی پێشین بە

[1] سنن ابن ماجه – أبواب الفتن – باب ما يكون من الفتن، الرقم ٤٠٧٦، أسد الغابة، ج١، ص٢٠٧.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٤٢.
[3] أسد الغابة، ج١، ص٢٠٧، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٤٢.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٤١.
[5] أسد الغابة، ج١، ص٢٠٦.

خەڵـک دەدات، شـوانەکەش بـە مەڕەکانـەوە چـوو بـۆ مەدینـەو لـە لایەکـەوە مەڕەکانی دانا و دواتـر چـوو بـۆ لای پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) و بەسـەرهاتەکەی بـۆ باسکرد، پێغەمبەریش(ﷺ) چوویـەدەر و بـە شـوانەکەی فەرمـوو: هەسـتە و بیگێڕەوە، ئەویش بەسـەرهاتەکەی بـۆ خەڵکەکـە بـاس کـرد، پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمووی: (صدق الراعي، ألا من أشراط الساعة كلام السباع الإنس، والذي نفسي بيده لا تقوم الساعة حتى تكلم السباع الإنس، ويكلم الرجل نعله، وعذبة سوطه، ويخبره فخذه بحديث أهله بعده)،[1] (شـوانەکە راسـت دەکات، چـاک بزانـن لـە نیشـانەکانی رۆژی دوایـی ئەوەیـە ئاژەڵـە دڕنـدەکان لەگـەڵ مـرۆڤ قسـە دەکـەن، سـوێند بـەوەی گیانـی منی بەدەستە رۆژی دوایـی نایـە تـا ئـەوەی ئاژەڵـە دڕنـدەکان لەگـەڵ مـرۆڤ قسـە دەکـەن و پیـاو نەعلەکەی خـۆی قسـەی لەگـەڵ دەکات و لای قامچیەکـەی قسـەی لەگـەڵ دەکات و ڕانـی هـەواڵ و قسـەی خێزان و مـاڵ و منداڵـی دوای خـۆی-دوای چوونـە دەرەوەی- پـێ دەدات).

ئەم فەرموودەیە ئاماژەیە بە کۆمەڵێک رووداو و گۆڕانکاری کە تا ئەمڕۆش نەهاتـون، بـەڵام کەسـانی ئەمڕۆ شـتەکەیان لا چاوەڕوانکراوتـرە لـە هـاوەڵان، نـەک لەبـەر متمانەبوونـی زیاتـر، بەڵکـو متمانـەی هـاوەڵان بـە فەرمودەکانـی پێغەمبـەر(ﷺ) مەسـەلەیەکی یەکلاییـەو هێندەش بەسـە بەوپـەڕی ئەمانەتـەوە فەرموودەکانیشـیان تۆمـار کـردون، بـەڵام ئـەوە هەیـە ئەمـڕۆ پێشـکەوتنی زانسـتە ماددیـەکان گەیشـتوەتە ئـەوەی پێشـبینی بـۆ هـەر پێشـکەوتنێکی نـوێ لـەو بـوارەدا جێـی قبـووڵ بێـت چ جـای هەواڵـی راسـتی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) لـەو بارەیـەوە، ئەمـەش موعجیزەیەکی پێغەمبـەری خوایـە(ﷺ) کـە لـەو سـەردەمەدا هەواڵـی داوە بـە پێشـکەوتنێکی زانسـتی وا کـە تـا ئەمـڕۆش

---

[1] صحيح ابن حبان - كتاب التاريخ - باب المعجزات - ذكر شهادة الذئب لرسول الله(ﷺ) على صدق رسالته، الرقم ٦٤٩٤، المستدرک على الصحيحين - كتاب الفتن والملاحم - لا تقوم الساعة حتى تكلم السباع الإنسان، الرقم ٨٥٣٦، صححه ووافقه الذهبي في التلخيص، كما صححه شعيب الأرناؤوط، ئەم فەرمودەیە بە کورتی لە کتێبەکانی تری فەرموودەشدا هاتووەو ئەلبانیش لە صحيح الجامع الصغير و زيادته (ج / ٢ ص -١١٩١-) بە صەحیحی داناوە.

نەهاتوەتەدی وەک چۆن لە چەندین فەرمـوودەی تـردا ئامـاژەی داوە بـە چەندین پێشڕەوی زانستی کە لەم سەردەمەدا هاتوونەتە دی و کتێبەکانی تایبەت بە موعجیزەی قورئـان و سوننەت ئـەو شتانەیان بـاس کـردووە.

## ٢٧٦. ئوهبانی کوڕی ئەوس(رضي الله عنه):

ئوهبانی کوڕی ئەوسی ئەسلەمی کونیەکەی ئەبوو عوقبەیە، یان دەوترێت نـاوی وەهبانـی کـوڕی ئەوسـە[١] لـەو هاوەڵانەیـە کـە زوو موسـڵمان بـون، رووەو هـەردوو قیبلە نوێژی کردووە، واتە لە سـەردەمی رووکردنە ئەقصا و سـەردەمی رووکردنە کەعبەش موسڵمان بووە، هەروەها لە بەشداربوانی بەیعەتی ریضوانـە، لـەو هاوەڵانـە ئەژمـار دەکرێت کە دواتر چون بۆ کووفەو لـەوێ نیشتەجێ بون، بەڵکو هـەر لەوێیش لـە سـەردەمی ویلایەتی موغیرەی کوڕی شوعبەدا کۆچی دوایی کرد.[٢]

رایەک دەڵێت: ئـەو فەرمـوودەی بـاس لـە قسەکردنی گورگەکە دەکات-کە لـە باسـی ئوهبانـی کـوڕی ئەکوەعـدا هێناومانـە- تایبـەت بـووە بـە ئوهبانـی کـوڕی ئەوسـەوە.[٣]

## ٢٧٧. ئیادی مەولای پێغەمبەر(ﷺ)

ئیـادی مـەولای پێغەمبـەری خـوا(ﷺ)،[٤] راجیایـی هەیـە لەسـەر ناوەکـەی، دەوترێت نـاوی ئەبووزەرە، زیاتر بـە کونیەکەی ناسراوە کە ئەبووسـەمحە،[٥] دەشوترێت نـاوی زیـادە.[٦]

---

[١] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١١٥.
[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٤٧.
[٣] أسد الغابة، ج١، ص
[٤] أسد الغابة، ج١، ص٢٣٠.
[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص١٨٩.
[٦] أسد الغابة، ج٦، ص١٦٥.

بەڵام پێدەچێت راستتر ئەوە بێت ناوی ئیادەو کونیەکەشی بە هەریەک لە ئەبووسەمح و ئەبووزەر هاتبێت، چونکە ئەبووزەر ناو نیە، بەڵکو زیاتر وەک کونیە دێت.

ئەبووسەمح دەڵێت: من خزمەتکاری پێغەمبەری خوا(ﷺ) بووم، جارێک حەسەن یان حوسەین-کوڕی عەلی کوڕی ئەبووطالیب- یان هێنا بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، ئەو منداڵەش میزی کرد بەسەر سنگیدا، ئەوانەی لەوێ ئامادە بوون ویستیان سەر سنگی پێغەمبەر(ﷺ) بشۆن، بەڵام ئەو فەرمووی: (رشوه رشا، فإنه يغسل بول الجارية ويرش بول الغلام)،[1] (ئاوپرژێنی بکەن، چونکە میزی منداڵی کچ شۆردنی دەوێت و میزی منداڵی کوڕیش ئاوپرژێنی دەوێت).

لێرەدا ئەوپەڕی خاکیبوون و میهرەبانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەدیدەکەین کە منداڵی لەسەر سنگی خۆی داناوە، هاوکات بە قورسی نەزانیوە لەسەر خۆی منداڵێک میز بکات بەسەر سنگیدا و باری خۆی تێکبدات، بەڵکو زۆر بە ئاسایی گرتووەو هاوەڵانیشی فێرکردووە چۆن چارەسەری ئەو میزبەسەردا کردنە بکەن.

ئەو منداڵەی میزی کرد بەسەر سنگی پێغەمبەردا(ﷺ) کوڕ بوو، کەچی پێغەمبەر(ﷺ) روونکردنەوەی دا بۆ کوڕ و کچیش.

ئەبووسەمح دواجار کوژرا، بەڵام چۆنێتی و شوێن و کاتەکەی نەزانراوە.[2]

## ٢٧٨. ئیاسی کوڕی بوکەیر(رضي الله عنه)

ناوی ئیاسی کوڕی بوکەیری کوڕی یالیلی کوڕی ناشبی کینانی لەیثیە،[3] ئەم هاوەڵە لە دەستەی یەکەمی کۆچەرانە.[4]

---

[1] المستدرک علی الصحیحین - كتاب الطهارة - ينضح بول الغلام ويغسل بول الجارية، الرقم ٥٩٣، صححه ووافقه الذهبي في التلخيص، سنن ابن ماجه - أبواب الطهارة وسننها - باب ما جاء في بول الصبي الذي لم يطعم، الرقم ٥٢٦، صححه شعيب الأرناؤوط، صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن ابن ماجة، الرقم ٥٢٦.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص١٨٩.

[3] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٢٤، أسد الغابة، ج١، ص٢٣١.

[4] أسد الغابة، ج١، ص٢٣١.

ئیاس سێ برای تری هەبوو کە ئەوانیش هەموویان هاوەڵ بوون، عاقل و عامر و خالید، ئەو برایانەی هەموویان پێکەوە بەشدار بون لە غەزای بەدردا.[1]

عاقلی برای یەکەم کەس بوو لە ماڵی ئەرقەمدا موسڵمان بوو و بەیعەتی دا بە پێغەمبەر(ﷺ)،[2] ناوی غافل بوو، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) ناوی گۆڕی و ناوەکەی کرد بە عاقل.[3]

عامری برایشی لە ماڵی ئەرقەمی کوڕی ئەرقەمدا موسڵمان بوو و لە موسڵمانە یەکەمینەکان بوو،[4]ئەم برایەشی لە غەزای یەمامەدا شەهید بوو.[5]

خالیدی برایشی لە رۆژی رەجیع لە تەمەنی سی و چوارساڵیدا شەهید بوو.[6]

ژنەکەی ئیاس ناوی رەبیعی کچی میعوەذ بوو کە ئەویش موسڵمان بوو و بەیعەتی دابوو بە پێغەمبەر(ﷺ) و دایکی موحەممەدی کوڕی ئیاس بوو.[7]

ئیاس لە دوای غەزای بەدر ئەو ژنەی هێناوە، بە بەڵگەی گێڕانەوەیەک کە رەبیعی ژنی دەگێڕێتەوەو دەڵێت: رۆژی هاوسەرگیریەکەم پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ ماڵمان و دوو کیژ گۆرانییان دەوت، لە گۆرانیەکەیاندا دەفیان لێدەدا و باسی باوباپیرانی منیان دەکرد کە لە بەدر کوژران و دەشیانوت پێغەمبەرێکمان تێدایە کە دەزانێت سبەینێ چی دەبێت، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: ئەم قسەیان مەڵێن.[8]

ئیاس کوڕێکی هەبوو بە ناوی موحەممەد، بەڵام هیچ بەڵگە نیە لەسەر

---

[1] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٨٩٦ الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٦٣.

[2] أسد الغابة، ج٣، ص١١٢.

[3] البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص٣٧.

[4] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٢٤.

[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٦٣.

[6] أسد الغابة، ج٢، ص١١٢.

[7] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص٤٤٧.

[8] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص٤٤٧.

هاوەڵبوونی موحەممەدی کوڕی،[1] کچێکیشی هەبوو بە ناوی مەریەم.[2]

سەردەمی موسڵمانبوونی زۆر زوو بوو، بانگەواز هێشتا لە ماڵی ئەرقەمی کوڕی ئەرقەمی مەخزوومیدا بوو ئیاسی کوڕی بوکەیر موسڵمان بوو.[3]

ئیاس پاش کۆچکردنی بۆ مەدینەو مانەوەی لەوێ، لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) بەشداری غەزاکانی بەدر و ئوحودو خەندەق و هەموو غەزاکانی تر بوو و تا دوای وەفاتی پێغەمبەریش(ﷺ) ژیا.[4]

لە غەزای بەدردا ئیاس لەگەڵ سێ براکەی تریدا بەشداری کرد، لەو غەزایەدا عاقلی برای شەهید بوو.[5]

پێش غەزاکە بۆ زانینی هەواڵی کاروانەکەی قورەیش، پێغەمبەر(ﷺ) چەند کەسێکی نارد بۆ هەواڵ وەرگرتن، یەکێک لەو کەسانە خالیدی برای ئیاس بوو.[6]

ئیاس لە دوای وەفاتی پێغەمبەریش(ﷺ) بەردەوام بوو لە خزمەتکردنی ئیسلامدا و لە فەتحی میصردا بەشداری کرد.[7]

گێڕانەوەیەک لە ژیاننامەی رەبیعی ژنی ئیاسدا هاتووە کە لە سەردەمی عوثمانی کوڕی عەففاندا روویداوە، لەبەرئەوەی ئیاس لە ساڵی ٣٤ کۆچیدا وەفاتی کردووەو نەشهاتووە رەبیعی ژنی شووی کردبێتەوە، بۆیە دەکرێت بڵێین ئەو رووداوە لەگەڵ ئیاسدا روویداوە، لە سەردەمی خەلیفە عوثمانی کوڕی عەففاندا رەبیعی ژنی لەگەڵ مێردەکەی کێشەیەکی بۆ دروست بوو و وتی: هەرچیم هەیە دەیدەم بە تۆ بەڵام تەڵاقم بدە، ئەویش رازی بوو، ئەوەبوو هەر چی شتی ژنەکەی هەبوو بردی جگە لە قەڵغانێک کە مابووی،

---

[1] أسد الغابة، ج٥، ص٨٣.

[2] المستدرک علی الصحیحین، الرقم ٧٥٣٠.

[3] أسد الغابة، ج١، ص٢٣١.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٦٣.

[5] تاريخ الإسلام للذهبي، ج٢، ص٦٥.

[6] أسد الغابة، ج٢، ص١١٢.

[7] تاريخ الإسلام للذهبي، ج٣، ص٤٢١، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٦٣.

رەبیع ئەوەی پێ نەدا، مێردەکەشی چوو بۆ لای عوثمان و سکاڵای لا کرد، عوثمانی کوڕی عەففانیش بە رەبیعی وت: دەبێت مەرجەکە بەجێ بگەیەنیت.[1]

لەساڵی سی و چواری کۆچیدا ئیاس وەفاتی کرد.

## ٢٧٩. ئیاسی کوڕی ثەعلەبە(ﷺ)

ناوی ئیاسی کوڕی ثەعلەبەیە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە، سەبارەت بە ناوی راجیایی هەیە، دەوترێت ناوی ثەعلەبەیە، یان دەوترێت ناوی سەهلە، بەڵام راستتر ئەوەیە ناوی ئیاسەو کونیەکەشی ئەبوئومامەیە کە زیاتر بەمەش ناسراوە.[2]

لە غەزای بەدردا ویستی هاودەم بە پێغەمبەر(ﷺ) بەشداری بکات، بەڵام دایکی نەخۆش بوو، خاڵۆی ئیاس کە ناوی ئەبوو بوردە بوو داوای لە ئیاس کرد تا لای دایکی بمێنێتەوە، بەڵام ئیاس رازی نەبوو و وتی: دەبێت بەشداری بەدر بم تۆ لای خوشکەکەت بمێنەرەوە، دواتر ئەبوبوردە مەسەلەکەی بردە لای پێغەمبەری خوا(ﷺ)، پێغەمبەریش فەرمانی کرد بە ئیاس تا لای دایکی بمێنێتەوە، ئەویش لای دایکی مایەوە، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) لە غەزای بەدر گەڕایەوە بیستی دایکی ئیاس کۆچی دوایی کردووە، پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی مردووی لەسەر دایکی ئیاس کرد.[3]

ئەمە بەڵگەیە لەسەر گەورەیی رێزگرتن و خزمەتکردنی دایک لە ئیسلامدا، هەروەها گرنگیدان بە نەخۆش و خزمەتکردنی ئاماژەیەکی گەورەی ناو ژیاننامەی پێغەمبەری خوایە(ﷺ)، ئەمەش پێچەوانەی پەیامی بیر و فەلسەفەی کۆنی رۆژئاوایە کە داخوازن نەخۆشان لە کۆمەڵگەدا لەناوبرێن

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص٤٤٧.

[2] أسد الغابة، ج٦، ص٢٠، الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص١٩.

[3] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٨٩٤ أسد الغابة، ج٦، ص٢٠.

و خۆسەرقاڵکردن بە نەخۆشەوە نەبێت، بەڵام لە ژیاننامەی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) دەبینین هەر لە غەزای بەدردا عوثمانی کوڕی عەففانی لای خێزانە نەخۆشەکەی هێشتەوە تا خزمەتی بکات و ڕێی دا بەشداری غەزای بەدری یەکەم غەزای ئیسلام نەکات تا لەبری ئەوەدا خزمەتی خێزانە نەخۆشەکەی بکات، وا بۆ ئیاسیش فەرمانی کرد لەبری بەشداری لە بەدردا خزمەتی دایکە نەخۆشەکەی بکات.

## ٢٨٠. ئیاسی کوڕی عەبەس(رضي الله عنه)

ناوی ئیاسی کوڕی عەبەسی کوڕی ئومەییەی کوڕی ڕەبیعەی صەباحیە، برایەکی هەبوو بە ناوی قائیف کە هەردووکیان هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوون و وەک وەفد هاتون بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ).[١]

## ٢٨١. ئیاسی کوڕی عەبد(رضي الله عنه)

ئیاسی کوڕی عەبد ئەبوو عەوفی موزەنیە، لەو هاوەڵانەیە کە لە کووفە نیشتەجێ بوو، کونیەکەی ئەبوفوراتە.[٢]

ئیاس ڕۆژێک چوویە بازاڕ، بینی خەڵکێک سەرقاڵن ئاو دەفرۆشن، ئیاس پێی وتن ئاو مەفرۆشن چونکە من لە پێغەمبەری خوام بیستووە کە ڕێگری دەکرد لە ئاوفرۆشتن.[٣]

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگری کردووە لە فرۆشتنی ئاوی زیاد لەپێویست.[٤]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٦٦.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٦٥.

[٣] سنن ابن ماجه - أبواب الرهون - باب النهي عن بيع الماء، الرقم ٢٤٧٦، صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن ابن ماجة، الرقم ٢٤٧٦.

[٤] سنن أبي داود - كتاب الإجارة - باب في بيع فضل الماء، الرقم ٣٤٧٨.

**وەستانێک:**

سەبارەت بە ڕێگری لە فرۆشتنی ئاو چەند ڕایەک هەیە، هەندێ لە زانایان پێیان وایە ئەو فەرموودەیە نەسخ بوەتەوەو دروستە ئاو بفرۆشرێت، هەندێکی تر ڕایان وایە دروست نیە ئاوی زیاد لە پێویستی خۆ بفرۆشرێت، ئاو دوو جۆرە: ئەوەی کە موڵکی گشتیە دروست نیە لێی بفرۆشرێت و بۆ هەموانە، بەڵام ئەوەی موڵکی تایبەتیە دروستە لێی بفرۆشرێت.

هەروەها ئەو ئاوەی کە کەسێک بۆ پێویستی لە تەنکیدا هەڵیدەگرێت، ئەوە بە زیادە دانانرێت بەڵکو پێویستی ئەو کەسەیە، بەڵام زیادە لەوەدایە کە لە بیر یان کارێزدا هەیە.

فرۆشتنی ئاو لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) هەبووە وەک بیری ڕومان کە هی جوولەکەیەک بوو و ئاوی دەفرۆشت بە موسڵمانان، ئەوەبوو عوثمانی کوڕی عەففان نیوەی بیرەکەی کڕی، عوثمان لە ڕۆژەکەی خۆیدا بە خۆڕایی ئاوی دەبەخشی، ئەوەبوو جوولەکەکە بازاڕی دای لە کزی.

جا ئەگەر فرۆشتنی ئاو ڕەوا نەبوایە ئەوا پێغەمبەر(ﷺ) ڕێی نەدەدا بە فرۆشتنی ئاو با کابراش جوولەکە بێت، چونکە بڕیارەکانی ئیسلام تایبەت نین بە پەرسشتی شەخصی دوور لە دەسەڵات، بەڵکو پێغەمبەر(ﷺ) حاکمی مەدینە بووەو بڕیارەکانیشی پەیڕەو کراون، بۆیە دەکرێت ئەو فەرموودەی ڕێگری کردن لە ئاو فرۆشتنە وەک کەراهیەت تایبەت بە موسڵمانان هاتبێت نەک وەک ئەمری واجب، واتە موسڵمانان کە بزانن کەسانی تر پێویستیان بە ئاوەو ئەوانیش ئاویان لەخۆیان زیادە بێت و ئەو ئاو بەخشینەش زیان نەگەیەنێت بە موڵکی تایبەتییان، دروست وایە ئاوەکە نەفرۆشن وەک چۆن ئیمامی عوثمان وایکرد، ئەمە ئەگەر لە موڵکی تایبەت بوو، بەڵام ئەگەر ئاوەکە موڵکی گشتی بوو ئەوە بۆی نیە لێی بفرۆشێت.

## ٢٨٢. ئیاسی کوڕی عەبدولا(رضي الله عنه)

ناوی ئیاسی کوڕی عەبدولّای فەهریەو کونیەکەشی ئەبوعەبدورەحمانەو زیاتریش بە کونیەکەی ناسراوە.[١]

## ٢٨٣. ئیاسی کوڕی عەبدولئەسەد(رضي الله عنه)

یەکێکە لەو هاوەڵانەی پێغەمبەر(ﷺ)بەشدار بوو لە فەتحی میصردا و هەر لەوێیش نیشتەجێ بوو.[٢]

## ٢٨٤. ئیاسی کوڕی عەدی(رضي الله عنه)

ناوی ئیاسی کوڕی عەددیە و لە هاوەڵە پشتیوانەکانە لە بەنی نەجار.[٣]

ئیاسی کوڕی نەجار بەشدار بوو لە غەزای ئوحوددا و تیایدا شەهید بوو.[٤]

## ٢٨٥. ئیاسی کوڕی موعاذ(رضي الله عنه)

ناوی ئیاسی کوڕی موعاذەو لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان.[٥]

قسەیەک هەیە لەسەر هاوەڵبوونی چونکە لە باسی ژیانیدا هاتووە پێش کۆچکردنی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ مەدینە هاتوەتە مەککەو گەڕاوەتەوە مەدینەو ماوەیەکی کەم پاش جەنگی بوعاثی نێوان ئەوس و خەزرەج لە مەدینە موعاذ مردووە، ئەوکاتیش گەرمەی تەمەنی لاوێتی بووە.

بەڵام گێڕانەوەیەکی تر هەیە هاوەڵبوونی دەسەلمێنێت، ئەویش ئەوەیە

---

[١] أسد الغابة، ج١، ص٢٣٤.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٦٥.

[٣] أسد الغابة، ج١، ص٢٣٥.

[٤] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٢٦.

[٥] أسد الغابة، ج١، ص٢٣٨.

کە ئەبولحەیسەر لەگەڵ دەستەیەک لە گەنجانی بەنی عەبدولئەشهەل هات بۆ مەدینە تا لەوێ هاوپەیمانێتیەکیان دەست بکەوێت، کاتێک هاتن پێغەمبەر(ﷺ) باسی ئەوانی بیست و چوو بۆ لایان و لایان دانیشت و پێی فەرموون شتێکی باشتر لەوەتان ئەوێت کە بۆی هاتون؟ وتیان: ئەو شتە چیە؟ فەرمووی: من پێغەمبەری خوام و خوا ناردوومی بۆ بەندەکانی تا بانگیان بکەم بۆ پەرستشتی خواو هاوەڵ بۆ دانەنانی، پێغەمبەر(ﷺ) باسی ئیسلامی کرد بۆیان، ئینجا بڕێ لە قورئانی خوێندەوە بەسەریاندا، خێرا ئیاس وتی: سوێند بەخوا ئەمە زۆر باشترە لەوەی کە بۆی هاتبووین، بەڵام ئەبولحەیسەر بە پەلاشێ دای بەناوچاویداو وتی: وازبێنە بەخوا ئێمە بۆ شتی تر هاتوین نەک بۆ ئەمە، ئیاسیش بێدەنگ بوو، دواتر وەفدەکە چوونەوە، ئەوەبوو رووداوی بوعاث لەنێوان ئەوس و خەزرەجدا روویدا، هێندەی نەبرد کە ئیاس لەناوچوو، کەسانی نزیکی و خزمانی دەڵێن بەردەوام دەمانبینی ئیاس دەیوت (لا إله إلا الله) و (الله أكبر) و (الحمد لله) و (سبحان الله)، واتە ئەمەی بە دەنگی بەرز دەوت: و خزمانیشی گوێیان لێ بوو، بۆیە هیچ گومانیان نەبوو لە موسڵمان بوونی.[1]

ئیبن سەعد هێناویەتی ژمارەی ئەو کەسانەی لەگەڵ ئەبولحەیسەر چوون پانزە کەس بوون کە یەکێکیان ئیاس بوو، وایان نیشاندا کە بۆ عومرە دەچن، لەوێ بۆ هاوپەیمانێکی قورەیش دەگەڕان دژ بە خەزرەج، ئەمانە یەکەم دەستەی پشتیوانان بوون کە پێغەمبەری خوایان(ﷺ) بینی لە ناوچەی (ذي المجاز)، هەروەها هێناویەتی سێ کەس لە خزمانی ئیاس دەیانوت بەردەوام ئیاسمان دەبینی تا مردنی دەیوت لا إله إلا الله.[2]

---

[1] تاريخ الطبري، ج١، ص٥٥٧، ص١٦٧، أسد الغابة، ج١، ص٢٣٨، البدايةو النهاية لابن كثير، ج٣، ص١٤٨.
[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٤٣٨.

دەبێت ئیاس لەکاتی بینینی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) موسڵمان بووبێت، هەر بۆیە ئەو مەشخەڵە ئیسلامی و پەیامە یەکخواپەرستیانەی لا إله إلا الله و الله أكبرى وەرگرتووەو وتوویەتیەوە، خودی وتن و دووبارەکردنەوەی ئەو دروشمە یەکخواپەرستیانەش لەلایەن ئیاسەوە ئاماژەن بە ویستی ڕاگەیاندنی موسڵمان بوونی خۆی و گەیاندنیشی بە دەوروبەری.

ئیمامی ئیبن کەثیر لە کتێبەکەیدا (البدايةو النهاية) ناونیشانێکی داناوە بە ناوی (موسڵمانبوونی ئیاسی کوڕی موعاذ) وەک ئەوەی هیچ گومانێک نەبێت لە موسڵمانبوونەکەی.[1]

بەو پێیەی یەکەم دەستەی پشتیوانان کە گەیشتبن بە پێغەمبەر(ﷺ) ئەم دەستە شانزە کەسیە بوون و لەناویاندا تەنها موسڵمانبوونی ئیاسی کوڕی موعاذ هاتووە، کەواتە دەبێتە بەڵگەی ئەوەی ئیاس یەکەم پشتیوانی بووە موسڵمان بووە و یەکەم پشتیوانیش بووە بە باوەڕداری وەفاتی کردووە.

## ٢٨٦. ئیاسی کوڕی هیلال(رضي الله عنه)

ناوی ئیاسی کوڕی هیلالی کوڕی ڕیئابی موزەنیە، کوڕێکی هەبوو بە ناوی قوررە، هەریەک لە ئیاس و قوررەی کوڕیشی هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بون.[2]

موعاویەی کوڕی قوررە کە نەوەی ئیاسە دەگێڕێتەوە کە قوورەی باوکی بۆی گێڕاوەتەوە پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئیاسی باپیرەی ناردووە بۆ کوشتنی پیاوێک کە باوەژنەکەی خۆی(ژنی باوکی) بە هاوسەر گرتبوو و چووبوویە لای، فەرمانی پێکرد پاش کوشتنیشی سامانەکەی پێنج یەک بکات، ئیاسیش چوو بۆ ئەوێ و دای لە گەردنی ئەو کەسە.[3]

---

[1] البدايةو النهاية لابن كثير، ج٣، ص١٤٨.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ١٦٨.

[3] السنن الكبرى للنسائي - كتاب الرجم - عقوبة من أتى ذات محرم، الرقم ٧١٨٦.

**وەستانێک:**

زانایان لەسەر ئەوە کۆکن ئەوەی لەگەڵ ژنی باوکیدا زینا بکات یان هاوسەرگیری بکات ئەوا لە هەردوو بارەکەدا سنووری خوای بەزاندووەو کەوتوەتە حەرامەوە، سەبارەت بە پەیڕەوی حوکم و سزادانی بۆ یەکەمیان سزای زیناکاری بەسەردا دەدرێت، بۆ سزادانی دووەم کە بریتیە لە بەهاوسەرگرتنی ژنی باوکی (باوەژن) لەگەڵ بوونی ئیجماع لەسەر تاوانباربوونی و حەرامی ئەو کارەی، بەڵام بۆ پەیڕەوی حەد لەسەری راجیایی هەیە، رای جمهوور لەسەر ئەوەیە ئەگەر ئافرەتێکی مەحرەمی هێنا لە خوشک یان دایکی یان ئەوەی کە هاوسەرگیری لەگەڵی حەرامە و گواستیشیەوە (واتە جیماعی لەگەڵ کرد) ئەوە حەددی زیناکاری لەسەر جێبەجێ دەکرێت، بەڵام ئەبوو حەنیفە پێی وایە ئەگەر کەسێک باوەژنەکەی بهێنێتەوەو بشزانێت لەسەری حەرامە ئەوا هێشتا حەددی لەسەر واجب نیە، چونکە پێی وایە عەقدی هاوسەرگیری ئەو حەددەی لەسەر ناهێڵێت.

شەوکانی لە باسی ئەم فەرموودەیەدا (کە لە بەرائی کوڕی عازبەوە هێناویەتی دەڵێت: خاڵۆمم بینی ئاڵایەکی پێ بوو وتم: بۆ کوێ دەڕۆیت وتی: پێغەمبەر(ﷺ) ناردوومی بۆ کوشتنی پیاوێک کە باوەژنەکەی خۆی(ژنی باوکی) بە هاوسەر گرتووە و چووەتە لای و پاش کوشتنیشی سامانەکەی ببەم) دەڵێت: ئەم فەرموودەی بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە ئیمام و دەسەڵاتداری وڵات بۆی هەیە فەرمان بکات بە کوشتنی هەرکەس کە پێچەوانەی حەرامکراوێکی یەکلاکراوەی شەریعەت بجووڵێتەوە وەک ئەم مەسەلەیە، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت (ولا تنكِحُوا ما نكح آباؤُكُمْ من النساء)، دەبێت ئەوە لە فەرموودەکە وەربگرین ئەو کەسەی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد بە کوشتنی دەیزانی ئەو شتە حەرامەو لەبەر بەحەڵاڵ کردنی ئەنجامی دابوو، ئەمەش هۆی کافربوونەو مورتەدیش دەکوژرێت لەبەر ئەو بەڵگانەی هاتون..[1]

---

[1] نيل الأوطار للشوكاني، ج٧، ص ٢٨٦.

## ٢٨٧. ئیاسی کوڕی وەدقە(ﷺ)

ناوی ئیاسی کوڕی وەدقەیە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان،[١] بەشدار بوو لە جەنگی یەمامەدا و تیایدا شەهید بوو.[٢]

## ٢٨٨. ئیاسی کوڕی ئەوس(ﷺ)

ئەم هاوەڵە ناوی ئیاسی کوڕی ئەوسی کوڕی عەتیکە، لە پشتیوانانە لە بەنی عەبدولئەشهەل.[٣]

ئەوسی باوکیشی لە هاوەڵان بوو کە لە جەنگی جیسر ئەبووعوبەیدا کوژرا.[٤]

رایەکی تر ناوی ئیاسی بە ئەنەس هێناوەو دەڵێت: ئەوس کوڕێکی هەبوو بە ناوی ئەنەس کە لە جەنگی ئوحوددا بەشدار بوو و لە جەنگی خەندەقدا شەهید بوو.[٥]

دەوترێت لە غەزای ئوحوددا شەهید بوو، دەشوترێت بەڵکو لە غەزای خەندەقدا شەهید بوو.[٦]

## ٢٨٩. ئیبراهیمی نەجار(ﷺ):

هەریەک لە ئیبن حەجەر و ئیبن ئەثیر ناوی ئەم کەسایەتیە بە هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) دەهێنن و پێیان وایە ئەم کەسەیە کە مینبەرەکەی پێغەمبەری(ﷺ) دروست کردبێ،[٧] بەڵام هەریەک لە ئیبن مندە و ئیبن قانع و ئیبن عەبدولبەر ناوی ئەم کەسەیان نەهێناوە.

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ١٦٨.

[٢] أسد الغابة، ج١، ص٢٣٩.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٦٣.

[٤] أسد الغابة، ج١، ص٢٠١.

[٥] أسد الغابة، ج١، ص١٨٦.

[٦] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٦٣.

[٧] أسد الغابة، ج١ص٧٠.

ئـەوەی لەبـارەی ئـەم هاوەڵـەوە هاتـووە فەرموودەیەکـە کـە طەبەرانـی لـە (المعجـم الأوسـط) هێناویەتـی لـە جابـری کـوڕی عەبـدوڵاوە (ﷺ) کـە پێغەمبـەر(ﷺ) لای دارخورمایەک وتاری دەدا و پاڵی پێوە دەدایەوە، پێی وترا ئـەی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) ئیسلام تـەواو بوو-تـەواو بڵاوبووەتـەوە- و خەڵکی زۆر بون و لە هەموو ئاسۆکانەوە خەڵکی دێن بۆ لات، بەڵکو فەرمان بکەیت شتێ دروست بکرێ تا لەسەری دیار و لەبەرچاو بیت، ئەویش بە کەسێکی فەرمـوو، ئایا مینبەر دروست ئەکەیت؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: ناوت چیە؟ وتی: فڵان، فەرمووی: تۆ هی ئەم کارە نیت، کەسێکی تری بانگ کرد و پرسیاری لێکردو هەمان جۆر روویدا، ئینجا کەسێکی تری بانگ کرد و پێی فەرموو: ئایا مینبەر دروست ئەکەیت؟ وتی: بەڵێ إن شاء الله،، فەرمووی: ناوت چیە؟ وتی: ئیبراهیم، فەرمووی: دەست بکە بە دروست کردنی،...).[1]

بـەڵام بـە گێڕانـەوەی صەحیحـی ئیمامـی بوخـاری و بەپێـی زۆرینـەی سـەرچاوەکانی هـاوەڵان ئـەو کەسـەی مینبەرەکـەی دروست کردووە کۆیلەی ئافرەتێک بـوو،[2] لـە هەنـدێ سـەرچاوەدا نـاوی ئـەو کەسـەی مینبەرەکـەی دروستکردووە بـە باقـوم هاتـووە.[3]

لـە صەحیحـی بوخاریدا لـە جابـری کـوڕی عەبـدوڵاوە هاتـووە ئافرەتێک بـە پێغەمبـەری(ﷺ) وت: ئـەی پێغەمبـەری خـوا شتێکت بـۆ دروست نەکـەم لەسـەری دابنیشـیت؟ چونکـە مـن کۆیلەیەکـم هەیـە دارتاشـە، پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمـووی: ئەگـەر ئەتـەوێ باشـە، ئەویـش دەسـتی کـرد بـە دروسـتکردنی،[4] بـە گێڕانـەوەی دیکـە هاتـووە پێغەمبـەر(ﷺ) داوای کـردووە خزمەتکاری ئـەو ئافرەتـە مینبەرەکـەی بـۆ دروست بـکات.[5]

---

[1] المعجم الأوسط للطبراني، الرقم ٥٣٦٩، أسد الغابة، ج١ص٧٠.
[2] صحيح البخاري - كتاب الجمعة - باب الخطبة على المنبر، الرقم ٩١٧.
[3] معرفة الصحابة لإبن منده، ص٣٠٦، أسد الغابة، ج١ص٧٠.
[4] صحيح البخاري - كتاب الصلاة - باب الاستعانة بالنجار والصناع في أعواد المنبر والمسجد، الرقم ٤٤٩.
[5] صحيح البخاري - كتاب الجمعة - باب الخطبة على المنبر، الرقم ٩١٧.

ریوایەتێکی دیکە ئاماژە بەوە دەدات پێغەمبەر(ﷺ) کە وتاری دەدا زۆر بە پێوە دەوەستا و ماندوو دەبوو، دواتر لە پەنا دارخورمایەکدا شوێنێکیان بۆ دروست کرد، جارێک کە وتاری دەدا، کابرایەک تازە هاتبووە ناو مەدینەوە، پێغەمبەری(ﷺ) لە وتاردانەکەدا بینی، بەو خەڵکەی چواردەوری وت: ئەگەر بزانم موحەممەد سوپاسم دەکات لەسەر شتێک بەرامبەری بکرێت، ئەوە شوێنێکی بۆ دروست دەکەم کە لەسەری بوەستێت و چەندەش بیەوێت بتوانێت لەسەری دابنیشێت، پێغەمبەر(ﷺ) کە ئەمەی بیست، فەرمووی: بیهێنن بۆ لام، ئینجا فەرمانی پێکرد ئەو سێ یان چوار پلیکانەی بۆ دروست بکات، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) بەوە حەسایەوە.[١] ئەو کابراش کەسێکی رۆمی بوو.[٢]

ئیبن حەجەر دەڵێت لەوانەیە ئەمە هەر ئەم هاوەڵە بێت و ناوی ئیبراهیم و نازناوەکەی باقووم بووبێت.[٣]

لەو ئەگەرەی ئیبن حەجەرەوە ئەو ئەگەرەی تریش هەیە لەوانەیە ئەو کەسە بە باقووم ناسرابێت و دواتر کە موسڵمان بووبێت ناوی خۆی گۆڕیبێت بە ئیبراهیم.

ئیبن حەجەر لە شەرحی صەحیحی بوخاریدا بە وردی باسی دروستکردنی مینبەرەکەی پێغەمبەری(ﷺ) هێناوە، باس لە هەریەک لە ئیبراهیمی نەجار و باقوم و تەمیمی داری دەکات، ئەو ریوایەتەی باسی باقوم دەکات بە لاوازی داناوە، ئەوەشیان باسی تەمیمی داری دەکات سەنەدەکەی بە جەید داناوە،[٤] لە گێڕانەوەیەکدا هاتووە دەڵێت باقوم داوای لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد تا لەسەر شێوازی ئەو مینبەرەی لە شام بینیویەتی مینبەرێکی بۆ دروست بکات، ئەویش راوێژی کرد بە هاوەڵان و ئەوانیش پێیان باش بوو مینبەرەکە

[١] مسند الدارمي – مقدمة المؤلف – باب ما أكرم النبي(ﷺ) من حنين المنبر، الرقم ٣٢.

[٢] مسند الدارمي – مقدمة المؤلف – باب ما أكرم النبي(ﷺ) من حنين المنبر، الرقم ٤٢.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٢١.

[٤] فتح الباري بشرح صحيح البخاري لابن حجر العسقلاني، ج٢، ص٣٩٨.

دروست بکات، عەبباسی کوڕی عەبدولموطەلیب وتی: من کۆیلەیەکم هەیە پێی دەوترێت کیلاب، زۆر ئیشکەرە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بینێرە با بەردەستی بۆ بکات، ئەویش ناردی و... مینبەرەکەیان بۆ پێغەمبەر(ﷺ) دروست کرد.[1]

دواتر ئیبن حەجەر دەڵێت بەڵگەی دروست نیە لەسەر ئەوەی تەمیمی داری دروستی کردبێت، بەڵکو پێی وایە بەڵگەی راست لەسەر ئەوەیە مەیموون دروستی کردبێ، دەشڵێت گونجاو نیە چەند کەسێک دروستیان کردبێت، چونکە مەدینە یەک دارتاشی کارای هەبووە، بەڵام دەکرێت ئەو یەک کەسە وەستاکە بووبێت و ئەوانی تر هاریکار و بەردەستی بووبن.[2]

دەکرێت بڵێین:

یەکەم: بیرۆکەی دروستکردنی مینبەر لە شامەوە وەرگیراوە.

دووەم: کەسێک ئەم بیرۆکەی خستوەتەڕوو کە زۆر سەردانی رۆمی کردووە.

سێیەم: کەسانێ بەردەستییان کردووە بۆ دروستکردنی مینبەرەکە.

بۆ وەرگرتنی وردەکاری زیاتر سەبارەت بە دروستکردنی مینبەرەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بڕوانە (فتح الباري: باب التأذين عند الخطبة).

## ٢٩٠. ئیبراهیمی کوڕی جابر(رضي الله عنه):

ئەم هاوەڵە کۆیلەی خەرشەی ثەقەفی بوو، سەبارەت بە وردەکاری لەسەر ژیانی ئەم هاوەڵە تەنها ئیبن حەجەر لە (الإصابة)دا شتێکی کەمی لەسەر هێناوە، بەڵام هەریەک لە ئیبن مندە و ئیبن ئەثیر و ئیبن قانع و ئیبن عەبدولبەر لە کتێبەکانیاندا تایبەت بە ژیانی هاوەڵان ناوی ئەم هاوەڵەیان نەهێناوە.

---

[1] الطبقات الکبری لابن سعد، ج١، ص٢٥٠.

[2] فتح الباري بشرح صحيح البخاري لابن حجر العسقلاني، ج٢، ص٣٩٩.

ئەم هاوەڵە لە جەنگی طائیف موسڵمان بوو کاتێک ئەوانەی لە قەڵای طائیف بوون دابەزین بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، ئیبراهیمی کوڕی جابریش یەکێک بوو لەوانەی لەگەڵ ژمارەیەک کۆیلەی تردا دابەزین، پێغەمبەر(ﷺ) ئازادی کرد و دایە دەست ئوسەیدی کوڕی حوضەیر و فەرمانی بە حوضەیر کرد تا یارمەتی بدات و لە پێویستی خواردن وپۆشاک و پێویستیەکانی تردا یارمەتی بدات، هەروەها زانستی فێر بکات.[1]

مەبەست بە فێرکردنەکە ئەوەبووە شارەزای بکات لە ئیسلامدا.

**پەند و وانە:**

ئەم هەنگاوەی پێغەمبەر(ﷺ) کە ئیبراهیمی کۆیلەی تازە موسڵمان بووی دایە دەست ئوسەید تا هەم پێویستی دابین بکات و هەم زانستی پێ ببەخشێت، دوو لایەنی گرنگی لەخۆگرت، ئەویش بریتیە لە دڵخۆشی و پاڵپشتی ماددی بۆ برا موسڵمانەکەت، هاوکات تێرکردنی بە زانیاریە پێویستیەکانی ئیسلام، واتە دڵنیاکردنی پێویستیە دنیاییەکان بۆ تاکی تازەموسڵمان بوو و لەگەڵ ئەوەشدا شارەزاکردنی بە ئیسلام، هەرچەندە حاڵەکە حاڵەتی جەنگ بوو، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) ئەو بەرنامەی پشتگوێ نەخست، ئەمەش سیفەتی سەرکردەیە کە دەبێت بیری لای دنیا و قیامەتی تاکەکانی ناو کۆمەڵگە بێت و بە کردەیی وانەی برایەتی ئیمانییان پێ پەیڕەو بکات تا تێبگەن خوای گەورە ئەم برایەتیەی لا لەپێشترە، برایەتیەک نا کە لە زار و دڵەکان زیاتر هیچ نەبێت، بەڵکو زار و دڵ و کرداریشی لەخۆگرتووە.

## ٢٩١. ئیبراهیمی کوڕی حارث(رضي الله عنه):

ئەم هاوەڵە قورەیشیە و یەکێکە لە کۆچەران کە لە گەڵ حارثی باوکیدا کۆچی کرد بۆ مەدینە، سەبارەت بە باوکی دوو راهەیە: یەکەمیان دەڵێت: کۆچی کرد بۆ حەبەشەو لەوێ خوا سێ منداڵی پێدا، مووسا و زەینەب و

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ ص١٩.

ئیبراهیم کە هەرسێیان لەوێ مردون، رای دووەمیش دەڵێت: حارث بە خۆی و منداڵەکانیەوە چووە بەرەو مەدینە بەڵام لە رێدا لە ئاوێکیان خواردەوە، هەموویان مردن جگە لە حارث.[1]

ئیبن حەجەر پێی وایە لەوانەیە حارث جگە لەم ئیبراهیمە کوڕێکی تری هەبووبێت بەناوی ئیبراهیم، چونکە ئەم ئیبراهیمەیان کوڕێکی بووەو کوڕەکەشی ناوی موحەممەد بووە.[2]

ئیبراهیم فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە، هاوکات موحەممەدی کوڕیشی یەکێک بوو لە فەرموودەناسە گەورەکان کە فەرموودەی گێڕاوەتەوە.[3]

## ٢٩٢. ئیبراهیمی کوڕی عەبباد(ﷺ):

ئەم هاوەڵە بەڕێزە یەکێکە لە پشتیوانەکان، واتە خەڵکی مەدینەیە و سەر بە ئەوسیەکانە، رەچەڵەکی ئەم هاوەڵە واهاتووە: ئیبراهیمی کوڕی عەببادی کوڕی ئەسافی کوڕی عەدی کوڕی یەزیدی کوڕی جوشەمی کوڕی حارثەی کوری حارثی کوڕی خەزرەجی کوڕی عەمری کوڕی مالیکی کوڕی ئەوسە.[4]

بەڵام ئیبن ئەثیر لە (أسد الغابة) دا لە نێوان عەبباد و ئەسافدا نوهەیک دێنێت.[5]

باوکی ئیبراهیم لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) پێشنوێژی قەومەکەی بووە، لە فەرموودەیەکدا هاتووە جارێکیان عەبباد نوێژی بۆ کردون، گوێی لە هاوارکەرێ بوو هاواری دەکرد وریابن پێغەمبەری خوا رووی بەرەو

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص١٩.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص١٩.
[3] سير أعلام النبلاء، ج٥ص٢٩٤.
[4] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١ص٦١.
[5] أسد الغابة، ج١ص٦٦.

کەعبە وەرچەرخاند، ئەوانیش وەرچەرخان بەولادا و روویانکردە کەعبە.[1]

ئیبراهیم لە جەنگی ئوحوددا بەشدار بوو.[2]

هەروەها ئیبراهیم فەرموودەیەکی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە کە ئیبن قانع لە (معجم الصحابة)دا هێناویەتی.[3]

## ٢٩٣. ئیبراهیمی کوڕی عەبدورەحمانی عوذری(ﷺ):

ناوی ئیبراهیمی کوڕی عەبدورەحمانی عوذریە،[4] فەرموودەیەکی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە.[5]

## ٢٩٤. ئیبراهیمی کوڕی عەبدولا(ﷺ):

ناوی ئیبراهیمی کوڕی عەبدولای کوڕی قەیسە،[6] باوکی ئەبووموسای ئەشعەری هاوەڵی ناوداری پێغەمبەری خوایە.[7]

ئیبراهیم گەورە کوڕی ئەبووموسای ئەشعەری بوو.[8]

ئەبوو مووسای ئەشعەری دەڵێت: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا منداڵێکمان بوو، منیش بردم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و ئەویش ناوی نا ئیبراهیم و بە خورمایەک لێوی شیرین کرد و نزای بەرەکەتی بۆ کرد ئینجا دایەوە کۆشی خۆم).[9]

---

[1] معجم الصحابة، ج٢ص١٨٩.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص١٩، أسد الغابة، ج١ص٦٦.
[3] معجم الصحابة، ج٢ص١٨٩.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٢٥.
[5] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٦٩٤، أسدالغابة، ج ١، ص٦٧.
[6] أسدالغابة، ج١، ص٦٨.
[7] معجم الصحابة لابن قانع، ج٢، ص١٢٤، أسدالغابة، ج٣، ص٣٧٦.
[8] أسدالغابة، ج١، ص٦٨.
[9] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص١٠٧، أسدالغابة، ج١، ص٦٨

## ٢٩٥. ئیبراهیمی کوڕی قەیس(رضي الله عنه):

ئـەم هاوەڵـە نـاوی ئیبراهیمی کـوڕی قەیسـی کـوڕی حجـری کـوڕی مەعدیەکریبی کندیە، برایەکی هەبوو بە ناوی ئەشعەث،[١] کوڕێکیشی هەبوو بە نـاوی ئیسـحاق ئەعرەج.[٢]

ئیبراهیمی کوڕی قەیس بە وەفد هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)[٣] و موسڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند.[٤]

## ٢٩٦. ئیبن ئەبجەر(رضي الله عنه):

سەبارەت بە ناوی ئەم هاوەڵە ڕاجیایی هەیە، هەندێ پێیان وایە ناوی ئەبجەری کوری غالبە،[٥] هەندێکی تر پێیان وایە ئیبن ئەبجەرەو ناوی غالبی کوڕی ئەبجەرە،[٦] ڕای دووەمیش ڕاستترە، چونکە لە زۆربەی سەرچاوەکاندا واهاتووە، هەریەک لە ئیبن مندەو ئیبن حەجەرو ئیبن ئەثیر و ئیبن عەبدولبەرو ئیبن قانع ڕای دووەم بە ڕاستتر دەزانن،[٧] لە سەنەدی ئەو فەرموودەشدا کە پەیوەستە بەم هاوەڵەوە و دواتر دەیهێنین هەر بە ئیبن ئەبجەر (غالبی کوری ئەبجەر هاتووە)، ئیبن ئەبجەر گەورەی موزەنیەکان بوو.[٨]

ئەو فەرموودەی ئیبن ئەبجەر گێڕاویەتیەوە تایبەتە بە مەسەلەی حەرام و حەڵاڵی گۆشتی کەرەکێوی و تیایدا بە حەڵاڵ زانراوەو فەرموودەکەش سەنەدی لاوازە.[٩]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص١٩.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص١٩.

[٣] أسد الغابة، ج١ص٦٩.

[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص١٩.

[٥] معرفة الصحابة، الرقم ١٠٢٩.

[٦] معرفة الصحابة لابن منده، ص٢٠٩.

[٧] معجم الصحابة، ج٢ص٣١٨، معرفة الصحابة لابن منده، ص٢٠٩، الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٣ص١٢٥٢، أسد الغابة، ج١ص٦١.

[٨] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٢٢٥.

[٩] شرح معاني الآثار - كتاب الصيد والذبائح والأضاحي - باب أكل لحوم الحمر الأهلية، الرقم ٦٣٧١.

## ٢٩٧. ئیدریس(ﷺ):

وەک وەفد هاتووەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)لەگەڵ بوحەیراو ئەبرەهەو ئەشرەف و تەمام و ئەیمەن و نافع و تەمیم.[١]

ئیبن ئەثیر سەبارەت بە هاتنی ئەم هاوەڵە گێرانەوەیەک دێنێت: کاتێک موسڵمانانی حەبەشە زانییان پێغەمبەر(ﷺ)و موسڵمانان لە جەنگی بەدردا سەرکەوتن، داوای مۆڵەتیان کرد لە نەجاشی تا بچنەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، ژمارەیەک لەوانەی لای نەجاشی بوون و بڕوایان هێنابوو بە نەجاشییان وت: مۆڵەت بدە بە ئێمەش با بچین بۆ لای ئەو پێغەمبەرەو بزانین ئەو کەسەیە کە لە کتێبەکەماندا باسی کراوە؟ ئەوەبوو چوون بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و لەگەڵیدا بەشداری غەزای ئوحود بوون، ریوایەتێ لە موقاتیل و کەسانی تریشەوە دێنێ کە وتویانە ئەوانە ٤٠ کەس بوون، سی و دوو کەسیان لە گەڵ جەعفەری طەیاردا هاتن، هەشت کەسیشیان لە شامەوە هاتن (بوحەیراو ئەبرەهەو ئەشرەف و تەمام و ئیدریس و ئەیمەن و نافع و تەمیم)، ئەمە گێرانەوەی ئەبوو مووسا بوو کە ئیبن ئەثیر هێناویەتی، ئیبن ئەثیر دەڵێت: ئەگەر مەبەستی بە بوحەیرا یەکێکی تری جیا لەو بوحەیرایە بێت کە پێغەمبەر(ﷺ) بە منداڵی بینی، ئەوە ئەگەری هەیە ئەم هاتنی وەفدە راست بێت.[٢]

ئیبن حەجەر دەڵێت: وادیارە ئەمە بوحەیرایەکی ترە، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) ئەوی لە خاکی شام دیوە، بەڵام ئەم بوحەیرایەیان لە حەبەشە بووە، باکووری وڵات لەکوێ و باشووری لەکوێ، ئاساییە دوو کەس یەک ناویان هەبێ.[٣]

---

[١] أسد الغابة، ج١ص٧١.

[٢] أسد الغابة، ج١ص٧١.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٢٢.

بەڵام بەپێی هەموو سەرچاوەکان جەعفەری طەیار(ﷺ) و موسڵمانان لە فەتحی خەیبەردا هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)،[1] دیاریشە غەزای ئوحود لەپێش فەتحی خەیبەر روویداوە، بۆیە هاتنی ئەو کەسانە لەگەڵ جەعفەری طەیار بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و بەشداری کردنیان لە غەزای ئوحوددا، بەپێی سەرچاوەکان هەڵەیەو راستی تێدا نیە، دەشکرێ ئەو ئەگەرە دابنێین ئەو کەسانەی تر (واتە ئەو ٤٠ کەسە) بەجیا و بەبێ جەعفەر هاتبن، وەک چۆن ئیبن حەجەر باس لەوە ناکات هاتنی ئەو کەسانە لەگەڵ جەعفەردا بووبێت.[2]

## ٢٩٨. ئیسحاقی غەنەوی(ﷺ):

ئەم هاوەڵە دانیشتووی مەککە بوو، خوشێکی هەبوو بە ناوی ئوم ئیسحاق کە مێردێکی بێباوەڕی هەبوو، پێکەوە بڕیاریان دا کۆچ بکەن بۆ مەدینە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، بەڵام لە میانەی رێدا ئیسحاق بە خوشکەکەی وت: لێرە بە چاوەڕێم بە تا بڕۆمەوە مەککە هەندێ پارەو شمەکم بیرچووە بچم بیهێنم، ئوم ئیسحاق وتی: مەڕۆ ئەترسم فاسق (مێردەکەی) بتکوژێ، ئیسحاق چوو و ئوم ئیسحاق لەوێ مایەوە، سوارێ کە لە مەککەوە دەهات دای بەلای ئوم ئیسحاقدا، وتی: ئوم ئیسحاق بۆچی لێرە وەستاویت؟ وتی: چاوەڕێی ئیسحاقی برام ئەکەم، سوارەکە وتی: ئیسحاقت بۆ نەما، کاتێک ئیسحاق لە مەککە دەرچوو فاسقی مێردت خۆی پێگەیاند و کوشتی، ئوم ئیسحاقیش بڕیاری نەگۆڕی و چوو بۆ مەدینە.[3]

نازانین ئایا ئیسحاق پێغەمبەری خوای(ﷺ) دیوە یان نا، بەڵام لەوانەیە بە باوەڕداری لە مەککە پێی گەیشتبێت و لەوێ مابووبێتەوە و دواتر کۆچی کردبێت، چونکە بڕێ لە موسڵمانانی بێتوانا لە مەککە مابوونەوە.

---

[1] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١ص٢٤٢، أسد الغابة، ج١ص٤٢١، سير أعلام النبلاء للذهبي، ج١ص٢٠٦.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٢٢.

[3] أسدالغابة، ج١، ص١٠٦.

سەبارەت بە کاتی کۆچی ئەو خوشک و برایەش دوای ساڵی دووەمی کۆچی یان سێیەمی کۆچی بووە، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) لە ساڵی دووەم یان سێیەمی کۆچی حەفصەی بەهاوسەرگرتووە،[1]ئوم ئیسحاقیش دەڵێت: من کاتێک چوومە مەدینە پێغەمبەر(ﷺ) لە ماڵی حەفصەی خێزانی بوو.

## ٢٩٩. ئیسحاقی کوڕی سەعد(رضي الله عنه):

ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە و ناوی ئیسحاقی کوڕی سەعدی کوڕی عوبادەی خەزرەجیە، لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) لەدایکبوو.[2]

## ٣٠٠. ئیسحاقی کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص(رضي الله عنه):

ناوی ئیسحاقی کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصە و گەورە کوڕی سەعد بووە، بەڵام هەر بە منداڵی مرد، سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص کونیەی ئەبووئیسحاقی بەم کوڕەیەوە وەرگرتووە.[3]

## ٣٠١. ئیسماعیل(رضي الله عنه):

زانیاری سەبارەت بە ناو و رەچەڵەکی نیە، ناوی ئیسماعیله، چوویە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و فەرموودەی لێ بیستووە، لە بەصرە نیشتەجێ بووە.[4]

گێڕانەوەیەک هاتووە کە ئەبووبەکری کوڕی عومارە لە باوکیەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (لن يلج النار رجل صلى قبل طلوع الشمس وقبل غروبها)، (کەسێک پێش خۆر هەڵاتن و پێش خۆرئاوابوون نوێژ بکات، پێ ناخاتە ناو دۆزەخەوە)، کەسێکی بەصری پێی وت: ئایا تۆ ئەوەت

[1] أسدالغابة، ج٧، ص٧٤.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٨١.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٨١.
[4] -أسد الغابة، ج١، ص١٢٣-١٢٤.

بیستووه له پێغەمبەر(ﷺ)؟ وتی: بەڵێ، کەسەکە وتی: منیش شایەتی دەدەم کە ئەوەم لە پێغەمبەر(ﷺ) بیستووە.[1]

هەریەک لە ئەبوونوعەیم و ئیبن حەجەر دەڵێن ئیبن خوزەیمە لە سەنەدەکەدا هێناویەتی کە ئەو هاوەڵە ناوی ئیسماعیل بوو، ئیبن حەجەریش دەڵێت: تەنها لەم ڕێگەیەوە ئەو ناوە هاتووە، سەنەدەکەی صەحیحە.[2]

مەبەستی فەرموودەکە گەورەیی نوێژی بەیانی و نوێژی عەسرە کە خێر و پاداشتیان زۆر گەورەیە، وەک لە فەرموودەی تری صەحیحدا سەبارەت بە گەورەیی ئەو دوو نوێژە هاتووە (من صلى البردين دخل الجنة)،[3] پرسیار کرا لە ئەبوو موحەممەد، مەبەست بەو دوانە چیە؟ وتی: نوێژی بەیانی و عەسر.[4]

## ٣٠٢. ئیمائی کوڕی ڕەحەضە(ﷺ)

ناوی ئیمائی کوڕی ڕەحەضەی کوڕی خوربەی کوڕی خیلافە، لە غیفاریەکانە.[5] کوڕێکی هەبوو بە ناوی خوفاف کە زۆر زوو موسڵمان بوو.[6]

ئیماء گەورە و پیاوماقووڵی ناو هۆزی غیفار بوو،[7] غیفاریەکان ئەویان وەک وەفدی خۆیان دەنارد بۆ شوێنان.[8]

سەبارەت بە کاتی موسڵمانبوونی ئیماء ڕاجیایی هەیە، بەپێی ئەو فەرموودەی صەحیحی موسلیم بێت کە باسی موسڵمانبوونی غیفاریەکان دەکات دەڵێت: ئیماء بەرنوێژی دەکرد بۆیان،[9] بەڵام لە موسنەدەکەی

---

[1] مسند أحمد بن حنبل - أول مسند الكوفيين(ﷺ) - حديث عمارة بن رويبة(ﷺ)، الرقم ١٨٥٨٧.
[2] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٠٠٨، الإصابة في تميز الصحابة، ج١، ص ٦٥.
[3] صحيح البخاري - كتاب مواقيت الصلاة - باب فضل صلاة الفجر، الرقم ٥٧٤.
[4] مسند الدارمي - كتاب الصلاة - باب فضل صلاة الغداة وصلاة العصر، الرقم ١٤٦٥.
[5] أسد الغابة، ج١، ص٢٤٠، الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٣٥.
[6] أسد الغابة، ج١، ص٢٤٠.
[7] صحيح مسلم - كتاب فضائل الصحابة - باب من فضائل أبي ذر(ﷺ)، الرقم ٢٤٧٣.
[8] أسد الغابة، ج١، ص٢٤٠.
[9] صحيح مسلم - كتاب فضائل الصحابة - باب من فضائل أبي ذر(ﷺ)، الرقم ٢٤٧٣.

ئەحمەدی کوڕی حەنبەلدا واهاتووە کە خوفافی کوڕی بەرنوێژی کردووە بۆیان و ئەوکاتیش گەورەی ئەو کۆمەڵەی غیفاریەکان خوفاف بوو.[1]

ئیماء پێشتر لە ناوچەی غەیقە نیشتەجێ بووو زوو زوو هاتوچۆی مەدینەی دەکرد.[2]

ئیماء لە جەنگی بەدردا لە سوپای بێباوەڕاندا بەشدار بوو،[3] بەڵام ماوەیەک پێش صولحی حودەیبیە موسڵمان بوو وماڵیشی هێنایە مەدینە.[4]

## ٣٠٣. ئامینەی کچی ئەرقەم(رضي الله عنها)

ناوی ئامینەی کچی ئەرقەمەو لە ئافرەتە کۆچەریەکانە، پێغەمبەر(ﷺ) لە ناوچەی عەقیق بیرێکی پێ بەخشی، ئیتر ئەو بیرە بە بیری ئامینە ناسرا.[5]

## ٣٠٤. ئامینەی کچی قەیس(رضي الله عنها)

ناوی ئامینەی کچی قەیسی کوڕی عەبدولایە، ئامۆزای زەینەبی دایکی باوەڕدارانە، ئەم ئافرەتە زۆر زوو لە مەککە موسڵمان بوو و کۆچی کرد بۆ حەبەشە، دواتر گەڕایەوە بۆ مەککەو لەوێوە کۆچی کرد بۆ مەدینە.[6]

## ٣٠٥. ئامینەی کچی عەففان(رضي الله عنها)

ناوی ئامینەی کچی عەففانی کوڕی ئەبیلعاصەو خوشکی عوثمانی کوڕی عەففانی خەلیفەی سێیەمی موسڵمانانە، ئەم ئافرەتە لە فەتحی مەککەدا موسڵمان بوو و هاودەم بە هیندی ژنی ئەبووسوفیان بەیعەتی دا بە پێغەمبەری خوا(ﷺ).[7]

---

[1] مسند أحمد بن حنبل – مسند الأنصار(رضي الله عنهم) – حديث أبي ذر الغفاري(رضي الله عنه)، الرقم ٢١٩٢٦.
[2] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٣٥.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ١٦٩.
[4] أسد الغابة، ج١، ص٢٤٠.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٤٧٣.
[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٤٧٤.
[7] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٤٧٥.

## ٣٠٦. ئامینەی ئەنصاری(ﵢ)

ناوی ئامینەی کچی قرطی کوڕیە خەنسائە، ئەم ئافرەتە لە پشتیوانانەو چووەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمان بووەو بەیعەتی پێداوە.[1]

## ٣٠٧. ئەثیلەی کچی حارث(ﵢ)

ناوی ئەثیلەی کچی حارثە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانەو چووەتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و بەیعەتی پێداوە.[2]

## ٣٠٨. ئەروای کچی ئەبیلعاص(ﵢ)

ناوی ئەروای کچی ئەبیلعاصەو پووری عوثمانی کوڕی عەففانە، لە فەتحی مەککەدا موسڵمان بوو و بەیعەتی دا بە پێغەمبەری خوا(ﷺ).[3]

## ٣٠٩. ئەروای کچی عەبدولموطەلیب(ﵢ)

ناوی ئەروای کچی عەبدولموطەلیبی کوڕی هاشمەو پووری پێغەمبەری خوایە(ﷺ)، هاوسەری عومەیری کوڕی وەهب بوو، دوای وەفاتی ئەو شووی کرد بە کلدەی کوڕی عەبدمەناف، دوای موسڵمانبوونی حەمزەی برای موسڵمان بوو و هانی کوڕەکانی دەدا تا پشتیوانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بن، ئەم ئافرەتە یەکێک بوو لە کۆچەران و کۆچی کرد بۆ مەدینە.[4]

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٤٧٦.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٤٧٧.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٤٨٠.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٤٨٠

## ٣١٠. ئەروای کچی کورەیز(رضي الله عنها)

ناوی ئەروای کچی کورەیزی کوڕی رەبیعەی عەبشەمیەو دایکی عوثمانی کوڕی عەففانی خەلیفەی سێیەمی موسڵمانانە، لە مەککە موسڵمان بوو و دواتر کۆچی کرد بۆ مەدینەو لەوێ مایەوە تا لە خیلافەتی کوڕەکەیدا وەفاتی کردو خەلیفە خۆی نوێژی لەسەر کرد و لە گۆڕستانی بەقیع ئەسپەردەی کردو دواتریش لەسەر گۆڕەکەی وەستابوو و نزای بۆ دەکرد.[1]

## ٣١١. ئەسمائی کچی سەعید(رضي الله عنها)

ناوی ئەسمائی کچی سەعیدی کوڕی زەیدی قورەیشی عەدویە، ئەم ئافرەتە خۆی و باوکیشی هاوەڵی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوون.[2]

## ٣١٢. ئەسمائی کچی سەلامە(رضي الله عنها)

ناوی ئەسمائی کچی سەلامە یان کچی سەلەمەیەو هاوسەری عەییاشی کوڕی ئەبی رەبیعە بوو، ئەم ئافرەتە هاودەم بە مێردەکەی لە مەککە موسڵمان بوو و دواتر پێکەوە کۆچیان کرد بۆ حەبەشەو دواتر گەڕانەوە مەککەو ویستیان کۆچ بکەن بۆ مەدینە، دواتر کە عەییاش لەدەست بێباوەڕانی مەککە رزگاری بوو و کۆچی کرد، ئەسمائیش کۆچی کرد بۆ مەدینە.[3]

## ٣١٣. ئەسمائی کچی شەکەل(رضي الله عنها)

ناوی ئەسمائی کچی شەکەلە، عائیشەی دایکی باوەڕداران دەڵێت: ئەسمائی کچی شەکەل هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٤٨١-٤٨٢.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٤٨٤.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٤٨٤.

خـوا(ﷺ) کـە یەکێکمـان لـە حەیـز پـاک بوویـەوە چـۆن خـۆی بشـوات؟ پێغەمبەریش(ﷺ) وەڵامـی دایـەوەو فەرمـووی: (ئـاو و سـیدرەکەی -گەڵایـەک بووە بۆ پاککردنـەوە بەکارهاتـووە- هەڵبگرێـت و بەجوانی خۆ پـاک بکاتـەوە و دواتـر ئـاو بکات بەسـەریدا و هێنده ئـاوی بەسـەردا بکات تـا بگاتـە هەمـوو بەشـەکانی سـەری، دواتـر ئـاو بـکات بەسـەریدا و دواتـر پارچـە خـوری یـان لۆکەیەکـی بۆنخـۆش بگرێـت و خـۆی پـێ پـاک بکاتـەوە)، ئەسـمائیش وتـی: چـۆن خـۆی پـێ پـاک بکاتـەوە؟ پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمـووی: سـوبحانەڵا، دەی خۆی پێ پاک بکاتـەوە، عائیشـە دەڵێت: مەبەسـتی شـوێنەوار خوێنەکـە بـوو، ئینجـا سـەبارەت بـە لەشـگرانیش پرسـیاری لێکـرد و پێغەمبـەر(ﷺ) وەڵامـی دایـەوە.[1]

## ٣١٤. ئەسمائی کچی عەبدوڵا(کچی ئەبووبەکری صدیق)(رضي الله عنها)

نـاوی ئەسـمائی ئەسـمائی کچـی عەبـدوڵای کـوڕی عوثمانـی تەیمیـە، باوکـی بـە ئەبووبەکری صدیـق ناسـراوەو موژدەپێدراوی بەهەشـت و یەکـەم خەلیفـەی موسـڵمانانە، خوشـکی عائیشـەی هاوسـەری پێغەمبـەری خوایـە(ﷺ)، ئـەم ئافرەتـە زۆر زوو لـە مەککـە موسـڵمان بـوو، دەوترێـت هەژدەهـەم کـەس بووە موسـڵمان بـووە، هاوسـەری زوبەیـری کـوڕی عـەووام بـوو.[2]

ئەسماء نزیکەی سیانزە ساڵ لە عائیشە گەورەتر بوو.[3]

ئەسـماء ئافرەتێکی کەتـە و بەخـۆ بـوو، بـەوە ناسـرابوو کە زۆر بەخشـندەیە، هەرچییەکـی دەسـتبکەوتایە کـۆی نەدەکـردەوەو یەکسـەر دەیبەخشـی، لەمـەدا لـە عائیشـەی خوشـکی جیـاواز بـوو، عائیشـە کەمـە کەمـە شـتی دەسـتدەکەوت و کـۆی دەکـردەوە هەتـا زۆر دەبـوو ئینجـا دەیبەخشـی.[4]

[1] صحيح مسلم، الرقم ٥٢٦.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٤٨٦.

[3] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٨٨.

[4] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٥١٦ و ٥٢٣.

واتە زوبەیر ئاوەڵزاوای پێغەمبەر(ﷺ) بوو، لەگەڵ ئەم ژنەی کۆچی کرد بۆ مەدینەو لەوێ چەند منداڵێکی بوو، عەبدوڵا، عورووە، مونذیر،[1] عاصم، موهاجیر، خەدیجەی گەورە، ئوممولحەسەن، عائیشە.[2]

رۆژێک پێغەمبەر(ﷺ) بەرەو ماڵی ئەبووبەکر هات و کاتەکەی جیا بوو لە هاتنی رۆژانی تری، هاتە ژوورەوەو بە ئەبووبەکری فەرموو: (ئەی ئەبووبەکر ئەوانەی لاتن بیانکەرە دەرەوە)، ئەبووبەکر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوانە کەسانی تۆن، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (مۆڵەتم پێدراوە) واتە بۆ کۆچکردن، ئەبووبەکریش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە باوکمەوە بەقوربانت بم یانی من هاودەمت دەبم؟ فەرمووی: بەڵێ، ئەبووبەکر وتی: دەی یەکێک لەو دوو سوارە بۆ تۆ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بە پارە دەیبەم)، ئەوەبوو هەردوو سوارەکەیان چاک ئامادە کردن و ئەسمائیش پشتێنەکەی کرد بە دوو بەشەوە بۆ بەستنەوەی توێشووەکانیان،[3] لەبەرئەمە ناونرا بە خاوەن دووپشتێنەکە (ذات النطاقين).[4]

ئەسماء دەڵێت: کاتێک باوکم کۆچی کرد بۆ مەدینە، چی سامانی هەبوو بردی، باپیریشم وتی: ئەڵێی ئەبووبەکر چی سامانی هەیە بردوویەتی، منیش وتم: نا شتێکی زۆری بۆ جێهێشتوین، ئەوەبوو برێ بەردم خستە کوپێکەوەو جلێکم دا بەسەریدا و دەستی باپیرمم گرت و خستمە سەر جلەکەو وتم: ئەمەی بۆ جێهێشتوین، ئەویش وتی: دەی ئەوەی جێهێشتبێت باشە، ئینجا ئەبووجەهل لەگەڵ چەند کەسێک هات بۆ ماڵمان و وتی: باوکت لەکوێیە؟ وتم: بەخوا نازانم لەکوێیە؟ ئەبووجەهلیش زللەیەکی توندی لێدام، ئینجا چوون.[5]

---

[1] أسد الغابة، ج٧، ص ١٢.

[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ١٠٠.

[3] صحيح البخاري، الرقم ٣٧١٤.

[4] صحيح البخاري - كتاب الجهاد والسير - باب حمل الزاد في الغزو، الرقم ٢٩٧٩.

[5] سير أعلام النبلاء، ج ٢، ص ٢٩٠.

بەپێی گێڕانەوەیەکی تر بێت کۆچی ئەسماء و زوبەیر پێکەوە نەبووە هەرچەندە هەردووکیان کۆچیان کردووە بۆ مەدینە، عائیشە دەڵێت: دوای ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی کرد بۆ مەدینە، زەیدی کوڕی حارثەی نارد بۆ لامان و ئەبوورافیعی مەولاشی لەگەڵدا نارد، دوو وشتر و پێنج سەد درهەمی پێدان تا بۆ کۆچەکە چی وشتریان پێویستە بیکڕن، ئەبووبەکریش عەبدوڵای کوڕی ئورەیقیطی بە دوو یان سێ وشترەوە نارد و نامەیەکی نووسی بۆ عەبدوڵای کوڕی ئەبووبەکر و فەرمانی پێدەکرد دایکی و من و ئەسمائی خوشکم بەودا بنێرێت بۆ مەدینە، ئەوەبوو کەوتنەڕێ، لەنیوەی ڕێدا زەید بە پارەکە سێ وشتری کڕی، دواتر هەموویان هاتنە مەککەو ڕێیان کەوتە طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵا کە دەیویست خێزانی ئەبووبەکر ببات بۆ مەدینە، ئەوەبوو هەموومان کەوتینەڕێ، زەید و ئەبوورافیع فاطیمە و ئومموکلثوم و سەودەی کچی زەمعەیان هێنان، هەروەها زەید ئومموئەیمەن و ئوسامەی کوڕی زەیدی هێنا، عەبدوڵای کوڕی ئەبووبەکریش دایکم و من و ئەسمائی هێنا، طەلحەش هاودەم بە ئێمە هات و هەموو پێکەوە کەوتینەڕێ تا گەیشتینە مەدینە، ئەو کات موسڵمانان خەریکی دروستکردنی مزگەوتی مەدینە بوون.[1]

عەبدوڵای کوڕی زوبەیر لە یەکەم ساڵی کۆچیدا لەدایکبوو و یەکەم منداڵی لەدایکبووی کۆچەران بوو پاش کۆچ بۆ مەدینە.[2]

ئەسمائی کچی ئەبووبەکر باسی سکپڕی خۆی بە عەبدوڵا و لەدایکبوونی عەبدوڵاوە دەکات و دەڵێت: سکم هەبوو، کە گەیشتمە مەدینەو لە قوبائدا دابەزیم، لەوێ منداڵەکەم بوو، دواتر منداڵەکەم بردە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و خستمە کۆشی، ئەویش داوای خورمایەکی کرد و خورماکەی مژی و دواتر خستیە دەمی منداڵەکەوە، ئیتر یەکەم شت چوویە ناو سکی منداڵەکەمەوە،

---

[1] المستدرک علی الصحیحین، الرقم ٦٧٥٥.

[2] الإصابة في تمییز الصحابة، ج٤، ص ٩٠.

لیکی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، دواتر خورماکەی هێنا بە دەم و لیوی منداڵەکەدا،[1] جا موسڵمانان بە بیستنی هەواڵی لەدایکبوونی عەبدوڵا تەکبیریان دەکرد، چونکە جوولەکەکان دەیانوت جادوویان لێکردون تا موسڵمانان منداڵی کوڕیان نەبێت، کەچی بەوە خوای گەورە جوولەکەکانی بەدرۆ خستەوە.[2]

ئەسمائی کچی ئەبووبەکر دەڵێت: سکم پڕ بوو بە خەدیجەوە، دروادسێیەکی جوولەکەمان گۆشتی لێنابوو، تەواو بێزووم پێوە کرد و خۆم پێ ڕانەگیرا و چووم بۆ لای ژنە جوولەکەکەو بە بیانووی هێنانی ئاگرەوە چووم بۆ لای، وتم: بەڵکو خۆی تۆزێکم بەش بدات، کە چوومە ئەوێ و بۆنم کرد و گۆشتەکەم بینی زیاتر حەزم لێکرد، ئەوەبوو ئاگرەکەم برد و ژنەکە بەشی نەدام، ئاگرەکەم کوژاندەوەو هەمدی چوومەوە بۆ ئاگرەکە، سێ جار وامکرد، کەچی هیچی بەش نەدام، منیش دانیشتم و دەستم کرد بە گریان و نزاکردن، مێردی ژنە جوولەکەکە هاتەوەماڵەوەو بە ژنەکەی وت: کەس نەهاتووە بۆ لات. ژنەکە وتی: ئافرەتێکی عەرەب هات داوای ئاگری کرد، کابرای جوولەکە وتی: تا بەشی ئەو ژنە نەنێریت لێی ناخۆم، ئەوەبوو قاپێک گۆشتی بۆ ناردم، تا ئێستاش شتێکم نەخواردووە هێندەی ئەو خواردنە چێژی پێدابم.[3]

ئەم ژنە هاوەڵە دەڵێت: زوبەیر کە منی بەهاوسەرگرت هیچ ماڵ و سامان و خزمەتکار و هیچ شتێکی نەبوو، تەنها وڵاخێکی بار و ئەسپەکەی نەبێت، ئیتر من ئالفی ئەسپەکەیم دەدا و ئاوم رادەکێشا، کونەم ئەدووریییەوەو هەویرم دەشێلا، بەڵام زۆر لە نانکردنم نەدەزانی، چەند ئافرەتێکی دراوسێم لە پشتیوانان هەبوون نانیان دەکرد و هاوڕێم بوون، پێغەمبەر(ﷺ) چارەچەیەک زەوی بۆ زوبەیر بڕیبوویەوە کە سێ فەرسەخ ڕێ بوو،

[1] صحيح البخاري – كتاب مناقب الأنصار – باب هجرة النبي(ﷺ) وأصحابه إلى المدينة، الرقم ٣٩٠٩.
[2] البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص ٢٣٠.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٠٥.

لەوێوە لەسەر سەر کۆڵم دەهێنایەوە، رۆژێک بەو حاڵەوە دەهاتمەوە کە بە پێغەمبەر(ﷺ) و ژمارەیەک لە پشتیوانان گەیشتم، پێغەمبەر(ﷺ) بانگی کردم، ویستی لە پشت خۆیەوە سەرم بخات، منیش شەرمم دەکرد لەگەڵ پیاواندا رێ بکەم، بیری غیرەی زوبەیرم کەوتەوە کە لە هەموان غیرەی زیاتر بوو، پێغەمبەر(ﷺ) زانی شەرم دەکەم، بۆیە رۆیشت، کە چوومەوە بۆ لای زوبەیر و مەسەلەکەم بۆ باسکرد، وتی: بەخوا کۆڵ لەسەر نانەکەت لە سەرکەوتنەکەت لام قورسترە، ئەوەبوو دوای ئەوە ئەبووبەکر خزمەتکارێکی بۆ ناردم سەرپەرشتی ئەسپەکەی لەکۆڵ کردمەوە، دەتوت لە کۆیلایەتی ئازادی کردوم.[١]

رەچاوکردنی حاڵەتی غیرەی زوبەیر لەلایەن ئەسمائەوە زۆر تایبەت بوو، دوای ئەوەی حاڵەتی ژیانی بەهۆی خزمەتکارێکەوە گۆڕا، پیاوێکی هەژار هات بۆ لای ئەسماء و داوای لێکرد مۆڵەتی بدات لە سێبەری دیواری ماڵەکەیدا شت بفرۆشێت، ئەسمائیش وتی: ئەگەر مۆڵەتیشت بدەم زوبەیر رێت پێنادات، بەڵام کاتێک ئەم داوایە بکە کە زوبەیر ئاگای لێ بێت، کابرایش وایکرد و بە بەرچاوی زوبەیرەوە ئەو داوایەی کرد، ئەسمائیش وتی: لەو هەموو ماڵە شوێن نەماوە ماڵەکەی من نەبێت؟ زوبەیریش کە ئاگای لە قسەکان بوو، بە ئەسمائی وت: بۆچی مۆڵەتی ئەو پیاوە هەژارە نادەیت؟ کابرا دەستی کرد بە کەسابەت هەتا ماڵ و سامانێکی پێکەوەنا، ئەسمائیش خزمەتکارەکەی خۆی فرۆشت بە کابرا و پارەکەی پێ بوو کە زوبەیر هاتەوە، پێی وت: با ئەو خزمەتکارەت ببەخشیایە بە من، ئەویش وتی: کردوومە بە خێر.[٢]

ئەسماء دەڵێت: دایکم هات بۆ لام و هێشتا بێباوەرش بوو، منیش چووم تا فەرمان لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) وەربگرم و وتم: ئەی پێغەمبەری

[١] صحيح البخاري - كتاب النكاح - باب الغيرة، الرقم ٥٢٢٤.

[٢] صحيح مسلم - كتاب السلام - باب جواز إرداف المرأة الأجنبية إذا أعيت في الطريق، الرقم ٢١٨٢.

خوا(ﷺ) دایکم هاتووه بۆ لام و داوای یارمەتیم لێدەکات ئایا لەگەڵی باش بم و یارمەتی بدەم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بەڵێ.[١]

ئەسماء دەڵێت: چووم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و ئەویش فەرمووی: (لَا تُوعِي فَيُوعِيَ اللَّهُ عَلَيْكِ، ارْضَخِي مَا اسْتَطَعْتِ)،[٢] (دەستت مەگرەوەو پیسکەیی مەنوێنە با خوا دەستت بەرووودا نەگرێتەوە، چەندە دەتوانیت ببەخشە).

ئەسمائی کچی ئەبووبەکر دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) چووین بۆ حەج تا گەیشتینە عەرج، پێغەمبەر(ﷺ) دابەزی و عائیشە لەکەنار پێغەمبەرەوە(ﷺ) دانیشت، منیش لەپاڵ باوکمەوە دانیشتم، کۆڵ و توێشووی پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبووبەکر یەکێک بوو و بە خزمەتکارێکی ئەبووبەکر بوو، ئەبووبەکر دانیشت و چاوەڕێی ئەو خزمەتکارە بوو بگات، ئەوەبوو خزمەتکارەکە دەرکەوت و وشترەکەی پێ نەبوو، ئەبووبەکر وتی: کوا وشترەکەت؟ خزمەتکارەکە وتی: دوێنێ شەو ونم کرد، ئەبووبەکر وتی: یەک وشترت پێ بوو و ئەویشت ونکرد؟ ئیتر کەوتە لێدانی، پێغەمبەر(ﷺ) بزەی دەکرد و دەیفەرموو (انظروا إلى هذا المحرم وما يصنع)،[٣] (تەماشای ئەم ئیحرام بەستووە بکەن چی دەکات).

ئەسمائی کچی ئەبووبەکر لە سەردەمی خیلافەتی راشیدیندا هادەم بە زوبەیری مێردی بەشداری جەنگی یەرمووکی کرد.[٤]

دواتر زوبەیر ئەسمائی تەڵاق داو ئەسمائیش لای عەبدوڵای کوڕی مایەوە، سەبارەت بە هۆکاری تەڵاقەکەشی چەند شتێک هاتووە کە روون نیە کامیانە، گێڕانەوەیەک هاتووە دەڵێت: عەبدوڵا وتوویەتی کەسی وەک

---

[١] صحيح البخاري - كتاب الجزية، الرقم ٣١٨٣.

[٢] صحيح البخاري - كتاب الزكاة - باب الصدقة فيما استطاع، الرقم ١٤٣٤.

[٣] مسند أحمد بن حنبل - مسند النساء(رضي الله عنهن) - حديث أسماء بنت أبي بكر الصديق(رضي الله عنهما)، الرقم ٢٧٥٥٨، سنن أبي داود - كتاب المناسك - باب المحرم يؤدب غلامه، الرقم ١٨١٨، ضعفه شعيب الأرناؤوط، حسنه الألباني في صحيح و ضعيف سنن أبي داود، الرقم ١٨١٨.

[٤] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٨٨.

من نابێت کەس بچێـە لای دایکی، بۆیـە زوبەیر تەڵاقی داوە، گێڕانەوەیەکی تر دەڵێت: لەبەرئـەوەی ئەسـماء تەمەنـی زۆر بـوو، گێڕانەوەیەکی تر دەڵێت: لەبەرئـەوەی جارێک زوبەیـر دای لـە ئەسماء و ئەویش قیژاندی، عەبدوڵاش چوو بـەدەم دایکیـەوە، زوبەیـر پێی وت: بێیتـە ژوورەوە دایکت تـەڵاق دەدەم، بـەڵام عەبدوڵا هـەر چوویـە ژوورەوە، بۆیـە تەڵاقـی دا، بـەڵام هیچکام لەوانـە بەڵگـەی رەوا نیـن.[1]

ئەسـماء باسـی حاڵەتێکـی پەرستشـی نـاو مزگـەوت دەکات و دەڵێـت: لـە سـەردەمی پێغەمبـەردا(ﷺ) خۆرگیرانێک روویدا.. چوومـە مزگـەوت و لەگـەڵ پێغەمبـەردا(ﷺ) نوێـژم دابەسـت، نوێژەکـەی زۆر درێژکـردەوە، وام لێهـات دەمویسـت دابنیشـم، دواتـر دەمبینـی ئافرەتـی لاواز هەبـوو، دەموت ئـەو لەمـن لاوازتـرەو دانانیشـێت، بۆیـە دانەدەنیشـتم.[2]

ئەسماء دوای خیلافەتی راشـیدینیش ژیا و سـەردەمی دەسـەڵاتی عەبدوڵای کوڕی بینی و بە چـاوی خۆی کوژرانی کوڕەکەشی بینی، لە سـاڵی حەفتاو دووی کۆچیدا عەبدولمەلیک حەججاجی کوڕی یووسفی نـارد بۆ گەمـارۆی مەککـە تـا دەسـەڵاتەکەی ئیبـن زوبەیـر لەناوبەرێـت، ئەمـەش لەسـەر داوای خودی حەججاج بوو،[3] حەججـاج مـاوەی پێنـج مانگ و نیو گەمـارۆی مەککەی دا، هـاوکات بـە مەنجەنیـق کەوتـە لێدانـی مەککـە و خەڵکێکـی زۆری کوشـت، ئاو و خۆراکیشـی لـێ قەدەغـە کردبوون، هەندێ لـە بەردەکان بـەر کەعبـەش کەوتـن، خەڵکەکـە داوایـان لـە عەبدوڵا کـرد لەگەڵیـان رێکبکەوێت، بـەڵام ئـەو وتـی: بەخـوا ئەوانـە ئەگـەر لەنـاو کەعبەشـدا بتانگـرن سـەرتان دەبـڕن، بۆیـە هەرگیـز داوای رێککەوتنیـان لـێ ناکـەم، خەڵکەکـە بـەردەوام دەچـوون بـۆ لای حەججاج و داوای پەنایان دەکرد و عەبدوڵایان جێدەهێشـت تا ئەوەی حەمزەو

[1] أسد الغابة، ج٧، ص ١٢.

[2] صحيح مسلم - كتاب صلاة الاستسقاء - باب ما عرض على النبي(ﷺ) في صلاة الكسوف من أمر الجنة والنار، الرقم ٩٠٦.

[3] البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص ٣٢٥.

خوبەیبی کوڕیشی جێیانهێشت، عەبدوڵا چوو بۆ لای دایکی و سکاڵای حاڵی خۆی کرد چۆن هەموو خەڵکەکە جێیانهێشت، دایکی هانیدا تا خۆڕاگر بێت چونکە ئەو نیازەکەی بۆ قیامەتە، عەبدوڵا بەو وتانەی دایکی دڵخۆش بوو و چوو بەرگریەکی گەورەی کرد، لەو کاتەشدا هێشتا بەردەوام بوو لە شەونوێژ کردن، دواجار خشتێک کەوتەخوار و بەر سەری کەوت و سەری خوێناوی کرد و خستیە زەوی، خێرا دەستەیەک هاتن و کوشتیان و تەرمەکەیان برد بۆ لای حەججاج، دوای کوژرانی شیوەن مەککەی داگرت، بەڵام زۆرو زمانی حەججاج بێدەنگی کردن.[1]

کاتێک عەبدوڵای کوڕی زوبەیر کوژرا، تەرمەکەی لەخاچ درا تا خەڵک بیبینێت، کە عەبدوڵای کوڕی عومەر دای بە لای تەرمەکەیدا، وەستا و وتی: سەلامت لێ بێت ئەبووخوبەیب، سێ جار ئەوەی وتەوە، ئینجا وتی: بەخوا من زۆر ڕێگریم لێکردیت لەمە، سێ جار ئەوەشی وتەوە، بەخوا هێندەی من تۆم ناسیبێت کەسێک بوویت نوێژ و ڕۆژووت زۆرزۆر بوو و پەیوەندی خزمایەتیشت زۆر بەهێز ڕاگرتبوو، بەخوا ئوممەتێک تۆ خراپترینی بێت چاکترین ئوممەتە، پاشان عەبدوڵای کوڕی عومەر چوو، ئینجا حەججاج ئەو هەڵوێستەی ئیبن عومەری بیست، ناردی تەرمەکەی عەبدوڵا داگیرایە خوارەوەو فڕێ درایە ناو گۆڕستانی جوولەکەکان، دواتر حەججاج ناردی بە شوێن ئەسمائی کچی ئەبوبەکری دایکی عەبدوڵادا، ئەسماء ئامادە نەبوو بچێت بۆ لای، چەند جار نێردراوی نارد و ئەسمائیش نەچوو، حەججاج وتی: دێیت یان کەسێک بنێرم بە پرچەکانت ڕاکێشی ئێرەت بکات، ئەسمائیش هەر نەچوو و وتی: بەخوا نایەم بۆ لات تا کەسێک نەنێریت کە بێت بە پرچەکانم ڕاکێشم بکات، حەججاج خۆی چوو بۆ لای ئەسماء، وتی: بینیت چیم کرد بە دوژمنی خوا-مەبەستی عەبدوڵای کوڕی بوو-؟ ئەسماء وتی: بینیم دنیای ئەو و قیامەتی خۆتت شێواند...پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیفەرموو

[1] البداية والنهاية لابن كثير، ج٨ ص ٣٣٠-٣٣١.

(لەناو ثەقیفدا درۆزنێک و خوێنڕێژێک دەردەکەون) جا درۆزنەکەمان بینی، بۆ خوێنڕێژەکەش تەنها تۆ شک دەبەم، حەججاج کە ئەوەی بیست هەستا و ئیتر نەهاتەوە بۆ لای ئەسماء.[1]

ئەسماء پاش ماوەیەکی زۆر کەم لە ڕووداوی کوژرانی عەبدوڵای کوڕی وەفاتی کرد، دەوترێت بیست ڕۆژ دوای مەرگی عەبدوڵای کوڕی مردووە.[2]

ذەهەبی دەڵێت: مردنی ئەو کۆتایی هێنا بە چی هاوەڵی کۆچەری هەیە چ لە پیاوان و چ لە ژنان، واتە ئەو کۆتا هاوەڵی کۆچەری بوو وەفاتی کرد. تەمەنی ئەم ئافرەتە سەد ساڵ بوو،[3] لە کۆتاییەکانی تەمەنیشیدا بینایی لەدەست دابوو،[4] وێڕای ئەوەش تاکە دانێکی نەکەوتبوو.[5]

ئەسماء گرنگیەکی زۆری دەدا بە قورئان خوێندن و لێوردبوونەوەی، وەک عەببادی کوڕی حەمزە دەڵێت: چووم بۆ لای ئەسماء دەبینم ئەم ئایەتە دەخوێنێتەوە (فمن اللهُ علينْا ووقانا عذاب السمُومِ)، (ئینجا خوا منەتی خستە سەرمان بە مەرحەمەتی خۆی و لە سزای ئاگری هاڵاودار پاراستوونی) لەسەر ئەو ئایەتە وەستا و نزای دەکرد و لەخوا دەپاڕایەوە لە دۆزەخ بیپارێزێت، منیش هەستام و چوومە بازاڕ و ئیشی ناوبازاڕم تەواو کرد و دواتر گەڕامەوە، دەبینم هێشتا سەرقاڵە بە خوێندنەوەی ئەو ئایەتەوەو نزاکردن و پاڕانەوەی لە خوا و پەناگرتنی پێی لە سزای دۆزەخ.[6]

## ٣١٥. ئەسمائی کچی عومەر(ﷺ)

[1] صحيح مسلم - كتاب فضائل الصحابة - باب ذكر كذاب ثقيف ومبيرها، الرقم ٢٥٤٥.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٤٨٧.
[3] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٩٦ و ج٣، ص ٥٢٣.
[4] المستدرک على الصحيحين - كتاب معرفة الصحابة(ﷺ) - ومن نساء قريش اللاتي روين عن رسول الله - ذكر أسماء بنت أبي بكر الصديق، الرقم ٧٠١٠.
[5] تاريخ مدينة دمشق لابن عساكر، ج٦٩، ص ٢٨.
[6] مصنف ابن أبي شيبة - من أبواب صلاة التطوع - في الرجل يصلي فيمر بآية رحمة أو آية عذاب، الرقم ٦٠٩٢.

ناوی ئەسمائی کچی عومەری کوڕی عەددیە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانەو دایکی موعاذی کوڕی جەبەلە، ئەم ئافرەتە هاودەم بە حەفتا هاوەڵە پشتیوانیەکە بەشدار بوو لە بەیعەتی عەقەبەدا.[1]

## ٣١٦. ئەسمائی کچی عومەیس(رضي الله عنها)

ناوی ئەسمائی کچی عومەیسی کوڕی مەعدە، ئەم ئافرەتە زۆر زوو لە مەککە موسڵمان بوو و هاوسەری جەعفەری ئامۆزای پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو، هاودەم بە جەعفەری مێردی کۆچی کرد بۆ حەبەشەو لەوێ چەند منداڵی لێ بوو، دواتر هاودەم بە مێردەکەی گەڕایەوە بۆ مەدینەو دوای شەهیدبوونی جەعفەری مێردی شووی کرد بە ئەبووبەکری صدیق، ئەمەش لە کاتی غەزای حونەیندا بوو، لە ئەبووبەکریش کوڕێکی بوو بەناوی موحەممەد، دواتر پاش ئەبووبەکر عەلی کوڕی ئەبووطالیب بەهاوسەری گرت و لەویش منداڵی بوو.[2]

کاتێک کۆچەرانی حەبەشە هاتنەوە بۆ مەدینە، خەڵکێ لە کۆچەران پێیان دەوتن ئێمە پێش ئێوە کۆچمان کردووە بۆ مەدینە، ئەسمائی کچی عومەیسیش کە لەو کۆچەرانەی حەبەشە بوو بە سەردان چوو بۆ لای حەفصەی ژنی پێغەمبەر(ﷺ)، عومەر چوویە ژوورەوە بۆ لای حەفصە و ئەسمائی لەوێ بینی، بە حەفصەی وت: ئەو ئافرەتە کێیە؟ وتی: ئەسمائی کچی عومەیسە، عومەر وتی: ئەمە حەبەشیەکەیە، ئەمە لەوانەی کەشتیەکەیە؟ (واتە ئەو کۆچەرانەی بە کەشتی لە حەبەشەوە هاتبوون بۆ مەدینە)، دایکی باوەڕداران وتی: بەڵێ، عومەر وتی: بە کۆچکردن پێشتان کەوتین، جا ئێمە لەئێوە لەپێشتر و شیاوترین بە پێغەمبەری خوا، ئەسمائیش تووڕە بوو و وتی: نەبەخوا، ئێوە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بوون و نانی برسیتانی دەدا و

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٤٨٩.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٤٨٩-٤٩٠.

ئامـۆژگاری نەزانتانـی دەکـرد، بـەڵام ئێمـە لـە خاکێکی-یـان وڵاتێکـی- دوور و ناخـۆش بوویـن لـە حەبەشـە، ئـەوەش لەبـەر خـوا و لەبـەر پێغەمبەرەکـەی، سـوێند بەخـوا نـان ناخـۆم و ئـاو ناخۆمـەوە تـا ئـەوەی وتـت باسـی نەکـەم بـۆ پێغەمبـەر(ﷺ)، ئێمـە ئازارمـان بەردەکـەوت و دەترسـاین، دەچـم و بـۆی بـاس دەکـەم و پرسـیاری لێدەکـەم و درۆ و فێڵیـش ناکـەم و کـەم و زیـادی بۆ ناکـەم، ئەسـماء چـوو بـۆ لای پێغەمبـەر(ﷺ) و مەسـەلەکەی بـۆ بـاس کـرد، پێغەمبـەر(ﷺ) پێـی فەرمـوو: ئـەی تـۆ چیـت پـێ وت؟ وتـی: ئـاواو ئـاوام پـێ وت، پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمـووی: (ليس بأحق بي منكم، وله ولأصحابه هجرة واحدة، ولكم أنتم - أهل السفينة – هجرتان) (ئـەو لـە ئێـوە شـیاوتر نیـە بـە مـن، ئـەو و هاوەڵانـی یـەک کۆچیـان بـۆ هەیـە و ئێوەش-یارانـی کەشـتی- دوو کۆچتـان بـۆ هەیـە).[1]

کاتێـک لـە غـەزای موئتـەدا جەعفـەر شـەهید بـوو، پێغەمبـەر(ﷺ) چـوو بـۆ ماڵـی جەعفـەر، ئەسـمائی ژنـی جەعفـەر دەڵێـت: جارێـک هەویـرم شـێلا بـوو و منداڵەکانـم شـۆردبوون و رۆنـم دابـوو لـە قژیـان و پـاک و پوختـم کردبوونـەوە، پێغەمبـەر(ﷺ) هـات بـۆ لامـان و فەرمـووی: (منداڵەکانـی جەعفەرم بـۆ بهێنـە)، منیـش ئەوانـم هێنـا، پێغەمبەریش(ﷺ) بۆنـی ئەوانـی دەکـرد و فرمێسـک بـە چاوانیدا دەهاتـە خـوارەوە، وتـم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) بە دایک و باوکمەوە بـە قوربانـت بـم بۆچـی دەگریـت، ئایـا هیچـت سـەبارەت بـە جەعفـەر و هاوەڵانـی بیسـتووە؟ فەرمـووی: (نعم أصيبوا هذ اليوم)، (بـەڵێ ئەمـڕۆ کوژران)، ئەسـمائی کچـی عومەیـس دەڵێـت: منیـش هەسـتام دەسـتم کـرد بـە شـیوەن و ژنـان لـە دەورم کۆبوونـەوە و پێغەمبـەر(ﷺ) گەڕایـەوە بـۆ ماڵـەوەو بە ژن و خێزانەکانـی فەرمـوو: (لا تغفلوا آل جعفر من أن تصنعوا لهم طعاما فإنهم قد شغلوا بأمر صاحبهم)،[2] (بنەماڵـەی جەعفـەر پشـتگوێ مەخـەن و چاوتـان لێیان بێت خواردنیان بۆ ئامادە بکـەن چونکـە ئـەوان خۆیـان پەشـۆکاون بـە مردووەکەیانـەوە).

---

[1] صحيح البخاري – كتاب المغازي – باب غزوة خيبر، الرقم ٤٢٣٠.

[2] مسند أحمد بن حنبل – مسند النساء(ﷺ) – حديث أسماء بنت عميس(ﷺ)، الرقم ٢٧٧٢٨، ضعفه شعيب الأرناؤوط.

پێغەمبەر(ﷺ) تا سێ ڕۆژ مۆڵەتی دا خێزانی جەعفەر ماتەمینی بگێڕن، دواتر پێغەمبەر(ﷺ) چوو بۆ لایان و فەرمووی: (لا تبكوا على أخي بعد اليوم)، (لەمڕۆ بەدواوە مەگرین بەسەر براکەمدا)، ئینجا فەرمووی: (برازاکانمم بۆ بانگ بکەن)، ئەوانیش هاتن، ئینجا داوای سەرتاشی کرد و سەرتاش هات، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد سەری کوڕەکانی جەعفەری چاک کرد.[1]

ئەسمائی کچی عومەیس لە دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) لە خزمەتی فاطیمەی کچی پێغەمبەردا(ﷺ) بوو، ئەوەبوو فاطیمە پێش مردنی تووشی نەخۆشیەکی سەخت بوو، لەو کاتەشدا خەمی ئەوەی بوو چۆن ببرێت بەرەو گۆڕستان، کاتێک ئەسمائی کچی عومەیسی لابوو، قسەی بۆ ئەسما دەکرد چەندە پێی ناخۆشە بە قوماشێکەوە ببرێت و جەستەی دەربکەوێت؟ ئەسمائیش وتی: بەخوا دارەمەیتێکت بۆ دروست دەکەم وەک ئەوەی بینیم لە حەبەشە دروست دەکرا، فاطیمەش وتی: ئادەی نیشانم بدە چۆنە، ئەویش بۆی دروست کرد، فاطیمەش پێکەنی، ئەوەش تاکە پێکەنینی بوو پاش وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ).[2]

ئەسمائی کچی عومەیس دەڵێت: فاطیمە پێی وتم: زۆرم پێ ناخۆشە کە قوماشێک دەدرێت بەسەر ئافرەتدا و جەستەی دەردەکەوێت، منیش وتم: ئەی کچی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من لە حەبەشە شتێکم بینیوە با بۆت باس بکەم، ئەوەبوو بە بڕێ دار دارەمەیتێکم دروست کرد و ئینجا قوماشێکی دا بەسەریدا دا، فاطیمە وتی: ئەمە زۆر چاکە، ئەگەر مردم تۆ و عەلی بمشۆن و کەسی تر نەیەتە ژوورەوە، ئەوەبوو کە وەفاتی کرد، عائیشە هات تا بێتە ژوورەوە، ئەسمائیش وتی: مەیەرە ژوورەوە، عائیشە لای ئەبووبەکر گلەیی کرد، ئەبووبەکر هات و وتی: بۆ ڕێی نادەن؟ ئەسمائیش وتی: فاطیمە خۆی

[1] سنن النسائي - كتاب الزينة - باب حلق رؤوس الصبيان، الرقم ٥٢٤٢، صححه أحمد شاكر، صححه شعيب الأرناؤوط، صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن النسائي، الرقم ٥٢٢٧.
[2] المستدرک على الصحيحين، الرقم ٤٧١٢،

وەسیەتی کرد تەنها من و عەلی بیشۆین، ئەبووبەکریش وتی: فاطیمە خۆی چۆنی وتووە وا بکەن.[1]

دواتریش ئەسماء تەرمی ئەبووبەکری صدیقی شۆرد.[2]

## ٣١٧. ئەسمائی کچی قرط(ﭭ)

ناوی ئەسمائی کچی قرطە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانەو چووەتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و بەیعەتی پێداوە.[3]

## ٣١٨. ئەسمائی کچی نوعمان(ﭭ)

ناوی ئەسمائی کچی نوعمانی کیندیە، پێغەمبەر(ﷺ) داوای کرد و بە هاوسەری گرت بەڵام نەیگواستەوەو تەڵاقی دا، سەبارەت بە هۆکاری تەڵاقدانەکەی راجیایی هەیە، رایەک دەڵێت: چونکە پێغەمبەر(ﷺ) بانگی کرد و ئەویش نەچوو، رایەکی تر دەڵێت: بەڵکو لەبەرئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) ویستی بچێتە لای وتی: پەنا دەگرم بە خوا لێت، رایەکیش دەڵێت: بەڵکو لەبەرئەوەی زۆر جوان بوو، ژنەکانی تری پێغەمبەر(ﷺ) ترسان کەنار بخرێن، بۆیە وتیان: پێغەمبەر(ﷺ) حەز دەکات کاتێک ویستی بێتە لات بڵێیت پەنا دەگرم بە خوا لێت، ئەویش وایکرد.[4]

## ٣١٩. ئەسمائی کچی یەزید(ﭭ)

ناوی ئەسمائی کچی یەزیدە، ئەم ئافرەتە لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان و ئامۆزای سەعدی کوڕی موعاذە، ئەم ئافرەتە چەند فەرموودەی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوەو دوای وەفاتی پێغەمبەریش(ﷺ) ژیا و

[1] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج٢، ص ١٢٨-١٢٩.
[2] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٨٦.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٤٩١.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٤٩٤-٤٩٥.

لە جەنگی یەرمووکدا بەشداری کرد و تیایدا چەند سەربازی رۆمی کوشت، دوای ئەوەش ماوەیەکی زۆر ژیا.[1]

ئەسمائی کچی یەزید دەڵێت: بیستم لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیفەرموو (لا تقتلوا اولادکم سرا)،[2] (منداڵەکانتان بە نهێنی مەکوژن).

ئەسمائی کچی یەزید لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) تەڵاق درا و هێشتا ئەوکات عیددە بۆ ئافرەتی تەڵاق دراو نەبوو، ئەوەبوو خوای گەورە ئایەتی لەو بارەوە دابەزاندە خوارەوە.[3]

## ٣٢٠. ئومامەی کچی بیشر(رضي الله عنها)

ناوی ئومامەی کچی بیشری کوڕی وەقشە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانەو موسڵمان بووەو چووەتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و بەیعەتی پێداوە.[4]

## ٣٢١. ئومامەی کچی حەمزە(رضي الله عنها)

ناوی ئومامەی کچی حەمزەی مامی پێغەمبەری خوایە(ﷺ)، واتە ئەم ئافرەتە ئامۆزای پێغەمبەری خوایە(ﷺ).[5]

لە عومرەی پاش رێککەوتنی حودەیبیەدا کە پێغەمبەر(ﷺ) ویستی بگەڕێتەوە کچەکەی حەمزە کەوتە دوای و هاواری دەکرد مامە گیان مامەگیان، عەلی دەستی گرت و بە فاطیمەی وت: وەرە بەدەم ئامۆزاکەتەوە، ئیتر عەلی و زەید و جەعفەر لەسەر ئەوە ناکۆک بوون کامیان ئومامە لای خۆیان بهێڵنەوە، عەلی دەیوت من هێنام و ئامۆزای منە، جەعفەر دەیوت ئامۆزای منەو پووریشی ژنی منە، زەیدیش دەیوت برازای منە،

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٤٩٨.

[2] سنن أبي داود - كتاب الطب - باب في الغيل، الرقم ٣٨٨١، ضعفه شعيب الأرناؤوط.

[3] سنن أبي داود - كتاب الطلاق - باب في عدة المطلقة، الرقم ٢٢٨١، حسنه شعيب الأرناؤوط، حسنه الألباني في صحيح و ضعيف سنن أبي داود، الرقم ٢٢٨١.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٤٩٩.

[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٤٩٩.

پێغەمبەر(ﷺ) دایە لای پووری-خوشکی دایکی- و فەرمووی: (پوور-خوشکی دایک- لە شوێن دایکە)، دواتر عەلی بە پێغەمبەری خوای(ﷺ) وت: بۆچی کچەکەی حەمزە بەهاوسەر ناگریت؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەو کچی برا شیریەکەمە.[1]

پێغەمبەر(ﷺ) دواتر ئومامەی کچی حەمزەی مارە کرد لە سەلەمەی کوڕی ئەبی سەلەمە، ئەوکات هەردووکیان تازەپێگەیشتووبوون، بەڵام هێندەی نەبرد ئومامە کۆچی دوایی کرد، سەلەمە دواتر پاش وەفاتی پێغەمبەریش(ﷺ) ژیا و لە سەردەمی ئومەویەکاندا کۆچی دوایی کرد.[2]

## ٣٢٢. ئومامەی کچی خودەیج(رضي الله عنها)

ناوی ئومامەی کچی خودەیجەو خوشکی رافیعی کوڕی خودەیجە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانەو موسڵمان بوو و چوویە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و بەیعەتی پێدا.[3]

## ٣٢٣. ئومامەی کچی سیماک(رضي الله عنها)

ناوی ئومامەی کچی سیماکی کوڕی عەتیکە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانەو موسڵمان بوو و چوویە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و بەیعەتی پێدا.[4]

## ٣٢٤. ئومامەی کچی صامیت(رضي الله عنها)

ناوی ئومامەی کچی صامیتەو خوشکی عوبادەی کوڕی صامیتە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانەو موسڵمان بوو و چوویە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و بەیعەتی پێدا.[5]

---

[1] صحيح البخاري - كتاب المغازي - باب عمرة القضاء، الرقم ٤٢٥١.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٣، ص١٤٩.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٥٠١.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٥٠١.

[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٥٠١.

## ٣٢٥. ئومامەی کچی ئەبیلعاص(رضي الله عنها)

ناوی ئومامەی کچی ئەبیلعاصەو دایکی ناوی زەینەبی کچی پێغەمبەری خوایە(ﷺ)، واتە ئومامە کچەزای پێغەمبەری خوایە(ﷺ).[١]

پێغەمبەر(ﷺ) ئومامەی زۆر خۆشدەویست، تەنانەت کە نوێژی دەکرد ئومامەی دەگرتەباوەش، کە دەچوو بە سوجدەدا دایدەنا، کە هەڵدەسایەوە هەمدی دەیگرتەوە باوەش.[٢]

دوای ئەوەی فاطیمەی کچی پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد، عەلی کوڕی ئەبوو طالیب ئومامەی کچی زەینەبی بەهاوسەرگرت کە خوشکەزای فاتیمە بوو،[٣] ئەمەش لە سەردەمی خیلافەتی ئەبووبەکری صدیق و پاش جەنگی یەمامە بوو.[٤]

ئومامە هاوسەری عەلی بوو تا شەهیدبوونی عەلی، پێشتر عەلی وەسیەتی کردبوو دوای خۆی موغیرەی کوڕی نەوفەل ئومامە بخوازێت، ئەوەبوو موغیرە خواستی و پێش مەرگی موغیرە ئومامە وەفاتی کرد.[٥]

## ٣٢٦. ئومامەی کچی عیصام(رضي الله عنها)

ناوی ئومامەی کچی عیصامی کوڕی عامیرە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانەو موسڵمان بووەو چووەتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و بەیعەتی پێداوە.[٦]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٥٠١.

[٢] صحيح البخاري - كتاب الصلاة - أبواب سترة المصلي - باب إذا حمل جارية صغيرة على عنقه في الصلاة، الرقم ٥١٦.

[٣] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٤٦.

[٤] البداية والنهاية لابن كثير، ج٦، ص ٣٥٣.

[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٥٠٣.

[٦] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٥٠٣.

## ٣٢٧. ئومامەی کچی قرط(ﵵ)

ناوی ئومامەی کچی قرطی کوڕی خەنسائە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانەو موسڵمان بووەو چووەتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و بەیعەتی پێداوە.[1]

## ٣٢٨. ئومامەی کچی موحەررەث(ﵵ)

ناوی ئومامەی کچی موحەررەثی کوڕی زەیدەو موسڵمان بووەو چووەتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و بەیعەتی پێداوە.[2]

## ٣٢٩. ئەمەی کچی خالید(ﵵ)

ناوی ئەمەی کچی خالیدە، کاتێک دایک و باوکی کۆچیان کرد بۆ حەبەشە لەوێ ئەمە لەدایک بوو، جا کاتێک چوونەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) ئەمە سەلامی نەجاشی گەیاند بە پێغەمبەر(ﷺ).[3]

## ٣٣٠. ئومەیمەی کچی بیشر(ﵵ)

ناوی ئومەیمەی کچی بیشرەو هاوسەری حەسسانی کوڕی دەحداحە بوو، ئەوکاتە مێردەکەی بێباوەڕ بوو، بۆیە ئومەیمە رایکرد بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و لەوێ پێغەمبەر(ﷺ) مارەی کرد لە سەهلی کوڕی حونەیف، ئومەیمە لە سەهل کوڕێکی بوو بە ناوی عەبدوڵا.[4]

## ٣٣١. ئومەیمەی کچی بەشیر(ﵵ)

ناوی ئومەیمەی کچی بەشیری کوڕی سەعدە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانەو خوشکی نوعمانی کوڕی بەشیرە، ئومەیمە موسڵمان بووەو چووەتە خزمەت

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٥٠٤.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٥٠٥.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٥٠٦.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٥٠٨.

پێغەمبەر(ﷺ) و بەیعەتی پێداوە.[1]

## ٣٣٢. ئومەیمەی کچی عەبدولا(رضي الله عنها)

ناوی ئومەیمەی کچی عەبدولای کوڕی ساعیدەیەو باوکی بە ئەبی حەثمە ناسراوە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانەو موسڵمان بووەو چووەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و بەیعەتی پێداوە.[2]

## ٣٣٣. ئومەیمەی کچی سوفیان(رضي الله عنها)

ناوی ئومەیمەی کچی سوفیانی کوڕی وەهبە، هاوسەری ئەبووسوفیانەو پاش فەتحی مەککە موسڵمان بوو و بەیعەتی دا بە پێغەمبەر(ﷺ).[3]

## ٣٣٤. ئومەیمەی دایکی ئەبووهورەیرە(رضي الله عنها)

ناوی ئومەیمەی کچی صوبەیح یان صوفەیحە، رایەکیش دەڵێت: بەڵکو ناوی مەیموونەیە، دایکی هاوەڵی ناسراوی پێغەمبەر(ﷺ) ئەبووهورەیرەیە.[4]

دایکی ئەبوو هورەیرە بێباوەڕ بوو، ئەو کاتەش کە ئەبووهورەیرە موسڵمان بووبوو هێشتا ئەو بێباوەڕ بوو، ئەبوو هورەیرە بەسەرهاتی موسڵمانبوونی دایکی باس دەکات و دەڵێت: بەردەوام دایکم بانگ دەکرد بۆ ئیسلام، رۆژێک کە داوام کرد موسڵمان بێت، قسەیەکی ناشیرینی وت: بە پێغەمبەر(ﷺ) کە پێم ناخۆش بوو، بۆیە چوومە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و دەگریام، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من دایکم بانگ دەکەم بۆ ئیسلام و ئەو رازی نابێت، جا ئەمڕۆ کە بانگم کرد بۆ ئیسلام، سەبارەت بە تۆ شتێکم لێ بیست کە پێم ناخۆش بوو، جا نزای بۆ بکە بەڵکو خوا رێنموونی بکات، پێغەمبەریش(ﷺ)

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٥٠٨.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٥٠٩.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٥١١.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٥١٢.

نزای بۆ کرد و فەرمووی: (خوایە دایکی ئەبوو هورەیرە ڕێنموونی بکە)، منیش بە دڵخۆشیەوە دەرچووم، کە گەیشتمە بەردەرگای ماڵەوە بینیم داخراوە، دایکم خشپەی پێی منی بیست و وتی: ئەبووهورەیرە لە شوێنی خۆت ڕاوەستە، دەنگی خوڕەی ئاوم دەبیست، دایکم جلوبەرگی پۆشی و لەچکەکەی دا بە سەریدا و دەرگاکەی کردەوەو دواتر بەبەرچاومەوە شایەتومانی هێنا، منیش گەڕامەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) و لە خۆشیدا دەگریام، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) موژدە بێت خوا نزاکەی وەرگرتیت و ڕێنموونی دایکی ئەبووهورەیرەی کرد، پێغەمبەریش(ﷺ) سوپاس و ستایشی خوای کرد، دواتر وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) نزام بۆ بکە خوا من و دایکم لای بەندە باوەڕدارەکانی خۆشەویست بکات و ئەوانیش لای ئێمە خۆشەویست بکات، پێغەمبەریش(ﷺ) نزای کرد و فەرمووی: (اللهم حبب عبيدك هذا وأمه إلى عبادك المؤمنين، وحبب إليهم المؤمنين)، (خوایە ئەم بەندە بچووکەی خۆت و دایکی لای بەندە باوەڕدارەکانت خۆشەویست بکەو باوەڕدارانیش لا ئەوان خۆشەویست بکە)، ئیتر هەر باوەڕدارێک باسی منی دەبیست یان دەیبینیم منی خۆش دەویست.[1]

## ٣٣٥. ئومەیمەی کچی عوقبە(رضي الله عنها)

ناوی ئومەیمەی کچی عوقبەی کوڕی عەمرە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانەو چووەتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و موسڵمان بووە، هاوسەری سەهلی کوڕی عەتیکە.[2]

## ٣٣٦. ئومەیمەی کچی عەمر(رضي الله عنها)

ناوی ئومەیمەی کچی عەمرە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانەو موسڵمان بووەو چووەتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و موسڵمان بووە.[3]

---

[1] صحيح مسلم - كتاب فضائل الصحابة - باب من فضائل أبي هريرة الدوسي(رضي الله عنه)، الرقم ٢٤٩١.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٥١٤.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٥١٤.

## ٣٣٧. ئومەیمەی کچی قەیس(رضي الله عنها)

ناوی ئومەیمەی کچی قەیسی کوڕی ئەبی صەلتە، ئەم ئافرەتە لە غیفاریەکانەو موسڵمان بووەو پاش هیجرەت بەیعەتی داوە بە پێغەمبەر(ﷺ)، دواتر لە فەتحی خەیبەردا بەشداری کرد.[1]

## ٣٣٨. ئومەیمەی کچی قەیسی ئەسەدی(رضي الله عنها)

ناوی ئومەیمەی کچی قەیسی کوڕی عەبدوڵای ئەسەدیەو زۆر زوو لە مەککە موسڵمان بوو و کۆچی کرد بۆ حەبەشەو لەوێ لەگەڵ ئوموحەبیبەی دایکی باوەڕداراندا بوو.[2]

## ٣٣٩. ئومەیمەی کچی ئەبولهەیثەم(رضي الله عنها)

ناوی ئومەیمەی کچەی ئەبولهەیثەمی کوڕی تیهانە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانەو چووەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و بەیعەتی پێداوە.[3]

## ٣٤٠. ئومەیمەی خزمەتکار(رضي الله عنها)

ناوی ئومەیمەیەو خزمەتکاری عەبدوڵای کوڕی ئوبەی بوو، هەریەک لە ئومەیمەو موسەیکە پێکەوە خزمەتکار بوون، جا عەبدوڵا زۆری لێدەکردن تا زینا بکەن، ئەوانیش چوون لای پێغەمبەر(ﷺ) سکاڵایان کرد، ئەوەبوو خوای گەورە ئایەتی دابەزاندە خوارەوە (وَلْيَسْتَعْفِفِ الَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّىٰ يُغْنِيَهُمُ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ وَالَّذِينَ يَبْتَغُونَ الْكِتَابَ مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا وَآتُوهُمْ مِنْ مَالِ اللَّهِ الَّذِي آتَاكُمْ وَلَا تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ عَلَى الْبِغَاءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا لِتَبْتَغُوا

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٥١٤.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٥١٥.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٥١٦.

عَرَضَ الْحَيَاةِ الدُّنيَا وَمَنْ يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ اللَّهَ مِنْ بَعْدِ إِكْرَاهِهِنَّ غَفُورٌ رَحِيمٌ)،[1] (با ئەوانەی توانای مارەکردن و زەماوەندیان نیە، خۆڕاگرن و داوێن پاک بن، هەتا خوا لە گەورەیی و چاکەی خۆیەوە داراو بێنیازیان دەکات، وە ئەو کەسانەی غولامی ئێوەن و داوای بڕیارنامە نووسین دەکەن، ئەگەر خێر و سەلاحتان لەواندا بەدیکرد پەیمان نامەیان لەگەڵ بنووسن و لە دارایی و ماڵێک کە خوا پێی داون پێیان بدەن، وە کەنیزەکی خۆتان ناچار بە زینا مەکەن، ئەگەر ئەوان ویستیان داوێن پاک وە بە عیسمەت بن، بەڵام ئێوە بتانەوێت ماڵ و دارایی دنیا بەدەست بێنن، هەرکەس ئەوان ناچار بکا، ئەگەر دوای ئەو ناچارکردنە تەوبە بکەن ئەوە خوای گەورە بێ شک زۆر بەخشەر و میهرەبانە).

## ٣٤١. ئومەینە(ﭬ)

ناوی ئومەینەی کچی خەلەفەو زۆر زوو لە مەککە موسڵمان بوو و هاودەم بە خالیدی کوڕی سەعیدی مێردی کۆچی کرد بۆ حەبەشەو لەوێ چەند منداڵێکی لێ بوو.[2]

## ٣٤٢. ئونەیسەی کچی خوبەیب(ﭬ)

ناوی ئونەیسەی کچی خوبەیبە، ئونەیسە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو (ئەگەر ئیبن ئوم مەکتووم بانگی دا ئەوە بخۆن و بخۆنەوە، ئەگەر بیلال بانگی دا ئەوە مەخۆن و مەخۆنەوە)، جا ئافرەتی وامان هەبوو هێشتا پارشێوی تەواو نەکردبوو، بە بیلالی ئەوت پەلە مەکە لە بانگدان با پارشێوەکەم بکەم.[3]

---

[1] صحيح مسلم - كتاب التفسير - باب في قوله تعالى ولا تكرهوا فتياتكم على البغاء، الرقم ٣٠٢٩.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥١٧.

[3] مسند أحمد بن حنبل - من مسند القبائل - حديث أنيسة بنت خبيب(ﭬ)، الرقم ٢٨٠٨٣، صحيح ابن خزيمة - كتاب الصلاة - جماع أبواب الأذان والإقامة - باب ذكر خبر يضاد إن بلالا يؤذن بليل، الرقم

## ٣٤٣. ئونەیسەی کچی ثەعلەبە(رضي الله عنها)

ناوی ئونەیسەی کچی ثەعلەبەیە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانەو چووەتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ).[1]

## ٣٤٤. ئونەیسەی کچی ئەبی حەبیبە(رضي الله عنها)

ناوی ئونەیسەی کچی ئەبی حەبیبەیە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانەو چووەتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و بەیعەتی پێداوە.[2]

## ٣٤٥. ئونەیسەی کچی رافیع(رضي الله عنها)

ناوی ئونەیسەی کچی رافیعی کوڕی موعەللایە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانەو چووەتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و بەیعەتی پێداوە.[3]

## ٣٤٦. ئونەیسەی کچی روهم(رضي الله عنها)

ناوی ئونەیسەی کچی روهمە، ئەم هاوەڵە لە پشتیواانەو چووەتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و بەیعەتی پێداوە.[4]

## ٣٤٧. ئونەیسەی کچی ساعیدە(رضي الله عنها)

ناوی ئونەیسەی کچی ساعیدەیە، ئەم هاوەڵە چووەتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و بەیعەتی پێداوە.[5]

---

٤٠٤، صححه شعيب الارناؤوط.

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥١٩.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥١٩.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٢٠.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٢٠.

[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٢٠.

## ٣٤٨. ئونەیسەی ئەنصاری(رضي الله عنها)

ناوی ئونەیسەی کچی ئەبی طەلحەیە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانەو چووەتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و بەیعەتی پێداوە.[١]

## ٣٤٩. ئونەیسەی کچی عەبدولا(رضي الله عنها)

ناوی ئونەیسەی کچی عەبدولایە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانەو چووەتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و بەیعەتی پێداوە.[٢]

## ٣٥٠. ئونەیسەی کچی عەددی(رضي الله عنها)

ناوی ئونەیسەی کچی عەددیە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانەو کوڕێکی هەبوو بە ناوی عەبدولا کە لە غەزای ئوحوددا شەهید بوو، جا ئونەیسە هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: حەز دەکەم تەرمی کوڕەکەم دەربهێنمەوەو بیگوازمەوە بۆ نزیک خۆم تا ئارامیم بۆ بێت، پێغەمبەریش(ﷺ) مۆڵەتی پێدا.[٣]

## ٣٥١. ئونەیسەی کچی عوروە(رضي الله عنها)

ناوی ئونەیسەی کچی عوروەیە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانەو چووەتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و بەیعەتی پێداوە.[٤]

## ٣٥٢. ئونەیسەی کچی عەمر(رضي الله عنها)

ناوی ئونەیسەی کچی عەمری کوڕی عەنمەیە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانەو چووەتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و بەیعەتی پێداوە.[٥]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٢٠.
[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٢٠.
[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٢٠.
[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٢١.
[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٢٠.

## ٣٥٣. ئونەیسەی کچی عەمری ئەنصاری(رضي الله عنها)

ناوی ئونەیسەی کچی عەمری کوڕی قەیسە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانەو چووەتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و بەیعەتی پێداوە.[1]

## ٣٥٤. ئونەیسەی کچی هیلال(رضي الله عنها)

ناوی ئونەیسەی کچی هیلالی کوڕی موعەللایە، لە پشتیوانانەو چووەتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و بەیعەتی پێداوە.[2]



[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٢٢.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٢٢.

## ٣٥٥. باذام(ﷺ)

ئەم هاوەڵە مەولای پێغەمبەر(ﷺ) بووە.[١]

## ٣٥٦. باقوم(ﷺ)

باقووم رۆمیە، لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) وەفاتی کرد، لەبەرئەوەی میراتگری نەبوو پێغەمبەر(ﷺ) میراتەکەی دا بە سوهەیلی کوڕی عەمر.[٢]

## ٣٥٧. باقومی رۆمی(ﷺ)

سەبارەت بە ناوی ئەم هاوەڵە هەریەک لە باقووم و باقوول هاتووە،[٣] ئەم هاوەڵە رۆمییە،[٤] فەرموودەیەکی لێوە گێردراوەتەوە کە مینبەرەکەی پێغەمبەری(ﷺ) دروست کردووە، بەڵام ئیبن حەجەر ئەو ریوایەتە بە لاواز دادەنێت.[٥]

دەوترێت لە رۆمەوە بە رێی دەریادا هاتووەو گەیشتوەتە مەککەو لەوێ کەعبەی بۆ قورەیش بنیادناوەتەوە.[٦]

پێشتر لە ناوی ئیبراهیمی نەججاردا دروستکردنی مینبەرەکەی پێغەمبەری خوامان(ﷺ) باسکردووە.

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٦٥.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٦٦.

[٣] أسد الغابة، ج١، ص٢٤٥.

[٤] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٢٠٣.

[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٦٥.

[٦] أخبار مكة للأزرقي، ج١، ص١٥٧.

## ٣٥٨. بەحیرای راهیب(رضي الله عنه)

یەکێکە لەو کەسانەی لەگەڵ جەعفەری کوڕی ئەبووطالیبدا هاتن بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ).[١]

ئیبن ئەثیر سەبارەت بە هاتنی ئەم هاوەڵە گێڕانەوەیەک دێنێت: کاتێک موسڵمانانی حەبەشە زانییان پێغەمبەر(ﷺ)و موسڵمانان لە جەنگی بەدردا سەرکەوتن، داوای مۆڵەتیان کرد لە نەجاشی تا بچنەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، ژمارەیەک لەوانەی لای نەجاشی بوون و بڕوایان هێنابوو بە نەجاشییان وت: مۆڵەت بدە بە ئێمەش با بچین بۆ لای ئەو پێغەمبەرەو بزانین ئەو کەسەیە کە لە کتێبەکەماندا باسی کراوە؟ ئەوەبوو چوون بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و لەگەڵیدا بەشداری غەزای ئوحود بوون، ریوایەتێ لە موقاتیل و کەسانی تریشەوە دێنێ کە وتویانە ئەوانە ٤٠ کەس بوون، سی و دوو کەسیان لە گەڵ جەعفەری طەیاردا هاتن، هەشت کەسیشیان لە شامەوە هاتن (بوحەیراو ئەبرەهەو ئەشرەف و تەمام و ئیدریس و ئەیمەن و نافع و تەمیم)، ئەمە گێڕانەوەی ئەبوو مووسا بوو کە ئیبن ئەثیر هێناویەتی، ئیبن ئەثیر دەڵێت: ئەگەر مەبەستی بە بوحەیرا یەکێکی تری جیا لەو بوحەیرایە بێت کە پێغەمبەر(ﷺ) بە منداڵی بینی، ئەوە ئەگەری هەیە ئەم هاتنی وەفدە راست بێت.[٢]

ئیبن حەجەر دەڵێت: وادیارە ئەمە بوحەیرایەکی ترە، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) ئەوی لە خاکی شام دیوە، بەڵام ئەم بوحەیرایەیان لە حەبەشە بووە، باکووری وڵات لەکوێ و باشووری لەکوێ، ئاساییە دوو کەس یەک ناویان هەبێ.[٣]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٧١.

[٢] أسد الغابة، ج١ص٧١.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٢٢.

بەڵام بەپێی هەموو سەرچاوەكان جەعفەری طەیار(ﷺ) و موسڵمانان لە فەتحی خەیبەردا هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)،[1] دیاریشە غەزای ئوحود لەپێش فەتحی خەیبەر روویداوە، بۆیە هاتنی ئەو كەسانە لەگەڵ جەعفەری طەیار بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و بەشداری كردنیان لە غەزای ئوحوددا، بەپێی سەرچاوەكان هەڵەیەو راستی تێدا نیە، دەشكرێ ئەو ئەگەرە دابنێین ئەو كەسانەی تر(واتە ئەو ٤٠ كەسە) بەجیا و بەبێ جەعفەر هاتبن، وەك چۆن ئیبن حەجەر باس لەوە ناكات هاتنی ئەو كەسانە لەگەڵ جەعفەردا بووبێت.[2]

ئیبن ئەثیریش پێی وایە ئەم بەحیرایە جیایە لەو بەحیرا راهیبەی كە پێغەمبەر(ﷺ) پێش پێغەمبەرایەتی بینیویەتی چونكە ئەو بەحیرا راهیبە تا ئەو كاتە نەژیاوە.[3]

ئیبن حەجەر فەرموودەیەكی هێناوە كە لە بەحیراوە گێردراوەتەوە.[4]

## ٣٥٩. بەحیری ئەنماری(ﷺ)

یەكێكە لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ)،[5] دەوترێت نازناوەكەی ئەبووسەعدی خەیرە،[6] لە پشتیوانان بوو.[7]

ئەبوسەعدی خەیری ئەنماری دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (**إن ربي وعدني أن يدخل الجنة من أمتي سبعين ألفا بغير حساب، ويشفع كل ألف لسبعين ألفا، ثم يحثي ربي ثلاث حثيات بكفيه**)،[8] (پەروەردگارم بەڵێنی پێداوم حەفتا هەزار كەس لە ئوممەتەكەم بە بێ لێپێچینەوە بخاتە بەهەشتەوەو هەر هەزاریان شەفاعەت

---

[1] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١ص٢٤٢، أسد الغابة، ج١ص٤٢١، سير أعلام النبلاء للذهبي، ج١ص٢٠٦.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٢٢.
[3] أسد الغابة، ج١، ص ٢٥١.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٢٧١.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٧٢.
[6] أسد الغابة، ج١، ص٢٥١.
[7] الآحاد و المثاني لابن أبي عاصم، الرقم ١٩٤٥.
[8] المعجم الكبير للطبراني - مسند من يعرف بالكنى - من يكنى أبا سعد - أبو سعد الخير الأنصاري، الرقم ٧٧١.

بکەن بۆ حەفتا هەزار کەس -لە ئوممەتەکەم- پاشان پەروەردگارم بە مشتەکانی خۆی سێ مشتی پڕ هەڵدەدات- تا بیانخاتە بەهەشتەوە-).

ئەم فەرموودەیە لە ڕێی ئەبووئومامەشەوە گێردراوەتەوەو ئیمامی ترمذی هێناویەتی و فەرموودەکەی بە حەسەن داناوەو ئیبن حیببانیش لە صەحیحەکەیدا هێناویەتی.

## ٣٦٠. بەدر ئەبووعەبدولا(ﭬ)

ئەم هاوەڵە مەولای پێغەمبەر(ﷺ) بوو و بە ئەبوو عەبدوڵا ناسراوە.[١]

فەرموودەیەکی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە، ئیبن ئەثیر ئەو فەرموودەی هێناوە کە بەدر دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) دانەوەی قەرزی پێش وەسیەت دانا، هەروەها برایانی لە هەردوو سەرەوە بران بێ لە برایانی کە تەنها لە باوکەوەن میراتی وەردەگرن.[٢]

## ٣٦١. بەدری کوڕی عەبدولا(ﭬ)

فەرموودەیەکی لێوە گێردراوەتەوە کە ئیبن حەجەر لە تەفسیرەکەی ئەبوشەیخەوە هێناویەتی لە عەبدوڵای کوڕی بەدرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (من أحب أن يبارك له في أجله وأن يمتعه بما خوله فليخلفني في أهلي خلافة حسنة).[٣]

## ٣٦٢. بەدری کوڕی عەبدوڵای موزەنی(ﭬ)

ناوی بەدری کوڕی عەبدوڵای موزەنیە،[٤] فەرموودەیەکی لێوە گێردراوەتەوە دەڵێت: لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) بووم، پێم وت: ئەی

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٧٢.
[٢] أسد الغابة، ج١، ص٢٥٣.
[٣] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١١٩٣، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٧٢.
[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٧٢.

پێغەمبەری خوا من کەسێکم زۆر هەوڵ دەدەم کەچی رزقم دەست ناکەوێ و سامانم زیاد ناکات، پێغەمبەری خوایش(ﷺ) پێی فەرموو (ئەی بەدری کوڕی عەبدوڵا هەرکات بەیانی هەستایت بڵێ بسم الله على أهلي ومالي اللهم رضني بما قضيت لي وعافني فيما أبقيت حتى لا أحب تعجيل ما أخرت ولا تأخير ما عجلت) منیش ئەوەم دەوت، ئیتر خوا بەرەکەتی خستە سامانمەوەو زیادی کرد و قەرزەکانم دایەوەو خۆم و ژن و مناڵمی دەوڵەمەند کرد.[1]

هەمان ئەم فەرموودەیە بە گێڕانەوەی تر هاتووە و ئەلبانی بە تەواو لاوازی داناوە.

## ٣٦٣. بەدری کوڕی عەبدولا(ﷺ)

ناوی بەدری کوڕی عەبدوڵای خەطەمیە،[2] لە پشتیوانانە، کوڕێکی هەبوو بە ناوی عەبدوڵا کە ئەو کوڕەشی کوڕێکی بوو ناوی نا بەدر.[3]

بەدر فەرموودەیەکی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە کە دەفەرموێت (خمس من سنن المرسلين : الحياء، والحلم، والحجامة، والسواك والتعطر)،[4] (پێنج شت لە سوننەتی پێغەمبەرانە، شەرم و نەرمونیانی و کەڵەشاخ و سیواک و بۆنی خۆش لەخۆدان).

## ٣٦٤. بەرائی کوڕی عازب(ﷺ)

ناوی بەرائی کوڕی عازبی کوڕی حارثی کوڕی عەددییە،[5] ئیبن عەبدولبەر پێی وایە ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان،[6] بەڵام

[1] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١١٩١، أسد الغابة، ج١، ص٢٥٣.
[2] أسد الغابة، ج١، ص٢٥٢.
[3] الآحاد و المثاني لابن أبي عاصم، الرقم ١٩٤٢.
[4] الآحاد و المثاني لابن أبي عاصم، الرقم ١٩٤٢، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١١٩٢، ضعفه الألباني في ضعيف الجامع الصغير و زيادته، الرقم ٢٨٥٨.
[5] البداية والنهايةلإبن كثير، ج٨، ص٣٢٨، تاريخ الإسلام للذهبي، ج٥، ص٣٦٥.
[6] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٥٥.

ئیبن ئەثیر دەڵێت: لە ئەوسیەکانە،[1] راستتر وایە لە ئەوسیەکانە، ئیبن سەعدیش بە ئەوسی هێناویەتی.[2]

کونیەکەی ئەبووعمارەیە، دەوترێت بەڵکو کونیەکەی ئەبووعەمرە،[3] دەشوترێت کونیەکەی ئەبوطوفەیلە، یان دەوترێت ئەبوو عومەرە، بەڵام زیاتر ئەبوعمارە هاتووە.[4]

هەریەک لە ئەوس و عازبی باوکیشی هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بون.[5]

دەوترێت دایکی ناوی حەبیبەی کچی ئوم حەبیبەیە، دەشوترێت بەڵکو ناوی ئوم خالیدی کچی ثابتی کوڕی سینانە.[6]

بەرائی کوڕی عازب برایەکی هەبوو بە ناوی عوبەید کە لە جەنگەکانی جەمەل و صفین و نەهرەواندا لەگەڵ بەرائی برایدا لە سوپای عەلی کوڕی ئەبووطالیبدا بەشداری کرد.[7]

براکانی تری بریتی بوون لە یوونس و عازب و یەحیا، خوشکێکیشی هەبوو بەناوی ئوم عەبدولا.[8]

هەروەها بەرائی کوڕی عازب کچێکی هەبوو بە ناوی حەفصە،[9] کچێکی تریشی هەبوو بە ناوی تەحیا.[10]

بەرائی کوڕی عازب دوو کوڕی هەبوو بە ناوی یەزید و سوەید، یەزید فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە، هەروەها سوەیدیش فەرموودەی لە

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص٢٥٨.
[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٦، ص١٧.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٧٨.
[4] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٥٥.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٧٨.
[6] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص٣٦٤.
[7] أسد الغابة، ج١، ص٢٥٨.
[8] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص٣٦٥.
[9] أسد الغابة، ج٣، ص٥٦١.
[10] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٥، ص٢٨١.

باوکیەوە گێڕاوەتەوەو دواتریش بووبوو بە ئەمیری عمان و یەکێک بوو لە والیە زۆر چاکەکارەکان.[1]

بەرائی کوڕی عازب خاڵۆیەکی هەبوو بە ناوی کەثیر، بەراء دەڵێت: خاڵۆم ناوی قەلیل بوو (واتە کەم) پێغەمبەر(ﷺ) ناوی گۆڕی و ناوی لێنا کەثیر (واتە زۆر).[2]

لە غەزای بەدردا پێغەمبەر(ﷺ) ڕێی نەدا هەریەک لە بەرائی کوڕی عازب و ئیبن عومەر بەشداری بکەن، چونکە تەمەنیان کەم بوو.[3]

لە گێڕانەوەیەکدا هاتووە بەرائی کوڕی عازب لە غەزای ئوحوددا بەشداری کردووە، لە غەزاکانی دواتریشدا بەشدار بوو تا ئەوەی لە چواردە غەزادا کە پێغەمبەر(ﷺ) تیایاندا بەشدار بوو ئەمیش ئامادەیی هەبوو.[4]

بەڵام بەپێی گێڕانەوەیەکی واقیدی هاتووە یەکەم غەزا کە هەریەک لە ئیبن عومەر و بەرائی کوڕی عازب تیایدا بەشدار بوون بریتی بوو لە غەزای خەندەق.[5]

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە لە غەزای خەندەقدا پێغەمبەر(ﷺ) ڕێی دا بە بەرائی کوڕی عازب بەشداری بکات، چونکە ئەوکات تەمەنی پانزە ساڵ بوو، بەڵام پێش خەندەق ڕێی نەدابوو بەشداری غەزاکان بکات.[6]

بەرائی کوڕی عازب باسی هەڵکەندنی خەندەقەکەی غەزای خەندەق دەکات و دەڵێت: پێغەمبەری خوایش(ﷺ) لەگەڵ ئێمەدا خۆڵی دەگواستەوەو خۆڵ سپیایی سەر سکی پێغەمبەری خوای(ﷺ) داپۆشیبوو، ئینجا ئەم شیعرەی دەوتەوە:

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٦، ص٢٩٦.

[2] أسد الغابة، ج٤، ص٤٨٣.

[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص٣٦٧.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٧٨.

[5] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٥٦.

[6] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص٣٦٨.

اللهم لولا أنت ما اهتدينا

ولا تصدقنا ولا صلينا

فأنزلن سكينة علينا

و ثبت الأقدام إن لاقينا

إن الألى قد بغوا علينا

و إن أرادوا فتنة أبينا[1]

بەرائی کوڕی عازب ڕووداوێکی سەرسوڕهێنەری هەڵکەندنی خەندەقەکە دەگێڕێتەوەو دەڵێت: لە کاتی هەڵکەندنی خەندەقەکەدا گابەردێکمان هاتەڕێ کە پاچ و خاکەناز چاریان نەدەکرد، سکاڵا برایە لای پێغەمبەر(ﷺ) و ئەویش هات، جلەکەی سەرشانی داناو دواتر دابەزی، پاچەکەی (زەنگنەکەی) گرت و فەرمووی: بسم الله، دای لە بەردەکە سێ یەکی بەردەکە شکا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: الله أكبر کلیلەکانی شامم پێ درا، سوێند بەخوا وا لەم شوێنەمەوە کۆشکە سوورەکانی دەبینم، ئینجا فەرمووی: بسم الله و دانەیەکی تری لێدا، سێ یەکی تری بەردەکە شکا، فەرمووی: الله اكبر کلیلەکانی فارسم پێ درا سوێند بەخوا وا مەدائین دەبینم و کۆشکە سپیەکەی لەم شوێنەمەوە دەبینم، پاشان فەرمووی: بسم الله و دانەیەکی تری لێدا پاشماوەکەی تری شکاو پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: الله أكبر کلیلەکانی یەمەنم پێ دران، سوێند بەخوا وا لەم شوێنەمەوە دەرگاکانی صەنعا دەبینم.[2]

بەرائی کوڕی عازب زۆربەی کاتەکانی خۆی لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) بەسەر دەبرد، ئەوەتا دەڵێت: لە هەژدە دەرچوونی پێغەمبەردا(ﷺ) هاودەمی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوم.[3]

[1] صحيح البخاري – كتاب الجهاد والسير – باب حفر الخندق، الرقم ٢٨٣٧.

[2] مسند أحمد بن حنبل – أول مسند الكوفيين(ﷺ) – حديث البراء بن عازب(ﷺ)، الرقم ١٨٩٩٤.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٧٨.

بەرائی کوڕی عازب لە ڕێککەوتنی حودەیبیەدا بەشداری کرد، وەک خۆی دەڵێت: لە ڕۆژی حودەیبیەدا سەدو چواردە وشترمان پێ بوو، حودەیبیەش بیرێک بوو، لەوێ لاماندا و چی ئاوی تێدا بوو دەرمانکرد تا هیچی تیا نەما، پێغەمبەر(ﷺ) لە لێواری بیرەکەوە دانیشت و داوای بڕێک ئاوی کرد، ئاوەکەیان بۆ هێناو بڕێکی خستە دەمی و لە دەمی رادا، دواتر ئاوەکەی ناو دەمی کردە ناو بیرەکەوە، چاوەڕێمان کرد هێندەی نەبرد خۆمان تێر ئاومان لێ خواردەوەو دواتریش ولاخەکانمان تێر ئاو کردن.[1]

بەرائی کوڕی عازب دەڵێت: جارێک پێغەمبەری خوام(ﷺ) بینی حەسەنی لە قەلادۆشکانی دانابوو و دەیفەرموو (اللهم إني أحبه فأحبه) خوایە من خۆشم ئەوێت دەی تۆیش خۆشت بوێت).[2]

بەرائی کوڕی عازب دەڵێت: حارثی کوڕی عەمر (کە بڕوا وایە مامی یان خاڵی بێت) منی لەگەڵ خۆیدا برد کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) ئەرکێکی پێ راسپاردبوو، وتم: مامە گیان پێغەمبەر(ﷺ) تۆ بۆ کوێ دەنێرێت؟ وتی: ناردوومی تا بڕۆم بدەم لە گەردنی پیاوێک کە باوەژنەکەی خۆی مارە کردووە.[3]

هەروەها بەرائی کوڕی عازب باسی رووداوی بەنی قورەیضە دەکات دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) لەو ڕۆژەدا بە حەسسانی کوڕی ثابتی فەرموو هێرش بکەرە سەر بێباوەڕان-بە شیعر- چونکە جبریل لەگەڵتدایە.[4]

بەرائی کوڕی عازب دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) ئێمەی لەگەڵ خالیدی کوڕی وەلیددا نارد بۆ یەمەن، دواتر لەبریدا عەلی کوڕی ئەبووطالیبی نارد،[5] دیارە بەرائی کوڕی عازب لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبووطالیبیشدا بەشدار بووە

---

[1] صحيح البخاري - كتاب المناقب - باب علامات النبوة في الإسلام، الرقم ٣٥٧٧.

[2] صحيح البخاري - كتاب فضائل الصحابة - باب مناقب الحسن والحسين، الرقم ٣٧٤٩.

[3] أسد الغابة، ج١، ص ٤٩٧.

[4] البداية و النهاية لابن كثير، ج٤، ص١٣١.

[5] البداية و النهاية لابن كثير، ج٥، ص١٠٤.

وەک خۆی دەڵێت: کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) عەلی نارد بۆ یەمەن من لەگەڵیدا بووم.[1]

بەرائی کوڕی عازب بەسەرهاتێکی حەجی ماڵئاوایی دەگێڕێتەوەو دەڵێت: لەو حەجەدا بووین کە تیایدا پێغەمبەر(ﷺ) حەجی کرد، پێغەمبەر(ﷺ) لە نێوەندی رێدا دابەزی و فەرمانی کرد نوێژ بکەن، دەستی عەلی گرت و فەرمووی: ئایا من بۆ باوەڕداران لە خودی خۆیان لەپێشتر نیم؟ وتیان با، فەرمووی: ئایا بۆ هەر باوەڕدارێک من لە نەفسی خۆی لەپێشتر نیم؟ وتیان با، فەرمووی: (**فهذا ولي من أنا مولاه، اللهم وال من والاه، اللهم عاد من عاداه**)،[2] دەی ئەمە وەلی هەر کەسێکە کە من مەولای بم، خوایە لەگەڵ ئەو کەسە بە کە لەگەڵیەتی و دژی ئەو کەسە بە کە دژیەتی).

بەرائی کوڕی عازب دوای وەفاتی پێغەمبەریش(ﷺ) بەردەوام بوو لە غەزاکاندا، لە ساڵی بیست و چواری کۆچیدا ناوچەی رەی فەتح کرد،[3] هەروەها هاودەم بە ئەبوو مووسای ئەشعەری لە غەزای توستوردا بەشدار بوو.[4]

دواتر بەرائی کوڕی عازب لە ناو سوپای خەلیفەی باوەڕداران عەلی کوڕی ئەبوطالیبدا بوو و بەشداری هەریەک لە جەنگی جەمەل و صفینی کرد و لە جەنگی نەهرەوانیشدا دژ بە خەواریجەکان لە سوپای عەلیدا بەشدار بوو.[5]

بەرائی کوڕی عازب دواتر لە کووفە نیشتەجێ بوو و لەوێ خانوویەکی بۆ خۆی دروست کرد و مایەوە تا لە سەردەمی ئیمارەتی موصعەبی

---

[1] البداية و النهاية لابن كثير، ج٥، ص١٣٠.

[2] سنن ابن ماجه - أبواب السنة - باب في فضائل أصحاب رسول الله(ﷺ) - فضل علي بن أبي طالب(ﷺ)، الرقم ١١٦، صححه الألباني في صحيح وضعيف سنن ابن ماجة، الرقم ١١٦.

[3] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٥٦.

[4] أسد الغابة، ج١، ص٢٥٨، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٧٨.

[5] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ص١٥٧.

کوڕی زوبەیردا کۆچی دوایی کرد،[1] ئەمەش لە ساڵی حەفتا و دووی کۆچیدا بوو.[2]

سەبارەت بە ساڵی مردنەکەی، ئیبن کەثیر دەڵێت: بۆچوونێ هەیە دەڵێت: لە ساڵی حەفتاو دوو یان حەفتا و سێ یان حەفتاو چواری کۆچیدا وەفاتی کردووە،[3] ذەهەبی دەڵێت: بەرائی کوڕی عازب لە ساڵی حەفتاو یەکی کۆچیدا وەفاتی کردووە،[4] بەڵام بۆچوونی زیاتر لەسەر ئەوەیە لە ساڵی حەفتاو دووی کۆچی وەفاتی کردووە.

رایەکی تر دەڵێت: بەرائی کوڕی عازب دواتر لە کووفەوە گەڕایەوە بۆ مەدینەو لەوێ کۆچی دوایی کرد.[5]

**تەمەنی بەرائی کوڕی عازب:**

هەرچەندە سەرچاوەکان تەمەنی بەرائی کوڕی عازبیان باس نەکردووە، بەڵام دەتوانین بە نزیکەیی تەمەنی دیاری بکەین:

لە غەزای خەندەقدا بەرائی کوڕی عازب تەمەنی پانزە ساڵان بووە، غەزای خەندەقیش لە ساڵی پێنجی کۆچیدا روویداوە، واتە لە ساڵی یەکی کۆچیدا کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی کردووە بۆ مەدینە تەمەنی بەرائی کوڕی عازب نزیکەی دە ساڵان بووە، لە کاتی بەدر و ئوحودیشدا تەمەنی کەم بووە بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) رێی نەداوە بەشداری ئەو غەزایانە بکات، ئەمەش بەڵگەیەکی دروستە لەسەر ئەوەی بەرائی کوڕی عازب بەشداری ئوحودیش نەبووە.

زۆرترین ساڵ لەسەر مردنەکەی هاتبێت ساڵی ٧٢ی کۆچیە، واتە کاتێک بەرائی کوڕی عازب کۆچی دوایی کردووە تەمەنی نزیکەی هەشتاو دوو ساڵان بووە.

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص٢٥٨.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٧٨.

[3] البداية والنهاية لابن كثير، ج٨، ص٣٢٨.

[4] تاريخ الإسلام للذهبي، ج٥، ص٣٠٠.

[5] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٦، ص١٧.

**پەند و وانە:**

خاکیبوون و گەورەیی پێغەمبەر(ﷺ) بەدیدەکەین کە چۆن لە کاتی سەنگەر و ماندووبوونی موسڵمانان و لە هەڵکەندنی ئەو خەندەقەدا بەشدار بووە و هێندە خۆڵی گواستوەتەوە تا تۆزو خۆڵ سەر سنگی داپۆشیوە، ئەمە هەم بەرپەرچدانەوەی ئەو بیرە شێواوەی هەندێ ڕێبازی ناردوستە کە پێیان وایە بەرپرسیارێتی تاکەکەسی و ئەرکی پەرستش واجب نیە، هەم وانەیەکە بۆ سەرکردەکان.

خۆشەویستی عەلی کوڕی ئەبووطالیب واجبێکی سەرشانی هەر موسڵمانێکە وەک چۆن پێغەمبەر(ﷺ) لەو فەرموودە صەحیحەدا ئاماژەی پێ داوە، هەروەک خۆشەویستی حەسەن و حوسەینی کوڕانی عەلیش واجبی هەر موسڵمانێکەو ئەوەی پێغەمبەری خوای(ﷺ) خۆش بوێت واجبە ئەوانیشی خۆش بوێت، پێغەمبەری خوا(ﷺ) داوای لە خوا کردووە رق و دوژمنایەتی هەبێت بەرامبەر بە دوژمنانیان.

## ٣٦٥. بەرائی کوڕی حەزم(ﭬ)

یەعلای کوڕی ئەشدەق دەڵێت: گەیشتم بە دە لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ)، لەوانە بەرائی کوڕی حەزم و عەبدوڵای کوڕی جراد کە دەیانوت پێغەمبەر(ﷺ) لە هەر سەد وشترێک دوو جیزعەی لێ وەردەگرتین-بۆ زەکات.[1]

ئیبن حەجەر لە (الإصابة) دا دەڵێت: یەعلای کوڕی ئەشدەق یەکێکە لە لاوازە مەتروکەکان.

## ٣٦٦. بەرائی کوڕی عەمر(ﭬ)

ناوی بەرائی کوڕی عەمری کوڕی عەبدورەحمانی کوڕی عوبەیدی

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٧٨.

خەزرەجیە، لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان،[1] لە غەزای ئوحوددا بەشداری کردووە.[2]

## ٣٦٧. بەرائی کوڕی مالیک(رضي الله عنه)

ناوی بەرائی کوڕی مالیکی کوڕی نەضرە،[3] لە پشتیوانانە لە بەنی نەجار،[4] برای ئەنەسی کوڕی مالیکە لە سەری باوکیەوە،[5] برایەکی تریشی هەبوو بە ناوی شەریکی کوڕی سەمحا، دایکی ناوی سەمحایە.[6]

هەرچەندە بۆچونێک پێی وایە ئەنەس و بەرائی کوڕی مالیک دایکیشیان یەک بووە،[7] بەڵام ئیبن حەجەر دەیسەلمێنێت تەنها لە سەری باوکەوە برا بون.[8]

بەرائی کوڕی مالیک دەنگێکی خۆشی هەبوو و لە زۆر گەشتی پێغەمبەردا(ﷺ) لەگەڵیدا دەچوو،[9] هەروەها لە هەموو غەزاکاندا لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) بەشداری کردووە جگە لە غەزای بەدر.[10]

پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژەی بەوە دابوو بەرائی کوڕی مالیک نزای گیرایە، بەراء تەواو تامەزرۆی جیهادی ڕێی خوا بوو، جارێک ئەنەس چوو بۆ لای بەرا و و سەیری کرد شیعر دەڵێتەوە، ئەویش وتی: براکەم شیعر دەڵێیتەوە لەکاتێکدا خوای گەورە لەبری شیعر چاکتری بۆ داناویت کە

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٧٩.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٧٩.
[3] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٥٣
[4] تأريخ الإسلام للذهبي، ج٣، ص٢٠٩.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٨١-٢٨٢.
[6] أسد الغابة، ج٢، ص٦٠١.
[7] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٥٣، البطقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص١٧، أسد الغابة، ج١، ص٢٥٩.
[8] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٨٠.
[9] أسد الغابة، ج١، ص٢٦٠.
[10] أسد الغابة، ج١، ص٢٥٩.

قورئانە؟ ئەویش وتی: دەترسیت خوا لەناو جێگەدا بممرێنی لەکاتێکدا بە تەنها نەوەدو نۆ بێباوەڕم کوشتووە جگە لەوەی لەگەڵ هاوەڵان بێباوەڕی ترم کوشتووە؟[1]

ئەنەسی کوڕی مالیک ئاماژە بەوە دەدات کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی بەرائی کوڕی مالیک ئەگەر سوێندی خوا بدات، خوای گەورە سوێندەکەی بەجێدەگەیەنێت (كم من أشعث أغبر ذي طمرين لا يؤبه له لو أقسم على الله لأبره منهم البراء بن مالك).[2]

بەرائی کوڕی مالیک دوای وەفاتی پێغەمبەریش(ﷺ) ژیاو لە غەزای یەمامەشدا رۆڵێکی کارای گێڕا.[3]

لە جەنگی یەمامەدا موسڵمانان لەبەردەم باخێکدا کە بە دیوار دەورە درابوو گیریان خواردبوو، بەرائی کوڕی مالیک وتی: هۆ موسڵمانان من بەرزبکەنەوە تا بچم بۆیان، ئەوەبوو بەرزیان کردەوەو بەسەر دیوارەکەدا سەرکەوت و جەنگا تا دەرگاکەی کردەوەو موسڵمانان توانییان بچنە ناوەوە و سەربکەون و دواجاریش موسەیلەمە کوژرا.[4]

جۆری سەرخستنەکەشی ئەوەبوو کە خستیانە سەر تەختێک(قەڵغانێک) و بە رمەکان بەرزیان کردەوە تا فڕێیان دا بەودیودا و لەوێ هەستایەوەو کەوتە کوشتنی بێباوەڕان تا چوو دەرگاکەی کردەوە.[5]

خالیدی کوڕی وەلید لە جەنگی یەمامەدا بە بەرائی کوڕی مالیکی وت: هەستە، ئەویش هەستا و وتی: ئەی خەڵکی مەدینە ئەمڕۆ بەس خوای گەورە وبەهەشتتان بۆ هەیە و بەتەما مەبن بگەڕێنەوە شارەکەتان، ئینجا

---

[1] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج١، ص١٩٧- ١٩٨.

[2] جامع الترمذي - أبواب المناقب عن رسول الله(ﷺ) - باب مناقب البراء بن مالك(ﷺ)، الرقم ٣٨٥٤ وحسنه، صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن الترمذي، الرقم ٣٨٥٤.

[3] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٥٥

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٨١-٢٨٢.

[5] البداية والنهاية لابن كثير، ج٦، ص٢٦٨.

هەڵمەتی برد و خەڵکیش کەوتنە شوێنی و دایان بەسەر خەڵکی یەمامەدا و سەرکەوتن.[1]

بەڕاء لەو جەنگەدا تووشی بوو بە تووشی کەسێکەوە کە پێی دەوترا گوێدرێژی یەمامە، چونکە زۆر زل و قەبە بوو، بەرائیش هێرشی بۆ برد و بە شمشێر دای لە هەردوو قاچی، کابراش لەسەر ئەژنۆ کەوت، ئینجا کوشتی، پاشان شمشێرەکەی خۆی هەڵگرت و بە شمشێرەکەی کابرا جەنگا تا شمشێرەکەی شکا.[2]

لە جەنگی یەمامەدا هێندە جەنگا تا نزیکەی هەشتاو ئەوەندە جار بریندار بوو، ئەوەبوو یەک مانگ لای خالیدی کوڕی وەلید بوو تا برینەکانی چاک بوونەوە.[3]

گەرموگوڕی و نەترسی بەرائی کوڕی مالیک لە ئاستێکدا بوو ئەمیری باوەڕداران عومەری کوڕی خەططاب نامەی نووسی و فەرمانی کرد بەرائی کوڕی مالیک نەکەنە سەرکردەی سوپا، چونکە گوێی لێ نیەو بەردەوام پێشڕەوییان پێ دەکات.[4]

دواجار لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەططابدا لە قەڵای توستور شەهید بووە.[5]

دەوترێت لە ساڵی بیستی کۆچی بووە، دەشوترێت بەڵکو لەپێش بیستی کۆچی بووە، یان دەوترێت لە ساڵی بیست و سێی کۆچیدا بووە، باس لەوەش دەکرێ هورمزان بەرائی کوڕی مالیکی شەهید کردووە.[6]

وەک پێشتر باسمانکرد پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژەی بەوە دابوو ئەگەر بەرائی

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٨١.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ٢٨١.

[3] أسد الغابة، ج١، ص٢٦٠.

[4] أسد الغابة، ج١، ص٢٥٩، تأريخ الإسلام للذهبي، ج٣، ص٢١٠.

[5] -الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٥٥، تأريخ الإسلام للذهبي، ج٣، ص٢١٠.

[6] الإصابة في تمييز الصحابة ١، ج٥، ص٧٧٤.

کوڕی مالیک سوێندی خوا بدات خوا سوێندەکەی ناخات، ئەوەبوو جارێ لە غەزایەکدا موسڵمانان بەدەست بێباوەڕانەوە گیرۆدە بوون، موسڵمانان وتیان ئەی بەرائی کوڕی مالیک پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژەی بەوە داوە ئەگەر سوێندی خوا بدەیت خوا سوێندەکەت ناخات دەی نزامان بۆ بکە، ئەویش وتی: خوایە سوێندت دەدەم گەردنی ئەو بێباوەڕانە بدەیتە دەستمان و دوای ئەوەش من بگەیەنیتەوە بە پێغەمبەرەکەت، ئەوەبوو خوای گەورە موسڵمانانی سەرخست، شەهیدیشی بەخشی بە بەرائی کوڕی مالیک.[1]

بەرائی کوڕی مالیک ژمارەیەکی زۆری دوژمنی ڕووبەڕوو کوشت، جگە لەوانەی لەگەڵ موسڵمانانی تردا بەشداری کوشتنیان بوو.[2]

دوای ئەوەی بەرائی کوڕی مالیک کە شەهید بوو کچێکی هەبوو لای ئەنەسی برای دەمایەوەو دواتریش ئەنەس دای بە شوو.[3]

## ٣٦٨. بەرائی کوڕی مەعرور(ﷺ)

ناوی بەرائی کوڕی مەعروری کوڕی صەخری کوڕی خەنسائی کوڕی سینانە،[4] لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان، کونیەکەی ئەبو بیشرە.[5]

دایکی ناوی ریبابی کچی نعمانە،[6] یان دەوترێ دایکی ناوی سەلاف بووە و پێغەمبەری خوا(ﷺ) چەند جار سەردانی کردووە.[7]

ژنەکەی ناوی حومەیمەی کچی صەیفیە،[8] ئیبن ئەثیر دەڵێت: پێم وایە

---

[1] المستدرک علی الصحیحین - کتاب معرفة الصحابة(ﷺ) - ذکر البراء بن مالک الأنصاري أخ أنس بن مالک(ﷺ) - ذکر شهادة البراء بن مالک، الرقم ٥٣١٠.

[2] البدایة والنهایة لابن کثیر، ج٧، ص٨٥.

[3] البطقات الکبری لابن سعد، ج٧، ص١٢١.

[4] الطبقات الکبری لابن سعد، ج٣، ص٦١٨.

[5] الإصابة في تمییز الصحابة، ج١، ص٢٨٢.

[6] أسد الغابة، ج١، ص٢٦٠.

[7] الإصابة في تمییز الصحابة، ج٧، ص٧٠٢.

[8] الإصابة في تمییز الصحابة، ج٧، ص٥٨٧.

ئامۆزای بووه،[1] ژنێكی تریشی هەبوو بە ناوی خلیسەی كچی قەیس كە دایكی بیشره.[2]

بەرائی كوڕی مالیک كوڕێكی هەبوو بە ناوی بیشر كە بەشداری بەیعەتی عەقەبە و غەزای بەدر و ئوحود و غەزاكانی تریش بوو تا لە فەتحی خەیبەردا وەفاتی كرد،[3] ئەم كوڕەی لەو گۆشتە ژەهراویەی خوارد كە ئافرەتە جوولەكەكە هێنای بۆ پێغەمبەر(ﷺ).[4]

كوڕێكی تریشی هەبوو بە ناوی موبەشیر[5] كە لە حودەیبیە و بەیعەتی ریضواندا بەشداربوو.[6]

كچێكیشی هەبوو بە ناوی ئوم بیشر یان ئوم ئەنەس كە فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە،[7] كچێكی تریشی هەبوو بە ناوی هیند كە ژنی جابری كوڕی عەتیک بوو.[8]

كچێكی تریشی هەبوو بە ناوی رەباب كە بەیعەتی داوە بە پێغەمبەر(ﷺ)،[9] كچێكی تری ناوی ظەبیە بوو كە ژنی ئەبووقەتادەی ئەنصاری بوو،[10] یان دەوترێت ناوی سەلافە بووە.[11]

بەڕا ْ یەكێكە لە بەشداربوانی بەیعەتی یەكەمی عەقەبە، دەشوترێت لەو بەیعەتەدا یەكەم كەس بەیعەتی دا بەرائی كوڕی مەعروور بوو، یەكەم كەسیش بوو رووی كردە قیبلە، یەكەم كەسیش بوو سەبارەت بە سێ

[1] أسد الغابة، ج٧، ص٨٠.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٦١٠.
[3] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٦٧.
[4] أسد الغابة، ج٣، ص٤٤١.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٥، ص٧٦٢.
[6] أسد الغابة، ج٥، ص٥٩.
[7] أسد الغابة، ج٧، ص٣٢٤.
[8] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٨، ص١٥٠.
[9] أسد الغابة، ج٧، ص١١٨.
[10] أسد الغابة، ج٧، ص١٩٧.
[11] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٧٠٢.

یەکی سامانەکەی وەسیەتی کرد.[1]

هەروەها بەرائی کوڕی مەعروور یەکێکە لە نەقیبەکان، نەقیبەکانیش دوانزە کەس بوون کە بریتی بوون لە: سەعدی کوڕی عوبادەو ئەسعەدی کوڕی زورارەو سەعدی کوڕی رەبیع و سەعدی کوڕی خەیثەمەو موندیری کوڕی عەمر و عەبدوڵای کوڕی رەواحەو بەرائی کوڕی مەعروور و ئەبولهەیثەمی کوڕی تیهان و ئوسەیدی کوڕی حوضەیر و عەبدوڵای کوڕی عەمر و عوبادەی کوڕی صامت و رافیعی کوڕی مالیک.[2]

کەعبی کوڕی مالیک باسی ئەو سەفەرەیان دەکات کە بۆ بەیعەتدان چون بۆ مەککە، دەڵێت: بۆ ساڵی دواتر کە وادەمان هەبوو لە مەککە پێغەمبەر(ﷺ) ببینین، حەفتا پیاو دەبووین، لە دەوروبەری بەیتدا بووین کە بەرائی کوڕی مەعروور (کە گەورە و رێبەرمان بوو) وتی: بەخوا بۆچوونێکم هەیە ئیتر نازانم ئێوە لەگەڵمن یان نا؟ پێم وایە رووەو کەعبە نوێژ بکەم، ئێمەش وتمان: وامەکە ئێمە بیستوومانە پێغەمبەر(ﷺ) رووەو شام نوێژ دەکات، بۆیە ئێمەش رووەو قیبلەکەی ئەو نوێژ دەکەین، هەرچەند هەوڵی دا ئێمە رازی نەبووین و ئەویش بە راکەی ئێمە رازی نەبوو، کە کاتی نوێژ هات بەرائی کوڕی مەعروور رووەو قیبلە نوێژی کرد، ئێمەش رووەو شام نوێژمان کرد، تا چووینە مەککە، بەرائی کوڕی مەعروور پێی وتم: برازاگیان بەزم و حاڵی ئەم سەفەرەم دڵەخورپەی بۆ دروست کردوم، جا ئەوکات ئێمە پێغەمبەری خوامان نەدەناسی، بەڵام عەبباسی کوڕی عەبدولموطەلیبمان دەناسی، چونکە بەهۆی بازرگانیەوە دەهات بۆ لامان و دەمانبینی، لە مەککە کەوتینە پرسیارکردن لەسەر پێغەمبەر(ﷺ) تا بزانین لە کوێیە، لە ناوچەی بەطحا گەیشتین بە کەسێک هەواڵی پێغەمبەرمان(ﷺ) لێ پرسی؟ وتی دەیناسن؟ وتمان: ناوەڵا، وتی دەی کە چوونە ژوورەوە

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٨٢.

[2] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٨٠، أسد الغابة، ج١، ص١١١.

ئـەو پیـاوەی لەگـەڵ عەبباسـدا دانیشـتووە ئـەوە موحەممـەدە، چونکـە ئێسـتا لای ئەوانـەوە هاتـم پێکـەوە دانیشـتبوون، ئێمـەش چوویـن تـا گەیشـتینە لای پێغەمبـەر(ﷺ) و بینیمـان لەگـەڵ عەبباسـە، سـەلامما کـرد لـە هەردووکیـان و لەلایـان دانیشـتین، پێغەمبـەر(ﷺ) بـە عەبباسـی فەرمـوو ئـەی عەبـاس ئـەو دوو پیـاوە دەناسـیت؟ عەبباسـیش وتـی: بەڵێ، ئـەو دوانـە خەزرەجین-ئـەوکات پشـتیوانان بـە ئەوسـی و خەزرەجـی دەناسـران نـەک بـە ئەنصـار، چونکـە دواتـر نـاوی ئەنصاریـان لێنـرا- ئەوەیـان بەرائـی کـوڕی مەعـروورەو گـەورە پیاوێکـی نـاو هۆزەکەیەتـی، ئـەوەش کەعبـی کـوڕی مالیکـە، سـوێند بەخـوا قسـەکەی پێغەمبـەرم(ﷺ) بیـر ناچێتـەوە کـە فەرمـووی: (شـاعیرەکە؟) وتـی: بەڵێ، ئینجـا بەرائـی کـوڕی مەعـروور وتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) مـن لـە سـەفەرەکەمدا شـتێکم کـردووەو حـەز دەکـەم پێـم بڵێیـت ئـەو کارەم چۆنـە؟- راسـتە یـان هەڵەیـە- چونکـە تووشـی رارایـی و دوودڵـی بـوم، مـن رووەو قیبلـە نوێـژم کـرد و هاورێکانیشـم نـاڕازی بـوون و ئـەوان رووەو شـام نوێژیـان کـرد، ئیتـر تووشـی دوودڵـی بـووم، پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمـووی: (أمـا إنـك قـد كنـت علـى قبلـة لـو صبـرت عليهـا)، (ئەگـەر خۆڕاگـر بوویتایـە لەسـەری رووەو قیبلـە دەبوویـت)، ئیتـر زیاتـر لـەوەی نەفەرمـوو، دواتـر چوویـن بـۆ مینـا و حەجمـان کـرد تـا لـە ڕۆژانـی تەشـریقدا- ئێمـەو پێغەمبـەر(ﷺ) وادەی عەقەبەمـان دانـا و لـە تاریکـی شـەودا بـە دزی بێباوەڕانـەوە چوویـن و لـە عەقەبـە کۆبووینـەوە، پێغەمبـەر(ﷺ) هـاودەم بـە عەبباسـی مامـی هـات، پێغەمبەری خـوا(ﷺ) قورئانـی خوێنـدەوە بەسـەرماندا و ئێمـەش لامـان خۆشـەویست بـوو و بەراسـتمان زانـی و باوەڕمـان پـێ هێنـا و بـە فەرمایشـتەکانی رازی بوویـن، پاشـان عەبباسـی کـوڕی عەبدولموطەلیـب قسـەی کـرد...ئینجـا بەرائـی کـوڕی مەعـروور قسـەی کـرد و دەسـتی پێغەمبـەری خـوای(ﷺ) گـرت و وتـی: بەیعەتمـان لـێ وەربگـرە، ئەویـش فەرمـووی: (أبايعكم على أن تمنعوني مما تمنعون منه أنفسكم ونساءكم وأبناءكم)،

(بەیعەتتان لێ وەردەگرم لەسەر ئەوەی چۆن خۆتان و ژن و منداڵتان دەپارێزن وا بمپارێزن)، بەرائیش وتی: سوێند بەوەی تۆی بە حەق ناردووە وادەکەین. [1]

**مردنی بەرائی کوڕی مەعرور:**

بەرائی کوڕی مەعروور لە سەفەرێکیدا کۆچی دوایی کرد، [2] بەڵام تەرمەکەی لە مەدینە ئەسپەردە کرا، مردنی بەرائیش مانگێک پێش هاتنی پێغەمبەر(ﷺ) بوو بۆ مەدینە. [3]

بەرائی کوڕی مەعروور پێش مردنی وەسیەتی کردبوو رووەو کەعبە ئەسپەردە بکرێت، بۆیە بەوجۆرە ئەسپەردەیان کرد، [4] ئەم وەسیەتەیشی لای پێغەمبەر(ﷺ) کردبوو و پێغەمبەریش(ﷺ)بە وەسیەتەکەی رازی بووبوو. [5]

هەروەها لە پێش مردنیدا وەسیەتی کرد سێ یەکی سامانی بدرێتە دەست پێغەمبەر(ﷺ) تا چی پێ باش بوو وای لێ بکات. [6]

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) هاتە مەدینە، نوێژی مردووی لەسەر گۆڕەکەی بەرائی کوڕی مالیک ئەنجام دا، [7] ئەمەش یەکەم نوێژی پێغەمبەر(ﷺ) بوو لەسەر گۆڕی موسڵمانێک.

**وەستانێک:**

لەوانەیە گومانێک لای خوێنەر دروست ببێت بڵێت پێشتر وترا ئەسعەدی کوڕی زورارە یەکەم کەس بوو نوێژی لەسەر کرا؟! لە وەڵامدا دەڵێین ئەو باسەی ئەسعەدی کوڕی زورارە پەیوەست بوو بە دوای کۆچ کرنی

---

[1] صحيح ابن حبان - كتاب إخباره(ﷺ) عن مناقب الصحابة رجالهم ونسائهم بذكر أسمائهم رضوان الله عليهم أجمعين - ذكر البراء بن معرور بن صخر بن خنساء رضوان الله عليه، الرقم ٧٠١١، حسنه الألباني في التعليقات الحسان على صحيح ابن حبان، الرقم ٦٩٧٢.

[2] أسد الغابة، ج١، ص٢٦١.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٨٢.

[4] أسد الغابة، ج١، ص٢٦٢.

[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٨٢.

[6] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٦١٩.

[7] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٦١٩، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٨٢.

پێغەمبەر(ﷺ) بۆ مەدینە، بەڵام بەرائی کوڕی مەعروور پێش کۆچکردنی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ مەدینە وەفاتی کرد.

هەروەها سەبارەت بەوەی ئەسعەد یەکەم کەس بوو پێغەمبەر(ﷺ) لە مەدینە نوێژی مردووی لەسەر کرد، ئەمەش وایە چونکە بەرائی کوڕی مەعروور پێش هاتنی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ مەدینە ئەسپەردە کرابوو و پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر گۆڕەکەی نوێژی مردووی کرد نەوەک لەسەر تەرمەکەی.

## ٣٦٩. بەرائی کوڕی ئەوس(رضي الله عنه)

ناوی بەرائی کوڕی ئەوسی کوڕی خالیدە،[١] ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە.[٢]

ژنەکەی ناوی خەولەی کچی مونذیرە کە بە ئوم بردە ناسراوەو شیردەری ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر(ﷺ) بوو.[٣]

ئوم بەردەی کچی مونذیری کوڕی زەیدی ئەنصاری کە ژنی بەرائی کوڕی ئەوس بوو هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و داوای لێکرد تا شیرپێدانی ئیبراهیمی پێ بسپێرێت، ئەم ئافرەتە ناوی خەولەی کچی مونذیر بوو لە بەنی مازن، داوای کرد رۆژانە شیر بدات بە ئیبراهیم و دواتر بیباتەوە بۆ لای ماریەی دایکی، پێغەمبەریش(ﷺ) بەشە دارخورمایەکی هەبوو دای بە ئوم بەردە.[٤]

هەر لەبەر ئەوەیە بەرائی کوڕی ئەوس بە باوکی شیری ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر(ﷺ) دادەنرێت.[٥]

---

[١] الاستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٥٣.
[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٧٧.
[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٧٧.
[٤] الاستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١ ص٥٦،٥٥، أسد الغابة، ج١، ص٦٣.
[٥] أسد الغابة، ج١، ص٢٥٨.

بەراء لە غەزای ئوحود و غەزاکانی دواتریشدا بەشدار بوو.[1]

بەرائی کوڕی ئەوس لە یەکێک لە غەزاکاندا کە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بەشداری کردبوو جڵەوی دوو ئەسپی بەدەستەوە بوو، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) پێنج پشکی لە غەنیمەت دیاری کرد بۆ بەرائی کوڕی ئەوس.[2]

## ٣٧٠. بەرذەعی کوڕی زەید(ﷺ)

ناوی بەرذەعی کوڕی زەیدی کوڕی نعمانی کوڕی زەیدی کوڕی عامرە، لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان،[3] ئەم هاوەڵە زۆر زوو موسڵمان بوو.[4]

بەرذەع یەکێک بوو لە شاعیرەکان، لە غەزای ئوحود و غەزاکانی تریشدا بەشداری کرد.[5]

## ٣٧١. بەرذەعی کوڕی زەیدی جذامی(ﷺ)

ئەم هاوەڵە جیایە لە بەرذەعی کوڕی زەیدی کوڕی نعمان، ئەمەیان برای رفاعەی کوڕی زەیدە، رفاعەی برای لە فەرموودەیەکدا باسی موسڵمانبوونی هەریەک لە بەرذەع و سوەیدی برای دەکات.[6]

بەرذەع لەگەڵ ریفاعەی برایدا وەک وەفد چووەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، کاتێک ریفاعە چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمان بوو و چەند رۆژێک مایەوە تا قورئان فێر بێت، دواتر نامەیەکی نووسی بۆ هۆزەکەی تا موسڵمان ببن، لەو کاتەدا پێغەمبەر(ﷺ) زەیدی کوڕی حارثەی ناردبوو بۆ ناوچەکەی ئەوان، زەید هێرشی کردە سەریان و هەندێکی لەوان کوشت و هەندێکی دیکەشی

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٧٧.

[2] أسد الغابة، ج١، ص٢٥٧.

[3] أسد الغابة، ج١، ص٢٦٣.

[4] أسد الغابة، ج١، ص٢٦٣.

[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٢٨٤.

[6] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١١٩٧.

بەدیل گرت، ریفاعەش هاودەم بە هەردوو براکەی خۆی (بەرذەع و سوەید) و کەسانێکی ناو هۆزەکەی کە بریتی بوون لە (ئەبووزەیدی کوڕی عرمو و ئەبوو ئەسمائی کووڕی عەمر و ئەعلەبەی کوڕی عەددی) هاتەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، ریفاعە نامەکەی خۆی گەیاندە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و خوێندیەوەو هەواڵی کارەکەی زەیدی کوڕی حارثەی پێدا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی چی بکەم بە کوژراوەکان؟ ئەبوویەزید وتی: ئەوەی زیندووە ئازادی بکە بۆمان، ئەوەی کوژراوە لەژێر ئەو دوو پێیەمدایە-واتە بیانوو ناگرین- پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەبوویەزید راست دەکات، ئینجا عەلی کوڕی ئەبووطالیبی نارد بۆ لای زەید و چی دیلی هەبوو ئازادی کردن و چی سامانی بردبوون پێی دانەوە.[1]

## ٣٧٢. بەرری کوڕی عەبدولا(رضي الله عنه)

سەبارەت بە ناوی ئەم هاوەڵە چەند رایەک هەیە: بەرە، بورەیر، لەیث، باوکی ناوی عەبدولایە،[2] کونیەکەشی ئەبووهیندە.[3]

ئیبن مەندەو ئەبوونوعەیم دەڵێن بەر برای هەریەک لە تەمیم و طەیبە، بەڵام ئیبن ئەثیر بەرپەرچی ئەو رایە دەداتەوەو دەیسەلمێنێت ئەوانە برای بەڕ نین، چونکە لە بەرەبابی پێنجەمەوە بەیەک دەگەنەوە، ئەوانەش دەڵێن برای بەرن مەبەستیان برایەتی ناو هۆزەکەیە.[4]

ئیبن حببان دەڵێت: بەر لە سەری دایکیەوە برایەکی هەبوو ناوی تەمیمی کوڕی ئەوس بوو.[5]

بەر کوڕێکی هەبوو بە ناوی زیاد کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە.[6]

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص٤٢٥.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٧٧.

[3] أسد الغابة، ج١، ص ٢٥٧.

[4] أسد الغابة، ج١، ص ٢٦٦.

[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٦٨.

[6] المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٨٦٢٨.

ئـەم هاوەڵـە لەلایـەن پێغەمبـەرەوە(ﷺ) ناوەکـەی گـۆڕا و پێغەمبـەر(ﷺ) نـاوی لێنـا عەبدوڵا.[1]

بەڕ لە خاکی فەلەستین و لە بەیتولموقەدەس نیشتەجێ بوو.[2]

بـەر فەرموودەیەکـی لـە پێغەمبـەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتـەوە کـە دەڵێـت: لـە پێغەمبـەرم(ﷺ) بیسـت دەیفەرمـوو خـوای گـەورە فەرموویەتـی (من لم يرض بقضائي ويصبر على بلائي فليلتمس ربا سواي)،[3] (هـەر کـەس بـە قـەزای مـن رازی نیـە و لەسـەر بـەڵام خۆڕاگر نیە، ئەوا با بۆ خوایەکی تر جگە لـە مـن بگەڕێت و خوایەکـی تـر بـۆ خـۆی پەیدا بـکات).

ئـەم فەرموودەیـە لاوازەو ئیبـن ئەثیـر هێناویەتـی کـە سـەنەدەکەی لاوازە، جگـە لـەوەش ئەلبانـی بـە لاوازی دانـاوە.

## ٣٧٣. بەرەکەی حەبەشی(ﷺ)

نـاوی بەرەکەیـەو ئافرەتێکـی حەبەشـی بـوو و لـە حەبەشـە لەگـەڵ ئومموحەبیبـە بـوو و خزمەتـی دەکـردو دواتریش لەگەڵـی هـات بـۆ مەدینـە.[4]

لـە گێڕانەوەیەکدا هاتـووە پێغەمبـەر(ﷺ) میـزی دەکـردە نـاو دەفرێکـەوەو دواتـر لـە خـوارووی جێگەکەیـەوە دادەنـرا، جارێـک کـە میـزی کـردە نـاو و پـاش ماوەیـەک ویسـتی هەمـدی میـز بکاتـە نـاوی، تەماشـای کـرد میزەکـەی تێـدا نەمـاوە، ئافرەتێـک کـە پێـی دەوتـرا بەرەکـەو خزمەتـی ئوممو‌حەبیبـەی دەکـرد و لـە خاکـی حەبەشـەوە هێنابـووی لـەوێ بـوو، پێغەمبـەر(ﷺ) پێـی فەرمـوو کوا میـزی نـاو دەفرەکـە؟ ئەویـش وتـی: خواردمـەوە، ئەویـش فەرمـووی: (بـە پەرژینـێ خـۆت لـە دۆزەخ پاراسـت).[5]

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص ٢٦٦.

[2] أسد الغابة، ج١، ص ٢٦٦.

[3] المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٨٦٢٨، حكم عليه الألباني ب(ضعيف جدا) في سلسلة الأحاديث الضعيفة، الرقم ٧٤٧.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٣١.

[5] المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٢٠٣٢٢، قال الألباني في صحيح و ضعيف الترغيب و الترهيب، الرقم ٢٠٠٤

## ٣٧٤. بەرەکەی کچی یەسار(رضي الله عنها)

ناوی بەرەکەی کچی یەسارەو خزمەتکاری ئەبووسوفیانی کوڕی حەرب بوو، هاوسەری قەیسی کوڕی عەبدوڵا بوو، بەرەکە زۆر زوو لە مەککە موسڵمان بوو و هاودەم بە مێردەکەی کۆچی کرد بۆ حەبەشە.[١]

## ٣٧٥. بەرزەی کچی مەسعوود(رضي الله عنها)

ناوی بەرزەی کچی مەسعوودی کوڕی عەمرەو هاوسەری صەفوانی کوڕی ئومەییەیە، هاودەم بە صەفوانی مێردی موسڵمان بوو.[٢]

## ٣٧٦. بەریرەی خزمەتکار(رضي الله عنها)

ناوی بەریرەیەو خزمەتکاری عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ) بوو، بەریرە لەگەڵ خاوەنەکانی بۆ خۆئازاردکردنی رێککەوت لەسەر نۆ ئۆقیەو هەر ساڵێک ئۆقیەیەک بدات، ئینجا هات بۆ لای عائیشەو وتی: وا لەگەڵیان رێککەوتوم، جا یارمەتیم بدە،[٣] عائیشەی دایکی باوەڕداران ویستی بەریرە بکڕێت تا ئازادی بکات و خاوەنەکانی بەریرەش دەیانویست مەرجی هەواداری بەریرە بۆ خۆیان بهێڵنەوە، کە عائیشە ئەوەی بیست باسی کرد بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش فەرمووی: (بیکڕە چونکە وەلاء بۆ ئەوەیە کە ئازادی دەکات)، ئینجا خواردنێ هێنرا بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، عائیشە وتی: ئەوە صەدەقەیە بۆ بەریرە، ئەویش فەرمووی: (بۆ ئەو صەدەقەیەو بۆ ئێمە دیاریە).[٤]

---

صحيح لغيره.

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٣٢.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٣٠.

[٣] صحيح البخاري - كتاب البيوع - باب إذا اشترط شروطا في البيع لا تحل، الرقم ٢١٦٨.

[٤] صحيح البخاري - كتاب الزكاة - باب الصدقة على موالي أزواج النبي(ﷺ)، الرقم ١٤٩٣.

لـە رووداوی ئیفکدا کاتێک پێغەمبـەر(ﷺ) رای عەلـی کـوڕی ئەبووطالیبی وەرگـرت، عەلـی وتـی: پرسـیار لـە بەریـرەی خزمەتکاری بکـە چونکـە ئـەو راستیەکەت پێ دەڵێت، ئەوەبوو پێغەمبەریش(ﷺ) پرسیاری لێکرد و ئەویش وتـی: سـوێند بـەوەی تۆی بەحـەق نـاردووە ئەگـەر شـتێکم لـێ شـک ببردایـە هەرگیـز لێـم نەدەشـاردیتەوە، تەنهـا هێنـدە دەزانـم عائیشـە ئەوەنـدە تەمەنـی کەمـە کـە بەدیـار هەویـرەوە خـەوی لێدەکەوێـت و مریشـک و پەلـەوەر دێـن هەویرەکـە دەخـۆن.[1]

## ٣٧٧. بەسبەسی جوهەنی(ﷺ)

نـاوی بەسـبەس[2] یـان بەسبەسـە[3] یـان بوسبوسـی کـوڕی عەمـرە،[4] ئـەم هاوەڵـە جوهەنیـە و لـە پشـتیوانانە لـە بەنـی سـاعیدە، لـە غـەزای بـەدر[5] و ئوحودیشـدا بەشـداری کـرد.[6]

بەسبەس دوای مردنی خۆی هیچ منداڵێکی جێ نەهێشت.[7]

پێش غـەزای بـەدر پێغەمبـەر(ﷺ) هەریـەک لـە بەسـبەس و عـەدی کـوڕی ئەبـوو زەغبائـی نـارد تـا هەواڵـی کاروانەکـەی ئەبووسـوفیانی کـوڕی حـەرب وەربگـرن و هەواڵـی بـۆ بهێننـەوە، ئەوانیـش کەوتنـە ڕێ تـا گەیشـتنە بـەدر، لـەوێ هەردوکیـان وشـترەکانیان بەستنەوە و لای ئاوێـک مانـەوە، گوێیـان لـە دەنگـی دوو کەنیزەک بوو کە یەکێکیان بـەوی تری دەوت: سبەینێ کاروانەکە دێتـەوە، مەجدی کـوڕی عەمـر بەنێوانیاندا تێپـەڕ بـوو و وتـی: راسـت دەکات، ئینجا هەریـەک لە بەسبەس و عـەدی سواری وشـترەکانیان بوون و گەڕانەوە

[1] صحيح البخاري - كتاب الشهادات - باب تعديل النساء بعضهن بعضا، الرقم ٢٦٦١.
[2] أسد الغابة، ج١، ص٢٦٨.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٨٧.
[4] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١١٨٩.
[5] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٩٠، أسد الغابة، ج١، ص٢٦٨.
[6] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٥٦٠.
[7] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٥٦٠.

تا هاتنه خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و هەواڵەکەیان پێدا، کاتێک ئەوان کەوتبوونە ڕێ و گەڕابوونەوە ئەبوسوفیان هات و زۆر وریا بوو، بە مەجدی کوڕی عەمری وت: هیچ کەست لای ئەو ئاوە نەدیوە؟ وتی: ناوەڵا بەڵام بینیم دوو سوار لای ئەو تەپۆڵکەیە وشترەکانیان بەستبوونەوەو بڕێک ئاویان برد و دواتر چون، ئەویش چوویە شوێنەکەیان و بە پاشماوەی ئاڵفەکەدا زانی کە ئەو دوانە خەڵکی مەدینەن، بۆیە هەستی بە مەترسی کرد و بڕیاری دا ڕێی کاروانەکەی بەرەو کەناری دەریا بگۆڕێت.[1]

## ٣٧٨. بەشیری ثەقەفی(ﷺ)

بە بەشیر و بوشەیریش ناوی هاتووە،[2] بەسەرهاتێکی خۆی باس دەکات و دەڵێت: چووم بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) و وتم: من لە سەردەمی نەفامیدا نەزرم کردووە گۆشتی حوشتر نەخۆم و مەی نەخۆمەوە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: گۆشتی حوشتر بخۆ، بەڵام مەی مەخۆرەوە.[3]

## ٣٧٩. بەشیری حارثی(ﷺ)

ناوی بەشیری حارثي کەعبیە، کوڕێکی هەبوو بە ناوی عیصام کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە.[4]

بەشیر دەڵێت: بەنوحارثی کوڕی کەعب منیان بە وەفد نارد بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ)، کاتێک چوومە خزمەتی فەرمووی: لە کوێوە هاتویت؟ وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە دایک و باوکمەوە بە قوربانت بم، من وەفدی هۆزەکەمم بۆ لای تۆ تا موسڵمان بوونی هۆزەکەم رابگەیەنم، ئەویش فەرمووی: (مەرحەبا) بەخێر بێیت، ناوت چیە؟ وتم: ئەکبەر، فەرمووی:

---

[1] دلائل النبوة للبيهقي، الرقم ٨٧٢، الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص١٣.

[2] أسد الغابة، ج١، ص ٢٩٧.

[3] معجم الصحابة لابن قانع، ج١، ص ٩٣، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣١٧.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣١٨.

بەڵکو تۆ بەشیریت (بل أنت بشیر).[1]

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری لێکردم فەرمووی: ناوت چیە؟ وتم: کەثیر، فەرمووی: (بل أنت بشیر)،[2] بەڵکو تۆ ناوت بەشیرە.

## ٣٨٠. بەشیری کوڕی جابر(رضي الله عنه)

ناوی بەشیری کوڕی جابری کوڕی عەرابی عەبەسیە،[3] وەک وەفد هاتوەتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ)،[4] دواتریش لە سەردەمی خیلافەتی راشیدیندا لە فەتحی میصردا بەشداری کرد.[5]

## ٣٨١. بەشیری کوڕی حارث(رضي الله عنه)

ناوی بەشیری کوڕی حارثەو لە پشتیوانانە،[6] بە بوشەیریش ناوی هاتووە.[7]

ئیبن ئەثیر پێی وایە هاوەڵ نەبووە، بەڵکو تابعی بووە،[8] بەڵام ئیبن قانع و ئیبن حەجەر بە هاوەڵ باسی دەکەن.

فەرموودەیەکی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی (إذا أشكلت عليك آية من القرآن تؤنثها أو تذكرها فذكر القرآن)،[9] (ئەگەر لە ئایەتێکی قورئاندا گیرت خوارد ئایا موذەکەرە یان موئەننەثە ئەوا بە موذەککەری دایبنێ).

[1] السنن الكبرى للنسائي - كتاب عمل اليوم والليلة - ما يقول للقادم إذا قدم عليه، الرقم ١٠٠٩٥.

[2] المستدرک علی الصحیحین - كتاب الأدب - النهي عن التسمية بملك الأملاک، الرقم ٧٨٢٠ وصححه و وافقه الذهبي و قال في التلخيص (صحيح).

[3] أسد الغابة، ج١، ص٢٨٧.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣١٠.

[5] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ١٧٧.

[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣١٠.

[7] معجم الصحابة لابن قانع، ج١، ص ٩١، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣١٠.

[8] أسد الغابة، ج١، ص٢٨٧-٢٨٨.

[9] معجم الصحابة لابن قانع، ج١، ص ٩١.

## ٣٨٢. بەشیری کوڕی سەعد(ﷺ)

ناوی بەشیری کوڕی سەعدی کوڕی ثەعلەبەیە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان،[١]بەشیر برایەکیشی هەبوو ناوی سەمماک بوو کە لە هەردوو غەزای بەدر و ئوحودیشدا بەشدار بوو.[٢]

ژنەکەی بەشیر کە دایکی نوعمان بوو ناوی عەمرەی کچی ڕەواحە بوو.[٣]

بەشیر کوڕێکی هەبوو بە ناوی نوعمان کە یەکەم لەدایکبووی پشتیوانان بوو دوای کۆچی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ مەدینە.[٤]

کچێکیشی هەبوو بە ناوی ئومەیمە کە موسڵمان بوو و بەیعەتی دابوو بە پێغەمبەری خوا(ﷺ)،[٥] ئومەیمە خوشکی نوعمان بوو.[٦]

بەشیر لە سەردەمی نەفامیشدا خوێندەواری هەبوو و بە زمانی عەرەبیش دەینووسی.[٧]

بەشیر لە بەیعەتی عەقەبەی دووەم[٨] و غەزای بەدرو ئوحود و غەزاکانی دواتریشدا بەشدار بوو.[٩]

پێغەمبەر(ﷺ) لە مانگی شەعبانی ساڵی حەوتەمی کۆچیدا سریەیەکی سی(٣٠) کەسی پێکهێنا و بە سەرکردایەتی بەشیری کوڕی سەعد ناردی بۆ فدک، ئەویش چوو بینی خەڵکەکەی لەوێ نین و چون بۆ ناو باخ و کشتوکاڵەکەیان، ئاژەڵەکانی بەدەستکەوت گرت و بەرەو شاری مەدینە خستیەڕێ، کاتێک کەسێکیان بەوەی زانی چوو بۆ لای خەڵکەکە و هاواری

---

[١] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٧٢، أسد الغابة، ج١، ص٢٩١.
[٢] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٢، ص٦٥٢.
[٣] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٤، ص١٨٨٧، الإصابة في تمييز الصحابة، ج٨ ص٣١.
[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٦، ص٤٤٠.
[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٥٠٨.
[٦] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص٣٦٢.
[٧] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٥٢١.
[٨] أسد الغابة، ج١، ص٢٩١.
[٩] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٧٢.

کرد ماڵاتتان نەما، ئەوانیش کەوتنە شوێنیان تا شەو لێیان نزیک بوونەوە، سوپاکەی بەشیر کەوتنە تیربارانی دوژمن تا تیریان پێ نەما، دوژمن دای بەسەریاندا و هاوەڵانی شەهید بوون، بەشیریش بەردەوام دەجەنگا،[1] دوژمنان ئاژەڵ و شمەکەکانیان بردنەوە، عەلبەی کوڕی زەید هەواڵی هێنایەوە بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ)، دواتر بەشیریش گەڕایەوە.[2]

لە مانگی شەوالی ساڵی حەوتی کۆچیدا پێغەمبەر(ﷺ) بەشیری کوڕی سەعدی بەرەو وادیلقورا نارد،[3] پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی بیستبوو عویەینەی کوڕی حیصن لەگەڵ غەطەفانیەکان ڕێککەوتووە تا هێرش ببەنە سەر پێغەمبەر(ﷺ)، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) بەشیری کوڕی سەعدی بانگکرد و لیوایەکی بۆ پێکهێنا و ٣٠٠ کەسی لەگەڵدا نارد، ئەوانیش شەوانە ڕێیان دەبڕی و بە ڕۆژ خۆیان دەشاردەوە تا گەیشتنە یەمەن و جبار، بە چەکەوە چوون تا لە دوژمن نزیک بوونەوە، بەشێکی زۆری ئاژەڵەکانیان کۆکردنەوەو دوژمنەکانیش بڵاوەیان لێکردبوو، پاش ئەوەی بەشیر بینی دوژمن دیار نیە بە ئاژەڵەکانەوە گەڕایەوە، لە ڕێدا دوو کەس لە دوژمنانی بینی، بۆیە هەردووکیانی بەدیل گرت و هێنانی بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، ئەو دوو دیلەش موسڵمان بوون، پێغەمبەریش(ﷺ) ئازادی کردن.[4]

جارێک عەمرەی کچی ڕەواحە کە ژنی بەشیر بوو داوای کرد لە بەشیر بەشێک ببڕێتەوە بۆ کوڕەکەی، بەڵام ئەو ڕازی نەبوو، دواتر دوای یەک یان دوو ساڵ[5] بەشیر ڕازی بوو، بەڵام عەمرە وتی: نابەخوا ڕازی نابم تا دەستی نەگریت و نەیبەیت بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و پێغەمبەری خوا(ﷺ) بکەیت بە شایەت، بەشیریش منداڵەکەی هێنا بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ)

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص١١٨، البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص٢٢١-٢٢٢.

[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص١١٨.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣١١.

[4] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص١٢٠.

[5] صحيح ابن حبان - كتاب الهبة - ذكر خبر ثالث يصرح بأن الإيثار بين الأولاد في النحل حيف غير جائز استعماله، الرقم ٥١٠٤.

و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من بەشێکی سامانم بڕیوەتەوە بۆ ئەم کوڕەم و دایکی ئەم کوڕەشم دەیەوێت تۆ شایەت بیت لەسەر ئەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئایا جگە لەمە منداڵی ترت هەیە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: ئایا ئەوەی بۆ ئەمت بڕیوەتەوە بۆ هەموو ئەوانیشت بڕیوەتەوە؟ وتی: نا،[1] پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: **(فإني لا أشهد على هذا، هذا جور أشهد على هذا غيري، اعدلوا بين أولادكم في النحل كما تحبون أن يعدلوا بينكم في البر واللطف)**،[2] (دەی من نابمە شایەت بۆ شتی وا، ئەوە ستەمە بڕۆ کەسی تر جگە لە من بکە بە شایەت بۆی، لەنێوان منداڵەکانتاندا دادپەروەر بن لە بەشدا وەک چۆن حەز دەکەن ئەوان لە چاکەو میهردا لەنێوانتاندا دادپەروەر بن).

لە گێڕانەوەکەی تردا هاتووە پێغەمبەر(ﷺ) لێی پرسی ئایا جگە لەمە منداڵی ترت هەیە؟ وتی: بەڵێ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: دەی بیگێڕەوە (پاشگەز ببەرەوە)،[3] هەروەها هاتووە پێی فەرموو **(فاتقوا الله واعدلو بين أولادكم)**،[4] (دەی لەخوا بترسن و لەنێوان منداڵەکانتاندا دادپەروەر بن).

هەر لە گێڕانەوەیەکی تری بوخاریدا هاتووە فەرمووی: **(لا تشهدني على جور)**،[5] (مەمکە بە شایەت لەسەر ستەمێک).

لە عومرەی پاش حودەیبییەدا پێغەمبەر(ﷺ) بەشیری کوڕی سەعدی لە مەروظهەران دانا تا لەوێ بێت.[6]

بەشیری کوڕی سەعد یەکەم کەسی پشتیوانان بوو بەیعەتی دا بە ئەبووبەکری صدیق.[7]

---

[1] صحيح مسلم - كتاب الهبات - باب كراهة تفضيل بعض الأولاد في الهبة، الرقم ١٦٢٣.

[2] صحيح ابن حبان - كتاب الهبة - ذكر خبر ثالث يصرح بأن الإيثار بين الأولاد في النحل حيف غير جائز استعماله، الرقم ٥١٠٤، صححه الألباني في صحيح الجامع الصغير و زيادته، الرقم ١٠٤٦.

[3] صحيح مسلم - كتاب الهبات - باب كراهة تفضيل بعض الأولاد في الهبة، الرقم ١٦٢٣.

[4] صحيح البخاري - كتاب الهبة وفضلها - باب الإشهاد في الهبة، الرقم ٢٥٨٧.

[5] صحيح البخاري - كتاب الشهادات - باب لا يشهد على شهادة جور إذا أشهد، الرقم ٢٦٥٠.

[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٥٣.

[7] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص١٨٢، البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص٣١٦.

لە سەردەمی خیلافەتی ئەبووبەکری صدیقدا لە ناو سوپاکەی خالیدی کوڕی وەلیددا لە (عین التمر) شەهید بوو، ئەمەش لە ساڵی دوانزەی کۆچیدا بوو پاش ئەوەی لە جەنگی یەمامە گەڕانەوە.[1]

**پەند و وانە:**

لە خوێندنەوەی ژیانی ئەم هاوەڵەوە بەڵگەیەکی تری مرۆیی بوونی هاوەڵان و پەیڕەوی مرۆیی بوونیان بەدی دەکەین، چونکە ئەو ڕوانینە هەڵەیە لای بڕێک لە موسڵمانان دروست بووە کە ئەگەرچی بە زمان دان دەنێن بە مرۆیی بوونیاندا کەچی لە پەیڕەودا وەک مرۆڤ ناڕوانن هاوەڵان، بەڵام لە ڕاستیدا ژیانی هاوەڵان ژیانێکی مرۆییە لە پلەیەکی بەرزی پەیڕەوی دروستدا هاودەم بە بوونی هەڵەو کەموکورتی، دەبینین عەمرەی ژنی بەشیر کە هاوەڵ بووە کەوتوەتە هەڵەی هەوڵی جیاکاری لەنێوان منداڵەکانیدا، هاوکات بەشیریش بەوە ڕازی بوو.

زۆر جار حەزی دنیایی مرۆڤ و تاسەی ویستەکانی دەروون وا دەکەن هەڵپەی دنیا و هەنگاو بۆ بەدیهێنانی ویستەکان، هەڵە بە مرۆڤ بکەن، بۆیە ئەو ویستەی کە عەمرە هەیبوو هۆکارێک بوو بۆ هەڵەیەک کە هەم خۆی و هەم مێردەکەشی تێی کەوتن تا پێغەمبەر(ﷺ) ڕێ ڕاستەکەی پێ نیشان دان، ملکەچی ئەوانیش بۆ ڕێ ڕاستەکە نیشانەی ئەو عەدالەتەیە کە دەڵێین لە هاوەڵاندا هەبووە.

## ٣٨٣. بەشیری کوڕی سەعد(ﭬ)

ناوی بەشیری کوڕی سەعدی کوڕی نوعمانی کوڕی ئەککالی موعاویە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە،[2]بەشیری کوڕی سەعد هاودەم بە سەعدی باوکی لە غەزای ئوحودو و خەندەق و چەند غەزایەکی تردا بەشداری کرد.[3]

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص٢٩١.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣١٢.

[3] أسد الغابة، ج١، ص ٢٩١.

## ٣٨٤. بەشیری کوڕی عەبدولا(رضي الله عنه)

ناوی بەشیری کوڕی عەبدوڵایەو لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان، دەشوترێت بەڵکو ناوی بیشرە،[١] لە جەنگی یەمامە شەهید بوو.[٢]

## ٣٨٥. بەشیری کوڕی عەبدولمونذیر(رضي الله عنه)

ناوی بەشیری کوڕی عەبدولمونذیرە، لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان،[٣] کونیەکەی ئەبولوبابەیە، زیاتریش بە کونیەکەی ناسراوە،[٤] دەوترێت بەڵکو ناوی ریفاعەیە،[٥] یان دەوترێت ناوی مەڕوانە.[٦]

ئەبولوبابە یەکێک بوو لە بەشداربووەکانی بەیعەتی عەقەبە و یەکێکیش بوو لە دوانزە نەقیبەکە.[٧]

ژنەکەی ناوی خەنسائی کچی خوذام بوو، لە جەنگی ئوحودا کاتێک ئونەیسی کوڕی قەتادە شەهید بوو خەنسائی ژنی مایەوە، باوکی خەنساء ویستی خەنساء بدات بە پیاوێکی موزەینە، بەڵام خەنساء حەزی نەدەکرد، بۆیە سکاڵای بردە لای پێغەمبەری خوا(ﷺ)، پێغەمبەری خواش(ﷺ) رێی نەدا بەو هاوسەرگیریە، ئینجا ئەبولوبابە خەنسائی بە هاوسەرگرت و خوای گەورەش منداڵێکی پێ بەخشین کە ناویان نا سائیب.[٨]

ئەبوولوبابە ژنێکی تریشی هەبوو بە ناوی نوسەیبەی کچی فضالە کە دایکی لوبابە بوو،[٩] ئەبوولوبابە کوڕێکی تریشی هەبوو بە ناوی

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣١٢.

[٢] أسد الغابة، ج١، ص ٢٩١.

[٣] أسد الغابة، ج١، ص ٢٩١.

[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣١٢.

[٥] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٢، ص٥٠٠.

[٦] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٣٤٩.

[٧] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٤، ص١٧٤٠.

[٨] أسد الغابة، ج١، ص ٢٠٣، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٣٧.

[٩] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج ٣، ص٤٥٧.

عەبدوڕەحمان کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە.[1]

کچەکەی ئەبولوبابە ناوی لوبابە بوو بەهۆی ئەم کچەیەوە ئەو کونیەی لێ نرا، زەیدی کوڕی خەطاب لوبابەی بە هاوسەرگرت.[2]

ئەبولوبابە و حارثی کوڕی حاطب ویستیان لە غەزای بەدردا بەشداری بکەن، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) هەردووکیانی گێڕایەوەو ئەبولوبابەی کرد بە بەرپرسی مەدینە، لە دەستکەوتەکانی بەدریشدا پشکی بۆ دانان و لە پاداشتی جیهادی بەدریشدا بەشدار بوون، بۆیە مووسای کوڕی عوقبە ناوی هەردووکیان بە بەشداربووی بەدر ناو دەبات.[3]

پێش گەڕانەوەی ئەبوولوبابە لە بەدر پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبولوبابەو عەلی کوڕی ئەبووطالیب پێکەوە بوون و یەک سواریان پێ بوو، ئەوان دەیانوت ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە بری ئێمە سەرکەوە، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو (ما أنتما بأقوى على المشي مني، ولا أنا أغنى عن الأجر منكما)،[4] (نە ئێوە لە من ئازاترن لە رێ کردنداو نە منیش لە ئێوە بێباکترم لە پاداشت).

جارێک پێغەمبەر(ﷺ) نزای باران بارینی دەکرد، ئەبوولوبابە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) خورماکانم لە مەربەددان (شوێنی هەڵگرتنی خورما)، پێغەمبەر(ﷺ) دووبارە فەرمووی: خوایە بارانمان بۆ ببارێنە، ئەبولوبابە دووبارە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) خورماکان لە مەربەددان، لە جاری سێیەمدا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (اللهم اسقنا حتى يقوم أبو لبابة عريانا فيسد ثعلب مربد بإزاره)، (خوایە بارانمان بۆ ببارێنە تا ئەبولوبابە بە رووتی هەستێت و بە جلەکانی کونی مەربەدەکە بگرێت)، بارانێکی بەخوڕ دایکرد و پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی کرد بۆ هاوەڵان، پشتیوانان هاتن بۆ لای ئەبولوبابەو وتیان ئەی

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٣٤٩.

[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج ٣، ص٤٥٧.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٣٤٩.

[4] مسند أحمد بن حنبل - مسند عبد الله بن مسعود(ﷺ)، الرقم ٤٠٧١، صححه الألباني في في سلسلة الأحاديث الصحيحة، الرقم ٢٢٥٧.

ئەبولوبابە تا بە رووتی نەچیت بە جلەکانت کونی مەربەدەکە بگریت باران ناوەستێ.[1]

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) نزیکەی زیاد لە سیانزە رۆژ گەمارۆی بەنوقورەیضەی دا، بەنوقورەیضە داوایان کرد ئەبوولوبابە بچێت بۆ لایان تا بیدوێنن، ئەویش وتی: ناچم تا پێغەمبەر(ﷺ) مۆڵەتم نەدات، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو وا مۆڵەتم دایت، ئەبولوبابە چوو بۆ لایان، ئەوانیش لەبەردەم ئەبولوبابەدا دەستیان کرد بە گریان و وتیان ئەی ئەبولوبابە حاڵەکە چۆن دەبینیت؟ چیمان بەسەر دێت؟ ئێمە توانای جەنگمان نیە، ئەبولوبابەش بە دەستی ئاماژەی کرد بۆ قورقوڕاگەی و پەنجەی بە قوڕگیدا دەهێنا وەک بڵێی لە گەردنتان دەدرێت، کاتێک ئەبولوبابە گەڕایەوە راچڵەکی و هەستی کرد کەوتووەتە فیتنەو هەڵەیەکی گەورەوە، بۆیە وتی: بەخوا ناڕوانمە نێوچاوانی پێغەمبەر(ﷺ) تا لای خوا تەوبەیەکی تەواوەتی بکەم بەجۆرێ خوا بیخاتە دڵمەوە کە تەوبەکەمی وەرگرتووە، بۆیە گەڕایەوە بۆ مەدینەو خۆی بەستەوە بە قەدی دارخورمایەکی مزگەوتەوە، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) سەیری کرد ئەبولوبابە دیار نیە فەرمووی: ئەرێ ئەبولوبابە لای هاوپەیمانەکانی تەواو نەبوو؟ ئیتر بۆی باسکرا کە ئەبولوبابە چی کردووە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: دوای من تووشی فیتنە بووەو ئەگەریش بهاتایە بۆ لام بە دڵنیاییەوە لێی خۆش دەبووم، ئەگەریش ئەوەی کردبێت ئەوا لە شوێنی خۆی نایجووڵێنم تا خوای گەورە بە ویستی خۆی بڕیاری لەسەر دەدەات،[2] ئەوەبوو دواتر خوای گەورە لێی خۆش بوو.[3]

ئەبوولوبابە یەکێک بوو لەو هاوەڵانەی لە غەزای تەبووکدا دواکەوتن و نەچوون.[4]

[1] السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ٦٠٤٦، المعجم الصغير للطبراني، الرقم ٣٨٦، أسد الغابة، ج١، ص٢٩٢.
[2] البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص١٠٩.
[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج ٣، ص٤٥٧.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٥٢.

سەبارەت بە ناو و ژمارەی ئەو کەسانەی لە غەزای تەبووکدا دواکەوتن ڕا جیایی هەیە، ڕایەک دەڵێت: دە کەس بون، ڕایەک دەڵێت: حەوت کەس بوون و چوار کەسیان خۆیان بەستبوویەوە بە پایەکانی مزگەوتی پێغەمبەرەوە(ﷺ) تا ئەو کاتەی خوا لێیان خۆش دەبێت، ڕایەک ناوی سێ کەس دێنێت،[1]ڕایەکیش ناوی شەش کەس دێنێت کە بریتین لە (ئەوسی کوڕی خیذام، ئەبوولوبابە، ثەعلەبەی کوڕی وەدیعە، کەعبی کوڕی مالیک، مرارەی کوڕی ڕەبیع، هیلالی کوڕی ئومەییە).[2]

زۆرجار بە جیا لە سەرچاوەکاندا ناوی یەکێک لەو شەش هاوەڵە دێت کە خۆی بەستوەتەوە بە پایەکانی مزگەوتەوە تا تەوبەیەک بێت لەو کارە و خوای گەورە لێی خۆش بێت، بەڵام ئەو کەسانەی خۆیان بەستەوە بە پایەکانی مزگەوتی پێغەمبەری خواوە(ﷺ) سێ کەس بوون کە بریتی بوون لە ئەوس و ئەبوو لبابە و ثەعلەبە.[3]

سەبارەت بەو کەسانەی کە نەچون بۆ غەزای تەبووک ئیبن کەثیر دەڵێت: ئەوانەی نەچوون بۆ غەزای تەبووک چوار بەش بوون، بەشێک فەرمانیان پێکرابوو لەلایەن پێغەمبەرەوە(ﷺ) تا نەچن و پاداشتیان بۆ هەیە وەک عەلی کوڕی ئەبووطالیب و موحەممەدی کوڕی مەسلەمەو ئیبن ئوم کلثوم، دەستەیەکی تر بیانوویان هەبوو لەبەرئەوەی لاواز و نەخۆش بوون، دەستەیەکیش ئەوانە بوون کە لە خەفەتی نەچوونەکەیان دەگریان، ئەمانە تاوانبارەکان بوون و بریتی بوون لە ئەبوولوبابەو هاوەڵەکانی، دەستەی چوارەمیش سەرکۆنەکراوان بوون کە بریتی بوون لە دووروەکان.[4]

سەبارەت بە کاتی مردنی ئەبولوبابە چەند ڕایەک هەیە، ڕایەک دەڵێت:

---

[1] صحيح البخاري – كتاب المغازي – باب حديث كعب بن مالك وقول الله عز وجل وعلى الثلاثة الذين خلفوا، الرقم ٤٤١٨.
[2] أسد الغابة، ج١، ص٢١٧، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٥٢.
[3] -الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٥٢.
[4] البداية والنهاية لابن كثير، ج٥، ص٢٧.

پێش کوژرانی عوثمانی کوڕی عەففان مردووە،[1] ڕایەکی تر دەڵێت: دوای کوژرانی عوثمانی کوڕی عەففان کۆچی دوایی کردووە، ڕایەکی تر دەڵێت: لە خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبووطالیبدا وەفاتی کردووە، ڕایەکیش دەڵێت: تا ساڵی پەنجای کۆچیش ژیاوە، واتە سەردەمی دەوڵەتی ئومەوی.[2]

ئیبن سەعد دەڵێت: پاش کوژرانی عوثمانی کوڕی عەففان و پێش کوژرانی عەلی کوڕی ئەبووطالیب کۆچی دوایی کردووە.[3]

**پەند و وانە:**

خاکیبوونی سەرکردەی موسڵمانان و تێگەیشتن لە باری هاوڵاتیان لە هەموو کاتێکدا سوننەتێکی بەردەوامی ناو ژیانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بووە، دەبینین پێغەمبەر(ﷺ) و عەلی و ئەبولوبابە بە هەرسێیانەوە یەک سواریان پێ بووە، پێغەمبەر(ﷺ) ئامادە نەبووە خۆی جیا بکاتەوە لە هەموو موسڵمانان هەرچەندە ئەم هەم پێغەمبەری خوا و هەم سەرکردەی وڵاتیش بووە، تەنانەت ڕازی نەبووە پشکی سەرکەوتنی هاوڕێکانی وەربگرێت پاش ئەوەی خۆیان بە تاسەوە داوایان لێکردووە بەوە ڕازی بێت، بەڵکو تێیگەیاندون لە ئاستی دنیادا ئێوەش وەک من ماندوو دەبن، لە ئاستی قیامەتیشدا منیش وەک ئێوە تاسەی بەهەشتم هەیە.

مەسەلەی زۆرەملێ لە هاوسەرگیریدا لە ئیسلامدا قبووڵ نەکراوە، ئەوەتا پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕێی نەداوە هاوسەرگیری زۆرەملێی خەنسائی کچی جەذام سەربگرێت و ئەو هاوسەرگیریەی هەڵوەشاندوەتەوەو لەبری ئەوەدا خەنساء بە ویستی خۆی شووی کردووە بە ئەبوولوبابە.

تەوبەکردن لە هەڵەو لادان و تاوان واجبە، زۆرجار تەوبەکردنەکە تەنها بە زمان و دڵ نابێت و دەبێت بچێتە بواری وەرگرتنی سزای جەستەیی

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص٢٩٢.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٣٤٩.

[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج ٣، ص٤٥٧.

و ماددیشـەوە، جـا زۆرن کەسـانێک ئامادەییـان هەیـە بـە دڵ و زمـان تەوبـە بکەن، بەڵام کاتێک دەگاتە بواری ماندووبوون و سزای جەستەیی و ماددی، بارەکەیان لێ قورس دەبێت و باکیان نامێنێت بە تەوبە، بۆ نموونە کەسێک کە قسـەیەکی هەڵـە دەکات تەوبەکـەی بـە زمـان و دڵ کۆتایـی دێـت، بـەڵام کەسـێک سـوێندێکی درۆ دەخـوات یـان سـوێندێک دەخـوات و بـە ناحـەق دەیخـات، دەبێـت جگـە لـە تەوبـەی دڵ و زمـان سـێ رۆژ رۆژوو بگرێـت یـان نانـی دە هـەژار بـدات یـان جل و بەرگـی دە هـەژار بـکات.

## ٣٨٦. بەشیری کوڕی عەتیک(ﭬ)

نـاوی بەشـیری کـوڕی عەتیکـی کـوڕی قەیسـە، لـە پشـتیوانانە لـە بەنـی عەمـری کـوڕی عـەوف،[١] واتـە لـە ئەوسـیەکان.[٢]

بەشیر برایەکی هەبوو بە ناوی جەبر یان جابر کە لە بەدر و هەموو غەزاکانـی تریشـدا بەشـدار بـوو.[٣]

بەشـیری کـوڕی عەتیـک لـە غـەزای ئوحـوددا بەشـداری کـرد، هەروەهـا تـا دوای وەفاتـی پێغەمبەریش(ﷺ) ژیـا و لـە جەنگـی یەمامەشـدا بەشـداری کـرد و هـەر لـەو جەنگەشـدا کـوژرا.[٤]

## ٣٨٧. بەشیری کوڕی عەمر(ﭬ)

ناوی بەشـیری کـوڕی عەمـری کـوڕی میحصەنـە، لـە پشـتیوانانە، سـەبارەت بـە نـاوی ڕا جیایـی هەیـە، بـە بەشـیر و بـە بیشـریش نـاوی هاتـووە، کونیەکـەی ئەبـوو عەمرەیە.[٥]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣١٢.
[٢] أسد الغابة، ج١، ص٣٧٩.
[٣] أسد الغابة، ج١، ص٣٧٩.
[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣١٣.
[٥] أسد الغابة، ج١، ص ٢٩٤.

## ٣٨٨. بەشیری کوڕی عەنبەس(ﷺ)

ناوی بەشیری کوڕی عەنبەسی کوڕی زەیدی کوڕی عامرە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە،[١] لە غەزای ئوحود و خەندەق و هەموو غەزاکانی دواتریشدا بەشداری کرد.[٢]

بەشیری کوڕی عەنبەس ئەسپێکی هەبوو ناوی حواء بوو، ئیتر بە بەشیر دەوترا فارس حواء.[٣]

لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەطابدا بەشیری کوڕی عەنبەس شەهید بوو،[٤] دەوترێت لە جەنگی جسردا شەهید بوو.[٥]

## ٣٨٩. بەشیری کوڕی عورفوطە(ﷺ)

ئەم هاوەڵە بە بەشیر و بە بیشریش ناوی هاتووە.[٦]

ناوی بیشری کوڕی عورفوطەی جوهەنیە، دەشوترێت ناوی بەشیرە، بەڵام ئیبن موندە دەڵێت: یەکەمیان راستترە.[٧]

ئەم هاوەڵە لە فەتحی مەککە و جەنگەکانی دواتریشدا بەشدار بوو.[٨]

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە جوهەنیەکان بە نزیکەی هەزار کەسەوە هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمان بوون و بەشداری جیهاد و غەزاکانیان کرد، بیشری کوڕی عورفوطە لەنێویاندا بوو.[٩]

---

[١] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٧٣.

[٢] أسد الغابة، ج١، ص ٢٩٤.

[٣] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٧٣، أسد الغابة، ج١، ص ٢٩٤.

[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣١٣.

[٥] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٧٣.

[٦] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣١٣.

[٧] أسد الغابة، ج١، ص٢٨٠.

[٨] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٠٠.

[٩] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٠٠.

## ٣٩٠. بەشیری کوڕی مەعبەد(ﷺ)

ناوی بەشیری کوڕی مەعبەدە، ناسراوە بە ئەبوو بیشیری ئەسلەمی.[١]

ناوی لەناو ئەو هاوەڵانەدا هاتووە کە دواتر لە کووفە نیشتەجێ بوون.[٢]

بەشیر کوڕێکی هەبوو بە ناوی بیشر کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە.[٣]

بەشیری کوڕی مەعبەد یەکێک بوو لە بەشداربوانی بەیعەتی ڕیضوان.[٤]

بەشیری کوڕی مەعبەد دەگێڕێتەوە جارێک ئەسپۆن (أشنان)[٥] هێنرا تا دەستی بشوات، دەستی بۆ برد، پێی وترا ئەوە بە دەستی ڕاست دەگیرێت، ئەویش وتی: ئێمە شتی چاک بەدەستی ڕاستمان دەگرین.[٦]

## ٣٩١. بەشیری کوڕی موعاویە(ﷺ)

ناوی بەشیری کوڕی موعاویەیە و ناسراوە بە ئەبووعەلقەمەی نەجرانی، موسڵمان بوو و هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و لەگەڵیدا مایەوە تا شەهید بوو.[٧]

## ٣٩٢. بەشیری کوڕی نەذیر(ﷺ)

ناوی بەشیری کوڕی نەذیری کوڕی مەعبەدی کوڕی شەراحیلی سەدوسیە، زیاتر بە ئیبنولخەصاصیە ناسراوە، دەشوترێت ناوی باوکی مەعبەدە،[٨] یان دەوترێت ناوی باوکی یەزیدە.[٩]

---

[١] أسد الغابة، ج١، ص٢٩٦.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج، ص ٣١٤.

[٣] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٧٤.

[٤] شعب الإيمان للبيهقي، الرقم ٥٥٦٢، أسد الغابة، ج١، ص٢٩٦.

[٥] ئوشنان جۆرێک گیایە کە سەردەمانی زوو بەکار دەهات بۆ شۆردنی دەست و جل و بەرگ. بڕوانە(المعجم الوسيط، ج١، ص١٩).

[٦] شعب الإيمان للبيهقي، الرقم ٥٥٦٢، أسد الغابة، ج١، ص٢٩٦، الإصابة في تمييز الصحابة، ج، ص ٣١٤.

[٧] الإصابة في تمييز الصحابة، ج، ص ٣١٥.

[٨] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣١٤.

[٩] أسد الغابة، ج١، ص ٢٨٩.

بۆیە پێی وتراوە ئیبنولخەصاصیە چونکە دایکی ناوی خەصاصیە بووە.[1]

بەشیر سەرەتا ناوی زەحم بوو، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) ناوی گۆڕی بە بەشیر.[2]

ژنەکەی بەشیر ناوی لەیلا بوو، لەیلا دەیوت پێغەمبەر(ﷺ) ناوی نا بەشیر ئەگەرنا پێشتر ناوی زەحم بوو.[3]

هەروەها هاتووە کە ژنەکەی بەشیر ناوی جەهدەمە بووە،[4] لەوانەیە بەشیر زیاتر لە ژنێکی هەبووبێت.

بەشیر کۆچی کرد بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و پێغەمبەری خوایش(ﷺ) لە صوففە داینا.[5]

بەشیر وەک ئەندامێکی ناو وەفدی بەکر بن وائیل هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ).[6]

بەشیر دەڵێت: کاتێک هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) تا بەیعەتی پێ بدەم، فەرمووی:(أن تشهد أن لا إله إلا الله وأن محمدا عبده ورسوله وتصلي الخمس و تصوم رمضان وتؤدي الزكاة وتحج البيت وتجاهد في سبيل الله)، (شایەتی بدەیت هیچ پەرستراوێک نیە جگە لە خوا و موحەممەدیش بەندەو نێردراوی خوایەو پێنج فەرزەکە نوێژ بکەیت و رۆژووی رەمەزان بگرێت و زەکات بدەیت و حەجی بەیت (کەعبە) بکەیت و لە رێی خوادا جیهاد بکەیت)، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دوانیان ناتوانم، سەبارەت بە زەکات من تەنها دە ژەمم هەیە کە پێویستی ماڵ و منالمن، سەبارەت بە جیهادیش دەڵێن هەرکەس لە سەنگەردا پشت هەڵبکات توورەیی خوا دەیگرێتەوە، منیش دەترسم ئەگەر چوومە جەنگەوە ترسی مردن دامبگرێت و ترس دەروونم

---

[1] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ١٧٣، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣١٤.

[2] أسد الغابة، ج١، ص ٢٨٩.

[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٦، ص ٥٠.

[4] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ١٧٤.

[5] حلية الأولياء لأبي نعيم الأصبهاني، ج٢، ص٢٦.

[6] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص ٣١٥، البداية والنهاية لابن كثير، ج٥، ص٩٣.

داگرێت، پێغەمبەر(ﷺ) دەستی بەیەکدا داخست و دەستەکانی پرواند و فەرمووی: (صەدەقە نەدەیت و جیهاد نەکەیت؟ ئەی ئیتر بە چی دەچیتە بەهەشتەوە؟)، دواتر وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەیعەتت پێ دەدەم، ئەوەبوو لەسەر هەموو ئەو شتانە بەیعەتم دا بە پێغەمبەر(ﷺ).[1]

بەشیر دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری لێکردم فەرمووی: تۆ لە چ هۆزێکیت؟ وتم: لە ڕەبیعە، فەرمووی: (لە ڕەبیعەتولفورس کە دەڵێن ئەگەر ئەوان نەبن زەوی بە خەڵکەکەیەوە سەراوژوور دەبێتەوە؟ سوپاسی ئەو خوایە دەکەم کە لە نێو ڕەبیعەدا تۆی منەتبار کرد).[2]

بەشیر دەڵێت: ئێمە لە صوففە بووین، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) دیاریەکی بۆ دەهات ئێمەشی تیادا بەشدار دەکرد، ئەگەریش صەدەقەیەکی بۆ بهاتایە هەمووی دەدا بە ئێمەو خۆی وەری نەدەگرت، شەوێک پێغەمبەر(ﷺ) چوویە دەرەوەو منیش کەوتمە شوێنی، پێغەمبەر(ﷺ) چوویە گۆڕستانی بەقیع، لەوێ فەرمووی: **(السلام عليكم دار قوم مؤمنين وإنا بكم لاحقون وإنا لله وإنا إليه راجعون لقد أصبتم خيرا بجيلا وسبقتم شرا طويلا)**، (سەلامتان لێ بێت ئەی دەستەی باوەڕداران، ئێمەش دەگەینەوە بە ئێوەو پەیوەستتان دەبین، ئێمە لای خواوە هاتوین و بۆ لای خۆیشی دەگەڕێینەوە، بەڕاستی چاکەیەکی زۆرتان دەستکەوت و پێش خراپەیەکی دووروودرێژ کەوتن)، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) لای کردەوە بە لای مندا و فەرمووی: ئەوە کێیە؟ وتم: منم بەشیر، فەرمووی: ئایا ڕازی نیت بەوەی لەو (ربيعة الفرس)[3]ەوە کە بانگەشەی ئەوەیان دەکرد ئەگەر ئەوان نەبن زەوی بە خەڵکەکەیەوە لەناودەچێت خوای گەورە گوێ و دڵ و بینایی بەرەو ئیسلام هێنایت؟ وتم: با ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، فەرمووی:

---

[1] المستدرک على الصحيحين - كتاب الجهاد - لا صدقة ولا جهاد فبم تدخل الجنة، الرقم ٢٤٣٤ وصححه و وافقه الذهبي أي صححه، لكن ضعفه الالباني في(تحقيق كلمة الإخلاص و تحقيق معناها، ١٦/١).

[2] المطالب العالية لابن حجر العسقلاني، الرقم ٤١٣٣.

[3] مەبەست بە ربيعە الفرس ئەوەیە کە نزاری کوڕی مەعد ئەسپێکی هەبوو دای بە ڕەبیعەی کوڕە گەورەی، بڕوانە: (حلية الأولياء لأبي نعيم الأصبهاني، ج٢، ص٢٦).

بۆچی هاتیت؟ وتم: ترسام شتێکی خراپت تووش بێت.[1]

لە گێڕانەوەیەکدا هاتووە پاش ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) سوپاسی خوای کرد کە لە ناو ڕەبیعەدا ڕێنموونی بەشیری کوڕی خەصاصیەی کردووە، بەشیر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) نزام بۆ بکە خوا من پێش تۆ بمرێنێت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: نزای وا بۆ کەس ناکەم.[2]

بەشیر دەڵێت: جارێک بە پێغەمبەرم(ﷺ) وت: ئەوانەی صەدەقە کۆدەکەنەوە لە سنوور دەردەچن، ئایا ئێمە بۆمان هەیە هێندەی ئەو سنوور دەرچوونە شتیان لێ بشارینەوە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (نەخێر).[3]

بەشیری کوڕی خەصاصیە دوای وەفاتی پێغەمبەریش(ﷺ) ژیا و بەشداری کرد لە فتووحاتدا، لە سوپاکەی موثەننای کوڕی حارثەدا بوو، کاتێک موثەننا چوو بۆ لای خەلیفە ئەبووبەکری صدیق بەشیری لە شوێنی خۆی دانا،[4] دواتریش کاتێک موثەننای کوڕی حارثە لە مەیدانی فتووحاتدا بریندار بوو، پێش مردنی خۆی بەشیری کوڕی خەصاصیەی کرد بە جێنشینی خۆی تا دوای خۆی سەرپەرشتی سوپاکە بکات.[5]

**پەند و وانە:**

پێغەمبەر(ﷺ) ناوە ناشیرینەکانی دەگۆڕی بە ناوی جوان، لەو بارەیەوە ئیبن قەیم دەڵێت:(لەبەرئەوەی ناوەکان قاڵب و دەلیلی واتاکانن، بۆیە حیکمەت و دانایی وادەخوازێ گونجان و پەیوەستیەک لەنێوان ئەو دوانەدا هەبێت... بەڵکو ناو کاریگەری هەیە لەسەر ناولێنراوەکە لە ڕووی چاکی و ناشیرینی و خراپی وسووکی و قورسیەوە... پێغەمبەر(ﷺ) بە چاکی زانیوە ناوی جوان بنرێت لە کەس، ئەگەریش کەسێکیان بە پۆستەو پەیام بەر دابنایە،

[1] حلية الأولياء لأبي نعيم الأصبهاني، ج٢، ص٢٦.

[2] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١١٢٥.

[3] سنن أبي داود - كتاب الزكاة - باب رضا المصدق، الرقم ١٥٨٦، ضعفه الألباني في صحيح و ضعيف سنن أبي داوود، الرقم ١٥٨٦.

[4] البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص١٧.

[5] تأريخ الإسلام للذهبي، ج٣، ص١٢٦.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی دەکرد تا ناوی جوان و روخساری باش بێت،[1]... وەک چۆن لە حودەیبییەدا بە هاتنی سوهەیل بۆ رێککەوتن، پێغەمبەر(ﷺ) گەشبینی نواند.[2]

پێویستە لە گەیاندنی پەیامی خوادا بەو جۆرە پەیام بگەیەنین کە هەیە و خوا داوای کردووە نەک بەوجۆرەی کە ئێمە بمانەوێت یان بەوجۆرەی بەرامبەر رازی بکات، پەیامی خوا بنەڕەتی نەگۆڕەو ئێمە پێناوی گەیاندنین نەک هێزی رێکخەر و دەستکاریکەر، ئەم بنەمایە زۆر پێویستە لە تاکی بانگخوازدا ڕەچاو بکرێت، چونکە هەمیشە بانگخواز حاڵی وای دێتە پێش، بە دیدی دنیایی و مرۆیی پێویست دەکات بڕیارێک بدات جیا لەوەی خوا داوای کردووە، بەڵام هیچکات سەرخستنی ئیسلام بە ناڕەوا ئەنجامی نابێت، ئیسلام بەس بە سروشتی خوایی دەگەیەنرێت، خوا دەفەرموێت (واتبع ما يوحى اليك من ربك ان الله كان بما تعملون خبيرا)،[3] بۆیە وەک ئیمامی ئەبووبەکر فەرمووی: (من شوێنکەوتەم نەک موبتەدیع).

بەختکردنی ماددەو گیان بۆ ئیسلام زەروورەتێکە و دەبێت موسڵمان ئامادەیی ئەوەی هەبێت، واتە نابێت موسڵمان ماڵ و سامان و گیانی خۆی لە ئیسلام لا لەپێشتر بێت، بۆ ئەوەش زۆرجار پێویست دەکات لەپێناو ئیسلامدا قوربانی بدەیت بە یەکێک یان هەردووکیان، خوای گەورە دەفەرموێت (انفروا خفافا وثقالا وجاهدوا باموالكم وانفسكم في سبيل الله ذلكم خير لكم ان كنتم تعلمون)،[4] هەریەک لە گیان و سامان پێناوی خزمەت بەم ئیسلامەن، ئەمە بەو واتایە نا کە موسڵمان هەمیشە لە نارەحەتی و سەختیدا بێت، بەڵکو پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت:(نعما بالمال الصالح للمرء الصالح)،[5] (ماڵ و سامانی چاک بۆ پیاوی چاک و صاڵەح باشە)، هەروەها بۆ مەسەلەی

---

[1] زاد المعاد في هدي خير العباد لأبن القيم، ج٢ص٣٣٦.

[2] زاد المعاد في هدي خير العباد لأبن القيم، ج٢ص٣٣٨.

[3] الأحزاب: ٢.

[4] التوبة: ٤١.

[5] مسند أحمد بن حنبل - مسند الشاميين(ﷺ) - حديث عمرو بن العاص عن النبي(ﷺ)، الرقم ١٨٠٤٠، صححه الألباني في غاية المرام في تخريج أحاديث الحلال و الحرام، الرقم ٤٥٤.

گیانیش پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت (ما عمر المسلم كان خيرا له)،[1] (موسڵمان تا تەمەن بکات ئەو تەمەنە خێرە بۆی)، بۆیە ئیسلام نە دژی خۆشگوزەرانیە و نە دژی زۆر ژیانە، بەڵکو دژی بوونە کۆیلەی سامان و گیانە.

دیاردەیەکی ناشیرینی ناو ئەمڕۆی موسڵمانان منەت کردنیانە بە موسڵمان بوونیان کە لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) کەسانێکی تازە موسڵمان بوو ئەو منەتەیان دەکرد، وەک خوا دەفەرموێت (يمنون عليك أن أسلموا قل لا تمنوا على إسلامكم بل الله يمن عليكم أن هداكم للإيمان إن كنتم صدقين)،[2] (منەت دەکەن بەسەرتدا کە موسڵمان بون، بڵێ موسڵمانبوونتان مەکەن بە منەت بەسەرمەوە، بەڵکو خوا منەتبارتان دەکات کە ڕێنموونی کردن بۆ ئیمان).

## ٣٩٣. بەشیری کوڕی نەهھاس(رضي الله عنه)

ناوی بەشیری کوڕی نەهھاسی عەبدیە،[3] فەرموودەیەکی گێراوەتەوە، بەڵام ئیبن حەجەر دەڵێت: سەنەدەکەی تەواو لاوازە.[4]

## ٣٩٤. بەشیری کوڕی ئەبی زەید(رضي الله عنه)

ناوی بەشیری کوڕی ئەبی زەیدە، لە پشتیوانانە،[5] ئەبی زەیدی باوکی لە غەزای ئوحوددا شەهید بوو.[6]

بەشیر هاودەم بە وداعەی کوڕی لە جەنگی صفیندا لە سوپای عەلی کوڕی ئەبووطالیبدا بەشدار بوو.[7]

---

[1] مسند أحمد بن حنبل – مسند الأنصار(رضي الله عنهم) – حديث عوف بن مالك الأشجعي الأنصاري(رضي الله عنه)، الرقم ٢٤٦٠٣، قال شعيب الأرناؤوط صحيح لغيره، و ضعفه الألباني في السلسلة الضعيفة، الرقم ٥٩١٥ لأن النهاس بن قهم ضعيف.
[2] الحجرات: ١٧.
[3] أسد الغابة، ج١، ص٢٩٦.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج، ص ٣١٦.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣١١.
[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣١١.
[7] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٧٥، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣١١.

## ٣٩٥. بەشیری کوڕی ئەبی زەید(رضي الله عنه)

ناوی بەشیری کوڕی ئەبی زەیدە، لە پشتیوانانە،[١] ئەبووزەیدی باوکی یەکێک بوو لەو شەش کەسەی کە لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) قورئانیان کۆکردەوە،[٢] بەشیر لە ڕۆژی (الحرة) شەهید بوو.[٣]

ئیبن حەجەر دەڵێت: لەوانەیە ئەم دوو ناوەی بەشیری کوڕی ئەبی زەید هەر یەک کەسایەتی بێت.[٤]

## ٣٩٦. بەشیری کوڕی یەزید(رضي الله عنه)

ناوی بەشیری کوڕی یەزیدی ضەبوعیە، لەو هاوەڵانەیە دواتر نیشتەجێی بەصرە بوون.[٥]

بەشیری کوڕی یەزید کەسێکی بە تەمەن بوو و سەردەمی نەفامیشی دیبوو.[٦]

فەرموودەیەکی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە ڕۆژی ذیقاردا فەرمووی: (**هذا أول يوم انتصفت فيه العرب من العجم**)،[٧] (ئەوە یەکەم ڕۆژە تیایدا عەرەب تۆڵەی خۆی لە عەجەم کردەوە).

جەنگی ذیقار ئەو جەنگە بوو کە لەنێوان عەرەب و فارسەکاندا ڕوویدا، سەبارەت بە کاتەکەی دەوترێت تەمەنی پێغەمبەر(ﷺ) چل ساڵان بووە، دەشوترێت، بەڵکو نزیک بە کاتی جەنگی بەدر ڕوویداوە، پەروێزی گەورەی

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣١١.
[٢] أسد الغابة، ج١، ص ٢٩٠.
[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣١١.
[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣١١.
[٥] أسد الغابة، ج١، ص ٢٩٦.
[٦] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣١٦.
[٧] المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٢٢٦، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١١٣٣، ضعفه الألباني في سلسلة الأحاديث الضعيفة، الرقم ٥٧٩.

فارسەکان پاش بەندکردنی نوعمانی کوڕی مونذیر و مردنی نوعمان، سوپایەکی سێ هەزار کەسی نارد بۆ عەرەبەکانی بەکری کوڕی وائیل، پاش ڕوودانی جەنگێکی سەخت تیایدا عەرەبەکان سەرکەوتن و فارسەکان شکان.[١]

## ٣٩٧. بەشیری کوڕی ئەککال(رضي الله عنه)

ناوی بەشیری کوڕی ئەککالە،[٢] لە پشتیوانانە،[٣] ئیبن ئەثیر پێی وایە لە ئەوسیەکانە،[٤] کونیەکەی بریتی بوو لە ئەبوو ئەیووب.[٥]

کوڕێکی هەبوو بە ناوی ئەییوب کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە.[٦]

ئەم هاوەڵە لە مەدینە نیشتەجێ بوو و هەر لەوێ مایەوە.[٧]

بەشیر دەڵێت: گرفت و ئاژاوەیەک لە نێو بەنی موعاویەدا هەبوو، پێغەمبەری خوا(ﷺ) چوو تا نێوانیان چاک بکاتەوە، لەو کاتەدا لای کردەوە بەرەو گۆڕێک و فەرمووی: (لا هديت)، (هەر ڕێنموونیت بۆ نەبێت)، پرسیار کرا ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوە چی بوو؟ فەرمووی: **(إن هذا سئل عني فقال لا أدري)**،[٨] (ئەو مردووە لەبارەی منەوە پرسیاری لێکرا لە وەڵامدا وتی: نازانم).

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە کەسێک وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە دایک و باوکمەوە بە قوربانت بم کەس لە نزیکتەوە بەدی ناکەین، ئەویش فەرمووی: دام بە لایدا و سەبارەت بە من پرسیاری لێ دەکرا.[٩]

---

[١] المختصر في تأريخ البشر لأبي الفداء، ج١، ص٥١.
[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٠٩.
[٣] أسد الغابة، ج١، ص٢٨٥.
[٤] أسد الغابة، ج١، ص٢٨٥.
[٥] معجم الصحابة لابن قانع، ج١، ص ٩٦.
[٦] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٠٩.
[٧] أسد الغابة، ج١، ص٢٨٥.
[٨] معجم الصحابة لابن قانع، ج١، ص ٩٦.
[٩] أسد الغابة، ج١، ص٢٨٥.

## ٣٩٨. بەشیری کوڕی ئەنەس(رضي الله عنه)

ناوی بەشیری کوڕی ئەنەسی کوڕی ئومەییەیە،[١] لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان، [٢] کوڕێکی هەبوو بە ناوی عەبدوڵا.[٣]

بەشیری کوڕی ئەنەس یەکێک بوو لە بەشداربوانی غەزای ئوحود.[٤]

## ٣٩٩. بەشیری ئەنصاری(رضي الله عنه)

بەشیر لە پشتیوانانەو لە ڕۆژی بیئر مەعوونەدا شەهید بوو.[٥]

## ٤٠٠. بەصرەی کوڕی ئەبوو بەصرە(رضي الله عنه)

ئەم هاوەڵە ناوی بەصرەی کوڕی ئەبووبەصرەیە و لە غیفاریەکانە،[٦] خۆیشی و باوکیشی هاوەڵی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بون، هەردووکیشیان ناویان لەو هاوەڵانەدا هاتووە کە دواتر چوونەتە میصر و لەوێ نیشتەجێ بون.[٧]

بەصرە کوڕێکی هەبوو بە ناوی حەمیل کە رایەک هەیە دەڵێت: ئەمیش هاوەڵی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بووە.[٨]

ئەبووهورەیرە دەڵێت: جارێک گەیشتم بە بەصرەی کوڕی ئەبوو بەصرەی غیفاری، لێی پرسیم لە کوێوە هاتویت؟ وتم: لە طوورەوە

---

[١] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ١٧٦، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣١٠.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣١٠.

[٣] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج ٨، ص٤٠٩.

[٤] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ١٧٦.

[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣١٧.

[٦] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ١٨٤.

[٧] أسد الغابة، ج١، ص ٢٩٨.

[٨] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص١٣٠.

هاتوومەتــەوە، بەصــرە وتــی: ئەگــەر پێــش ئــەو چوونــەت تــۆم بدیبا نەدەچوویــت بــۆ طــوور، چونکــە مــن بیســتوومە لــە پێغەمبــەری خــوا(ﷺ) دەیفەرمــوو (لا تعمل المطي إلا إلى ثلاثة مساجد، إلى المسجد الحرام وإلى مسجدى هذا وإلى مسجد إيلياء-أو مسجد بيت المقدس)،[1] (کۆڵــی ســەفەر و بەتایبــەت ســەفەرکردن تەنهــا بــۆ ســێ مزگــەوت ببێچنــەوە، بــۆ مەســجیدولحەرام و ئــەم مزگەوتــەم-مزگەوتــی پێغەمبــەر(ﷺ)- و مزگــەوتــی ئیلیاء-یــان مزگەوتــی بەیتولموقــەددەس دوودڵ بــوو کام ناویــان بــوو).

بــەڵام لــە هەنــدێ ســەرچاوەدا هاتــووە ئــەم فەرموودەیــە ئەبووبەصــرەی باوکــی گێراویەتیــەوە نــەک بەصــرە خــۆی،[2] ئەلبانیــش ئــەم رایــەی پــێ راســتترە.[3]

## ٤٠١. بەصرەی کوڕی ئەکثەم(رضي الله عنه)

نــاوی بەصــرەی کــوڕی ئەکثەمــە، دەوترێــت خوزاعیــە، دەشــوترێت لــە پشــتیوانانە، بــە بوســرە و نەضلــە و نەضــرە نــاوی هاتــووە، بــەڵام راســتتر ئەوەیــە کــە نــاوی بەصرەیــە.[4]

بەصــرە فەرموودەیەکــی لــە پێغەمبــەری خواوە(ﷺ)ســەبارەت بــە مەســەلەی هاوســەرگیری گێڕاوەتــەوە.[5]

بەصــرە دەڵێت: کچێکــم مــارە کرد، کەچــی کــە چوومــە لای سکی پڕ بــوو، پێغەمبــەر(ﷺ) فەرمــووی: (لها الصداق بما استحللت من فرجها والولد عبد لك فإذا ولدت)،[6] (ئافرەتەکــە مارەییەکــەی بــۆ هەیــە بەرامبــەر بــەوەی داوێنــی بــۆت

---

[1] سنن النسائي - كتاب الجمعة - باب ذكر الساعة التي يستجاب فيها الدعاء يوم الجمعة، الرقم ١٤٢٩، صححه الألباني.

[2] أسد الغابة، ج١، ص٢٩٨.

[3] الثمر المستطاب في فقه السنة والكتاب، ٥٥٥/٢.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣١٩.

[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣١٩.

[6] سنن أبي داود - كتاب النكاح - باب الرجل يتزوج المرأة فيجدها حبلى، الرقم ٢١٢٧، ضعفه الألباني في

رەوا کـردووە، منداڵەکەشـی کـە لەدایـک بـوو کۆیلـەی تۆیە-واتـە کۆیلـەی بەصـرە-).

لـە گێڕانەوەیەکـی تـردا هاتـووە بەصـرە بەسـەرهاتەکەی گێڕایـەوە بـۆ پێغەمبـەر(ﷺ)، ئەویـش لەیەکـی جیاکردنـەوەو دواتـر فەرمـووی: (إذا وضعت فاجلدوها الحد)،[1] (ئەگـەر ئافرەتەکە منداڵەکەی بوو حەددی جەلدی لێ بدەن).

## ٤٠٢. بەعجەی کوڕی زەید(رضي الله عنه)

نـاوی بەعجـەی کوڕی زەیدی خوزاعیـە، بـرای بەرزەعـی کـوڕی زەیـدە،[2] بەعجـە هـاودەم بـە بەرزەعـی بـرای وەک وەفـد چوەتـە خزمـەت پێغەمبـەری خـوا(ﷺ)،[3] پێشـتر لـە باسـی ژیانـی بەرزەعـدا بەسـەرهاتی سـەفەرەکەمان باسـکردووە.

ئیبـن ئیسـحاق پێی وایـە بەعجـە هـاودەم بـە بەرزەعـی بـرای لـەو وەفدەدا بـووە.[4]

## ٤٠٣. بوغووم(رضي الله عنها)

نـاوی بوغوومی کچـی خالیدەو هاوسـەری صەفوانـی کـوڕی ئومەییەیە، ئەم ئافرەتـە لـە فەتحـی مەککـەدا موسـڵمان بـوو، یـان ئیبـن سـەعد دەڵێت: پێشـتر موسـڵمان بووبـوو و لـە حەجـی ماڵئاواییدا بەیعەتـی دا بـە پێغەمبـەر(ﷺ).[5]

---

صحيح و ضعيف سنن أبي داود، الرقم ٢١٣١.

[1] السنن الكبرى للبيهقي - كتاب النكاح - جماع أبواب ما يحل من الحرائر ولا يتسرى العبد وغير ذلك - باب لا عدة على الزانية ومن تزوج امرأة حبلى من زنا لم يفسخ النكاح، الرقم ١٤٠٠٤.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٢٠.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٢٨٤.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٨٤.

[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٣٨.

## ٤٠٤. بەغیضی کوڕی حەبیب(ﷺ)

ناوی بەغیضی کوڕی حەبیبی کوڕی مەڕوان بوو، لە مازنیەکان بوو،[١] ئیبن ئەثیر بە تەمیمی ناوی هێناوە،[٢] وەک وەفد هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەریش(ﷺ) ناوەکەی گۆڕی و ناوی نا حەبیب،[٣] کاتێک هات پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری لێکرد ناوت چیە؟ ئەویش وتی: بەغیض، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (بل أنت حبیب)،[٤] (بەڵکو تۆ ناوت حەبیبە-خۆشەویست).

## ٤٠٥. بەکری کوڕی حارث(ﷺ)

ناوی بەکری کوڕی حارثی ئەنماریە،[٥] لە پشتیوانانە، کونیەکەیشی ئەبوومەیفەعەیە،[٦] بەڵام ئیبن حەجەر بە ئەبولمەنقەعە هێناویەتی.[٧]

بەکری کوڕی حارث دواتر چوویە حیمص و لەوێ نیشتەجێ بوو.[٨]

## ٤٠٦. بەکری کوڕی عەبدولا(ﷺ)

ناوی بەکری کوڕی عەبدوڵای کوڕی رەبیعە، لە پشتیوانانە.[٩]

فەرموودەیەکی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە کە دەفەرموێت (علموا أبناءكم السباحة والرماية...)،[١٠] (منداڵەکانتان فێری مەلەوانی و هاویشتن بکەن).

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٢٠.
[٢] أسد الغابة، ج١، ص ٣٠٠.
[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٢٠.
[٤] أسد الغابة، ج١، ص ٣٠٠.
[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٢٣.
[٦] أسد الغابة، ج١، ص ٣٠١.
[٧] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٢٣.
[٨] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٢٣.
[٩] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٢٥.
[١٠] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١١٩٤، ضعفه الألباني في السلسلة الضعيفة، الرقم ٣٨٧٦.

## ٤٠٧. بەکری کوڕی موبەشیر(ﷺ)

ناوی بەکری کوڕی موبەشیری کوڕی جەبرە، لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان،[١] لە هاوەڵانی دانیشتووی مەدینەیە و هەر لەوێ ماوەتەوە.[٢]

بەکری کوڕی موبەشیر دەڵێت: ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قوربانیش بەری بەیان لەگەڵ هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) دەچووینەدەرەوەو بەرەو بوطحان دەچووین تا بچینە شوێنی نوێژکردن، ئینجا لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) نوێژمان دەکرد، دواتر دەگەڕاینەوە بۆ ماڵەکانمان.[٣]

## ٤٠٨. بەکری کوڕی ئومەییە(ﷺ)

ناوی بەکری کوڕی ئومەییەی کوڕی خوەیلیدی کوڕی عەبدوڵای ضەمریە،[٤] ئومەییەی باوکیشی یەکێک بوو لە هاوەڵان و هەواڵگی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو.[٥]

برایەکی هەبوو بە ناوی عەمر کە لە هاوەڵانی زۆر نزیکی پێغەمبەر(ﷺ) بوو،[٦] پێغەمبەر(ﷺ) عەمری نارد بۆ لای نەجاشی تا داوای ئوم حەبیبەی بۆ بکات.[٧]

بەکری کوڕی ئومەییە دەڵێت: لە سەرەتای هاتنی ئیسلامدا دراوسێیەکی جوهەینەییمان هەبوو، ئەوکات ئێمە هێشتا بێباوەڕ بووین، کەسێکی پیسی شەڕانیمان لەناودا بوو پێی دەوترا ڕیشە، ئەم کەسە بەردەوام هێرشی

---

[١] أسد الغابة، ج١، ص ٣٠٣، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٢٥.

[٢] أسد الغابة، ج١، ص ٣٠٣، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٢٥.

[٣] سنن أبي داود - كتاب الصلاة - باب إذا لم يخرج الإمام للعيد من يومه يخرج من الغد، الرقم ١١٥٦، ضعفه الألباني في تمام المنة في التعليق على فقه السنة، (٣٤٦/١).

[٤] أسد الغابة، ج١، ص ٣٠٠.

[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٢٤٧.

[٦] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ١٧٨، أسد الغابة، ج١، ص ٣٠٠.

[٧] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤، ص٦٠٢.

دەکردە سەر ئەو کەسە جوهەینیە، ئەوانیش دەهاتن و دژ بەو کەسە لای ئێمە سکاڵایان دەکرد، ئێمەش پێمان دەوتن بەخوا نازانین چی پێ بکەین، ئێمە دەستمان لێی شتووە، بڕۆن بیکوژن، جارێک ریشە وشترێکی زۆر باشی کابرای برد و بردیە شوعبەتولوادی و لەوێ سەری بڕی و بەشە هەرەخۆشەکەی خوارد و هەموو ئەوی تری جێهێشت، کاتێک کابرای جوهەینی چوو تا وشترەکەی بدۆزێتەوە زۆر گەڕا تا بەو شێوەیە دۆزیەوە، ئینجا هات بۆ ناو کۆڕی بەنی ضەمرە و بە داخ و دڵگرانیەوە شیعرێکی وت: کە تیایدا نارەزایی بەرامبەر خودا نیشان دەدا و دەیوت خواش توانای نیە بەسەریدا، ئینجا داوای لە خوا کرد بە دەردێک بیکوژێت، ئەوەبوو خوای گەورە بەو دەردە کوشتی، دەردەکەش ئەوەبوو لە نێو چاوانیەوە زیپکەیەکی دەرکرد کە بەرەبەرە سەری دەگرتەوە، بەکر دەڵێت: تا چووین بۆ حەج و هاتینەوە هەموو سەری خواردبوو و بەوجۆرە مرد.[1]

سەبارەت بەم گێڕانەوەیە ئیبن حەجەر دەڵێت: من بە مونقەطیعی دەزانم.[2]

## ٤٠٩. بەكری كوڕی جەبلە(ﷺ)

ناوی بەکری کوڕی جەبلەی کوڕی وائیلی کوڕی قەیسی کەلبیە،[3] وەک وەفد هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و موسڵمان بوو،[4] بەکر دەڵێت: من و عاصم (کە کەسێک بوو لە بەنی رقاش) هاتینە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و ئەویش پێشنیاری ئیسلامی بۆ کردین، ئێمەش موسڵمان بووین، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: من پێغەمبەری نەخوێندەواری راستگۆی پاکم و هاوار سەد هاوار بۆ ئەوەی بە درۆم دەخاتەوەو بڕوام پێ ناهێنێت و پشتم تێ دەکات و لەگەڵم دەجەنگێت، تەواوی خێریش بۆ ئەوەی پاڵپشتمەو سەرم

[1] مجابو الدعوة لابن أبي الدنيا، الرقم ٦، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١١٥٥.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٢٠.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٢٢.
[4] تاريخ مدينة دمشق لأبي القاسم علي بن الحسن الشافعي، دار الفكر(بيروت-١٩٩٥)، ج٧، ص٢٩٨.

دەخات و بڕوام پێدێنێت و قسەم بە ڕاست دادەنێت و لەگەڵم جیهاد دەکات، بەکر و عاصم وتیان دەی ئێمە بڕوات پێ دێنین و قسەت بە ڕاست دەزانین، ئیتر موسڵمان بوون، ئینجا بەکر لەسەر موسڵمان بوونەکەی شیعرێکی هۆنیەوە.[1]

ئەم هاوەڵە سەرەتا ناوی عەبد عەمر بوو، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) ناوی گۆڕی و ناوی لێنا بەکر.[2]

کوڕێکی هەبوو بە ناوی وەلید،[3]برایەکی هەبوو بە ناوی نوعمانی کوڕی جەبلە،[4] برایەکی تریشی هەبوو بە ناوی ئەبرەش.[5]

## ٤١٠. بەکری کوڕی حارثە(ﷺ)

ناوی بەکری کوڕی حارثەیە و لە جوهەنیەکانە.[6]

بەکری کوڕی حارثە دەڵێت: من لە سریەیەکدا بووم کە پێغەمبەر(ﷺ) ناردبووی، لەگەڵ بێباوەڕان بەریەککەوتین و جەنگاین، منیش هەڵمکوتایە سەر یەکێک لە بێباوەڕەکان، ئەویش داوای پەنای کرد و موسڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند، منیش کوشتم، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەی بیستەوە تووڕە بوو و دووری خستمەوە، ئەوەبوو خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند(وما كان لمؤمن أن يقتل مؤمنا إلا خطأ) ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) ڕازی بوو و نزیکی خستمەوە.[7]

## ٤١١. بەکری کوڕی حەبیب(ﷺ)

ناوی بەکری کوڕی حەبیبی حەنەفیە، سەرەتا ناوی بەربەر بوو، بەڵام

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص٣٣٤.
[2] أسد الغابة، ج١، ص٣٠١.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٢٢.
[4] الجزء المتمم لطبقات ابن سعد، ج٢، ص ٢٨٩.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٢٢.
[6] أسد الغابة، ج١، ص ٣٠١.
[7] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١١٥٨.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) ناوی نا بەکر.[1]

گۆڕینی ناو بە جوانترین ناو دروستە بەتایبەت گۆڕینی ناوی ناشیرین بۆ ناوی جوان سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) بووە.

## ٤١٣. بەکری کوڕی شودداخ(رضي الله عنه)

ناوی بەکری کوڕی شودداخی لەیثیە،[2] دەشوترێت بەڵکو ناوی بوکەیرە، یەکێک بوو لەوانەی خزمەتی پێغەمبەری خوایان(ﷺ) دەکرد.[3]

بەکر لە دەوری پێغەمبەر(ﷺ) بوو و خزمەتی دەکرد و دەچوویە ماڵی، ئەوکات هێشتا مێردمنداڵ بوو، کاتێک باڵغ بوو چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من جاران دەچوومەوە ماڵەوە و خێزانەکانت لەوێ بوون، بەڵام وا ئێستا باڵغ بوم، پێغەمبەر(ﷺ) نزای خێری بۆ کرد و فەرمووی(اللهم صدق قوله ولقه الظفر)،[4] (خوایە قسەی بە راست بگێڕەو سەرکەوتنی پێ بگەیەنە).

لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەتتابدا بەکری کوڕی شودداخ جوولەکەیەکی کوشت، خەلیفە کە بیستی جوولەکەیەک کوژراوە چوویە سەر مینبەر و وتی، هەرکەس زانیاریەکی هەیە بەم کوشتنە خوای بەبیردەهێنمەوە تا پێم بڵێت، ئەوەبوو بەکر هەستا و وتی: من کوشتوومە، خەلیفە وتی: الله اکبر خوێنەکەی لەسەرتە، پۆزش و بەڵگەت چیە؟ بەکر وتی: بەڵێ بەڵگەم پێیە، فڵانە کەس چوو بۆ غەزا و منی راسپارد تا ئاگاداری ژن و منداڵەکانی بم، منیش چوومە لای ماڵەکەیان ئەم جوولەکەیەم بینی لە ماڵی ئەو هاوەڵەدا بوو و دەیویست دەستدرێژی بکاتە سەر ژنەکەی و دەیوت:

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٢٤.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٢٤.

[3] أسد الغابة، ج١، ص٣٠٢.

[4] أسد الغابة، ج١، ص٣٠٢.

وأشعثُ غَرَّه الإسلام مني

خَلَوْتُ بعُرْسِهِ ليل التَّمامِ

أبيتُ على ترائبها ويمسي

على قَوَدِ الأعِنَّة والحزامِ

كأن مجامع الرَّبَلات منها

فئامٌ ينهضون إلى فئامِ

عومەر بەڵگەکەی وەرگرت و خوێنبابییەکەشی هەڵوەشاندەوە، ئەمەش هاتنەدی فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بوو کە فەرمووی: خوایە قسەی بە راست بگێڕە-واتە قسەی بە راست دابنرێت-.[1]

ئەو هاوەڵەی چوو بۆ غەزاو بەکری راسپارد ئاگاداری ژن وماڵەکەی بێت ئەشعەثی ئەنصاری بوو.[2]

## ٤١٣. بەننەی جوهەنی(رضي الله عنه)

سەبارەت بە ناوی ئەم هاوەڵەش چەند رایەک هەیە، بە بەننەی جوهەنی ناوی هاتووە، بە نوبەیهیش هاتووە، بە یەننەش هاتووە.[3]

فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوەو دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) دای بە لای خەڵکێکدا شمشێریان هەڵدەکرد و بێ ئەوەی لە کالاندا بێت دەیانجووڵاند و گەمەیان پێ دەکرد و دەیاندا بە یەکدی، ئەویش فەرمووی: (لعن الله من يفعل ذلك، أولم أزجركم عن هذا؟ فإذا سللتم السيف، فليغمده الرجل، ثم ليعطه كذلك)،[4] (نەفرین لەوەی ئەوە دەکات، مەگەر من لەسەر ئەوە سەرکۆنەم نەکردن؟ کە شمشێرتان هەڵکرد با ئەو کەسە بیخاتەوە کالان ئینجا بەوجۆرە بیدات بەوی تر).

[1] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١١٥٧، أسد الغابة، ج١، ص٢٠٢-٢٠٣.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٨٩.

[3] أسد الغابة، ج١، ص ٢١٠.

[4] مسند أحمد بن حنبل - مسند جابر بن عبد الله(رضي الله عنه)، الرقم ١٤٩٧٠، صححه الألباني.

## ٤١٤. بەهزاد(رضي الله عنه)

ناوی بەهزادەو بە ئەبوو مالیک ناسراوە، چونکە کوڕێکی هەبوو بە ناوی مالیک، ئەو کوڕەشی کوڕێکی هەبوو بە ناوی یووسف، ئەو یووسفە فەرموودەی لە بەهزادی باپیرەیەوە گێڕاوەتەوە، بەڵام سەنەدی فەرموودەکە لاوازە، چونکە جەعفەری کوڕی عەبدولوەهابی تێدایە کە تۆمەتبارە بە درۆزنی،[1] فەرموودەکەش ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی (احفظوني في أبوبكر فإنه لم يسؤني منذ صحبني)، (سەبارەت بە ئەبووبەکر چاک بن و لەبەر من قسەی لەسەر مەکەن، چونکە لەو کاتەوەی هاوەڵی کردوم خراپەی بەرامبەرم نەبووە).[2]

## ٤١٥. بەهزی قوشەیری(رضي الله عنه)

ناوی بەهزی قوشەیری یان بەهزیە، فەرموودەیەکی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە و دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) کاتێ سیواکی دەکرد بە باری پانیدا سیواکی دەکرد، کە ئاویشی دەخواردەوە وەک هەڵلوشین دەیخواردەوە، لە ئاوخواردنەوەشدا سێ هەناسەی دەدا-واتە بە سێ جار دەیخواردەوە.[3]

## ٤١٦. بەولا(رضي الله عنه)

ئیبن حەجەر بە بەولا و ئیبن ئەثیر بە بەولی ناویان هێناوە، کوڕێکی هەبووە بە ناوی موحەممەد کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە.[4]

بەولا دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (إياكم و الطعام الحار فإنه يذهب بالبركة

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٣٠.

[2] أسد الغابة، ج١، ص ٣١١.

[3] المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٢٣٠، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١١٩٥، ضعفه الألباني في ضعيف الجامع الصغير و زيادته، الرقم ٤٥٥٢.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٣٢.

وعليكم بالبارد فإنه أهنأ وأعظم بركة)،[1] (وریابن خواردنی گەرم مەخۆن، چونکە بەرەکەت ناهێڵێت، خواردنی سارد بخۆن، چونکە ئارامبەخشتر و بەرەکەتی زیاترە).

لە فەرموودەیەکی تردا کە جابر گێڕاویەتیەوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی (أبردوا الطعام الحار فإن الطعام الحار غير ذي بركة)،[2] (خواردنی گەرم سارد بکەنەوە، چونکە خواردنی گەرم بەرەکەتی نیە).

## ٤١٧. بەیحەرەی کوڕی عامر(ﷺ)

ناوی بەیحەرەی کوڕی عامرە، وەک وەفد چوەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمان بووە.[3]

بەیحەرە کوڕێکی هەبوو بە ناوی مونذیر کە فەرموودەیەکی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە،[4] بەیحەرە دەڵێت: چووینە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمان بووین و داوامان لێکرد عەتەمەمان لەسەر لابەرێت، چونکە سەرقاڵین بە شیری وشترەوە، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: پشت بە خوا شیرەکەش دەدۆشن و نوێژیش دەکەن.[5]

## ٤١٨. برتای کوڕی ئەسود(ﷺ)

ناوی برتای کوڕی ئەسوەد دوای وەفاتی پێغەمبەری خوایش(ﷺ) ژیاو لە فەتحی میصردا بەشدار بوو، دەوترێت لە فەتحی ئەسکەندەریەدا کوژراوە.[6]

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص ٣١٢، ضعفه الألباني في ضعيف الجامع الصغير و زيادته، الرقم ٢٢٠١.

[2] المستدرک على الصحيحين - كتاب الأطعمة - أبردوا الطعام الحار، الرقم ٧٢١٨.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٣٢.

[4] أسد الغابة، ج١، ص ٣١٣.

[5] المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٢٢٨، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١١٩٦، أسد الغابة، ج١، ص ٣١٣.

[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٨٣.

## ٤١٩. بقیلەی ئەشجەعی(رضي الله عنه)

ناوی بوقەیلەی ئەکبەری ئەشجەعیە، کونیەکەی ئەبولمینهالە، هەروەها بە نوفەیلەش ناوی هاتووە، بوقەیلە یەکێک بوو لە کەسە ناسراو و دیارەکان و شاعیرێکی دیار بوو، لە غەزایەکیدا شیعرێکی بەهێزی نووسی بۆ عومەری کوڕی خەططاب، لە جەنگی ئوحوددا بەشداربوو و لە نزیکی پێغەمبەرەوە(ﷺ) بوو.[1]

## ٤٢٠. بلیحی کوڕی مەخشی(رضي الله عنه)

ناوی بلیحی کوڕی مەخشیە، یەکێک بوو لە شاعیرەکان، شیعرێکی وتووە کە بەڵگەی هاوەڵبوونیەتی، تیایدا باس لەوە دەکات پێغەمبەری خوایان سەرخستووەو فەرمانی خواو پێغەمبەری خوایان بەجێگەیاندووەو دەڵێت: چ فەرمانێ لە سەروو فەرمانی ئەوانەوەیە:

نصرنا النبي بأسيافنا

نكر بمكة نستبشر

بأمر الإله وامر النبي

وما فوق امريهما مأمر[2]

## ٤٢١. بوجەیری خوزاعی(رضي الله عنه)

بوجەیری خوزاعی ناسراوە بە ئەبوو مالیک، زانیاری تر لەسەر ژیانی نیە.[3]

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٢٠.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٢٩.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٧٠.

## ٤٢٢. بوجەیری ثەقەفی(رضي الله عنه)

هیچ زانیاری لەسەر نەهاتووە.

## ٤٢٣. بوجەیری کوڕی زوهەیر(رضي الله عنه)

ناوی بوجەیری کوڕی زوهەیری کوڕی ئەبوسولمای موزەنیە.[١]

برایەکی هەبوو بە ناوی کەعب، زوهەیری باوکیان لە گەورە شاعیران بوو، هەریەک لە بوجەیر و کەعبیش لە گەورە شاعیران بوون و زۆر ناسراو بوون.[٢]

بوجەیر لەپێش کەعبی برایدا موسڵمان بووە، جارێک بوجەیر و کەعب پێکەوە لای ئاژەڵ بوون، بوجەیر بە کەعبی وت: لای ئەم مەڕانە بە تا دەچم بۆ لای ئەو پیاوە (موحەممەد) و گوێی لێ بگرم بزانم چی دەڵێت؟ بوجەیر چوو بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئەوەبوو پێغەمبەر(ﷺ) ئیسلامی بۆ باس کرد و پێشنیازی موسڵمانبوونی بۆ کرد، بوجەیریش موسڵمان بوو،[٣] کاتێ کەعب بیستی بوجەیری برای موسڵمان بووە بە شیعرێ ناڕەزایی دەربڕی.[٤]

کەعب بە بێباوەڕی مایەوە،[٥] پێغەمبەر(ﷺ) خوێنی کەعبی ڕەوا کرد، بەڵام دواتر بوجەیری برای نامەی نارد و داوای کرد تەوبە بکات،[٦] بۆی نووسی پێغەمبەر(ﷺ) کەسانێکی لە مەککە کوشتووە کە بە شیعر هێرشیان کردوەتەسەر پێغەمبەر(ﷺ) و قسەیان پێ وتووە، جا خێرا وەرە بۆ لای

[١] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٤٨.
[٢] أسد الغابة، ج١، ص٢٤٧.
[٣] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٤٩.
[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٥، ص٥٩٣.
[٥] أسد الغابة، ج١، ص٢٤٧-٢٤٨.
[٦] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٥، ص٥٩٣-٥٩٤.

پێغەمبەر(ﷺ) و تەوبە بکە،[1] کەعبیش هات بۆ مەدینەو پرسیاری کرد دڵ نەرمترین هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) کێیە؟ پێی وترا ئەبووبەکری صدیقە، کەعب چوو بۆ لای ئەبووبەکر تا بیبات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، ئەبووبەکر پێشکەوت بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و کەعبیش بە دوایدا چوو، لە مزگەوت لە شوێنی ئەهلی صوففە پێغەمبەریان(ﷺ) بینی و کەعب داوای پەنای کرد، پێغەمبەریش(ﷺ) پەنای دا، بەوە کەعب موسڵمان بوو، پێغەمبەریش(ﷺ) عەبایەکی پێ بەخشی و ئەو عەبایەی مایەوە تا دواتر لە سەردەمی موعاویەدا ئەو عەبایە کە لای کوڕەکەی کەعب بوو موعاویە لێی کڕی و پاش ئەوە خەلیفەکان ئەو عەبایان دەپۆشی.[2]

بوجەیر بە باوەڕداری لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) بوو و لە فەتحی مەککەدا بەشداری کرد و شیعرێکی بەسەردا هۆنیەوە.[3]

هەوەها بوجەیری کوڕی زوهەیر لە غەزای طائیفیشدا بەشداری کرد و شیعرێکی بەسەردا هۆنیەوە.

کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) لە طائیفەوە گەڕایەوە بوجەیریش هاودەمی بوو، خێرا نامەی نووسی بۆ کەعبی برای و داوای لێکرد تەوبە بکات و بێت بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) چونکە پێغەمبەر(ﷺ) بەرپەرچی تەوبەکار ناداتەوە، بۆ ئەوەش شیعرێکی بۆ نووسی.[4]

## ٤٢٤. بوجەیری کوڕی ئەبوبوجەیر(رضي الله عنه)

ناوی بوجەیری کوڕی ئەبووبوجەیری عەبسیە، لە هەردوو غەزای بەدر و ئوحوددا بەشدار بوو.[5]

---

[1] البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص٣٦٨، تأريخ الإسلام للذهبي، ج٢، ص٦١٥.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٥، ص٥٩٣-٥٩٤.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٧٠.

[4] أسد الغابة، ج١، ص٢٤٧-٢٤٨.

[5] أسد الغابة، ج١، ص٢٤٧.

## ٤٢٥. بوححاتی کوڕی ثەعلەبە(﵁)

ناوی بوححاتی کوڕی ثەعلەبەی کوڕی خەزمەی کوڕی ئەصرەمە،[١] هاوپەیمانی پشتیوانان بوو.[٢]

دوو برای هەبوو بە ناوەکانی عەبدوڵا و یەزید، یەزیدی برای بەشداری هەردوو عەقەبە بوو، بەڵام لە بەدردا بەشدار نەبوو،[٣] عەبدوڵای برای لە بەدر و ئوحودیشدا دا بەشدار بوو.[٤]

ئەم هاوەڵە لەگەڵ عەبدوڵای برایدا لە غەزای بەدر[٥] و ئوحودیشدا بەشداری کرد،[٦]بوححات و عەبدوڵای برایشی پاش مەرگی خۆیان هیچ نەوەیەکیان جێ نەهێشت.[٧]

## ٤٣٦. بوحری کوڕی ضوبوع(﵁)

ناوی بوحری کوڕی ضوبوعی کوڕی ئەتتەی کوڕی یەحمودی روعەینیە، وەک وەفد هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)،[٨] دوای پێغەمبەریش(ﷺ) ژیاو لە فەتحی میصردا بەشدار بوو و لەوێش نیشتەجێ بوو.[٩]

## ٤٣٧. بوحەینە(﵂)

ناوی بوحەینەی کچی حارثەو چوویە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و بەیعەتی پێدا، پێغەمبەر(ﷺ) لە دەستکەوتەکانی خەیبەر سی کۆڵی بۆ بڕیەوە.[١٠]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٧٠.
[٢] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٩٠.
[٣] أسد الغابة، ج١، ص ٢٤٩.
[٤] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٥٤٤.
[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٧٠.
[٦] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٩٠.
[٧] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٥٤٤.
[٨] أسد الغابة، ج١، ص ٢٥٠.
[٩] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٧١.
[١٠] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٣٠.

## ٤٢٨. بوسرەی کچی صەفوان(ﷺ)

ناوی بوسرەی کچی صەفوانی کوڕی نەوفەلی ئەسەدیە، زۆر زوو لە مەککە موسڵمان بوو و دواتریش کۆچی کرد بۆ مەدینە.[١]

## ٤٢٩. بوشەیرە(ﷺ)

ناوی بوشەیرەی کچی حارثە، لە پشتیوانانەو چووەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و بەیعەتی پێداوە.[٢]

## ٤٣٠. بوثەینەی کچی نوعمان(ﷺ)

ناوی بوثەینەی کچی نوعمانی کوڕی خەلەفە، چووەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و بەیعەتی پێداوە، هاوسەری موحەممەدی کوڕی عەمرە.[٣]

## ٤٣١. بوشەیرەی ئەنصاری(ﷺ)

ناوی بوشەیرەی کچی ثابتە، لە پشتیوانانەو چووەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و بەیعەتی پێداوە.[٤]

## ٤٣٢. بوشەیرەی کچی نوعمان(ﷺ)

ناوی بوشەیرەی کچی نوعمانە، لە پشتیوانانەو چووەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و بەیعەتی پێداوە.[٥]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٣٦.
[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٣٦.
[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٢٩.
[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٣٨.
[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٣٨.

## ٤٣٣. بوقەیرە(رضي الله عنها)

ناوی بوقەیرەیەو هاوسەری قەعقاعی کوڕی ئەبی حەدرەدە، بوقەیرە دەڵێت: بیستم لە پێغەمبەر(ﷺ) کاتێک لەسەر مینبەر بوو دەیفەرموو (إذا سمعتم بجيش قد خسف به قريبا فقد أظلت الساعة)،[1] (ئەگەر بیستتان سوپایەک بەم نزیکانە چوو بە ناخی زەویدا ئەوە ڕۆژی دوایی نزیک بووەتەوە)

## ٤٣٤. بودەیل(رضي الله عنه)

دەوترێت ناوی بودەیل یان بورەیل یان بورەیرە، لە کۆچەرانە، باوکی ناسراوە بە ئەبوو مەریەم یان ئەبووماریە.[2]

## ٤٣٥. بودەیل(رضي الله عنه)

ئەم هاوەڵە جیایە لە بودەیلی کوڕی ئەبومەریەم، فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوە کە ئیبن حەجەر دەڵێت: سەنەدەکە کەسی لاوازی تێدایە، بودەیل دەڵێت: پێغەمبەری خوام(ﷺ) بینی لەسەر خوف مەسحی دەکرد.[3]

## ٤٣٦. بودەیلی کوڕی سەلەمە(رضي الله عنه)

ناوی بودەیلی کوڕی سەلەمەی کوڕی خەلفی کوڕی عەمری خوزاعی سەلوولیە، زیاتر بە بودەیلی کوڕی ئوم ئەصرەم ناسراوە، بودەیل شاعیرێکی دیاریش بوو و لە فەتحی مەککەدا شیعری دەوت.[4]

دایکی ناوی ئوم ئەصرەمی کچی ئەحجەمی خوزاعیە،[5] بودەیلیش زیاتر

---

[1] مسند أحمد بن حنبل - مسند النساء(رضي الله عنهن) - حديث بقيرة(رضي الله عنها)، الرقم ٢٧٧٧٣، ضعفه شعيب الأرناؤوط.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٧٤.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٧٤.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٧٣.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٧٣.

به ناوی دایكیەوە ناسراوە.[1]

پێغەمبەر(ﷺ) هەریەک لە بودەیل و بوسری کوڕی سوفیانی نارد بۆ لای بەنی کەعب تا ئاگاداریان بکاتەوە بێن بۆ فەتحی مەککە.[2]

لە فەتحی مەککەدا بودەیل بەشدار بوو و بە شیعر وەڵامی ئەنەسی کوڕی زنیمی دایەوە. [3]

## ٤٣٧. بودەیلی کوڕی عەمری خەطەمی(ﷺ)

ناوی بودەیلی کوڕی عەمری خەطەمیە، لە پشتیوانانە.[4]

بودەیل دەڵێت: چوومە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و پێشنیازی روقیەی حەییەم لا کرد، ئەویش مۆڵەتی دام و نزای بەرەکەتی کرد بۆ روقییە.[5]

ئیبن حەجەر دەڵێت: لە سەنەدی ئەم گێڕانەوەدا کەسی نەناسراو هەیە.[6]

## ٤٣٨. بودەیلی کوڕی کولثوم(ﷺ)

ناوی بودەیلی کوڕی کولثومی خوزاعیە، هاتوەتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ)،کاتێک قورەیش ناپاکییان نواند لە رووی خوزاعەدا بودەیل هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ).[7]

گێڕانەوەیەک هاتووە کاتێک بودەیل چوویە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) شیعرێکی هۆنیەوە: لا هم إني ناشد محمدا...

بەڵام ئیبن حەجەر دەڵێت: ئەو سەنەدە مونقەطیعەو ئەو شیعرە هی

---

[1] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٥١.
[2] أسد الغابة، ج١، ص٢٥٤.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٧٣.
[4] أسد الغابة، ج١، ص٢٥٤.
[5] أسد الغابة، ج١، ص٢٥٤، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٧٣.
[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٧٣.
[7] أسد الغابة، ج١، ص٢٥٥.

عەمری کوڕی سالمە نەک هی بودەیل بێت،[1] لەوانەیە هەر ئەم خاوەنێتیەی شیعرە وای کردبێت هەندێک لەبری بودەیلی کوڕی کولثوم ناوی عەمری کوڕی کولثوم دێننن بۆیە ئیبن ئەثیر دەڵێت: ئەوانە لێیان تێکچووەو ئەو عەمرە کوڕی سالمی کوڕی کولثومەو ناوی سالمەکەیان پەڕاندووە.[2]

## ٤٣٩. بودەیلی کوڕی وەرقاء(رضي الله عنه)

ناوی بودەیلی کوڕی وەرقائی کوڕی عەمری کوڕی ڕەبیعەی خوزاعیە،[3] دانیشتووی مەککە بوو.[4]

کوڕێکی هەبوو بە ناوی عەبدوڵا کە لە سەردەمی خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبووطالیبدا لە جەنگی صفیندا کوژرا،[5] کوڕێکی تری هەبوو بە ناوی سەلەمە.[6]

بودەیل لە پێش فەتحی مەککەدا موسڵمان بووبوو، دەشوترێت بەڵکو ڕۆژی فەتحی مەککە موسڵمان بوو.[7]

گێڕانەوەیەک نیشانی دەدات بودەیل لە فەتحی مەککەدا موسڵمان بووە، بودەیل دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕۆژی فەتحدا سەیری کردم ڕەشی بە مووەکانمەوە مابوو، پێی فەرمووم تەمەنت چەندە؟ وتم: تەمەنم نەوەدو حەوت ساڵە، فەرمووی: خوا تەمەن و ڕەشیت-ڕەشی مووت- زیاد بکات.[8]

لە صولحی حودەیبیەدا بودەیلی کوڕی وەرقا لەگەڵ چەند کەسێکی هۆزەکەیدا هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و هەواڵی پێدا کە قوڕەیش ڕێ نادەن

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٧٤.
[2] أسد الغابة، ج١، ص٢٥٥.
[3] أسد الغابة، ج١، ص٢٥٦.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٧٥.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٧٥.
[6] أسد الغابة، ج١، ص٢٥٦.
[7] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٥٠.
[8] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٧٦.

بچێتـه مەککـه، پێغەمبەریـش(ﷺ) هەواڵـی پێدا و فەرمـووی: (ئێمـە نەهاتویـن لەگەڵ کەس بجەنگین بەڵکو هاتویـن عومـرە بکەیـن، قورەیش جەنگ سـەری خواردون و زیانی گەیاندووە پێیان، ئەگەر بیانەوێت ماوەیەک لێیان دەوەستم تا ڕێمـان بدەن... بودەیل وتـی: پەیامەکەت دەگەیەنم پێیان، ئەوەبوو چـوو تا گەیشـتە لای قورەیش، وتـی: ئێمـە لای ئەو پیاوەوە هاتویـن وگوێمـان لێـی بـوو قسـەیەکی کـرد، ئەگـەر حەزتـان لـێ بێت دەیخەینـەروو بۆتـان، گەمژەکانیـان وتیـان هیـچ پێویسـتمان بـەوە نیـە قسـەی ئەومـان بـۆ بگێڕیتـەوە، هەنـدێ لـە ژیرەکانیـان وتیـان: ئادەی بڵـێ چیـت لـێ بیسـت؟ ئەویـش قسـەکەی گێڕایـەوە بۆیـان.[٩]

بودەیلی کوڕی وەرقا دەڵێت: پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمانـی پێکردم کەنیزەک و سـامانە –غەنیمەکانـی جیهـاد– لـە جەعرانـە بوەسـتێنم و لـەوێ ئاگاداریـان بـم تـا پێغەمبـەر(ﷺ) خـۆی دێـت بـۆ ئـەوێ.[١٠]

سـەبارەت بـە مردنـی دوو ڕا هەیـە، یەکەمیـان دەڵێـت: لـە پێـش وەفاتـی پێغەمبـەری خـوادا(ﷺ) کۆچـی دوایـی کـرد، دووەمیشـیان دەڵێـت: لـە جەنگـی صفینـدا کـوژرا، بـەڵام ئیبـن حەجـەر دەڵێـت: عەبـدوڵای کـوڕی لـە جەنگـی صفینـدا کـوژرا.[١١]

پێغەمبـەر(ﷺ) لـە حەجـی ماڵئاواییـدا بودەیلـی بـە وشـترەکەیەوە نـارد تـا لـە ڕۆژی مینـادا بەنـاو خەڵکدا هـاوار بـکات ئـەم ڕۆژانـە ڕۆژانـی خـواردن و خواردنەوەن.[١٢]

لـە ڕۆژی فەتحی مەککەدا خەڵکی قورەیش پەنایان دەبرد بۆ ماڵی بودەیلی کوڕی وەرقا و ڕافیعی مەولای.[١٣]

---

[٩] صحيح البخاري – كتاب الشروط – باب الشروط في الجهاد، الرقم ٢٧٣١.

[١٠] المعجم الأوسط للطبراني، الرقم ٧٣٨٦.

[١١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٧٦.

[١٢] سنن الدارقطني – كتاب الصيد والذبائح والأطعمة وغير ذلک – باب الضحايا، الرقم ٤٧٥٩.

[١٣] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٥٠.

بودەیل و عەبدوڵای کوڕیشی لە هەریەک لە غەزاکانی حونەین و تەبووکدا بەشدارییان کرد.[1]

## ٤٤٠. بورەیدەی کوڕی حوصەیب(ﭬ)

ناوی بورەیدەی کوڕی حوصەیبی کوڕی عەبدوڵای ئەسلەمیە،[2] سەبارەت بە کونیەکەی چەند کونیەیەک هاتووە، ئەبووسەهل، ئەبولحوصەیب، ئەبوو ساسان، بەڵام زیاتر بە ئەبوو عەبدوڵا ناسراوە.[3]

کوڕێکی هەبوو بە ناوی عەبدوڵا کە لەگەڵ باوکیدا بەشداری جیهادی دەکرد تا دواجار لەگەڵ باوکی لە مەروو نیشتەجێ بوو، هەروەها فەرموودەی لە باوکیەوە دەگێڕایەوە.[4]

کوڕێکی تریشی هەبوو بە ناوی سولەیمان کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە.[5]

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی کرد بەرەو مەدینە، دای بە ناو ناوچەکەی ئەم هاوەڵەدا کە نزیکەی هەشتا ماڵ دەبوون، پێغەمبەر(ﷺ) بانگهێشتی کردن بۆ ئیسلام، لەوێ بورەیدەی کوڕی حوصەیب و ئەوانەشی لەگەڵی بوون کە نزیکەی هەشتا ماڵ دەبوون موسڵمان بوون، پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی خەوتنانی بۆ کردن و ئەوانیش لە دوایەوە نوێژیان کرد، پاش ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) چوو پاش ماوەیەکی زۆر و دوای جەنگی ئوحود بورەیدە چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و لەوێ لەگەڵیدا بوو و بەشداری غەزاکانی دەکرد، هەروەها لە ڕێککەوتنی حودەیبیەو بەیعەتی ڕیضواندا بەشدار بوو.[6]

---

[1] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٥٠، أسد الغابة، ج١، ص٢٥٦.
[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص٢٤١، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٨٦.
[3] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٨٥، أسد الغابة، ج١، ص٢٦٣.
[4] أسد الغابة، ج١، ص٢٦٣.
[5] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص٢٢١.
[6] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص٢٤٢، أسد الغابة، ج١، ص٢٦٣.

ئەو بەرنوێژیەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ ئەو هەشتا ماڵە لە نوێژی عیشادا بوو، بورەیدەش هەر لەو شەوەدا برێک لە قورئانی پیرۆز فێر بوو.[1]

لە غەزای مورەیسیعدا پێغەمبەر(ﷺ) بورەیدەی نارد تا هەواڵی دوژمنانی بۆ وەربگرێت، ئەویش هەواڵی بۆ وەرگرت و گەڕایەوە... دواتر پێغەمبەر(ﷺ) هێرشی بردە سەریان و ژمارەیەکی زۆری لێ کوشتن و زۆرێکی لێ بەدیل گرتن و بورەیدەی راسپارد تا ئاگاداری دیلەکان بێت.[2]

لە موحەرەمی ساڵی نۆیەمی کۆچیدا پێغەمبەر(ﷺ) بورەیدەی کوڕی حوصەیبی نارد بۆ کۆکردنەوەی صەدەقەی ئەسلەم و غیفار.[3]

هەروەها لە فەتحی مەککەدا پێغەمبەر(ﷺ) ئالآیەکی دایە دەست بورەیدەی کوڕی حوصەیب، لە غەزای تەبووکیشدا بۆ خۆئامادەکردن بۆ ئەو غەزایە پێغەمبەر(ﷺ) بورەیدەی نارد بۆ لای ئەسلەم تا پێیان بڵێت لە غەزادا بەشداری بکەن.[4]

بورەیدە هەر لە مەدینە مایەوەو لەوێ نیشتەجێ بوو، دوای سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) چوو بۆ بەصرەو لەوێ مایەوە، دواتریش لەوێ دانەنیشت و بۆ جیهادی رێی خوا رووەو خوراسان چوو و دواجار لە ناوچەی مەرو نیشتەجێ بوو و لەوێ مایەوە تا لەوێ کۆچی دوایی کرد و لەوێیش ئەسپەردە کرا و کوڕەکەشی هەر لەوێ لە مەروو مایەوە.[5]

عەبدولآی کوڕی فەرموودەیەکی لە بورەیدەی باوکیەوە گێڕاوەتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی (**ما من أحد من أصحابي يموت بأرض إلا بعث قائدا ونورا لهم يوم القيامة**)،[6] (هەر هاوەڵێکم لە خاکێکدا بمرێت ئەوا کاتێک رۆژی دوایی

[1] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ١٨٥.

[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص٦٣-٦٤.

[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص١٦٠.

[4] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص٢٤٢.

[5] أسد الغابة، ج١، ص٢٦٣.

[6] جامع الترمذي - أبواب المناقب عن رسول الله(ﷺ) - باب فيمن سب أصحاب النبي(ﷺ)، الرقم ٣٨٦٥ وقال حديث غريب، ضعفه الألباني في السلسلة الضعيفة، الرقم ٤٤٦٨.

زیندوو دەکرێتەوە وەک سەرکردەو رووناکیە بۆ خەڵکی ئەو شوێنە).

فەرموودەیەکی تر لە بورەیدەوە گێردراوەتەوە کە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) بە من و حەکەمی غیفاری فەرمووو (أنتما عينان لأهل المشرق، وبكما يحشر أهل المشرق)، (ئێوە ئەو دوانەتان چاوی خەڵکی رۆژهەڵاتن و خەڵکەکەی بە ئێوەوە حەشر دەکرێن)، ئەوەبوو هەردووکیان چوونە ناوچەی مەرو و لەوێیش کۆچی دواییان کرد.[1]

بورەیدە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) عەلی کوڕی ئەبووطالیبی نارد بۆ لای خالیدی کوڕی وەلید تا پێنج یەکی دەستکەوت دابەش بکات، کە بەیانی بوویەوە عەلی ئاو لەسەری دەچۆڕا، خالید بە بورەیدەی وت: دەبینیت (عەلی) چی دەکات یان دەبینیت چی کردووە؟ بورەیدە دەڵێت: منیش رقم بوو لە عەلی، کاتێک گەڕامەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵم پێدا عەلی چی کردووە، ئەویش فەرمووی: ئەی بورەیدە ئایا تۆ رقتە لە عەلی؟ وتم: بەڵێ، فەرمووی: رقت لێی نەبێت.[2]

لە گێڕانەوەکەی ئیمامی بوخاریدا وا هاتووە کە بورەیدە بە خالیدی وت: نابینیت چی کردووە؟ جا کە گەڕاینەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەم بۆ باسکرد، ئەویش فەرمووی: ئەی بورەیدە ئایا رقتە لە عەلی؟ وتم: بەڵێ، فەرمووی: رقت نەبێت لێی چونکە لە پێنج یەکدا بەشی لەوە زیاتریشی بۆ هەیە).[3]

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە بورەیدە دەڵێت: هێندە رقم لە عەلی بوو کەسی تر نەبوو هێندە رقم لێی بێت، تەنانەت پیاوێک هەبوو لە مەککە بەس لەبەرئەوە خۆشم دەویست کە رقی بوو لە عەلی، جا لە سوپایەکدا هاودەمی ئەو پیاوەم کرد بەس تەنها لەبەرئەوەی کە رقی بوو لە عەلی، ئەوەبوو

[1] مختصر تاريخ دمشق لابن منظور، ج٢، ص١٧٥، أسد الغابة، ج١، ص٢٦٤.

[2] فضائل الصحابة لأحمد بن حنبل، الرقم ١١٣٥، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١١٧٥، أسد الغابة، ج١، ص ٢٦٤.

[3] صحيح البخاري – كتاب المغازي – باب بعث علي بن أبي طالب وخالد بن الوليد إلى اليمن، الرقم ٤٣٥٠.

بڕێ دەستکەوتمان دەستکەوت، ئەو کەسە هەواڵی نارد بۆ پێغەمبەر(ﷺ) کەسێک بنێرە تا پێنج یەکەکەی دابەش بکات، پێغەمبەریش(ﷺ) عەلی نارد، لە دیلە ئافرەتیەکاندا ئافرەتێک هەبوو کە لە هەموویان جوانتر بوو، عەلی ئەوەی لە پێنج یەکەکە دانا و دابەشی کرد، دواتر هاتەدەر و سەری ئاوی لێدەچۆڕا، وتمان: ئەی ئەبولحەسەن ئەوە چیە؟ وتی: وەصیفە (ئافرەتەکە) نابینن کە لە کەنیزەکەکان بوو، من دابەشم کرد و بەر پێنج یەکەکە کەوت، دواتر بوو بە بەشی ئالوبەیتی پێغەمبەر(ﷺ) و دواتر بوو بە بەشی بنەماڵەی عەلی و منیش چوومە لای، پیاوە سەرکردەکە نامەی نووسی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و منیش وتم: من وەک نێردراو و پشت راست بنێرە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، کە نامەکەم دەخوێندەوەو دەموت راستی نووسیوە، پێغەمبەریش(ﷺ) دەستی گرتم و نامەکەشی گرتە دەستی و فەرمووی: ئایا رقتە لە عەلی؟ وتم: بەڵێ، فەرمووی: (دەی رقت لێی نەبێت، ئەگەریش خۆشت دەوێت زیاتر خۆشت بوێت، دە سوێند بەوەی گیانی موحەممەدی بەدەستە پشکی بنەماڵەی عەلی لە پێنج یەکدا باشتر و زیاترە لە وەصیفە)، بورەیدە دەڵێت: سوێند بەخوا دوای ئەو فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) کەس نەبوو هێندەی عەلی لام خۆشەویست بێت.[1]

دوای ئەوە لە ساڵی دەی کۆچیدا پێغەمبەر(ﷺ) عەلی کوڕی ئەبووطالیبی نارد بۆ یەمەن و سوپایەکی لەگەڵدا نارد، لەناو سوپاکەشدا بورەیدەی کوڕی حوصەیب بەشدار بوو، فەرمانی پێکرد نەجەنگێت تا ئەوان دەست پێ نەکەن، جەنگ روویدا و موسڵمانان سەرکەوتن و عەلی کوڕی ئەبووطالیب بورەیدەی کوڕی حوصەیبی لای غەنیمەو دەستکەوتەکان دانا.[2]

بورەیدە دەڵێت: لەو چوونەماندا بۆ یەمەن رەقی و توندیەکم لە عەلیدا

[1] السنن الكبرى للنسائي - كتاب الخصائص - الترغيب في حب علي وذكر دعاء النبي لمن أحبه ودعاءه على من أبغضه، الرقم ٨٤٢٨.

[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص١٦٩.

بەدیکرد، بۆیە کە هاتمەوە لای پێغەمبەر(ﷺ) کەوتمە رەخنەگرتن لە عەلی، بینیم دەموچاوی پێغەمبەر(ﷺ) گۆڕا و رەنگی تێکچوو، ئینجا فەرمووی: (یا بريدة ألست أولى بالمؤمنين من أنفسهم)، (ئەی بورەیدە ئایا من بۆ باوەڕداران لەخۆیان لەپێشتر نیم؟) وتم: با ئەی پێغەمبەر(ﷺ)، فەرمووی: (من كنت مولاه فعلي مولاه)،[1] (دەی من مەولای هەر کەس بم عەلیش مەولایەتی).

بورەیدە دەڵێت: گەمارۆی خەیبەرمان دا، پێغەمبەر(ﷺ) ئاڵاکەی دایە دەست ئەبووبەکر کەچی بۆی فەتح نەکرا، دواتر دایە دەست عومەر ئەویش بۆی فەتح نەکرا، موسڵمانان زۆر ماندوو بوون، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بەیانی ئاڵاکە دەدەمە دەست پیاوێک کە خواو پێغەمبەری خوا خۆشیان دەوێت و ئەویش خوا و پێغەمبەری خوای خۆش دەوێت، ناگەڕێتەوە تا بۆی فەتح دەبێت)، ئیتر بێخەم شەومان بەسەربرد، بەیانی زوو کە پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی کرد دوای نوێژەکە داوای ئاڵاکەی کرد و خەڵکی ریزیان بەست، پێغەمبەر(ﷺ) عەلی کوڕی ئەبووطالیبی بانگ کرد و ئەویش ئازاری چاوی هەبوو، پێغەمبەر(ﷺ) تفی دا لە چاوانی و دواتر ئاڵاکەی دایە دەستی، ئەوەبوو خوای گەورە فەتحی پێ بەخشی.[2]

هەروەها بوریدە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا(ﷺ)لەو سوپایەدا بەشداری کرد کە پێغەمبەر(ﷺ) رێکیخست و ئوسامەی کوڕی زەیدی کردە سەرکردەی سوپاکە، تیایدا بورەیدە ئاڵاکەی بەدەستەوە بوو،[3] دواتر کە زانرا پێغەمبەر(ﷺ) نەخۆشە، بورەیدە ئاڵاکەی ئوسامەی کوڕی زەیدی هێنا و لەبەردەم ماڵی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) دایکوتا، دواتر کە بەیعەت درا بە ئەبووبەکری صدیق خەلیفە فەرمانی کرد بە بورەیدەی کوڕی حوصەیب تا ئاڵاکە هەڵگرێت و بیبات بۆ ماڵی ئوسامەی کوڕی زەید، ئەویش ئاڵاکەی

[1] السنن الكبرى للنسائي - كتاب المناقب - فضائل علي(ﷺ)، الرقم ٨١٠٨، صححه الألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة، ٣٣٦/٤.

[2] البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص٣٣٨.

[3] تاريخ الإسلام للذهبي، ج٢، ص٧١٣.

برد بۆ سەربازگەی یەکەمی موسڵمانان کە ئوسامەی کوڕی زەیدی لێ بوو، هەرچەندە کاتی هەڵگەڕانەوەی عەرەبەکان بوو و هەوڵ درا ئەبووبەکر رازی بکرێت تا ئوسامەی کوڕی زەید بەو سوپایەوە نەنێرێت، بەڵام ئەبووبەکر رازی نەبوو سوپایەک بوەستێنێت کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کردبوو بە رۆیشتنی، ئەوەبوو سوپاکە چوو و سەرکەوت و دواتر بورەیدە بە ئاڵاکەوە گەڕایەوە بۆ مەدینەو ئاڵاکەی بەرەو مزگەوت برد و چوویە ژوورەوەو دوو رکات نوێژی کرد، ئینجا بەرەو ماڵی خۆی گەڕایەوە.[1]

لە سەردەمی خیلافەتی عوثمانی کوڕی عەففاندا بورەیدەی کوڕی حوصەیب رووەو خوراسان چوو بۆ غەزا و لەوێ لە مەروو مایەوە تا لە سەردەمی یەزیدی کوڕی موعاویەدا لەوێ کۆچی دوایی کرد.[2]

پیاوێک لە هۆزی بەکری کوڕی وائیل باس لەوە دەکات کە لە سجستان بورەیدەی کوڕی حوصەیبی بینیوە، دەڵێت: ویستم رای ئەو سەبارەت بە عوثمانی کوڕی عەففان و عەلی کوڕی ئەبووطالیب و طەلحە و زوبەیر بزانم، کەوتمە قسەکردن لەسەریان و بە خراپە ناوبردنیان، ئەویش روویکردە قیبلە و دەستەکانی بەرز کردەوەو وتی: خوایە لە عوثمانی کوڕی عەففان خۆش بە، خوایە لە عەلی کوڕی ئەبووطالیب خۆش بە، خوایە لە طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵا خۆش بە، خوایە لە زوبەیری کوڕی عەوام خۆش بە، کابرا دەڵێت: پاشان بورەیدە روویکردە من و وتی: بێ باوک بکەویت دەتەوێت بمکوژیت، منیش وتم: ناوەڵا کوشتنی تۆم ناوێت بەڵکو ئا ئەم قسانەم لە تۆ دەویست، بورەیدە وتی: ئەوانە خەڵکانێک بوون هەندێ شتیان کرد، ئەگەر خوا بیەوێت بە هۆی چاکەی پێشینیانەوە لێیان خۆش دەبێت، ئەگەریش بیەوێت لەسەر کارەکانیان سزایان دەدات، حیسابیان لای خوایە.[3]

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص١٩٠-١٩١.

[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص٨، تاريخ الإسلام للذهبي، ج٥، ص٧٧.

[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص٢٤٣.

بورەیدەی کوڕی حوصەیب لە ساڵی شەست و دووی کۆچیدا وەفاتی کرد.[1]

ذەهەبی دەڵێت: سەدو پەنجا فەرموودە لە بورەیدەی کوڕی حوصەیبەوە گێڕدراوەتەوە.[2]

گۆڕەکەی هەریەک لە بورەیدەو حەکەمی کوڕی عەمر لە مەروو لەپاڵ یەکدا بوو.[3]

**پەند و وانە:**

ئەرکی سەرشانی موسڵمانە زۆر ئاگادار بێت لە قۆستنەوەی دەرفەتدا، دەبینین لە ماوەی یەک شەوی مانەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لای بورەیدە و یارانی، خێرا بورەیدە دەرفەت دێنێ و لەوێ بڕێک لە قورئانی پیرۆز فێر دەبێت و لەبەری دەکات، ئەم حاڵەتە لە ژیانی چەندین هاوەڵی تردا بەدی دەکەین کاتێک وەک وەفد هاتوونەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و ساتێک یان رۆژێک یان چەند رۆژێک لە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) ماونەتەوە، هێندە زانیاری و ئامۆژگارییان وەرگرتووە کە بەشی توێشووی قیامەتیان بکات، بەڵام ئەوەی گرنگە ئەوان لەو وەرگرتنەدا مەبەستیان پەیڕەوکردن بوو، کەچی لەمڕۆدا موسڵمان بە دەیان کتێب و سەد هێندەی بڕێک لە هاوەڵان زانیارییان وەرگرتووە، کەچی لە پەیڕەودا لاواز و پەککەوتەن، هەر بۆیە ناتوانن ئەو نموونە باڵایە دووبارە بکەنەوە کە هاوەڵان پێشکەشیان کرد.

لە خوێندنەوەی ژیانی ئەم هاوەڵەوە بەڵگەیەکی تری مرۆیی بوونی هاوەڵان و پەیڕەوی مرۆیی بوونیان بەدی دەکەین، چونکە ئەو روانینە هەڵەیە لای بڕێک لە موسڵمانان دروست بووە کە ئەگەرچی بە زمان دان

---

[1] تاريخ الإسلام للذهبي، ج٥، ص٢٢، شذرات الذهب لابن العماد الحنبلي، ج١، ص٧٠.

[2] تاريخ الإسلام للذهبي، ج٥، ص٧٧.

[3] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٢٥٦.

دەنێن بە مرۆیی بوونیاندا کەچی لە پەیڕەودا وەک مرۆڤ ناڕواننە هاوەڵان، بەڵام لە راستیدا ژیانی هاوەڵان ژیانێکی مرۆییە لە پلەیەکی بەرزی پەیڕەوی دروستدا و هەڵەو کەموکورتیشیان هەبووە، دەبینین بورەیدە کە هاوەڵێکی نزیکی پێغەمبەر(ﷺ) بووەو پێغەمبەر(ﷺ) هێندە متمانەی پێ بووەو لێی رابینیوە ناردوویەتی بۆ ئەرکە گرنگەکانی وەک کۆکردنەوەی صەدەقە و بانگکردنی هۆزەکان بۆ جیهاد و دانەدەستی ئاڵای جیهادی سوپای ئوسامەی کوڕی زەید و چەندین کاری تر، کەچی ئەم هاوەڵە رقێکی زۆری هەیە لە عەلی کوڕی ئەبووطالیب، ئەو عەلیەی کە ئامۆزاو زاوای پێغەمبەر(ﷺ) و مژدەپێدراوی بەهەشت و یەکێک لە موسڵمانە یەکەمینەکان بوو، ئەو رق و کینەشی تا ماوەیەکی زۆر مایەوە.

لە ژیانی ئەم هاوەڵەوە نەرمونیانی پێغەمبەر(ﷺ) و رەچاوکردنی دەرونی مرۆیی دەوروبەرەکەی بەدیدەکەین، هەرچەندە بورەیدە رقی لە عەلی هەڵگرتبوو، کەچی پێغەمبەر(ﷺ) توندی بەرامبەر نانوێنێت و بە نەرمونیانی تێیدەگەیەنێت کە ئەو رق و کینەی بێ بنەما و ناڕەوایەو ستەمە بەرامبەر بە عەلی، هەر بۆیە کاتێک بورەیدە بە رەخنەوە باسی عەلی دەکات پێغەمبەر(ﷺ) تەواو پێی بێ تاقەت دەبێت و رەنگی دەگۆڕێت، بەڵام بە لەسەرخۆیی تێیدەگەیەنێت خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ) و عەلی گرێدراوە بە یەکەوە.

خۆشەویستی عەلی کوڕی ئەبووطالیب واجبێکی سەرشانی هەر موسڵمانێکە وەک چۆن پێغەمبەر(ﷺ) لەو فەرمووده صەحیحەدا ئاماژەی پێ داوە، هەروەک خۆشەویستی حەسەن و حوسەینی کوڕانی عەلیش واجبی هەر موسڵمانێکەو ئەوەی پێغەمبەری خوای(ﷺ) خۆش بوێت واجبە ئەوانیشی خۆش بوێت، پێغەمبەری خواش(ﷺ) داوای لە خوا کردووە دوژمنایەتی دوژمنانیان بکات.

دەم گرتنەوە لە فیتنەی نێوان هاوەڵان سیفەتێکی دیاری ناو مێژووی زانایان بووە، هەروەک بورەیدەی هاوەڵی پێغەمبەریش(ﷺ) هەمان هەنگاوی ناوەو لەئاست پێکان و نەپێکانی ئیجتیهادی هاوەڵاندا بێدەنگ بووەو نزای خێری کردووە بۆیان، بەداخەوە موسڵمانانێکی ئەمڕۆ بە بیانووی نەترسی و یەکلاکردنەوەی پرسە هەستیارەکانی ناو مێژووی ئیسلامی دەکەونە قسەکردن لەسەر هاوەڵان و سنووری ڕەوایی دەبەزێنن.

حەزو تاسەی موسڵمان بۆ بەشداری لە غەزاو جیهادی ڕێی خوادا واجبە، ئەوەی سەبارەت بە جیهاد لەسەرشانی موسڵمانە بریتیە لە حەزی جیهادی و شارەزایی فیقهی جیهاد و پەیڕەوی جیهادی، جا مەسەلەی حەزو تاسەی جیهادی فەرزی هەمیشەیی سەرشانی هەموو موسڵمانێکەو وەک پەیڕەوی جیهادی نیە کە هەندێ جار فەرزی عەینەو هەندێ جار فەرزی کیفایەیە، چونکە ڕۆحیەتی جیهادی لە ناخی موسڵماندا بنەرەتێکی فەرامۆش نەکراوە، وەک دەبینین پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت (من مات ولم يغز ولم يحدث به نفسه مات على شعبة من نفاق)،[1] (هەرکەس بمرێت و غەزای نەکردبێت و لە دەروونیشیدا ئامادەیی نەبووبێت ڕۆژێک لە ڕۆژان غەزا بکات ئەوە لەسەر لقێکی دووڕوویی مردووە).

## ٤٤١. بورەیدی ئەسلەمی(ﷺ)

ناوی بورەیدەیە و لە ئەسلەمیەکانە، یەکێک بوو لەو هاوەڵانەی لە جەنگی صفیندا بەشداری کرد و لە ناو سوپای عەلی کوڕی ئەبووطالیبدا بوو و لەو جەنگەشدا کوژرا.[2]

[1] صحيح مسلم – كتاب الإمارة – باب ذم من مات ولم يغز ولم يحدث نفسه بالغزو، الرقم ١٩١٠.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٨٦.

## ٤٤٢. بورز(رضي الله عنه)

ئەم هاوەڵە باوکی ئەبوو زجائی عەطاردیە، هەندێ دەڵێن ناوی تیمە، وەک وەفد هاتوەتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ).[١]

## ٤٤٣. بورزی باوکی ئەبولعشرا(رضي الله عنه)

سەبارەت بە ناوی ئەم هاوەڵە چەند رایەک هەیە، لەوانە بورز و بلز و مالیک،[٢] رای راستتریش ئەوەیە ناوی مالیکە، ئەبولعشرای کوڕی فەرموودەی لێوە گێڕاوەتەوە.[٣]

## ٤٤٤. بوسری کوڕی جیحاش(رضي الله عنه)

ناوی بوسری کوڕی جیحاشی قورەیشیە،[٤] لە شام نیشتەجێ بوو، دواجاریش لە حیمص کۆچی دوایی کرد.[٥]

بوسری کوڕی جیحاش دەڵێت: رۆژێک پێغەمبەر(ﷺ) (بەڵغەمێکی) کردە سەر دەستی و دواتر پەنجەی شایەتومانی خستە سەری، ئینجا فەرمووی: (يقول الله عز وجل: أنى تعجزني ابن آدم وقد خلقتك مِن مثل هذه، فإذا بلغت نفسك هذه قلت أتصدق، وأنى أوان الصدقة)، (خوای گەورە دەفەرموێت ئەی ئادەمیزاد چۆن لەدەستم دەردەچیت لەکاتێکدا من لە شتێکی وا دروستم کردویت، کاتێک گیانت گەیشتە ئەوێت-ئاماژەی کرد بۆ قورقوڕاگەی- ئینجا دەڵێیت چاکە دەکەم، ئەوکات کەی کاتی چاکەکردنە؟).[٦]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٨٥.

[٢] أسد الغابة، ج١، ص ٢٦٣.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٨٥.

[٤] أسد الغابة، ج١، ص٢٧٠.

[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٢٩١.

[٦] سنن ابن ماجه - أبواب الوصايا - باب النهي عن الإمساك في الحياة والتبذير عند الموت، الرقم ٢٨٠٠، حسنه الألباني في صحيح و ضعيف سنن ابن ماجة، الرقم ٢٧٠٧.

ئەمە ئاماژەیە بەو ئایەتەی قورئان کە خوای گەورە حاڵی سەرەمەرگی کەسانی خراپ باس دەکات و دەفەرموێت (وأنفقوا مما رزقناكم من قبل أن يأتي أحدكم الموت فيقول رب لولا أخرتني إلى أجل قريب فأصدق وأكن من الصالحين)، (ببەخشن لەو رۆزیەی پێمان بەخشیون پێش ئەوەی هەرکامتان مەرگ پێی بگات ئیتر ئەوکات دەڵێت: خوایە بریا کەمێک مەرگت دوادەخستم تا چاکەبکەم و خێرو بەخشین بکەم و لە پیاوچاکان بم).

بەراستی مرۆڤ لە ئاست مەرگدا بەرچاو قایمە و ترسی نیە لەوەی کت و پڕ مەرگ بێت و بەری پێ بگرێت، بۆیە چاکەی بیرچوەتەوە تا ئەو کاتەی مەرگ دێت، ئینجا رادەچڵەکێت و ئاواتەخواز دەبێت وادەی مەرگی کەمێک دوابکەوێت تا دەست بکات بە خێر و چاکەکردن، بۆ چارەسەری ئەم دەردە پێغەمبەر(ﷺ) هانمان دەدات زۆر بیری مەرگ بکەین تا لە ئاست ئارەزووبازی دنیادا سەرکەوتوو بین وەک دەفەرموێت (أكثروا من ذكر هادم اللذات)،[1] (زۆر بیری لەناوبەری چێژەکان بکەن) واتە مەرگ کە تاسەی راکەڕاک بەدوای ئارەزووەکاندا ناهێڵێت و سنوورێک بۆ ئارەزووبازی دادەنێت.

## ٤٤٥. بوسری کوڕی سوفیان(رضي الله عنه)

ناوی بوسری کوڕی سوفیانی کوڕی عەمری کوڕی عوەیمرە، ئەم هاوەڵە لە خوزاعیەکانە، یەکێک بوو لە گەورە و خانەدانەکان.[2]

دەوترێت بوسری کوڕی سوفیان لە ساڵی شەشەمی کۆچیدا موسڵمان بووە.[3]

بوسری کوڕی سوفیان وەک هەواڵگری پێغەمبەری خوا(ﷺ) چوو بۆ

[1] جامع الترمذي - أبواب صفة القيامة والرقائق والورع عن رسول الله(ﷺ)، الرقم ٢٤٦٠، صححه الألباني في إرواء الغليل، الرقم ٦٨٢.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٩٢.

[3] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٥١.

مەککە،[1] هەروەک لە ڕێککەوتنی حودەیبییەدا هەواڵی قورەیشییەکانی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) وەرگرت.[2]

پێغەمبەر(ﷺ) نامەیەکی نارد بۆ خوزاعەو تیایدا هەریەک لە بودەیل و بیشر و سەرەواتی بە بەڕێزترینی خەڵکی تیهامە ناو بردووە، ئەمەش دەقی نامەکەیە (بسم الله الرحمن الرحيم، من محمد رسول الله إلى بديل وبشر وسروات بني عمرو، فإني أحمد إليكم الله الذي لا إله إلا هو، أما بعد فإني لم أثم بالكم ولم أضع في جنبكم، وإن أكرم أهل تهامة علي أنتم، وأقربهم رحما ومن تبعكم من المطيبين، وإني قد أخذت لمن هجر (يعني) هاجر منكم مثل ما أخذت لنفسي، ولو هجر (هكذا أملى علينا وإنما هي هاجر) بأرضه غير سكن (يريد ساكن مكة) إلا معتمرا أو حاجا، وإن لم أضع فيكم إذا سلمت وإنكم غير خائفين من قبلي ولا محصرين، أما بعد فإنه قد أسلم علقمة بن علاثة وابنا هوذة، وتبعا يعني : وبايعا وهجرا (يعني) وهاجرا على من تبعهم من عكرمة، وأخذ لمن تبعه منكم مثل ما أخذ لنفسه، وإن بعضنا من بعض أبدا في الحل والحرم، وإنني والله ما كذبتكم، وليحييكم ربكم)،[3] نامەکەش بە دەستنووسی عەلی کوڕی ئەبووطالیب نووسرابوو.[4]

لە ڕێککەوتنی حودەیبییەدا کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) ویستی بچێت بۆ عومرە و نیازی جەنگی نەبوو، کە گەیشتە عوسفان گەیشت بە بوسری کوڕی سوفیان، لەوێ بوسری کوڕی سوفیان هەواڵی پێدا چۆن قورەیش هاتوونەتە سەر ڕێی و ناهێڵن بچێت.[5]

لە فەتحی مەککەدا پێغەمبەر(ﷺ) هەریەک لە بودەیل و بوسری کوڕی سوفیانی نارد بۆ لای بەنی کەعب تا ئاگاداریان بکاتەوە بێن بۆ غەزای فەتحی مەککە.[6]

---

[1] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٥١.
[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص٩٥.
[3] أخبار مكة للفاكهي، الرقم ١٧٩٠.
[4] أسد الغابة، ج١، ص٢٥٦.
[5] أسد الغابة، ج٢، ص١٣٥، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٩٢.
[6] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٥١، أسد الغابة، ج١، ص٢٥٤.

## ٤٤٦. بوسری کوڕی سولەیمان(رضي الله عنه)

ناوی بوسری کوڕی سولەیمانە، کچێکی هەبوو بە ناوی سەعیە کە دەڵێت: بوسری باوکی دەیوت فەرمووودەم لە پێغەمبەر(ﷺ) بیستووەو لەدوایەوە نوێژم کردووە.[١]

## ٤٤٧. بوسری کوڕی عەبدورەحمان(رضي الله عنه)

ناوی بوسری کوڕی عەبدورەحمانی حەضرەمیە، دواتر لە حیمص نیشتەجێ بوو.[٢]

## ٤٤٨. بوسری کوڕی عصمە(رضي الله عنه)

ناوی بوسری کوڕی عصمەیە و لە موزەنیەکانە، یەکێک بوو لە گەورەکانی موزەینە، فەرموودەیەکی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە کە لە کتێبەکانی فەرموودەدا نەهاتووە، بەڵام ئیبن حەجەر لە (الإصابة) دا هێناویەتی، ئەویش لە ئەبووبیشری ئامەدیەوە کە دەڵێت: بوسر لە پێغەمبەری خوای(ﷺ) بیست دەیفەرموو (هەرکەس ئازاری جوهەینە بدات ئەوە ئازاری منی داوە).[٣]

## ٤٤٩. بوسری کوڕی ئەبووبوسر(رضي الله عنه)

ناوی بوسری کوڕی ئەبووبوسری مازنیە، کوڕێکی هەبوو بە ناوی عەبدوڵا کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوەو هاوەڵی پێغەمبەری خوایش(ﷺ) بووە.[٤]

---

[١] أسد الغابة، ج١، ص٢٧٢.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٩٣.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٩٤.

[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٩٠.

عەبدولای کوڕی بوسر دەڵێت: ڕۆژێک پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ لای باوکم و لەوێ دانیشت، ئێمەش خواردنمان بۆ بردو لێی خوارد، پاشان خورما هێنرا و پێغەمبەر(ﷺ) لە خورماکەی دەخوارد و ناوکەکەی دەخستە نێوان پەنجەی شایەتومانی و پەنجەی ناوەڕاستی، پاشان خواردنەوە هێنرا-ئاو یان شیر- خواردیەوە، ئینجا دای بەو کەسەی کە لەلای ڕاستیەوە بوو، ئینجا باوکم ڕەشۆی وڵاخەکەی گرت و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) نزامان بۆ بکە، ئەویش فەرمووی: (خوایە بەرەکەت بخەرە ئەو ڕۆزیەی پێت بەخشیون و لێیان خۆش بە و ڕەحمیان پێ بکە).[1]

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: ناوکی خورماکانی دەخستە سەر دوو پەنجەی شایەتومان و ناوەڕاستی، ئینجا خورماکەی دەوەشاند.[2]

هەروەها لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە عەبدولای کوڕی بوسر دەڵێت: باوکم بە دایکمی وت: بەڵکو خواردنێک ئامادە بکەیت بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش تریتێکی-تشریب- ئامادە کرد، باوکم چوو پێغەمبەری خوای(ﷺ) بانگهێشت کرد، پێغەمبەر(ﷺ) دەستی خستە سەری و فەرمووی: بەناوی خواوە لێی نەون-لێی بخۆن-، هەموان لەلای خۆیانەوە لێیان دەخوارد، ئینجا پێغەمبەری خوا(ﷺ) نزای کرد بۆیان و فەرمووی: (خوایە لێیان خۆش بە و ڕەحمیان پێ بکە و بەرەکەت بخەرە رزقیانەوە).[3]

## ٤٥٠. بوهەیری حارثی(رضي الله عنه)

ناوی بوهەیر یان نوهەیرە، کونیەکەی ئەبولهەیثەمە، لە پشتیوانانە.

بوهەیر یەکێک بوو لە بەشداربوانی بەیعەتی عەقەبە و غەزای ئوحودیشدا بەشداری کرد.[4]

[1] صحيح مسلم - كتاب الأشربة - باب استحباب وضع النوى خارج التمر، الرقم ٢٠٤٢.

[2] صحيح ابن حبان - كتاب الأطعمة - باب الضيافة - ذكر ما يدعو الضيف لمن أكل من طعامهم، الرقم ٥٢٩٧.

[3] مسند الدارمي - كتاب الأطعمة - باب الدعاء لصاحب الطعام إذا أطعم، الرقم ٢٠٦٥.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٣١.

## ٤٥١. بوهەیسی کوڕی سەلما(ﷺ)

ناوی بوهەیسی کوڕی سەلمای تەمیمیە، فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوە و دەڵێت: بیستم لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیفەرموو (لا یحل لمسلم من مال أخیه الا ما أعطاه عن طیب نفس منه)، (سامانی موسڵمان بۆ براکەی حەڵاڵ نیە مەگەر ئەوەی بە دڵی خۆی و بە ڕەزامەندی پێی ببەخشێت).[1]

## ٤٥٢. بوهلوولی کوڕی ذوئەیب(ﷺ)

ناوی لە بەسەرهاتێکدا هاتووە کە سەنەدەکەی ناپەیوەستە (غیر متصل)، جارێک موعاذی کوڕی جەبەل هاتە ژوورەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) و زۆر بە سەختی دەگریا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی موعاذ ئەوە بۆچی دەگریت؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) گەنجێکی کەشخەی جل و بەرگ پاک لەبەردەرگایە و چۆن دایکێکی جگەرسووتاو بۆ جگەرگۆشەکەی دەگری، ئاوا بۆ گەنجیەکەی دەگری، دەیەوێت بێتەژوورەوە بۆ لای تۆ، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ئەی موعاذ گەنجەکە بێنەرە ژوورەوەو لەبەر دەرگا مەیوەستێنە، موعاذیش گەنجەکەی هێنایە ژوورەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەی گەنج بۆچی دەگریت)، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) چۆن نەگریم لەکاتێکدا هێندە تاوانم کردووە ئەگەر تەنها بە هەندێکیان سزا بدرێم ئەوا بە هەتایی لە دۆزەخدا دەمهێڵنەوە، دەشبینم ئەو تاوانانەم لەسەر حسابن و دەمبەنە دۆزەخ.. دواتر گەنجەکە بە گریانەوە چوو تا چوویە لای شاخێکی مەدینە، خۆی ون کرد و بە زنجیر دەست و گەردنی پێکەوە بەستەوەو هاواری دەکرد خوایە ئەی مەولا و گەورەم ئەوە بوهلوولی کوڕی ذوئەیبە بە دەستبەستراوی و کۆت کراوی، دان دەنێت بە تاوانەکانیدا).[2]

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص ٣١٢، الإصابة في تمییز الصحابة، ج١، ص ٣٣١.

[2] أسد الغابة، ج١، ص ٣١١، الإصابة في تمییز الصحابة، ج١، ص ٣٣١.

## ٤٥٣. بیرحی کوڕی عوسکر(ﷺ)

ناوی بیرحی کوڕی عوسکری کوڕی وەتتارە،[١] وەک وەفد هاتوەتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ).[٢]

لە فەتحی میصردا بەشداری کرد و لەوێیش مایەوە.[٣]

## ٤٥٤. بیشری سولەمی(ﷺ)

بیشری سولەمی کوڕێکی هەبوو بە ناوی رافیع[٤] کە فەرموودەیەکی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی (یوشك أن تخرج نار من حبس، تسير سير بطيئة الإبل تسير النهار وتقيم الليل تغدو وتروح يقال غدت النار أيها الناس فاغدوا قالت النار أيها الناس فأقيلوا راحت النار أيها الناس فروحوا من أدركته أكلته)،[٥] (زۆری نەماوە لە حوبس ئاگرێک دەربچێت کە وەک رۆیشتنی خاوترین وشتر دەڕوات، رۆژ دەڕوات و شەو دەمێنێتەوە، بەیانی و ئێوارە ڕێ دەکات، دەوترێت ئەی خەڵکینە وا بەم بەرەبەیانە ئاگر رێ دەکات دەی ئێوەش بڕۆن، ئەی خەڵکینە وا ئاگر قەیلوولە (سەرخەوی پێش نیوەڕۆ) دەکات دەی ئێوەش قەیلوولە بکەن، ئەی خەڵکینە وا بە ئێوارەو شەو ئاگرەکە رێ دەکات، دەی ئێوەش رێ ببڕن و بڕۆن، ئەو ئاگرە بگات بە هەر کەس دەیخوات).

(حوبس) یان (حەبس سەیل) کە لە گێڕانەوەی تردا هاتووە ناوی شوێنێکە، جا بەپێی دوو گێڕانەوە دەتوانین دیاری بکەین ئەو شوێنە کوێ دەکات، لە گێڕانەوەیەکدا کە لە (المستدرک علی الصحیحین) هاتووە پێغەمبەری

---

[١] أسد الغابة، ج١، ص٢٦٢.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٨٣.

[٣] أسد الغابة، ج١، ص٢٦٢.

[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٠٨.

[٥] مسند أحمد بن حنبل - مسند المكيين(ﷺ) - حديث بشر أو بسر عن النبي(ﷺ)، الرقم ١٥٨٩٨، و قال شعيب الأرناؤوط رافع بن بشر من رجال التعجيل.

خودا(ﷺ) ئاماژەی داوە بە حەبس سەیل کە ئاگرێکی لێدەکەوێتەوە گەردنی وشتر لە بوصرا رووناک دەکاتەوە،[1] لە گێڕانەوەیەکی تریشدا سەبارەت بەو ئاگرەی گەردنی وشتر لە بوصرا رووناک دەکاتەوە هاتووە لە حیجاز ئاگرێک دەکەوێتەوە کە گەردنی وشتر لە بوصرا رووناک دەکاتەوە.[2]

بەم پێیە ئەو ناوچەیە کە ئاگرەکەی لێ دێتەدەر لە خاکی حیجاز (شانشینی سعوودیەی ئەمڕۆ) دەبێت و ناوچەکەش ناوی حەبس سەیلە.

## ٤٥٥. بیشری کوڕی بەراء(ﷺ)

ناوی بیشری کوڕی بەرائی کوڕی مەعروری صەخری کوڕی خەنسائی کوڕی سینانە،[3] لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان.[4]

بەرائی باوکی یەکێک بوو لە هاوەڵە دیارو نزیکەکانی پێغەمبەر(ﷺ) کە پێشتر باسمان کردووە.

دایکی ناوی خلیسەی کچی قەیسە.[5]

بیشر برایەکی هەبوو بە ناوی موبەشیر[6] کە بەشداربوو لە حودەیبیە و بەیعەتی ریضواندا.[7]

خوشکێکیشی هەبوو بە ناوی ئوم بیشر یان ئوم ئەنەس کە فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە.[8]

خوشکێکی تریشی هەبوو بە ناوی هیند کە ژنی جابری کوڕی عەتیک بوو.[9]

---

[1] المستدرک علی الصحیحین، الرقم ٨٤٣٤.

[2] صحیح البخاري - کتاب الفتن - باب خروج النار، الرقم ٧١١٨.

[3] الطبقات الکبری لابن سعد، ج٣، ص٥٧٠.

[4] الإستیعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٦٧.

[5] الإصابة في تمییز الصحابة، ج٧، ص٦١٠.

[6] الإصابة في تمییز الصحابة، ج٥، ص٧٦٢.

[7] أسد الغابة، ج٥، ص٥٩.

[8] أسد الغابة، ج٧، ص٣٢٤.

[9] الإصابة في تمییز الصحابة، ج٨، ص١٥٠.

خوشـکێکی تریشـی هەبـوو بـە نـاوی ڕەبـاب کـە بەیعەتـی داوە بـە پێغەمبـەر (ﷺ).[١]

خوشکێکی تری ناوی ظەبیە بوو کە ژنی ئەبووقەتادەی ئەنصاری بوو،[٢] یان دەوترێت ناوی سەلافە بووە.[٣]

بیشری کوڕی بەرائی ئەنصاری لەگەڵ باوکیدا بەشدار بوو لە بەیعەتی عەقەبـەدا.[٤]

بیشر تیرهاوێژی نزیک لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو.[٥]

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) برایەتی خستە نێوان کۆچەران و پشتیوانان، برایەتی خستە نێوان واقیدی کوڕی عەبدوڵا و بیشری کوڕی بەرائەوە.[٦]

بیشـر لـە جەنگی بـەدر و ئوحـود و خەندەقیشـدا بەشـداری کـرد،[٧] لـە ڕێککەوتنـی حودەیبیەشـدا بەشـدار بـوو.[٨]

بیشـر یەکێـک بـوو لـە پیاوماقـووڵ و کەسـە دیارەکانـی نـاو هۆزەکـەی،[٩] فەرموودەیەکیشـی لەسـەرە کـە پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) بـە بەنـی سـولەیمی- بەنی عوبەیـد- فەرمـوو گەورەتـان کێیـە؟ وتیـان جـەددی کـوڕی قەیسـە، بـەڵام پیسـکەییەکی تێدایـە، پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمـووی: (فأي داء أدوأ من البخل، بل سيدكم بشر بن البراء بن معرور)،[١٠] (جـا چ دەردێ خراپتـرە لـە بەخیلـی، بەڵکـو گـەورەی ئێـوە بیشـری کـوڕی بـەرائـی کـوڕی مەعـروورە).

---

[١] أسد الغابة، ج٧، ص١١٨.

[٢] أسد الغابة، ج٧، ص١٩٧.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص٧٠٢.

[٤] تأريخ الإسلام للذهبي، ج١، ص٣٠٦-٣٠٧.

[٥] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٥٧٠.

[٦] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٦٧، تأريخ الإسلام للذهبي، ج٣، ص٢٩٩.

[٧] البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص١٦٧.

[٨] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٥٧٠.

[٩] سير أعلام النبلاء للذهبي، ج١، ص٢٦٩.

[١٠] المستدرك على الصحيحين - كتاب معرفة الصحابة(رضي الله عنهم) - ذكر مناقب بشر بن البراء بن معرور(رضي الله عنه)، الرقم ٤٩٩٦، صححه ووافقه الذهبي على شرط مسلم.

لە جەنگی خەیبەردا کاتێک ئافرەتە جوولەکەکە گۆشتی بە دیاری هێنا بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و ژەهری پێوە کردبوو، بیشر لەو گۆشتەی خوارد و بەهۆی ئەو خواردنەوە مرد،[1] ئەوەبوو دوای مردنی بیشر پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد بە کوشتنی ئەو ژنە جوولەکە.[2]

بەسەرهاتی ئافرەتە جوولەکەکەش بەمجۆرە بوو: کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) فەتحی خەیبەری کرد و ژمارەیەکی زۆر لە جوولەکەکان کوژران، زەینەبی کچی حارث کە ئافرەتێکی جوولەکە بوو بەرخێکی برژاوی ژەهراوی بە دیاری هێنا بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، زۆربەی ژەهرەکەی لە باڵ و شانی بەرخەکەدا دانا چونکە بیستبووی پێغەمبەر(ﷺ) ئەو پارچەی بەرخی لە هەموو پارچەکانی تر لا بەچێژترە، کاتێک ئەو بەرخەی هێنا بیشری کوڕی بەرائی کوڕی مەعروور لای پێغەمبەر(ﷺ) بوو، پێغەمبەر(ﷺ) بەشێ لە شانی بەرخەکەی هەڵگرت تا بیخوات، بیشریش بەشێک لە گۆشتەکەی هەڵگرت، کە پێغەمبەر(ﷺ) پارووەکەی خوارد بیشریش پارووەکەی خوارد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: دەست هەڵگرن چونکە شانی ئەم بەرخە هەواڵم پێ دەدات چی پێدا کراوە، بیشر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) سوێند بەوەی ڕێزداری کردیت من ئەوەم لە خواردنەکەمدا بەدیکرد، بەڵام تەنها لەبەر گەورەیی و ڕێزی تۆ نەمتفاندەوە چونکە حەزم نەکرد خواردنەکەت لا بێزراو بکەم، کاتێک بینیم پاروەکەت خوارد خۆم لە تۆ لا لەپێشتر نەبوو و حەزم نەکرد جیا لە تۆ خۆم ڕزگار بکەم، بۆیە هیوام وابوو ئەوەی خواردت ژەهراوی نەبێت، بیشر هەر لەو شوێنەیدا ڕەنگی تێکچوو و مرد، پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە پشتی شانیەوە کەڵەشاخی گرت،[3] پێغەمبەری خوایش(ﷺ) ئافرەتەکەی بانگ کرد و پێی فەرموو چی وایکرد وا بکەیت؟

---

[1] البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص١٦٧.

[2] البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص٢١٠.

[3] دلائل النبوة للبيهقي، الرقم ١٦١٢، البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص٢١٠.

ئەویش وتی: وتم: ئەگەر پێغەمبەر بێت ئەوە زیانی پێ ناگەیەنێت، ئەگەریش پێغەمبەر نەبێت ئەوە لە کۆڵی هەموانی دەکەمەوە،[1] دواتر سێ ساڵ بەو ئازارەیەوە مایەوە تا هەر بەو ئازارەوە وەفاتی کرد وەک لە رۆژی وەفاتیدا فەرمووی: (ما زلت أجد من الأكلة التي أكلت من الشاة يوم خيبر عددا حتى كان هذا أوان انقطع الأبهر مني)، (هێشتا بە برێ دەردی ئەو خواردنەوە دەناڵێنم کە لە رۆژی خەیبەر لە بەرخەکەم خوارد، ئیتر ئێستا توانای پێ نەهێشتم[2])، ئەوەبوو پێغەمبەر(ﷺ) بە شەهیدی وەفاتی کرد.[3]

ئیبن سەعد دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) ئەو ژنەی دایە دەست کەس وکاری بیشر، ئەوانیش کوشتیان.[4]

**پەند و وانە:**

پیسکەیی و بەخیلی لە مرۆڤدا سیفەتی زۆر خراپەو هێندە بەسە پێغەمبەر(ﷺ) بە ئەوپەڕی خراپە باسی کردووە، خۆپاراستنیش لە سیفەتی خراپە پێویستە، بۆیە هەرکەس سیفەتێکی خراپە لە خۆیدا بەدیدەکات با وانەزانێت لێی جیانابێتەوە، وەک چۆن هەندێ بۆچوونی بە ناو زانستی باسی لێوە دەکەن، بەڵکو دەتوانێت سیفەتی خراپە بگۆڕێت بە سیفەتی چاکە، با ئەو خراپەش چەندین ساڵ لە ناخ و ژیانی ئەو کەسەدا ریشەی داکوتابێت، کاتێک رووناکی ئیمان و ئیسلامی بۆ خستەکار خێرا چاکەو سەربڵندی لە شوێنیدا رەگ دادەکوتێت، کەسی سەرکردەش پێویستە بە سیفەتە بالاّو ناوازەکان رازاوە بێت نەک سیفەتە پەستەکان لەخۆبگرێت.

---

[1] سنن أبي داود - كتاب الديات - باب فيمن سقى رجلا سما أو أطعمه فمات أيقاد منه، الرقم ٤٥١٠، صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن أبي داوود، الرقم ٤٥١٤.

[2] وشەی أبهر واتای شاخوێنبەر دەدات و پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژەی بەوە داوە کە ژەهرەکە کاری کردۆتەسەری و شاخوێنبەری بریوە، بەلاّم واتایەکی تر کە لە زمانەوانی عەرەبیدا بەو رستەی سەرەوە دێت واتە توانا و هێزی پێ نەهێشتووەو لەناوی دەبات. بۆیە لێرەدا ئاماژەمان داوە بە هەردوو واتاکە.

[3] دلائل النبوة للبيهقي، الرقم ١٦١٢.

[4] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص٢٠٢.

هـاوەڵان نموونـەی بـاڵا بـون لـە ڕێزگرتـن و بـە شـکۆدانانی پێغەمبـەری خـوادا(ﷺ)، ئـەم نموونـەی بیشـریش یەکێکـە لـە سـەدان نموونـەی نـاو ژیانـی هاوەڵان کە تـا چەندە ڕێز و گەورەیی پێغەمبـەری خوایان لا بووە، دەبینین ئەگەرچی هەستی کردووە بە تـام و بوونـی ژەهرەکـە لـە پاروەکەیدا، بـەڵام تەنها لەبەرئـەوەی خواردنێک کە پێغەمبـەر(ﷺ) حـەزی پێ بـووە لەبەرچاوی پێغەمبـەر(ﷺ) بێـزراو نـەکات ئامادەیـە ئـەو پـارووە نەتفێتـەوە، دەی سـوێند بەخـوا ئەگـەر ئێمـە بووینایـە ئـەو پاروەمـان دەتفانـدەوەو ناویشـمان لـێ دەنـا ژیـری و وریایـی.

## ٤٥٦. بیشری کوڕی حارث(ﷺ)

نـاوی بیشـری کـوڕی حارثـی کـوڕی سـەریعی عەبەسـیە، ئـەم هاوەڵـە لەگـەڵ هەشـت کەسـی تـر لـە هاوڕێیانـی هاتوونەتـە خزمـەت پێغەمبـەر(ﷺ)،[1] پێغەمبـەر(ﷺ) نـزای کـرد بۆیـان و فەرمـووی: بەڵکو کەسـێکی تـر بێتـە لاتـان و ببنـە دە کـەس تـا لیوایەکتـان بـۆ پێـک بهێنم، ئەوەبوو طەلحـەی کوڕی عوبەیدوڵا هـات، پێغەمبـەر(ﷺ) لیوایەکـی پێکهێنـا بۆیـان و بڕیـاری دا دروشـمەکەشـیان بریتـی بێـت لـە (یـا عشـرة).[2]

## ٤٥٧. بیشری کوڕی حارث(ﷺ)

ناوی بیشری کوڕی حارثی کوڕی قەیسی قورەیشی سەهمیە، هـاودەم بە هـەردوو براکـەی تری کە ناویـان حـارث و موعەممـەر بـوو کۆچیان کرد بۆ حەبەشـە،[3] بیشـر هـەر لـە حەبەشـە مایـەوە تـا دوای جەنگـی بـەدر گـەڕایـەوە.

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٩٥.

[2] الطبقات، جا، ص٢٩٦.

[3] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٦٩، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٩٦.

## ٤٥٨. بیشری کوڕی حارث(ﷺ)

ناوی بیشری کوڕی حارثی کوڕی عەمرە، لە پشتیوانانە،[١] دوو برای تری هەبوو بە ناوەکانی بوشەیر و مەبشیر کە هەر سێیان بەشدار بوون لە غەزای ئوحوددا.[٢]

بوشەیری برای لەو شاعیرانە بوو کە هێرشیان دەکردە سەر هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ)، واتە مونافیق بوو، لە جەنگی ئوحودیشدا کە موسڵمانان پێویستییان بە چەک و شمەک بوو بەشیر هەستا و قەڵغانێکی دزی، دواتریش لە مانگی رەبیعولئەوەلی ساڵی چوارەمی کۆچیدا مورتەد بوویەوە.[٣]

## ٤٥٩. بیشری کوڕی حەنظەلە(ﷺ)

ناوی بیشری کوڕی حەنظەلەی جوعفیە،[٤] ئیبن حەجەر دەڵێت: پێدەچێت برای سوەیدی کوڕی حەنظەلە بێت.[٥]

فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوە و دەڵێت: لەگەڵ وائیلی کوڕی حیجردا لە رێیەکدا پێکەوە بووین بەرەو لای پێغەمبەر(ﷺ) دەچووین، لەرێدا دامان بەلای تاقمێکدا کە دوژمنی وائیل بوون و ماڵ و مناڵی بوون و بەدوایدا دەگەڕان، دوژمنەکەی وائیل وتی: ئەرێ وائیل لەنێوتاندایە؟ وتمان: نا، وتی: دەی خۆ ئەوە وائیلە، منیش لە ناخی خۆمدا وتم: ئەمە یەکێکە لە پاشاکانی یەمەن، دوژمنەکانی وتیان دەبێت سوێند بخۆن کە ئەوە وائیل نیە، منیش سوێندم خوارد وتم: ئەمە برای دایکی و باوکیمە، ئەوەبوو وازیان لێ هێنا و چووین، کاتێک هاتینە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) باسەکەمان بۆ گێڕایەوە،

---
[١] أسد الغابة، ج١، ص ٢٧٥.
[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٩٦.
[٣] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٧١.
[٤] أسد الغابة، ج١، ص٢٧٧.
[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٩٦.

ئەویش فەرمووی: (صدقت هو أخوك ابن أبيك وأمك آدم وحواء عليهما السلام لك أجر بيمينك هذه عظيمة)،[1] (راست دەفەرمویت، ئەوە برای دایک و باوکیتە ئادەم و حەوا -سەلامی خوایان لێ بێت- بەو سوێندخواردنەت پاداشتێکی گەورەت بۆ هەیە).

**وەستانێک:**

سەبارەت بە سوێندخواردن لە باری سەختی وادا ئەگەر سوێندەکەش ببێتە درۆ ئەوە دروستە، شەوکانی لە (نيل الاوطار) دا ئەو رایەی هێناوە کە زانایان لەسەر ئەوە کۆکن دروستە لەکاتی ناچاریدا درۆ بکرێت بۆ نموونە ئەگەر ستەمکارێک ویستی پیاوێک بکوژێت کە لای کەسێک خۆی شاردوەتەوە، ئەو کەسەی شاردوویەتیەوە بۆی هەیە بڵێت لای من نیە و سوێندیشی بۆ بخوات، هیچ تاوانباریش نابێت لەسەر درۆ و سوێندە درۆکەیشی.[2]

نەوەوی لە شەرحی صەحیحی موسلیمدا ئەو رایە دێنێت کە دەڵێت: بەڵکو ئەگەر کەسێک کەسێکی شاردبوویەوە لای خۆی کە ستەمکارێک دەیویست بیکوژێت ئەوە واجبە لەسەری ئەو درۆیە بکات و بڵێت نازانێت لە کوێیە.[3]

سەبارەت بە درۆکردن و کاتی دروست بۆ درۆکردن چەند رایەک هەیە، رای زیاتر کە ئیبن حەجەر لە شەرحی صەحیحی بوخاریدا هێناویەتی لەسەر ئەوەیە لە سێ حاڵدا درۆکردن دروستە:

یەکەم: کاتی جەنگ موسڵمان بۆی هەیە درۆ بکات بەڵام درۆیەک نا کە راستیە رێپێدراوەکانی شەریعەت بشێوێنێت، بۆ نموونە بۆی نیە پەنای کەسێک بدات و دواتر بیکوژێت و بڵێت درۆ رەوایە.

---

[1] معجم الصحابة لابن قانع، ج١، ص٨١

[2] نيل الاوطار للشوكاني، ج٨، ص٨٥

[3] شرح النووي على صحيح مسلم، ج١٦، ص١٥٨.

دووەم: بۆ ڕێکخستن و چاککردنەوەی نێوانی خەڵک و نەهێشتنی دوژمنایەتی و کینەو ڕقی نێوان خەڵک، وەک پێغەمبەر(ﷺ) لە فەرموودەیەکدا فەرموویەتی (ليس الكذاب الذي يصلح بين الناس، فينمي خيرا، أو يقول خيرا)،[1] (درۆزن نیە کەسێک کە نێوانی خەڵک چاک دەکاتەوەو دەدات و لای هەرکام چاکەی ئەوی تر دەڵێت: یان قسەی چاک دەکات).

سێیەم: درۆی نێوان ژن و مێرد بۆ دڵخۆشکردنی یەکتر، بەڵام دەبێت درۆکردنەکە پەیوەست نەبێت بە ماف و ئەرکی یەکتری، بۆ نموونە پیاوەکە بەڵێنی شتێکی پێ دەدات و نەیکات نابێت.[2]

جیا لەمانە چەند ڕایەکی تر هەن، بۆ نموونە هەیە پێی وایە هیچ کاتێک نیە درۆکردن تیایدا دروست بێت، هەندێ پێیان وایە درۆیەک قبوول نەکراوو سەرکۆنە کراوە کە زیانی تێدا بێت بۆ کەسێک یان هیچ سوودێکی نەبێت.[3]

یان هەندێ جار درۆکردنەکە لە دەربڕینەکەدا درۆ نیە بەڵکو لە مەبەستدا شتێکی ترە و لە دەربڕیندا دروستە، بۆ نموونە کەسێک خراپە و ستەمی ستەمکارێکی لا ڕوون بێت و بۆ دووربوون لە ستەمی پێی دەڵێت: دوێنێ شەو نزام بۆ کردیت، لە بنەڕەتیشدا نزاکەی ئەوەبووە کە وتوویەتی خوایە لە موسڵمانان خۆش بە،[4] ئەو کەسە موسڵمانە ستەمکارەش بەر ئەو نزایە دەکەوێت کە کردوویەتی، جا هەرچەندە بە تایبەت نزای بۆ نەکردووە، بەڵام ئەو قسەی نابێت بە درۆ.

---

[1] صحيح البخاري – كتاب الصلح – باب ليس الكاذب الذي يصلح بين الناس، الرقم ٢٦٩٢.

[2] فتح الباري شرح صحيح البخاري لابن حجر العسقلاني، ج٥، ص٣٠٠.

[3] فتح الباري شرح صحيح البخاري لابن حجر العسقلاني، ج٥، ص٣٠٠.

[4] فتح الباري شرح صحيح البخاري لابن حجر العسقلاني، ج٥، ص٣٠٠.

دووەم: بۆ ڕێکخستن و چاککردنەوەی نێوانی خەڵک و نەهێشتنی دوژمنایەتی و کینەو رقی نێوان خەڵک، وەک پێغەمبەر(ﷺ) لە فەرموودەیەکدا فەرموویەتی (ليس الكذاب الذي يصلح بين الناس، فينمي خيرا، أو يقول خيرا)،[1] (درۆزن نیە کەسێک کە نێوانی خەڵک چاک دەکاتەوەو دەدات و لای هەرکام چاکەی ئەوی تر دەڵێت: یان قسەی چاک دەکات).

سێیەم: درۆی نێوان ژن و مێرد بۆ دڵخۆشکردنی یەکتر، بەڵام دەبێت درۆکردنەکە پەیوەست نەبێت بە ماف و ئەرکی یەکتری، بۆ نموونە پیاوەکە بەڵێنی شتێکی پێ دەدات و نەیکات نابێت.[2]

جیا لەمانە چەند رایەکی تر هەن، بۆ نموونە هەیە پێی وایە هیچ کاتێک نیە درۆکردن تیایدا دروست بێت، هەندێ پێیان وایە درۆیەک قبووڵ نەکراوو سەرکۆنە کراوە کە زیانی تێدا بێت بۆ کەسێک یان هیچ سوودێکی نەبێت.[3]

یان هەندێ جار درۆکردنەکە لە دەربڕینەکەدا درۆ نیە بەڵکو لە مەبەستدا شتێکی ترە و لە دەربڕیندا دروستە، بۆ نموونە کەسێک خراپە و ستەمی ستەمکارێکی لا روون بێت و بۆ دووربوون لە ستەمی پێی دەڵێت: دوێنێ شەو نزام بۆ کردیت، لە بنەڕەتیشدا نزاکەی ئەوەبووە کە وتوویەتی خوایە لە موسڵمانان خۆش بە،[4] ئەو کەسە موسڵمانە ستەمکارەش بەر ئەو نزایە دەکەوێت کە کردوویەتی، جا هەرچەندە بە تایبەت نزای بۆ نەکردووە، بەڵام ئەو قسەی نابێت بە درۆ.

[1] صحيح البخاري - كتاب الصلح - باب ليس الكاذب الذي يصلح بين الناس، الرقم ٢٦٩٢.

[2] فتح الباري شرح صحيح البخاري لابن حجر العسقلاني، ج٥، ص٣٠٠.

[3] فتح الباري شرح صحيح البخاري لابن حجر العسقلاني، ج٥، ص٣٠٠.

[4] فتح الباري شرح صحيح البخاري لابن حجر العسقلاني، ج٥، ص٣٠٠.

## ٤٦٠. بیشری کوڕی راعیلعیر(رضي الله عنه)

ناوی بیشری کوڕی راعیلعیره، له ئەشجەعیەکانە، له مەدینە نیشتەجێ بوو.[١]

جارێک بیشر بە دەستی چەپ نانی دەخوارد پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو (بە دەستی راستت نان بخۆ)، ئەویش وتی: ناتوانم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (دەی هەر نەتوانیت)، لەوە بەدوا بیشر دەستی راستی نەدەگەیشتە لای دەمی، واتە نەیدەتوانی بەرزی بکاتەوە بۆ لای دەمی.[٢]

له ریوایەتەکەی موسلیمدا ناوی بیشر نەهاتووە، هەروەها دەڵێت: کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەی پێ فەرموو، تەنها لەبەر خۆبەزلزانین ئامادە نەبوو بە دەستی راست نان بخوات.[٣]

قاضی عیاض لە شەرحی فەرموودەکەی صەحیحی موسلیمدا کە تیایدا هاتووە (تەنها لەبەرخۆبەگەورە زانین ئەوەی نەکردووە) دەڵێت: ئەو کەسە واتە بیشر مونافیق بووە، بەڵام نەوەوی لە شەرحی صەحیحی موسلیمدا بەرپەرچی دەداتەوەو دەڵێت: بەڵکو بیشری کوڕی راعیلعیر هاوەڵێکی ناودار بووە و ئەو وتەی قاضی عیاض کە هێناویەتی وا نیە، چونکە تەنها خۆبەزلزانین و سەرپێچیەک نابێتە هۆی مونافیق بوون و کافر بوون، بەڵام ئەگەر فەرمان کردنەکە فەرمانی واجب بووبێت ئەگەر سەرپێچی لێ بکات ئەوە تاوانە.[٤]

ئیبن حەجەر ئەگەرێکی تر دادەنێت و دەڵێت: لەوانەیە ئەو کاتەی ئەو شتە روویداوە هێشتا بیشر موسڵمان نەبووبێت و دواتر موسڵمان بووبێت.[٥]

---

[١] أسد الغابة، ج١، ص٢٧٧.

[٢] مسند أحمد بن حنبل - أول مسند المدنيين(رضي الله عنهم) أجمعين - حديث سلمة بن الأكوع(رضي الله عنه)، الرقم ١٦٧٦٢.

[٣] صحيح مسلم - كتاب الأشربة - باب آداب الطعام والشراب وأحكامها، الرقم ٢٠٢١..

[٤] صحيح مسلم بشرح النووي، ج١٣، ص١٩٢.

[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٩١.

نەوەوی دەڵێت: ئەم فەرموودەیە-فەرموودەکەی بیشر- ئاماژەیە بە دروستی نزاکردن لە کەسێک کە بێ بوونی هیچ بیانوویەک لە حوکمی شەرعی دەربچێت، هەروەها ئاماژەیە بە فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە لە هەموو بارێکدا، تەنانەت لە کاتی نانخواردنیشدا، هەروەها ئەوەی تێدایە ئەگەر سوننەتە کەسێکت بینی لایدا لە ئادابی نانخواردن فێری بکەیت.[1]

صەنعانی لە (سبل السلام)دا دەڵێت: ئەمە ئاماژەیە بە واجبی نان خواردن بە دەستی ڕاست چونکە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێکردووەو نزای لەو کەسە کردووە، چونکە تەنها کاتێک نزا لە کەسێک دەکرێت کە لە واجب دەرچووبێت، خۆ لەوانەشە نزاکەی لەبەر خۆبەزلزانینەکەی لێ کردبێت، یان دوور نیە لەبەر هەردوو هۆکاری بەچەپ خواردن و خۆبەزلزانیەکە نزای لێ کردبێت.[2]

ئەم فەرمانەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) سەبارەت بە نان خواردن ویست و حەزێکی شەخصی نەبووە، هەروەها تایبەت نەبووە بە چەند هاوەڵێک یان تاکە هاوەڵێکەوە، فەرمانی نان خواردن بە دەستی ڕاست بەشێکی ڕێنمایی شەریعەتە بۆ هەموان، وەک دەبینین پێغەمبەر(ﷺ) لە فەرموودەی تردا ئاماژەی بەوە داوە هۆی چیە بە دەستی چەپ نان نەخۆین و ئاو نەخۆینەوە، وەک دەفەرموێت (**لا يأكلن أحد منكم بشماله ولا يشربن بها، فإن الشيطان يأكل بشماله ويشرب بها**)،[3] (کەس لە ئێوە بە دەستی چەپی نەخوات و نەخواتەوە چونکە شەیتان بە دەستی چەپی دەخوات و دەخواتەوە).

نزاکردنی پێغەمبەر(ﷺ) لەم هاوەڵە بەڵگە نیە بۆ مونافیق بوونی، چونکە دەبینین پێغەمبەر(ﷺ) نزای لە هەندێ هاوەڵی تریش کردووە لە کاتی بینینی سەرپێچیەک لێیان.

---

[1] صحيح سلم بشرح النووي، ج١٣، ص١٩٢.

[2] سبل السلام للصنعاني، ط٤، دار إحياء التراث العربي، (بيروت-١٣٧٩هـ)، ج٣، ص١٥٩.

[3] صحيح مسلم - كتاب الأشربة - باب آداب الطعام والشراب وأحكامها، الرقم ٢٠٢٠.

## ٤٦١. بیشری کوڕی سوحەیم(ﷺ)

ناوی بیشری کوڕی سوحەیمی غیفاریە،[١] دەشوترێت بەڵکو خوزاعیە، یان دەوترێت نەهرانی، بەڵام زیاتر وا هاتووە کە غیفاریە.[٢]

بیشری کوڕی سوحەیم دەڵێت: لە ڕۆژانی تەشریقدا پێغەمبەر(ﷺ) منی نارد تا لەناو خەڵکدا هاوار بکەم:(**لا يدخل الجنة إلا نفس مسلمة، وإن هذه الأيام أيام أكل وشرب**)،[٣] (تەنها نەفسی موسڵمان-کەسی موسڵمان- دەچێتە بەهەشتەوەو ئەم ڕۆژانەش –ڕۆژانی تەشریق- ڕۆژانی خواردن و خواردنەوەن).

ئەمەش لە حەجیماڵئاواییدا بوو، وەک لە گێڕانەوەکەی نەسائیدا هاتووە پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژانی حەج وتاری دەدا فەرمووی...[٤]

دیارە پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەو ڕۆژەدا چەند کەسێکی ڕاسپاردووە تا بەناو خەڵکدا هاوار بکەن ئەو ڕۆژانە ڕۆژی خواردن و خواردنەوەن، هەروەک لە گێڕانەوەیەکدا هاتووە فەرمانی کردووە بە بودەیلی کوڕی وەرقاش، بودەیل لە حەجی ماڵئاواییدا لەسەر وڵاخەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بوو و دەگەڕا و دەیوت پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی (**من كان صائمًا فليفطر، فإنهن أيام أكل وشرب**)،[٥] (هەرکەس بە ڕۆژووە با ڕۆژووەکەی بشکێنێ، چونکە ئەم ڕۆژانە ڕۆژانی خواردن و خواردنەوەن).

---

[١] أسد الغابة، ج١، ص ٢٧٨.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٢٩٧.

[٣] صحيح ابن خزيمة - كتاب المناسک - باب النهي عن صيام أيام التشريق، الرقم ٢٩٦٠، صححه الألباني في إرواء الغليل(١٢٨/٤).

[٤] السنن الكبرى للنسائي - كتاب الصيام - النهي عن صيام أيام التشريق وذكر اختلاف الناقلين للخبر في ذلک - خالفه ابن الهاد، الرقم ٢٩٠٤.

[٥] المستدرک على الصحيحين - كتاب التفسير - زيارة قبور الشهداء ورد السلام منهم إلى يوم القيامة، الرقم ٣٠٠٦.

## ٤٦٢. بیشری کوڕی سوفیان(ﷺ)

ناوی بیشری کوڕی سوفیانی عەتکیە.[١]

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) لە ساڵی ڕێککەوتنی حودەیبییەدا بەرەو مەککە بەڕێکەوت تا عومرەی ماڵی خوا بکات، بیشری کوڕی سوفیانی عەتیکی هاتە خزمەتی و سەلامی لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو ئەی بیشر ئایا هەواڵی ئەوەت هەیە خەڵکی مەککە زانیبێتیان بەم هاتنەی من؟ ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە دایک و باوکمەوە بەقوربانت بم من لە فلانە شەودا سەرقاڵ بووم تەوافی کەعبەم دەکرد کە کەسێک لە سەرووی (أبی قبیس)ەوە هاواری دەکرد، هاوارێ کە دوورو نزیکیان دەیانبیست، دەیوت بەڕێ کەون وا هاوڕێکەتان بەرەو لای ئێوە دێت، خەڵکی ڕاپەڕین و لای کەعبە کۆبوونەوەو ڕێککەوتن و بڕیاریان دا نەهێڵن تۆ بچیتە مەککە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەوە شەیتانی بتەکانە خەریک بوو خوا بیکوژێت.[٢]

## ٤٦٣. بیشری کوڕی عاصم(ﷺ)

ناوی بیشری کوڕی عاصمی کوڕی عەبدوڵای مەخزوومیە، یان دەوترێت بیشری کوڕی عاصمی کوڕی سوفیانی ثەقەفیە، ئیبن ئەثیر دەڵێت: ئەمەیان ڕاستترە،[٣] بەڵام ئیبن حەجەر ڕای پێچەوانەی هەیە و دەڵێت: ئەم بیشرە هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بووەو جیایە لە بیشری کوڕی عاصمی کوڕی سوفیان کە کاربەدەستێکی تری عومەری کوڕی خەططاب بوو.[٤]

لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەططابدا خەلیفە بیشری کوڕی

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٩٧.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٩٧.

[٣] أسد الغابة، ج١، ص٢٧٩.

[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٩٨.

عاصمی کرد بە بەرپرس لە کۆکردنەوەی صەدەقەی هەوەزان، بەڵام بیشر دواکەوت، خەلیفە چوو بۆ لای و پێی وت: بۆچی دواکەوتیت؟ مەگەر گوێڕایەڵی ئێمەت لەسەر نیە؟ ئەویش وتی: با، بەڵام من لە پێغەمبەری خوام(ﷺ) بیستووە دەیفەرموو **(من ولي شيئا من أمور المسلمين أتي به يوم القيامة حتى يوقف على جسر جهنم، فإن كان محسنا نجا وإن كان مسيئا انخرق به الجسر فهوى فيه سبعين خريفا)**، (هەرکەس شتێک لە کاروباری موسڵمانانی گرتەدەست رۆژی دوایی دەهێنرێت تا لەسەر پردی دۆزەخ دەوەستێنرێت، ئەگەر چاکەکار بێت رزگاری دەبێت، وە ئەگەر خراپەکار بێت پردەکە فڕێی دەداتە دۆزەخەوە تا ئەوەی حەفتا پاییز بەناو دۆزەخدا رۆدەچێت)، عومەری کوڕی خەتتاب کە ئەمەی بیست خەم و پەژارە دایگرت و بە دڵتەنگیەوە ئەوێی جێهێشت، لەرێدا ئەبووزەری غیفاری پێگەیشت، ئەبووزەر پێی وت: چیە دەتبینم غەمباریت؟ وتی: چۆن دڵگران نەبم لەکاتێکدا لە بیشری کوڕی عاصمم بیست دەیوت پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی هەرکەس شتێک لە کاروباری موسڵمانانی گرتەدەست، رۆژی دوایی دەهێنرێت تا لەسەر پردی دۆزەخ دەوەستێنرێت، ئەگەر چاکەکار بێت رزگاری دەبێت، وە ئەگەر خراپەکار بێت پردەکە فڕێی دەداتە دۆزەخەوە تا ئەوەی حەفتا پاییز بەناو دۆزەخدا رۆدەچێت، ئەبووزەر وتی: تۆ ئەو فەرموودەت لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) نەبیستووە؟ عومەر وتی: نا، ئەبووزەر وتی: دەی من شایەتی دەدەم لە پێغەمبەری خوام(ﷺ) بیست دەیفەرموو (هەرکەس شتێک لە کاروباری یەک کەسی گرتەدەست رۆژی دوایی دەهێنرێت تا لەسەر پردی دۆزەخ دەوەستێنرێت، ئەگەر چاکەکار بێت رزگاری دەبێت، وە ئەگەر خراپەکار بێت پردەکە فڕێی دەداتە دۆزەخەوە تا ئەوەی حەفتا پاییز بەناو دۆزەخدا رۆدەچێت، ئاگری دۆزەخیش زۆر رەش و تاریکە)، جا کام فەرموودەیان زیاتر دڵی ترساندیت؟ ئەویش وتی: هەردووکیان، ئینجا عومەر وتی: کێ

بە هەموو چاک و خراپیەوە ئەم دەسەڵاتەم لێ وەردەگرێت و لەبری من دەسەڵاتداری دەکات؟ ئەبووزەر وتی: هەرکەسێک خوای گەورە لووت بڕاوی بکات و کوڵمیشی بە زەویەوە بنووسێنێت.[1]

## ٤٦٤. بیشری کوڕی عەبد(رضي الله عنه)

بیشری کوڕی عەبد لە بەصرە نیشتەجێ بوو،[2]کوڕێکی هەبوو بە ناوی عەففان کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە.[3]

فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی (إن أخاكم النجاشي قد مات فاستغفروا له)،[4] (نەجاشی براتان کۆچی دوایی کرد، دەی داوای لێخۆشبوونی بۆ بکەن).

ئەم فەرموودەیە بە چەند سەنەدی تر لە هاوەڵانی ترەوە هاتووە، لەو هاوەڵانەش (ئەبی قیلابە، عیمرانی کوڕی حوصەین، جابری کوڕی عەبدوڵا، جەریری کوڕی عەبدوڵا، حوذەیفەی کوڕی ئوسەید)، بەم پێیە دیارە پێغەمبەر(ﷺ) لە قەرەباڵغی ناو هاوەڵاندا ئەوەی فەرمووە.

## ٤٦٥. بیشری کوڕی عەبدولا(رضي الله عنه)

ناوی بیشری کوڕی عەبدوڵایە، لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان،[5] هەندێکی تر بە بەشیر ناوی دێنن، بەڵام ئیبن حەجەر دەڵێت: لەوانەیە دوو کەسی جیا بن و برا بن،[6] بیشر لە جەنگی یەمامەدا شەهید بووە.[7]

---

[1] الآحاد والثانى لابن أبي عاصم، الرقم ١٤٠، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٢٠٦، ضعفه الألباني في صحيح و ضعيف الترغيب و الترهيب، الرقم ١٣١١.

[2] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٦٩.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٠٠.

[4] أسد الغابة، ج١، ص٢٨٠، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٠٠.

[5] أسد الغابة، ج١، ص ٢٨٠.

[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٩٩.

[7] أسد الغابة، ج١، ص ٢٨٠.

## ٤٦٦. بیشری کوڕی عەبدولا(رضي الله عنه)

ئەم هاوەڵە جیایە لە بیشری کوڕی عەبدوڵای ئەنصاری، لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەططابدا خەلیفە لەگەڵ سەعدی کوڕی ئەبی وەققاصدا ناردنی بۆ عێراق، سەعدیش ئەوی کرد بە بەرپرسی یەکەیەکی هەزار کەسی لە قەیسیەکان.[١]

ئیبن ئەبی شیبە دەڵێت: ئەو خەلیفانە تەنها دەستەی هاوەڵانیان دەکردە بەرپرسی سوپا.[٢]

## ٤٦٧. بیشری کوڕی عورفوطە(رضي الله عنه)

ناوی بیشری کوڕی عورفوطەی جوهەنیە، دەشوترێت ناوی بەشیرە، بەڵام ئیبن مونده دەڵێت: یەکەمیان راستترە.[٣]

لە فەتحی مەککە و جەنگەکانی دواتریشدا بەشدار بوو.[٤]

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە کە جوهەنیەکان بە نزیکەی هەزار کەسەوە هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمان بوون و بەشداری جیهاد و غەزاکانیان کرد، لەنێویاندا بیشری کوڕی عورفوطە هاتووە.[٥]

## ٤٦٨. بیشری کوڕی عیصمە(رضي الله عنه)

ناوی بیشری کوڕی عیصمەی لەیثیە،[٦] فەرموودەیەکی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە کە ئەمە بەسەرهاتەکەیەتی:

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٩٩.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢٩٩.

[٣] أسد الغابة، ج١، ص٢٨٠.

[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٠٠.

[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٠٠.

[٦] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١١٠٧.

جارێک بیشر لای موعاویەی کوڕی ئەبووسوفیان بوو، کاتێک قسەیان دەکرد بیشر وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(الأزد مني وأنا منهم، أغضب لهم إذا غضبوا، وأرضى لهم إذا رضوا)، (ئەزدیەکان لە منن و منیش لەوانم، هەرکات توورە بوون منیش لەسەریان توورە دەبم، هەرکاتیش رازی بوون منیش لەبەر ئەوان رازی دەبم)، موعاویە وتی: بەڵکو پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەی بۆ قورەیش فەرمووە، بیشر وتی: بۆ یانی من درۆ دەکەم بەدەم پێغەمبەری خواوە؟ ئەگەر درۆم بەدەمیەوە بکردایە ئەو فەزڵ و گەورەییەم بۆ هۆزەکەی خۆم دەوت: نەک بۆ ئەزدیەکان.[1]

## ٤٦٩. بیشری کوڕی عیصمە(رضي الله عنه)

ناوی بیشری کوڕی عیصمەی موزەنیە،[2] هەندێک پێیان وایە بیشری کوڕی عیصمەی لەیثی و ئەم بیشرە هەر یەک کەسایەتین، بەڵام ئیبن حەجەر دەڵێت: ئەوە راستە کە ئەم دوانە دوو هاوەڵی جیان.[3]

ئەم هاوەڵەش فەرموودەیەکی هاوشێوەی فەرموودەکەی بیشری کوڕی عیصمەی لەیثی گێڕاوەتەوە، بەڵام ئەم سەبارەت بە خوزاعەیە، بیشر دەڵێت: بیستم لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیفەرموو (خزاعة مني وأنا منهم)،[4] (خوزاعە لە منن و منیش لەوانم).

---

[1] المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٢٠٣، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١١٠٧، أسد الغابة، ج١، ص٢٨٠، قال الحافظ ابن حجر في كتابه (الإصابة): في إسناده ضعف وقد روى عن مجاهد بإسناد آخر فقال عن بشر بن عطية.

[2] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٧٠.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٠١.

[4] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٧٠، أسد الغابة، ج١، ص٢٨١، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٠١، قال ابن عبدالبر في كتابه (الإستيعاب) وفي إسناده شيخ مجهول لا يعرف.

## ٤٧٠. بیشری کوڕی عەقرەبە(رضي الله عنه)

ناوی بیشری کوڕی عەقرەبەی جوهەنیە، کونیەکەی ئەبولیەمانە،[١] هەروەها بە بەشیریش ناوی هاتووە،[٢] بەڵام ئیبن ئەثیر دەڵێت: راستتر ئەوەیە ناوی بیشرە،[٣] بیشر خۆیشی و عەقرەبەی باوکیشی هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بون.[٤]

بیشر دەڵێت: لە پێغەمبەری خوام(ﷺ) بیستووە دەیفەرموو (من وقف موقف رياء وسمعة وقفه الله يوم القيامة موقف رياء وسمعة)،[٥] (هەرکەس هەڵوێستێکی رووپامایی و ناوبانگ پەیداکردنی هەبێت ئەوا خوای گەورە لە رۆژی دواییدا لە وێستگە و شوێنی رووپامایی و ناوبانگدا دەیوەستێنێت).

لە ریوایەتێکی تردا هاتووە (من قام بخطبة لا يلتمس بها إلا رياء وسمعة، أوقفه الله عز وجل يوم القيامة موقف رياء وسمعة)،[٦] (هەرکەسێ وتارێ بدات و تەنها مەبەستی لێی رووپامایی و ناوبانگ بێ، رۆژی دوایی خوا لە وێستگە و شوێنی رووپامایی و ناوبانگدا دەیوەستێنێت).

ئەم گێڕانەوەی فەرموودەیە لە سەردەمی عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕواندا بووە کاتێک مەڕوان بە بیشری کوڕی عەقرەبەی وت: من قسەی تۆم لا بەڵگەو وەرگیراوە جا قسەم بۆ بکە، ئەویش ئەم فەرموودەی پێغەمبەری خوای(ﷺ) گێڕایەوە.[٧]

بیشری کوڕی عەقرەبە دەڵێت: جارێک لەگەڵ عەقرەبەی باوکم چوومە

---

[١] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ١٧١.

[٢] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص٤٢٩.

[٣] أسد الغابة، ج١، ص ٢٨١.

[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٠٢.

[٥] شعب الإيمان للبيهقي، الرقم ٦٥٣١.

[٦] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص٤٢٩، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٢١٥، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١١٢٠.

[٧] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٠٢، تأريخ الإسلام للذهبي، ج٥، ص٧٨.

خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە عەقرەبەی باوکمی فەرموو ئەی عەقرەبە ئەوە کێیە لەگەڵت؟ ئەویش وتی: بەحیر، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرمووم نزیک بەرەوە، منیش نزیک بوومەوە و لە لای راستیەوە دانیشتم، پێغەمبەر(ﷺ) دەستی هێنا بەسەرمدا و فەرمووی: ناوت چیە؟ وتم: بەحیر، فەرمووی: (نا، بەڵکو ناوت بەشیرە)، هەروەها گیریەک لە زمانمدا هەبوو، پێغەمبەر(ﷺ) فووی کرد بە دەممدا و گیریەکەی زمانم نەما، دواتر هەرچی مووی سەرم هەیە سپی بوو کەچی ئەو شوێن دەستەی پێغەمبەر(ﷺ) لەسەرمدا بە رەشی مایەوە.[١]

بیشری کوڕی عەقرەبە دەڵێت: باوکم لە یەکێک لە غەزاکاندا کە لەگەڵ پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەشدار بوو شەهید بوو، منیش دەگریام بۆی، لەو کاتەدا پێغەمبەر(ﷺ) دای بە لامدا و فەرمووی: بێدەنگ بە، ئایا رازی نابیت من باوکت بم و عائیشەش دایکت بێت؟ وتم: با، بە دایک و باوکمەوە بەقوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ).[٢]

بیشر لە خاکی فەلەستین نیشتەجێ بوو،[٣] لە دوایساڵی هەشتاو پێنجی کۆچیەوە لە فەلەستین کۆچی دوایی کرد.[٤]

## ٤٧١. بیشری کوڕی قەیس(رضي الله عنه)

ناوی بیشری کوڕی قەیسی تەمیمی عەنبەریە، گێڕانەوەیەکی لەسەر هاتووە کە بیشری کوڕی قەیس هاودەم بە رەحیمی کوڕی هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، لە هاتنەکەشیاندا بە هۆی سوێندێکەوە کە خواردبووی خۆی و کوڕەکەی بە زنجیرێک بەیەکەوە بەسترابوونەوە، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو (یا بشر اقطعها فليست عليك يمين)، (ئەی بیشر بیپچڕێنە ئیتر سوێندەکەت

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٠٢.
[٢] التاريخ الكبير للبخاري، ج٢، ص٧٨.
[٣] أسد الغابة، ج١، ص ٢٨١.
[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٠٢.

لەسەر نیە)، بیشریش زنجیرەکەی پچڕاند و موسڵمان بوو و دەستی هێنا بە دەم وچاویدا، پێغەمبەر(ﷺ) نزای خێری بۆ کرد.[1]

**وەستانێک:**

مەسەلەی سوێند خواردن و پابەندبوون بەو سوێندەوە مەسەلەیەکی گرنگەو پێویستە ئاگادار بین لە چ کاتێکدا سوێند خستن دروستە و لە چ کاتێکدا ناڕەوایە.

پێغەمبەر(ﷺ) لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێت (**من حلف على يمين، فرأى غيرها خيرا منها، فليأتها وليكفر عن يمينه**)،[2] (هەرکەس سوێندی خوارد لەسەر شتێک و جگە لەو شتەی باشتر بینی ئەوا با باشترەکە بکات و کەفارەتی سوێندەکەی بدات).

لەو بارەیەوە (شەوکانی) لە (نیل الأوطار) دا دەڵێت: (ئەو فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی سوێند شکاندن باشترە لە بەردەوام بوون لەسەری ئەگەر لە سوێند خستنەکەدا بەرژەوەندیەک هەبێت، ئەوەش بەپێی ئەو شتە جیاوازی هەیە کە سوێندی لەسەر خوراوە، ئەگەر سوێندی خوارد لەسەر کارێکی واجب یان ئەنجام نەدانی حەرامێک ئەوە سوێندەکە گوێڕایەڵی فەرمانی خوایەو واجبە بەردەوامی بدات بە سوێندەکەی و شکاندنی سوێندەکەشی حەرامە، هەروەها بە پێچەوانەشەوە، یان ئەگەر سوێندی خوارد لەسەر ئەنجامدانی سوننەتێک ئەوە سوێندەکەی گوێڕایەڵیەو سوننەتە بەردەوامی پێ بدات و مەکروهە سوێندەکەی بخات، ئەگەر سوێندی خوارد لەسەر ئەنجام نەدانی سوننەتێک ئەوا حوکمەکەی پێچەوانەی پێشووە، ئەگەر سوێندی خوارد لەسەر ئەنجامدانی کارێکی موباح...ئەوا ئەگەر کردن و نەکردنی هاوسەنگ بوون و جیاواز نەبوون ئەوا راستتر ئەوەیە درێژە

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٠٤.

[2] صحيح مسلم - كتاب الأيمان - باب ندب من حلف يمينا فرأى غيرها خيرا منها أن يأتي الذي هو خير ويكفر عن يمينه، الرقم ١٦٥٠.

بدات بە سوێندەکەی، چونکە فەرموودەکە فەرموویەتی با چاکترەکە بکات.[1]

جا ئەو بڕیاری خۆبەستنەوەی بیشر لەگەڵ ڕەحیمی کوڕیدا بڕیارێکی چاک نەبوو کە سوێندی لەسەر خواردبوو، بۆیە پێغەمبەری خواش(ﷺ) داوای لێکرد درێژە نەدات بە سوێندەکەی و سوێندەکەی بخات.

ئیبن تەیمیە دەڵێت: ئەگەر کەسێک وتی: حەڵاڵم لێ حەرام بێت ئەوە ناکەم، یان تەڵاقم لەسەر بێت ئەگەر ئەوە بکەم، یان ئەگەر ئەوە بکەم حەجێکم لەسەر بێت یان ئەگەر ئەوە بکەم سامانەکەم هەمووی بکەم بە خێر، ئەوا بەرامبەر بەوە دەبێت کەفارەتی سوێندێ بدات، ئەگەر کەفارەتی ظیهار بدات ئەوە زۆر باشترە، کەفارەتی سوێندیش سەرپشکە تیایدا ئایا کۆیلەیەک ئازاد دەکات یان نانی دە هەژار دەدات یان جلوبەرگ بۆ دە هەژار دەکڕێت، ئەگەر نانی پێدان ئەوا دەبێت بۆ هەرکامیان نانێکی باوی ناو وڵاتی خۆی بدات.[2]

## ٤٧٣. بیشری کوڕی قودامە(رضي الله عنه)

ناوی بیشری کوڕی قودامەی ضەبابیە،[3] چوویە یەمەن و لەوێ نیشتەجێ بوو، [4]بیشر لە حەجیماڵئاواییدا بەشدار بوو و فەرموودەیەکیشی گێڕاوەتەوە.[5]

بیشر دەڵێت: ئەم دوو چاوەم خۆشەویستەکەمیان بینی کە پێغەمبەری خوایە(ﷺ)، لە عەرەفات لە سەر وشترە سوورە گوێ ڕەپەکەی ڕاوەستابوو و قەتیفەیەکی پۆلانی لەژێردا بوو، دەیفەرموو (اللهم اجعله حجا غير رياء ولا هياء

[1] نيل الأوطار للشوكاني، ج٩، ص١٣٦.

[2] إقامة الدليل على بطلان التحليل لابن تيمية، ج٣، ص٧٠.

[3] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ١٧١.

[4] أسد الغابة، ج١، ص ٢٨٢.

[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٠٤.

ولا سمعة)،[(١)] (خوایـە بیکەیتـە حەجێکـی دوور لـە رووپامایـی و ویسـتی نـاوو ناوبانـگ)، خەڵکیش دەیانـوت ئـەوە پێغەمبـەری خوایـە(ﷺ).[(٢)]

## ٤٧٣. بیشری کوڕی موحتەفەز(رضي الله عنه)

نـاوی بیشـری کوڕی موحتەفەزەو یەکێک بوو لە کاربەدەستانی سـەردەمی خیلافەتی عومـەری کوڕی خەططاب و خەلیفە کردی بە بەرپرسـی ناوچەی سـووس، بیشـر پرسـیاری لـە خەلیفـە کـرد ئایـا ئـەو دیاریانـە وەربگرێـت کـە عەجەمـەکان دەیکەنـە خەڵاتـی؟ ئەویش رێـی پـێ نـەدا.[(٣)]

## ٤٧٤. بیشری کوڕی موعاویە(رضي الله عنه)

نـاوی بیشـری کـوڕی موعاویـەی کـوڕی ثـەوری کـوڕی موعاویـەی بەککائیـە،[(٤)] بیشـر و باوکیشـی هاوەڵـی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) بـون، چونکـە لەگـەڵ باوکیـدا هاتـە خزمـەت پێغەمبـەر(ﷺ).[(٥)]

بیشـر لـە گـەڵ موعاویـەی باوکیدا زۆر چاکەکار بـوو و باوکیشـی لێـی رازی بوو،[(٦)] هەرچەنـدە باوکـی زۆر پیـر و بەتەمـەن بوو.[(٧)]

هەروەهـا بیشـر کوڕێکـی هەبـوو بـە نـاوی موحەممـەد کـە شـاعیر بـوو و بەسـەرهاتی باوکـی بـە شـیعر هۆنیوەتـەوە،[(٨)] کچێکیشـی هەبـوو کـە نـاوی مەیموونـە بـوو.[(٩)]

---

(١) صحیح ابن خزیمة - کتاب المناسک - باب الاستعاذة في الموقف من الریاء والسمعة في الحج، الرقم ٢٨٣٦، صححه الألباني في السلسلة الصحیحة، ٦/٢٢٩.

(٢) معرفة الصحابة لأبي نعیم الأصبهاني، الرقم ١١١٠.

(٣) الإصابة في تمییز الصحابة، ج١، ص ٣٠٤.

(٤) معجم الصحابة لابن قانع، ج١، ص ٧٩، أسد الغابة، ج١، ص ٢٨٣.

(٥) الإستیعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص١٧٠.

(٦) الطبقات الکبری لابن سعد، ج١، ص٣٠٤.

(٧) أسد الغابة، ج١، ص ٢٨٤.

(٨) الطبقات الکبری لابن سعد، ج١، ص٣٠٤.

(٩) الطبقات الکبری لابن سعد، ج٥، ص٥٠.

ئەم هاوەڵە لە هاوەڵانی دانیشتووی حیجاز بوو و هەر لەوێ مایەوە.[1]

کاتێک موعاویەی باوکی ویستی بچێت بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، بیشری کوڕیشی برد، کە چوونە خزمەتی، پێغەمبەر(ﷺ) دەستی هێنا بەسەر سەری بیشردا،[2] لە گێڕانەویەکی تردا هاتووە موعاویە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەست بێنە بەسەر دەموچاوی کوڕەکەمدا.[3]

هاتنی ئەم وەفدەی بەککائیەکان لە ساڵی نۆی کۆچیدا بوو کە ژمارەیان ٣٠ کەس دەبوو، هەریەک لە موعاویە و بیشری کوڕی و فەجیع هاتبوون، ئەوکات موعاویەی کوڕی ثەور تەمەنی سەد ساڵ دەبوو،[4] هاودەم بە بیشری کوڕی و فەجیعی کوڕی عەبدوڵا و عەبد عەمریی بەککائی هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ)، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمانی کرد ماڵێکیان بۆ تایبەت بکرێت تا تیایدا بمێننەوەو میوانداری بکرێن.[5]

موعاویەی باوکی پێش چوونیان بۆ خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) بە بیشری وت: کە چوویتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) تەنها سێ قسە هەن بێ کەم و زیاد بیانکە، بڵێ سەلامت لێ بێت ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، هاتوم بۆ لات ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) تا سەلامت لێ بکەین و موسڵمان بین، نزای بەرەکەتیشم بۆ بکەیت).[6]

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) سوورەتی (یس) و فاتیحەو (قل هو الله أحد)و (قل أعوذ برب الفلق) و (قل أعوذ برب الناس)ی فێری هەردووکیان کرد، هەروەها فێری کرد پێویستە لەسەرەتای نوێژدا (بسم الله الرحمن الرحيم) بڵێن و بە دەنگی بەرزیش بیڵێن.[7]

[1] أسد الغابة، ج١، ص ٢٨٣.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٠٦.
[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص٣٠٤، البداية والنهاية لابن كثير، ج٥، ص٩١.
[4] البداية والنهاية لابن كثير، ج٥، ص٩١.
[5] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص٣٠٤.
[6] أسد الغابة، ج١، ص ٢٨٣.
[7] معجم ابن المقرىء، الرقم ٤٩، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٠٦.

کاتێک ویستیان بچنەوە پێغەمبەر(ﷺ) چەند گێسکە مێنگەیەکی سپی دا بە بیشر و نزای بەرەکەتیشی کرد بۆیان، ئیتر قات و قڕی و دەرد نەدەهاتە ڕێی بنەماڵەکەی موعاویە.[1]

## ٤٧٥. بیشری کوڕی موعەلا(ﷺ)

ناوی بیشرە، سەبارەت بە ناوی باوکی چەند ڕایەک هەیە، موعەلا یان عەمر، کونیەکەی ئەبولمونذیرە.[2]

## ٤٧٦. بیشری کوڕی هەجەننەع(ﷺ)

ناوی بیشری کوڕی هەجەننەعی بەککائیە،[3] یەکێک بوو لە ئەندامانی وەفدی بەککائیەکان کە هاتنە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمان بوو.[4]

## ٤٧٧. بیشری ئەسەدی(ﷺ)

ئەم هاوەڵە ئافرەتێکی خۆشدەویست کە ناوی هیند بوو، هێندە خۆشەویستی هەبوو بۆ ئەو ئافرەتە کە باس و خواسی بڵاو بووبوویەوە.

بیشری ئەسەدی جارجارە دەچوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، لە کاتی گەڕانەوەیدا دەیدا بە لای جوهەنیەکاندا، لەناو جوهەنیەکاندا ئافرەتێک هەبوو بە ناوی هیندی جوهەنی کە ئافرەتێکی جوان و خوێن گەرم بوو، جارێک سەیری بیشری کرد و بیشریش تەواو عاشقی بوو، هیند مێردێکی هەبوو بە ناوی سەعدی کوڕی سەعید، ئەو ئافرەتە هەموو بەیانیەک دادەنیشت تا بیشر بێت و بیشر سەرسام بکات،[5] بیشر بەو خۆشەویستیەوە مایەوە تا

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص٣٠٤.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٠٧.
[3] أسد الغابة، ج١، ص ٢٨٥.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٠٧.
[5] أسد الغابة، ج٧، ص٣١٤.

بەو خۆشەویستیەوە کۆچی دوایی کرد.[١]

## ٤٧٨. بیلالی کوڕی ڕەباح(ﷺ)

ناوی بیلالی کوڕی ڕەباحە، یەکێک بوو لە دەستەی یەکەمی موسڵمان بوانی مەککە، بانگبێژو خۆشەویست و هاوەڵی زۆر نزیکی پێغەمبەر(ﷺ) بوو،[٢] دایکی ناوی حەمامەیە.[٣]

دەوترێت لە حەبەشە لەدایک بووە، دەشوترێت بەڵکو لە حیجاز لەدایک بوو،[٤] ئیبن کەثیر دەڵێت: لە مەککە لەدایک بوو.[٥]

سەبارەت بە کونیەی بیلال سێ را هەیە: ئەبووعەبدولکەریم، ئەبوو عەبدولا، ئەبوو عەمر.[٦]

بیلالی کوڕی ڕەباح کەسێکی لاوازی باڵابەرز بوو، قژی زۆر بوو.[٧]

بیلال برایەکی هەبوو بە ناوی خالید، رایەک دەڵێت: برای حەق و دایکیەتی، رایەکیش دەڵێت: بەڵکو برای ئایینی بووە،[٨] بەڵام رای یەکەم راستترە، چونکە ئەگەر مەبەست برایەتی کۆچەران و پشتیوانان بێت ئەوا پێغەمبەر(ﷺ) بیلال و ئەبووعوبەیدەی کوڕی جەراحی کرد بە برای یەکتر، یان وەک گێڕانەوەیەکی تر بیلالی لەگەڵ ئەبووروەیحە کرد بە برای یەکتر، ئەگەریش برایەتی گشتی ئایینی بێت ئەوا هەموو هاوەڵان برای ئایینی بیلال بوون.

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٢٠٩.

[٢] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ١٧٨، أسد الغابة، ج١، ص ٣٠٥-٣٠٦، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٢٦، سير أعلام النبلاء، ج١، ص٣٤٧.

[٣] البداية والنهاية لابن كثير، ج ٣، ص ٥٧.

[٤] سير أعلام النبلاء، ج١، ص٣٤٧.

[٥] البداية والنهاية لابن كثير، ج٥، ص ٣٣٣.

[٦] أسد الغابة، ج١، ص ٣٠٥، سير أعلام النبلاء، ج١، ص٣٥٠.

[٧] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٢٣٨.

[٨] أسد الغابة، ج٢، ص ١١٥.

هەروەک لە گێڕانەوەیەکیشدا هاتووە بیلال داوای ژنی کرد بۆ خالیدی برای، بە خاوەن ماڵەکەی وت: ئێمە دوو برای کۆیلە بووین خوا ئازادی کردین، هەژار بووین خوا دەوڵەمەندی کردین، گومڕا بووین خوا ڕێنموونی کردین، ئەگەر کچمان بدەنێ سوپاس بۆ خوا، ئەگەریش جوابمان بکەن ئەوا دەڵێین (لا إله إلا الله)، ئەوەبوو کچەکەیان پێدا.[1]

بیلال خوشکێکیشی هەبوو ناوی غەفرە بوو.[2]

بیلال یەکێک بوو لەو دەستە یەکەمینەی کە موسڵمان بوونی خۆیان ڕاگەیاند، وەک لە گێڕانەوەیەکدا هاتووە یەکەم کەسانێ موسڵمانبوونی خۆیان ڕاگەیاند بریتی بوون لە حەوت کەس: پێغەمبەری خوا(ﷺ) و ئەبووبەکر و عەممار و سومەییەی دایکی عەممار و بیلال و صوهەیب و میقداد، پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبووبەکر بە هۆی هۆزەکانیانەوە خوا لە زیانی بێباوەڕان پاراستنی، بەڵام ئەو پێنجەکەی تر لەلایەن بێباوەڕانەوە سزا دەدران، بەرگی ئاسنینیان دەکرایە بەر و دەبرانە بەر گەرمای خۆر، دواجار هەریەک لەوانە داوای دوژمنیان هێنایەدی-واتە بە ناچاری و بە رووکەش داواکەی بێباوەرانیان قبووڵ کرد- جگە لە بیلال کە ئامادەیی نەبوو داواکەیان قبووڵ بکات، ئەوانیش دەیاندایە دەست مێردمنداڵان تا رایکێشن بە دۆڵەکانی مەککەدا، ئەویش بەردەوام دەیوت أحد أحد.[3]

بۆ ئەوەی منداڵان رایبکێشن پەتێکیان دەخستە گەردنی و دواتر پەتەکەیان دەدایە دەست منداڵانیان تا رایبکێشن.[4]

لە فەرموودەیەکدا هاتووە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت (السباق أربعة أنا سابق

---

[1] أسد الغابة، ج٢، ص ١١٥.

[2] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ١٨٠.

[3] سنن ابن ماجه - أبواب السنة - باب في فضائل أصحاب رسول الله(ﷺ) - فضائل بلال(رضي الله عنه)، الرقم ١٥٠، المستدرک علی الصحيحين - كتاب معرفة الصحابة(رضي الله عنهم) - ذكر بلال بن رباح - أول من أظهر إسلامه سبعة، الرقم ٥٢٧٣، قال الحاكم صحيح الإسناد و لم يخرجاه و وافقه الذهبي، قال الألباني في صحيح و ضعيف سنن ابن ماجة، الرقم ١٥٠ حسن صحيح.

[4] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٢٣٣.

العرب وسلمان سابق الفرس وبلال سابق الحبشة وصهيب سابق الروم)،[1] (پێشکەوتوان چوارن، من پێشکەوتووی عەرەبم، سەلمان پێشکەوتووی فارسە، بیلال پێشکەوتووی حەبەشەیە، صوهەیب پێشکەوتووی رۆمە).

بیلالی کوڕی رەباح کۆیلەی ئومەییەی کوڕی خەلەف بوو، ئومەییەش لەسەر موسڵمانبوونی سزای سەختی دەدا.[2]

کاتێک بیلال ئازار دەدرا بێباوەڕان پێیان دەوت: ئەوە بڵێ کە ئێمە دەیڵێین، بیلالیش دەیوت زمانم پێی ناوترێت-نایەتە سەرزمانم-[3] وەک ئەوەی بڵێت وا کوفرم وازلێهێناوە زمانیشم نەتوانێت بیڵێتەوە.

جارێک بیلالی کوڕی رەباح لەلایەن قورەیشیەکانەوە ئازار دەدرا، پێغەمبەر(ﷺ) کە ئەوەی دیبوو کاتێک گەیشت بە ئەبووبەکر فەرمووی: (لو كان عندنا شي و اشترينا بلالا)، (خۆزگە شتێکمان لا دەبوو-پارەیەکمان دەبوو-بیلالمان پێ دەکڕی)، ئەوەبوو ئەبووبەکر گەیشت بە عەبباسی کوڕی عەبدولموطەلیب و وتی: بیلالم بۆ بکڕە، عەبباسیش چوو بۆ لای گەورەکەی بیلال و وتی: ئەتوانیت پێش ئەوەی خێر لەو بەندەیەت نەبینیت بیفرۆشیت بە من؟ ئەویش وتی: جا چی پێ دەکەیت؟ ئەوە پیسە، ئەوە... عەبباس بیلالی کڕی و ناردی بۆ لای ئەبووبەکر، ئەویش ئازادی کرد.[4]

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە ئەبووبەکر بینی بیلالیان سزا دەداو ئەویش هەر دەیوت ئەحەد ئەحەد، ئەبووبەکر وتی: لەسەر چی دەیکوژن خۆ ئەو هەر بەقسەتان ناکات، ئەوانیش وتیان دەی بیکڕە، ئەویش بیلالی کڕی و ئازادی کرد.[5]

---

[1] المستدرك على الصحيحين - كتاب معرفة الصحابة(رضي الله عنهم) - ذكر بلال بن رباح - خير السودان ثلاثة، الرقم ٥٢٧٨، ضعفه الذهبي في التعليق على المستدرك، ضعفه ابن حجر العسقلاني في المطالب العالية، ضعفه الألباني في السلسلة الضعيفة، الرقم ٢٩٥٣.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٢٦.

[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج ٣، ص ٢٢٣.

[4] جامع معمر بن راشد، الرقم ١٠٢١، سير أعلام النبلاء، ج١، ص٣٥٢.

[5] سير أعلام النبلاء، ج١، ص٣٥٣.

گێڕانەوەیەک هاتووە جارێک بیلال سزا دەدرا، وەرەقەی کوڕی نەوفەل دای بە لایدا و بیلال دەیوت ئەحەد ئەحەد، ئەویش وتی: ئەحەد ئەحەد ئەڵڵاه ئەی بیلال،[1] بەڵام ذەهەبی دەڵێت: ئەمە راست نیە چونکە وەرەقەی کوڕی نەوفەل تا ئەو کاتە نەژیاوە.[2]

لە مەککەدا جارێک ئەقرەع لە گەڵ عویەینە تێپەڕ دەبوون، سەیریان کرد پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ عەممار و صوهەیبو بیلال و خەبباب و چەند موسڵمانێکی تری لاوازدا دانیشتووە، ئەوانیش گاڵتەیان پێکرد و دەیانوت کاتێ وەفدی عەرەب دێن شەرم دەکەین بمانبینن تۆ لەگەڵ ئەوانەدا دانیشتبیت، هەرکات هاتین بۆ لات تۆ ئەوانە دەرکە، پێغەمبەریش(ﷺ) رازی بوو، ئەوانیش وتیان دەی بەڵێنێکمان بۆ بنووسە، ئەویش ویستی بینووسێت و عەلی کوڕی ئەبوو طالیبی بانگ کرد تا بینووسێت، ئەوەبوو جبریل هات و ئەم ئایەتەی بۆ هێنا (ولا تطرد الذين يدعون ربهم بالغداة والعشي يريدون وجهه ما عليك من حسابهم من شئ وما من حسابك عليهم من شئ فتطردهم فتكون من الظالمين وكذلك فتنا بعضهم ببعض ليقولوا أهؤلاء من الله عليهم من بيننا أليس الله بأعلم بالشاكرين)، پێغەمبەر(ﷺ) وەرەقەکەی فڕێ داو ئەو هاوەڵانەی بانگ کردەوەو پێی فەرموون (سلام عليكم)، ئەوانیش دەورەیان لێ دا.[3]

کاتێک هاوەڵان کۆچیان کرد بۆ مەدینەو لەوێ مانەوە، هەریەک لە بیلال و ئەبووبەکری صدیق تووشی تا بوون، کە ئەبووبەکر تاکەی زیادی دەکرد دەیوت:

كل امريء مصبح في أهله

والموت ادنى من شراك نعله

---

[1] حلية الأولياء لأبي نعيم الأصبهاني، ج١، ص ١٤٨.

[2] تأريخ الإسلام للذهبي، ج٣، ص ٢٠٣.

[3] حلية الأولياء، ١، ص١٤٧، البداية والنهاية، ج٦، ص٥٧.

هەرکاتیش بیلال تاکەی زیادی دەکرد دەیوت:

ألا ليت شعري هل أبيتن ليلة

بواد وحولي إذخر وجليل

وهل اردن يوما مياه مجنة

وهل يبدون لي شامة وطفيل

ئینجا دەیوت: خوایە نەفرین بکە لە شەیبەی کوڕی رەبیعەو عوتبەی کوڕی رەبیعەو ئومەییەی کوڕی خەلەف چۆن لە خاکی خۆمانەوە دەریانکردین بۆ خاکی دەرد و نەخۆشی، دواتر پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (اللهم حبب إلينا المدينة كحبنا مكة أو أشد اللهم بارك لنا في صاعنا وفي مدنا وصححها لنا وانقل حماها إلى الجحفة)،[1] (خوایە مەدینەمان لا خۆشەویست بکە وەک خۆشەویستیمان بۆ مەککە یان زیاتر لەوەش، خوایە بەرەکەت بخەرە رزق و رۆزیمانەوە و تەندروستی بکە بۆمان، تای مەدینەش بگوازەرەوە بۆ جوحفە).

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) برایەتی خستە نێوان کۆچەرانەوە، برایەتی خستە نێوان بیلالی کوڕی رەباح و ئەبووعوبەیدەی کوڕی جەراحەوە.[2]

هەروەها کە برایەتی خستە نێوان کۆچەران و پشتیوانانەوە، برایەتی خستە نێوان بیلال و ئەبوروەیحەوە، ئیتر بیلال دەیوت ئەبوروەیحە برامە، پێغەمبەریش(ﷺ) دەیفەرموو (تۆ برای ئەویت و ئەویش برای تۆیە).[3]

کاتێکیش عومەری کوڕی خەططاب دیوانی دانا و ناوەکانی تۆمار دەکرد، عومەر بە بیلالی وت: دیوانت لەگەڵ کێ دادەنێیت؟ ئەویش وتی: لەگەڵ ئەبوروەیحە، هەرگیز لێی جیا نابمەوە لەبەر ئەو برایەتیەی کە پێغەمبەر(ﷺ) خستیە نێوانمانەوە.[4]

ئیبن سەعد هێناویەتی پێغەمبەر(ﷺ) برایەتی خستە نێوان بیلال و

---

[1] صحيح البخاري - فضائل المدينة - باب حدثنا مسدد، الرقم ١٨٨٩.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٢٦.

[3] الكنى والأسماء للدولابي، الرقم ٨٤١، أسد الغابة، ج٦، ص ١٢٣.

[4] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٢٣٤.

عوبەیدەی کوڕی حارثەوە.[١]

بیلالی کوڕی ڕەباح یەکێک بوو لە بەشداربوانی بەدرو لەو غەزایەدا ڕۆڵی بەرچاوی هەبوو، ویستی خواش وابوو لەو غەزایەدا بیلال ئومەییەی کوڕی خەلەفی کوشت.[٢]

لە غەزای بەدردا ئومەییەی کوڕی خەلەف و عەلی کوڕیشی بەشدار بوون، پێشتر ئومەییە هاوڕێی نزیکی عەبدورەحمانی کوڕی عەوف بوو، بەڵام ئامادەیی نەبوو بە عەبدورەحمان بانگی بکات، بۆیە لەسەر ئەوە ڕێککەوتن ئەگەر بە عەبدولئیلاه بانگی بکات وەڵامی بداتەوە، ئەوەبوو لە جەنگی بەدردا ئومەییە هاواری کرد عەبد عەمر، بەڵام عەبدورەحمان وەڵامی نەدایەوە، ئینجا هاواری کرد عەبدولئیلاه، ئیتر عەبدورەحمان وەڵامی دایەوە، ئەوەبوو داوای پەنای کرد... کاتێک بیلالی کوڕی ڕەباح ئومەییەی بینی وتی: ڕزگارم نەبێت ئەگەر بهێڵم تۆ ڕزگار بیت، عەبدورەحمان وتی: بیلال ئەوە دیلی منە، بیلال وتی: ڕزگارم نەبێت ئەگەر بهێڵم ئەو ڕزگار بێت، دواتر بیلال تا توانی هاواری کرد ئەی پشتیوانانی خوا وا سەری کوفر ئومەییەی کوڕی خەلەفە ڕزگارم نەبێت ئەگەر بهێڵم ڕزگاری بێت، هاوەڵان دەوریان دان، کەسێک دای لە عەلی کوڕی ئومەییە وکوشتی، ئینجا دایان لە ئومەییەش و ئەویشیان کوشت.[٣]

بیلال لە غەزاکانی ئوحود و خەندەق و هەموو غەزاکانی تریشدا بەشداری کرد.[٤]

بیلال لەلایەن پێغەمبەری خواوە(ﷺ) مزگێنی چوونە بەهەشتی پێ دراوە، وەک لە فەرموودەیەکدا هاتووە پێغەمبەر(ﷺ) جارێک لە کاتی نوێژی بەیانیدا بە بیلالی کوڕی ڕەباحی فەرموو (حدثني بأرجى عمل عملته في الإسلام فإني

[١] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٢٣٣، الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ١٧٨.
[٢] أسد الغابة، ج١، ص ٣٠٦.
[٣] البداية والنهاية لابن كثير، ج٣، ص ٢٨٦.
[٤] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٢٣٨.

سمعت دف نعليك بين يدي في الجنة)، (ئەی بیلال پێم بڵێ چ کارێکت لە ئیسلامدا کردووتە زۆر دڵی خۆش کردویت و هیوات پێیەتی، چونکە من لە بەهەشتدا گوێم لە تەپەی نەعلەکانت بوو لە پێش خۆمەوە)، بیلال وتی: هیچ کارێکم نەکردووە هیوابەخشتر بێت هێندەی ئەوەی هەرکات دەستنوێژم گرتبێت شەو بێت یان رۆژ هێندەی بۆم نووسرابێت بەو دەستنوێژە نوێژم کردووە. [1]

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە بەیانیەک پێغەمبەر(ﷺ) بیلالی بانگ کرد و فەرمووی: (يا بلال بم سبقتني إلى الجنة إني دخلت البارحة الجنة فسمعت خشخشتك أمامي)، (ئەی بیلال بە چی پێش من کەوتیت بۆ بەهەشت، من دوێنێ شەو چوومە بەهەشت دەنگی خشەی پێکانی تۆم دەبیست لەپێش خۆمەوە)، بیلال وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەرکات بانگم داوە دوو رکات نوێژم کردووە، هەرکات دەستنوێژم شکابێت خێرا دەستنوێژم گرتوەتەوە، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (بهذا) (دەی بەوە بووە). [2]

لە گێڕانەوەیەکدا هاتووە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت (بلال سيد المؤذنين يوم القيامة ولا يتبعه إلا مؤمن والمؤذنون أطول الناس أعناقا يوم القيامة)، [3] (بیلال گەورەی بانگبێژانە لە رۆژی دواییدا، تەنها باوەڕداریش شوێنی دەکەوێت، بانگبێژان لە رۆژی دواییدا درێژترین گەردنیان هەیە).

سەبارەت بە جۆری بانگدانەکەی بیلال گێڕانەوەیەک هاتووە بەم جۆرە:

پێغەمبەر(ﷺ) سەرەتا بۆ کۆکردنەوەی خەڵک بۆ نوێژ چاوەڕێی خەڵکی دەکرد لە کاتی نوێژەکاندا بێن بۆ نوێژ بێ ئەوەی بانگ بکرێن،

---

[1] صحيح البخاري - أبواب التهجد - باب فضل الطهور بالليل والنهار وفضل الصلاة بعد الوضوء بالليل والنهار، الرقم ١١٤٩.

[2] صحيح ابن خزيمة - كتاب الصلاة - جماع أبواب التطوع غير ما تقدم ذكرنا لها - باب استحباب الصلاة عند الذنب يحدثه المرء لتكون تلك الصلاة كفارة لما أحدث من الذنب، الرقم ١٢٠٩، صححه الألباني في صحيح الترغيب و الترهيب، الرقم ٢٠.

[3] مصنف ابن أبي شيبة - كتاب الأذان - في فضل الأذان وثوابه، الرقم ٢٣٥٧، ضعفه الذهبي.

بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) ویستی وەک بووقەکەی جوولەکە بووقێک دابنێت تا موسڵمانان بانگ بکرێن بۆ نوێژ، بەڵام دڵی نەیگرت و پێی خۆش نەبوو، دواتر فەرمانی کرد بە زەنگ تا بەوە موسڵمانان بانگ بکرێن بۆ نوێژ، لەو حاڵەدا بوو کە عەبدوڵای کوڕی زەیدی کوڕی عەبد رەببیە لە خەودا بانگی پێ وترا، عەبدوڵا هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەمشەو لەخەومدا کەسێک هات دوو جلی سەوزی لەبەربوو و زەنگێکی بەدەستەوە بوو، وتم: ئەی بەندەی خوا ئەو زەنگە دەفرۆشیت؟ وتی: بۆ چیتە؟ وتم: تا خەڵکی پێ بانگ بکەین بۆ نوێژ، ئەویش وتی: ئایا لەوە چاکترت پێ نیشان بدەم؟ وتم: چیە؟ وتی: بڵێ:

الله أكبر الله أكبر

الله أكبر الله أكبر

أشهد أن لا إله إلا الله

أشهد أن لا إله إلا الله

أشهد أن محمدا رسول الله

أشهد أن محمدا رسول الله

حي على الصلاة

حي على الصلاة

حي على الفلاح

حي على الفلاح

الله أكبر الله أكبر

لا إله إلا الله

دواتر کەمێک وەستا و پاشان هەمان شتی وت: بەڵام بە تاک هەمووی وت، بەڵام لە کۆتاییدا وتی:

قد قامت الصلاة قد قامت الصلاة

الله أكبر الله أكبر

لا إله إلا الله

کاتێک ئەو خەوەی گێڕایەوە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: پشت بە خوا ئەو خەوە راستە، دەی هەستە بیڵێ بە بیلال چونکە ئەو دەنگی لەتۆ بەرزتر و باشترە، کاتێک بیلال هەستا ئەو بانگەی دەدا عومەری کوڕی خەططاب لەماڵەوە بوو ئەوەی بیست، خێرا هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و عەباکەی رادەکێشا و دەیوت ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) سوێند بەوەی تۆی بە حەق ناردووە من هەمان ئەم خەوەم بینی کە -عەبدولا- بینیویەتی، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (فلله الحمد فذاك أثبت)،[1] (سوپاس بۆ خوا، دەی ئەوە دڵنیاتر و چەسپاوترە).

بەنی ئەبولبوکەیر هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و وتیان خوشکەکەمان مارە بکە لە فڵانەکەس، ئەویش فەرمووی: ئەی چۆنە بیدەن بە بیلال، ئەوانیش چوون و قسەیان نەکرد، پاش ماوەیەک هاتنەوەو وتیان خوشکەکەمان مارە بکە لە فڵانەکەس، ئەویش فەرمووی: ئەی چۆنە بیدەن بە بیلال؟ ئەوانیش چوون و پاش ماوەیەکی تر هاتنەوەو وتیان خوشکەکەمان مارە بکە لە فڵانەکەس، ئەویش فەرمووی: ئەی چۆنە بیدەن بە بیلال، چۆنە بیدەن بە کەسێک لە دارودەستەی بەهەشت، ئەوانیش خوشکەکەیان مارەکرد لە بیلال.[2]

جارێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) سەردانی بیلالی کرد، بیلال بڕێک خورمای هێنا کە هەڵیگرتبوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەوە چیە ئەی بیلال؟ وتی: خورمایە ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەڵمگرتووە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (أما خفت أن تسمع له بخارا في جهنم ؟ أنفق بلال ولا تخافن من ذي العرش إقلالا)،[3] (ئایا

---

[1] صحيح ابن خزيمة - كتاب الصلاة - جماع أبواب الأذان والإقامة - الدليل على أن النبي(ﷺ) أمر بأن يشفع بعض الأذان لا كلها، الرقم ٣٧٠، حسنه الألباني في إرواء الغليل، الرقم ٢٤٦.

[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٢٣٧، السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٢٨٧٨.

[3] مسند أبي يعلى الموصلي - مسند أبي هريرة، الرقم ٦٠٤٠، قال الألباني في السلسلة الصحيحة، الرقم

ناترسیت لەبەرئەوە دەنگی بوخار لە دۆزەخ ببیستیت، ببەخشە ئەی بیلال و مەترسە خاوەنی عەرش کەمی بکاتەوە).

پێغەمبەر(ﷺ) باس لەو بارە سەختە دەکات کە لەگەڵ بیلال پێکەوە بینیویانە، دەفەرموێت (لقد أخفت في الله تعالى وما يخاف أحد، ولقد أوذيت في الله وما يؤذى أحد، ولقد أتت علي ثلاثون من يوم وليلة ما لي ولا لبلال طعام يأكله أحد إلا شيء يواريه إبط بلال)،[1] (لەبەر خوا ترسێنراوم لەکاتێکدا کەس ترسی نەبوو، لەبەر خوا سزا دراوم کاتێک کە کەس سزا نەدەدرا، جار بووە ۳۰ ڕۆژ و شەوم بەسەردا هاتووە و من و بیلالیش هیچ خواردنێکمان نەبووە بیخۆین جگە لە شتێ کە لە ژێر باڵی بیلالدا هەبوو-ئەو توێشووەی بیلال خستبوویە بن باڵی-).

فەرموودەیەکی لاواز هاتووە کە بیلال دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرمووم (ئەی بیلال بە هەژاری بمرەو بە دەوڵەمەندی مەمرە)، وتم: ئەی چۆن وا بکەم؟ فەرمووی: (چی ڕۆزیت پێ بەخشرا مەیشارەوەو هەرکات داوات لێ کرا دەست مەگرەوە).[2]

لە فەتحی مەککەدا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد بە بیلالی کوڕی ڕەباح تا بچێتە سەر کەعبە و بانگ بفەرموێت، ئەوەبوو ئەویش سەرکەوتە سەر کەعبە و بانگی فەرموو.[3]

کاتێک بانگی دەفەرموو هەریەک لە حارثی کوڕی هیشام و صەفوانی کوڕی ئومەییە دانیشتبوون یەکێکیان بەوی تری وت: بڕوانە ئەو حەبەشیە، ئەوی تریشیان وتی: ئەگەر خوا رقی لێی بێت دەیگۆڕێت.[4]

---

٢٦٦١، إسناده جيد.

[1] جامع الترمذي - أبواب صفة القيامة والرقائق والورع عن رسول الله(ﷺ)، الرقم ٢٤٧٢و قال حديث حسن صحيح.

[2] المعجم الكبير للطبراني - باب الباء - من اسمه بلال - بلال بن رباح مؤذن رسول الله(ﷺ) - أبو سعيد الخدري عن بلال(ﷺ)، الرقم ١٠٢١، ضعفه الألباني في ضعيف الترغيب والترهيب، الرقم ٥٤٣.

[3] سير أعلام النبلاء/ ج١، ص ٣٥٦.

[4] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٢٣٥.

ئیبن سەعد گێڕانەوەیەکی هێناوە دەڵێت: کاتێک بیلال ئامادە بوایە بانگی دەفەرموو، ئەگەر بیلال ئامادە نەبوایە ئەوە ئەبوو مەحذورە بانگی دەدا.[1]

بیلالی کوڕی ڕەباح یەکەم بانگ بێژی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، دواتریش لە مانەوەو گەشت و چوونەدەرەوەی پێغەمبەردا(ﷺ) بەردەوام بیلال بانگی دەدا.[2]

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی دوایی کرد و تەرمەکەی خرایە ناو گۆڕەوەو داپۆشرا، ئینجا بیلال بڕێک ئاوی هێنا و دەیپرژاند بەسەر گۆڕەکەیدا، لە لای ڕاستەوە لە سەریەوە دەستی پێکرد تا لای قاچەکانی ئاوپرژێن کرد.[3]

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی دوایی کرد ئیتر بیلال توانای نەما بانگ بدات، شارەکەی پێغەمبەر(ﷺ) دەنگی بانگی بانگبێژەکەی پێغەمبەری خوای(ﷺ) تێدا نەما، تەنانەت توانای ئەوەی نەما لە مەدینەش بمێنێتەوە، بۆیە هات بۆ لای خەلیفەی یەکەمی موسڵمانان ئەبووبەکری صدیق و داوای مۆڵەتی لێکرد تا بچێت بۆ جیهاد، ئەوەبوو کاتێک ئەبووبەکر لە ڕۆژی هەینیدا لەسەر مینبەر بوو، بیلال ئەبووبەکری دواند، خەلیفە داوای لێکرد بیلال لە مەدینە بمێنێتەوە، بیلال لە وەڵامدا پێی وت: لەبەر خوا ئازادت کردم یان لەبەر خۆت؟ ئەبووبەکر وتی: لەبەر خوا، بیلال وتی: دەی ڕێم بدە بچم بۆ جیهاد، خەلیفەش ڕێی پێدا و بیلالیش چوو بەرەو شام.[4]

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە بیلال بە ئەبووبەکری وت: من لە پێغەمبەری خوام(ﷺ) بیستووە دەیفەرموو (أفضل أعمال المؤمن الجهاد في سبيل الله)، (چاکترین کاری باوەڕدار جیهادی ڕێی خوایە)، جا منیش دەمەوێت تا مردن لە سەنگەری جیهاددا بم، ئەبووبەکر وتی: ئەی بیلال سوێندت دەدەم بە خوا لەبەر ڕێز و مافی من مەڕۆ، وا من پیر بووم و مەرگم نزیک بوەتەوە،

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص٢٣٤.
[2] أسد الغابة، ج١، ص ٣٠٦.
[3] البداية والنهاية لابن كثير، ج٥، ص ٢٧١.
[4] سير أعلام النبلاء، ج١، ص٣٥٧.

ئیتر بیلال لەگەڵ ئەبووبەکر مایەوە تا وەفاتی کرد، ئینجا هات بۆ لای عومەر و داوای مۆڵەتی کرد، عومەریش هەمان شتی پێ وت، بەڵام بیلال بە داواکەی رازی نەبوو، عومەر داوای لێکرد بانگ بدات،[1] بیلال وتی: من بانگبێژی پێغەمبەر(ﷺ) بووم تا وەفاتی کرد، دواتریش بانگبێژی ئەبووبەکر بووم چونکە ئەو چاکەی هەبوو بەسەرمەوە، من لە پێغەمبەری خوام(ﷺ) بیستووە دەیفەرموو (ئەی بیلال کارێک نیە چاکتر بێت لە جیهادی رێی خوا)، بۆیە بیلال چوو بەرەو شام.[2]

بەڵام ئیبن کەثیر دەڵێت: راستتر و باوتر ئەوەیە بیلال دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) بانگی نەداوە بۆ ئەبووبەکر و چووە بۆ شام.[3]

دواتر کاتێک عومەری کوڕی خەططاب چوویە شام موسڵمانان داوایان کرد لە عومەر تا تکایان بۆ بکات بیلال بانگیان بۆ بدات، ئەویش داوای لە بیلال کرد، بیلالیش رۆژێک بانگی فەرموو، خەڵکەکە بە بیستنی ئەو بانگە پێغەمبەری خوایان(ﷺ) دەهاتەوە بیر و دەستیان کرد بە گریان، گریانێک کە نەبینرابوو شار ئاوا بەجارێک گریان دایبگرێت.[4]

لەو ماوەی بیلال لە شام بوو جارێک گەڕایەوە بۆ مەدینەو لەوێ بانگێکی فەرمووو.[5]

پاش ماوەیەک بیلال خەوی دی بە پێغەمبەری خواوە(ﷺ)، لە خەوەکەیدا پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو ئەو هەموو جەفاو دوورگرتنەت چیە ئەی بیلال، ئایا کاتی نەهاتووە سەردانم بکەیت، بیلال بە خەفەت و دڵداگیرانەوە لەخەو راچڵەکی، سواری وڵاخەکەی بوو بەرەو مەدینە، چوویە لای گۆڕەکەی پێغەمبەر(ﷺ) و دەگریا، لەو کاتەدا حەسەن و حوسەین-دوو رەیحانەکەی

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٢٣٦، أسد الغابة، ج١، ص ٣٠٧.

[2] أسد الغابة، ج١، ص ٣٠٧، المطالب العالية لابن حجر، الرقم ١٩٨٠.

[3] البداية والنهاية لابن كثير، ج٥، ص ٣٣٤.

[4] سير أعلام النبلاء، ج١، ص٣٥٧.

[5] أسد الغابة، ج١، ص ٣٠٧.

پێغەمبەر(ﷺ)- هاتن بۆ ئەوێ، بیلال دەیگوشین بە خۆیدا و ماچی دەکردن، حەسەن و حوسەین وتیان زۆر بە تاسەوەین بانگت ببیستین، ئەویش دڵی دوو رەیحانەکەی نەشکاند و بانگی دا، دەنگی بانگی بیلال لە مەدینەدا بەرزبوویەوە، هەر کە وتی: الله أكبر خەڵکی مەدینە راپەڕین، تا گەیشتە أشهد أن محمدا رسول الله ئیتر گریان هەموانی گرتەوە، دوای پێغەمبەری خوا(ﷺ) رۆژێکی تری وا نەبینرابوو ئاوا گریان هەموان بگرێتەوە.[1]

بیلال لای هاوەڵانی تر زۆر رێزدار و خۆشەویست بوو، ئەمەش چەند نموونەیەک لەو بارەیەوە:

جارێک شاعیرێک شیعری دەهۆنیەوەو بیلالی کوڕی عەبدوڵای بە چاکترین بیلال ناوبرد، ئیبن عومەر لەوێ ئامادە بوو، وتی: درۆت کرد بیلالەکەی پێغەمبەر(ﷺ) چاکترین بیلالە.[2]

عومەری کوڕی خەططاب وەسفی ئەبووبەکری صدیقی دەکرد و دەیوت ئەمەش گەورەمان بیلالە کە چاکەیەکە لە چاکەکانی ئەبووبەکر،[3] هەروەها دەیوت ئەبووبەکر گەورەمانەو گەورەی ئێمەشی ئازاد کرد-واتە بیلال-.[4]

خاکیبوونی بیلال لە ئاستێکدا بوو جارێکیان کەسانێک باسی پلەوپایەی بیلالیان دەکرد، ئەویش وتی: من تەنها حەبەشیەکم کە تا دوێنێ کۆیلە بووم.[5]

بیلال پاش سەفەرەکەی مەدینەی گەڕایەوە شام و لەوێ مایەوە تا لەساڵی بیستی کۆچیدا وەفاتی کرد،[6] یان دەوترێت لە ساڵی بیست و یەکی کۆچیدا وەفاتی کردووە،[7] بۆچوونێ دەڵێت: لە حەڤدەی کۆچی یان

(1) أسد الغابة، ج١، ص ٣٠٧، سير أعلام النبلاء، ج١، ص٣٥٨، قال الذهبي إسناده لين و هو منكر.
(2) سير أعلام النبلاء، ج١، ص٣٤٩.
(3) سير أعلام النبلاء، ج١، ص٣٥٩.
(4) الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٢٣٣، أسد الغابة، ج١، ص ٣٠٧.
(5) الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٢٣٨.
(6) البداية والنهاية لابن كثير، ج٥، ص ٣٣٤.
(7) الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ١٧٩.

هەژدەی کۆچیدا وەفاتی کردووە،[1] ئەوکات تەمەنی لە سەروو شەست و سێ ساڵیەوە دەبوو.[2]

ئیبن عەبدولبەر سەبارەت بە تەمەنی بیلال دوو رای هێناوە، رایەک دەڵێت: بیلال لە تەمەنی شەست و سێ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە، رای دووەم دەڵێت: بەڵکو لە تەمەنی حەفتا ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە.[3]

سەبارەت بە شوێنی ئەسپەردەکردنی دوو بۆچوون هەیە، رایەک دەڵێت: لە دیمەشق بووە، رایەکیش هاتووە کە لە حەلەب بووە، بەڵام ئیبن کەثیر دەڵێت: رای راست ئەوەیە خالیدی برای لە حەلەب مردووە.[4]

## ٤٧٩. بیلالی کوڕی حارث(ﷺ)

ناوی بیلالی کوڕی حارثی کوڕی عوصمی کوڕی سەعیدە،[5] ئەم هاوەڵە لە موزەنیەکانە، یەکێک بوو لە دانیشتوانی دەرەوەی مەدینە، دواتریش چوویە بەصرەو لەوێ مایەوە.[6]

لە ساڵی پێنجەمی کۆچی و لە مانگی رەجەبدا وەفدی موزەینە هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) بیلالی کوڕی حارثیش لەنێویاندا بوو.[7]

پێغەمبەری خوا(ﷺ) عەقیقی بۆ بڕیەوە،[8] لە رۆژی فەتحی مەککەدا ئاڵای موزەنیەکان بەدەست بیلالەوە بوو.[9]

لە ساڵی دەی کۆچیدا بیلال لەگەڵ خالیدی کوڕی وەلیددا بوو کاتێک

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص ٣٠٨.
[2] سير أعلام النبلاء، ج١، ص٣٥٩-٣٦٠.
[3] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ١٧٩.
[4] البداية والنهاية لابن كثير، ج٥، ص ٣٣٤.
[5] أسد الغابة، ج١، ص ٣٠٤، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٢٦.
[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٢٦.
[7] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج ١، ص ٢٩١، أسد الغابة، ج١، ص ٣٠٤.
[8] أسد الغابة، ج١، ص ٣٠٤، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٢٦.
[9] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣٢٦.

پێغەمبەر(ﷺ) داوای کرد بڕوات بانگەوازی بەنی حارث بکات، ئەوانیش کە موسڵمان بوون خالید بە نامەیەک وردەکاری نووسی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و بە بیلالی کوڕی حارثدا نامەکەی نارد بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش نامەکەی گەیاند.[1]

## ٤٨٠. بیلالی کوڕی ئوحەیحە(رضي الله عنه)

ناوی بیلالی کوڕی ئوحەیحەی کوڕی جەلاحە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان.[2]

کوڕێکی هەبوو بە ناوی بولەیل کە لە جەنگی ئوحوددا بەشدار بوو،[3] کوڕێکی تریشی هەبوو بە ناوی عیمران،[4] کوڕێکی تری ناوی داوود یان یەسار بوو، بەڵام زیاتر بە کونیەکەی ناسراوە کە ئەبوو لەیلایە،[5] منداڵێکی تریشی ناوی عەمر بوو کە بەشدار بوو لە غەزای ئوحوددا،[6] کوڕێکی تریشی هەبوو ناوی حارث بوو.[7]

## ٤٨١. بیلز(رضي الله عنه)

سەبارەت بە ناوی ئەم هاوەڵە چەند رایەک هەیە، ناوی بە بیلز یان بیرز یان مالیک هاتووە، باوکی ئەبولعشراء بوو.[8]



(١) الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص ٣٣٩.
(٢) الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٢٥.
(٣) الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٢٩.
(٤) أسد الغابة، ج١، ص ٣١٠.
(٥) الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٢، ص ٤٦١، ج٤، ص ١٥٨١.
(٦) الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٦.
(٧) أسد الغابة، ج٧، ص ٣٠٣، الإصابة في تمييز الصحابة، ج٨ ص ١٤١.
(٨) الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٢٨٥.

## ٤٨٢. تەلیبی کوڕی ثەعلەبە(رضي الله عنه)

ناوی تەلیبی کوڕی ثەعلەبەی کوڕی رەبیعەی تەمیمی عەنبەریە،[١] ئیبن عەبدولبەر بە ثەلیب ناوی دەهێنێت،[٢] بەڵام ئیبن ئەثیر و ئیبن حەجەر بە تەلیب ناویان هێناوە،[٣] ئیبن سەعد بە ناوی تەلیبی کوڕی زەیدی کوڕی عەبدولڵا ناوی هێناوە،[٤] رایەکیش هەیە دەڵێت: تەلیب برای زەینەبی کچی ثەعلەبەیە.[٥]

ئەم هاوەڵە لە نزیکی پێغەمبەری خواوە(ﷺ) بوو و چەندین فەرموودەی لێوە گێڕاوەتەوە.[٦]

تەلیب کوڕێکی هەبوو ناوی هیلقام-یان میلقام- بوو کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە.[٧]

تەلیب دەگێڕێتەوە جارێک چووەتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و داوای کردووە پێغەمبەر(ﷺ) داوای لێخۆشبوونی بۆ بکات، ئەویش لای خوا داوای لێخۆشبوونی بۆ کردووە.[٨]

تەلیب فەرموودەیەکی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە کە دەفەرموێت (الضيافة ثلاثة أيام فما زاد فهو صدقة)،[٩] (میوانداری تا سێ رۆژە، لەوە زیاتر بوو ئەوە صەدەقەیە).

---

[١] أسد الغابة، ج١، ص ٣١٥، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٦٦.

[٢] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ١٩٧.

[٣] أسد الغابة، ج١، ص ٣١٥، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٦٦.

[٤] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص ٤٢.

[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٦٦.

[٦] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٦٦.

[٧] أسد الغابة، ج١، ص ٣١٥.

[٨] أسد الغابة، ج١، ص ٣١٥.

[٩] المعجم الأوسط للطبراني - باب الألف - باب من اسمه إبراهيم - إبراهيم بن عبد الله أبو مسلم الكشي، الرقم ٢٦٠٧، قال الألباني في صحيح الترغيب و الترهيب، الرقم ٢٥٩٣ (صحيح لغيره).

تەلیب دەڵێت: چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ)و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لای خوا داوای لێخۆشبوونم بۆ بکە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی تا مۆڵەتت بۆ بدرێت، ماوەیەک تێپەڕ بوو، تا جارێک پێغەمبەر(ﷺ) تەلیبی بانگ کرد و دەستی هێنا بەسەر دەموچاویدا و فەرمووی: (خوایە لە تەلیب خۆش بە و ڕەحمی پێ بکە)، سێ جار ئەوەی فەرموو.[1]

## ٤٨٣. تەممامی حەبەشی(ﷺ)

یەکێکە لەو هەشت هاوەڵەی لەلای نەجاشیەوە هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ).[2]

ئیبن ئەثیر سەبارەت بە هاتنی ئەم هاوەڵە گێڕانەوەیەک دێنێت: کاتێک موسڵمانانی حەبەشە زانییان پێغەمبەر(ﷺ)و موسڵمانان لە جەنگی بەدردا سەرکەوتن، داوای مۆڵەتیان کرد لە نەجاشی تا بچنەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، ژمارەیەک لەوانەی لای نەجاشی بوون و بڕوایان هێنابوو بە نەجاشییان وت: مۆڵەت بدە بە ئێمەش با بچین بۆ لای ئەو پێغەمبەرەو بزانین ئەو کەسەیە کە لە کتێبەکەماندا باسی کراوە؟ ئەوەبوو چوون بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و لەگەڵیدا بەشداری غەزای ئوحود بوون، ریوایەتێ لە موقاتیل و کەسانی تریشەوە دێنێ کە وتویانە ئەوانە ٤٠ کەس بوون، سی و دوو کەسیان لە گەڵ جەعفەری طەیاردا هاتن، هەشت کەسیشیان لە شامەوە هاتن (بوحەیراو ئەبرەهەو ئەشرەف و تەمام و ئیدریس و ئەیمەن و نافع و تەمیم)، ئەمە گێڕانەوەی ئەبوو مووسا بوو کە ئیبن ئەثیر هێناویەتی، ئیبن ئەثیر دەڵێت: ئەگەر مەبەستی بە بوحەیرا یەکێکی تری جیا لەو بوحەیرایە بێت کە پێغەمبەر(ﷺ) بە منداڵی بینی، ئەوە ئەگەری هەیە

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص ٤٢، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٢٨٥، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٢٣٤.

[2] أسد الغابة، ج١، ص ٣١٧، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٦٦.

ئەم هاتنی وەفدە راست بێت.[1]

ئیبن حەجەر دەڵێت: وادیارە ئەمە بوحەیرایەکی ترە، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) ئەوی لە خاکی شام دیوە، بەڵام ئەم بوحەیرایەیان لە حەبەشە بووە، باکووری ولآت لەکوێ و باشووری لەکوێ، ئاساییە دوو کەس یەک ناویان هەبێ.[2]

بەڵام بەپێی هەموو سەرچاوەکان جەعفەری طەیار (ﷺ) و موسڵمانان لە فەتحی خەیبەردا هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)،[3] دیاریشە غەزای ئوحود لەپێش فەتحی خەیبەر روویداوە، بۆیە هاتنی ئەو کەسانە لەگەڵ جەعفەری طەیار بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و بەشداری کردنیان لە غەزای ئوحوددا، بەپێی سەرچاوەکان هەڵەیەو راستی تێدا نیە، دەشکرێ ئەو ئەگەرە دابنێین ئەو کەسانەی تر (واتە ئەو ٤٠ کەسە) بەجیا و بەبێ جەعفەر هاتبن، وەک چۆن ئیبن حەجەر باس لەوە ناکات هاتنی ئەو کەسانە لەگەڵ جەعفەردا بووبێت.[4]

## ٤٨٤. تەممامی کوڕی عوبەیدە(ﷺ)

ناوی تەممامی کوڕی عوبەیدەی ئەسەدیە، لە کۆچەرانە،[5]برایەکی هەبوو بە ناوی زوبەیر کە ئەویش کۆچی کرد بۆ مەدینە.[6]

تەممامی کوڕی عوبەیدە یەکێک بوو لەوانەی هاودەم بە ئافرەتانی هۆزەکەی (کە بەنو غەنمی کوڕی دوودان بوو) کۆچی کرد بۆ مەدینە.[7]

---

[1] أسد الغابة، ج١ص٧١.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٢٢.

[3] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١ص٢٤٢، أسد الغابة، ج١ص٤٢١، سير أعلام النبلاء للذهبي، ج١ص٢٠٦.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٢٢.

[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٦٦.

[6] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٢، ص ٥١٠، الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٥٥٣.

[7] أسد الغابة، ج١، ص ٣١٧.

## ٤٨٥. تەمیمی کوڕی بیشر(ﷺ)

ناوی تەمیمی کوڕی بیشری کوڕی عەمرە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان، برای سوفیانی کوڕی بیشرە.[1]

تەمیمی کوڕی بیشر لە غەزای ئوحوددا بەشداری کرد.[2]

## ٤٨٦. تەمیمی کوڕی جەراشە

ناوی تەمیمی کوڕی جەراشەی ثەقەفیە، لەناو وەفدی ثەقیفدا هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمان بوونی خۆی راگەیاند.[3]

تەمیم دەڵێت: داوامان کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) تا نووسراوێکمان بۆ بنووسێت و چەند مەرجێکی تێدابێت، ئەویش فەرمووی: (چیتان ویست بینووسن دواتر بیهێنن بۆم)، ئێمەش لە نووسینەکەدا داوامان لێکرد سووخواردن و زینامان بۆ حەڵاڵ بکات، عەلی رازی نەبوو ئەوەمان بۆ بنووسێت، داوامان کرد لە خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص، عەلی وتی: دەزانیت چی دەنووسیت؟ ئەویش وتی: ئەوە دەنووسم کە دەیڵێن، پێغەمبەری خوا(ﷺ) شیاوترە تا بڕیاری لەسەر بدات، تەمیم دەڵێت: ئینجا نووسینەکەمان برد بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش بە خوێنەرەکەی فەرموو بیخوێنەوە، کاتێک گەیشتە مەسەلەی سووخواردنەکە، فەرمووی: دەستم بخەرە سەری، ئەویش دەستی پێغەمبەری(ﷺ) لەسەر دانا، پێغەمبەر(ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە (يا أيها الذين آمنوا اتقوا الله وذروا ما بقي من الربا إن كنتم مؤمنين)، دواتر پێغەمبەر(ﷺ) سڕیەوەو سوکناییش هات بۆ ئێمە، ئیتر لەسەری نەچووین، کاتێکیش گەیشتە مەسەلەی زینا دەستی لەسەر دانا و فەرمووی:

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٧٢.

[2] أسد الغابة، ج١، ص ٣٢٠.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٦٩.

(ولا تقربوا الزنا إنه كان فاحشةوساء سبيلا)، ئینجا ئەوەشی سڕیەوەو فەرمانی کرد ئەو نووسینە لەبەری بگیرێتەوە بۆمان.[1]

## ٤٨٧. تەمیمی کوڕی حارث(رضي الله عنه)

ناوی تەمیمی کوڕی حارثی کوڕی قەیسی کوڕی عەدی کوڕی سەعدی قورەیشی سەهمیە،[2] یەکێک بوو لە کۆچەرانی کۆچی دووەمی حەبەشە.[3]

لە سەری دایکیەوە برایەکی هەبوو بە ناوی سەعیدی کوڕی عەمری تەمیمی،[4] ئیبن ئەثیر دەڵێت: لە سەری باوکیشەوە برایەتی،[5] تەمیم سێ برای تریشی هەبوو بە ناوی ئەبووقەیس و عەبدولا و سائیب،[6] برایەکی تریشی هەبوو بە ناوی حەجاج.[7]

هەریەک لە تەمیم و سەعید و ئەبووقەیس کە برای یەکن پێکەوە کۆچیان کرد بۆ حەبەشە، حەجاجی برایان لە بەدردا بەدیل گیرا، عەبدولای برایان لە رۆژی طائیف شەهید بوو، سائیبی برایشیان لە طائیف بریندار بوو و رۆژی فەحل کوژرا.[8]

حارثی باوکی یەکێک بوو لە کەسە قسەخۆشەکان.[9]

تەمیم لە رۆژی ئەجنادەین لە شام هاودەم بە سەعیدی برای شەهید بوو.[10]

تەمیمی کوڕی حارث یەکێک بوو لەوانەی کە لەبەردەرگا دەوەستا تا بە سەرە مۆڵەتی چوونەژوورەوەی خەڵک بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) رێک بخات.[11]

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص ٣٢٠.
[2] معرفة الصحابة لابن مندة، ج١، ص ٣٢٨.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٦٩.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٦٩.
[5] أسد الغابة، ج٢، ص ٤٥١.
[6] أسد الغابة، ج١، ص ٣٢١.
[7] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ١٩٢.
[8] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ١٩٢.
[9] أسد الغابة، ج١، ص ٣٢١.
[10] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٦٩.
[11] البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٣٢.

## ٤٨٧. تەمیمی کوڕی حوجر(ﷺ)

ناوی تەمیمی کوڕی حوجرە و بە ئەبوو ئەوس ناسراوە، لە ئەسلەمیەکانە و لە ناوچەی ئەسلەمیەکان نیشتەجێ بوو،[1] ئیبن عەبدولبەر بە ئەبوو ئەوس تەمیمی کوڕی حوجر ناوی هێناوە،[2] بەڵام راستتر ئەوەیە ناوی ئەبووتەمیم ئەوسی کوڕی عەبدوڵایە.[3]

## ٤٨٩. تەمیمی کوڕی رەبیعە(ﷺ)

ناوی تەمیمی کوڕی رەبیعەی کوڕی عەوفی جوهەنیە، زوو موسڵمان بوو و لە حودەیبیەو بەیعەتی ریضوانیشدا بەشدار بوو.[4]

## ٤٩٠. تەمیمی کوڕی زەید(ﷺ)

ناوی تەمیمی کوڕی زەیدە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە، برای عەبدوڵای کوڕی زەیدە[5] کە ئەویش هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، تەمیم کوڕێکی هەبوو بە ناوی عەبباد کە فەرموودەی لە باوکی و مامیشیەوە گێڕاوەتەوە.[6]

تەمیم فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوە کە پێغەمبەری خوای(ﷺ) بینیوە دەستنوێژی گرتووە، سەرەتا دەموچاوی شۆردووە، ئینجا هەردوو باڵی، دواتر ئاوی لە دەم و لووتی راداوەو دواتر مەسحی سەری کردووە.[7]

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص ٣٢١.

[2] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ١٩٥.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٧٠.

[4] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ٣٤٥، أسد الغابة، ج١، ص ٣٢٢، الإصابة، ج١، ص ٣٧٠.

[5] معرفة الصحابة لابن مندة، ج١، ص ٣٢١.

[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٧٠.

[7] المعجم الكبير للطبراني - باب التاء - من اسمه تميم - تميم بن زيد أبو عباد الأنصاري ثم المازني، الرقم ١٢٨٥.

## ٤٩١. تەمیمی کوڕی سەعد(رضي الله عنه)

ئەم هاوەڵە ناوی تەمیمی کوڕی سەعدە و لە تەمیمیەکانە، وەک ئەندامی ناو وەفدی تەمیمیەکان هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) و موسڵمان بوو.[١]

## ٤٩٢. تەمیمی کوڕی عەبدعەمر(رضي الله عنه)

ناوی تەمیمی کوڕی عەبدعەمرە، بەڵام زیاتر بە کونیەکەی ناسراوە کە ئەبوو حەسەنی ئەنصاریە،[٢] لە پشتیوانانە لە مازنیەکان،[٣] سەبارەت بە ناوی باوکیشی چەند رایەک هەیە، وەک عەمر یان عەبد عەمر یان عەبدقەیس.[٤]

ئەم هاوەڵە کوڕێکی هەبوو بە ناوی عمارە کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە.[٥]

ئەبووحەسەن هەم لە بەیعەتی عەقەبە و هەم لە غەزای بەدریشدا بەشداری کرد.[٦]

ئەبووحەسەن دەڵێت: جارێک پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ دەستەیەک لە هاوەڵاندا دانیشتبوو، کابرایەک هەستا و نەعلەکانی لەبیر چوو، کەسێکی تریش نەعلەکانی ئەوی خستە ژێر خۆی و شاردیەوە، کابرا هاتەوەو وتی: نەعلەکانم دیار نین، خەڵکەکە وتیان نەماندیون، کابرای تر وتی: من نەعلەکانی تۆم شاردەوە و بۆ یاری و گاڵتە وامکرد، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (فكيف بروعة المؤمن)، ئەی چی دەڵێیت بۆ ترساندنی باوەڕدار،

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٧١.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٧١.

[٣] أسد الغابة، ج٦، ص ٧٩.

[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٨٩.

[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٨٩.

[٦] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٨٩.

کابرا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) سوێند بەوەی تۆی بە حەق ناردووە تەنها بۆ گاڵتە و گەمە ئەوەم کرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی چی دەڵێیت بۆ ترساندنی باوەڕدار، سێ جار ئەوەی فەرموو.[1]

ئەبوو حەسەن دوای پێغەمبەریش(ﷺ) ژیا و تا سەردەمی خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبوو طالیب لە ژیاندا مایەوە.[2]

## ٤٩٣. تەمیمی کوڕی مەعبەد(ﷺ)

ناوی تەمیمی کوڕی مەعبەدی کوڕی عەبد سەعدی کوڕی عامرە، لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان،[3] هاودەم بە مەعبەدی باوکی لە غەزای ئوحوددا بەشداری کرد.[4]

## ٤٩٤. تەمیمی کوڕی یەزید(ﷺ)

تەمیمی کوڕی یەزید لە هاوەڵە پشتیوانەکانە،[5] تەمیم دەڵێت: چووینە مزگەوتی قوباء و پێغەمبەری خوایش(ﷺ) فەرمانی کردبوو موعاذ بەرنوێژییان بۆ بکات، ئەوانیش چاوەڕوانی بوون.[6]

## ٤٩٥. تەمیمی کوڕی ئەسید(ﷺ)

تەمیمی کوڕی ئەسید یان کوڕی ئەسەد، ئەمە جیایە لە تەمیمی خوزاعی، ئەم هاوەڵەیان کونیەکەی ئەبووریفاعەیە و زیاتریش بە کونیەکەی ناسراو بووە،[7] رایەکیش دەڵێت: ناوی عەبدوڵا بووە نەک تەمیم.[8]

[1] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٨٩.
[3] أسد الغابة، ج١، ص ٣٢٤.
[4] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٣، ص ١٤٢٧.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٧٢.
[6] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٢٢٩.
[7] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص ٦٨، الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ١٣٩.
[8] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ١٣٩.

ئەبووریفاعە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) وتاری دەدا کە من چوومە خزمەتی و لە بەردەمیدا وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کەسێکی بێگانە هاتووە پرسیار لەبارەی ئایینەکەیەوە دەکات و نازانێت ئایینەکەی چیە، پێغەمبەر(ﷺ) بەرەورووی چوو و وتارەکەی وەستاند تا هات بۆ لام، ئینجا کورسیەک هێنرا و وابزانم قاچەکانی لە ئاسن بوون، پێغەمبەر(ﷺ) لەسەری دانیشت و خوا چی فێر کردبوو منی فێری ئەوە دەکرد، ئینجا چوو وتارەکەی تەواو کرد.[1]

پێشەوا نەوەوی لە شەرحی ئەم فەرموودەیەدا دەڵێت: (ئەم فەرموودە ئەوەی تێدایە کە کەسی پرسیارکەر کاتێک پرسیار دەکات لە زانا، لە دەربڕینیدا نەرم و نیان و قسەجوان بێت، هەروەها ئەم فەرموودە خاکیبوون و نەرمونیانی پێغەمبەر(ﷺ) بەرامبەر بە موسڵمانان و دڵسووتانی بۆیان نیشان دەدات، هەروەها دەستپێشخەری تێدایە بۆ وەڵامدانەوەی کەسێک کە وەڵام و فەتوای دەوێت و پێوتنی گرنگترین زانیاری پێویستە، لەوانەیە سەبارەت بە ئیمان و بنەما گرنگەکانی ئیمان پرسیاری کردبێت، زانایان لەسەر ئەوە کۆکن کە هەرکەس بێت سەبارەت بە ئیمان و چۆنێتی هاتنە ناو ئیسلام پرسیار بکات ئەوا واجبە وەڵامی بدرێتەوەو بە خێرایی فێربکرێت، هەرەها سەبارەت بەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر کورسی دانیشتووە بۆ ئەوە بووە خەڵکی تر فەرمایشتی ببیستن و ببینن، لەوانەیە ئەو وتارەی پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو وتاری هەینی نەبووبێت بۆیە هێندە بەینی خستوەتە وتارەکەوە، لەوانەشە وتاری هەینی بووبێت و وەستاندبێتی، لەوانەشە زۆر زۆر بەینی تێ نەکەوتبێت، لەوانەشە فەرمایشتی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ ئەو نامۆیە پەیوەست بووبێت بە وتارەکەیەوەو بەشێک بووبێت لە وتارەکەو لەسەرچوونی زیانی نەبووبێت.[2]

---

[1] صحيح مسلم - كتاب الجمعة - باب حديث التعليم في الخطبة، الرقم ٨٧٦

[2] شرح النووى على صحيح مسلم، ج٦، ص ١٦٦.

ئەبوو ریفاعە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ) فێری سوورەتی (البقرة) بوو، هەتا مردیش نە بیری دەچوویەوەو نە لێی تێکدەچوو، بەڵکو زۆر بە جوانی لەبەری بوو و زیاتریش لە شەونوێژدا دەیخوێند، هەروەها تەمیم دەڵێت: دوای ئەوە لە شەونوێژدا هەرگیز پشتم ئازاری نەدەبوو.[1]

ئەم هاوەڵە دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) لە بەصرە نیشتەجێ بوو و لە گەورە هاوەڵانی ناو بەصرە بوو، دواتر لەگەڵ عەبدورەحمانی کوڕی سەمورە چوو بۆ غەزای سجستان و درەنگانێکی شەو هەستا بۆ شەونوێژ،[2] ئینجا کەمێک راکشا و هاوڕێکانی نەیانزانی جێیانهێشت، دەستەیەکی دوژمن هاتن و ئەویان بینی و سەریان بڕی،[3] ئەمەش لە کابول لە ساڵی چل و چواری کۆچیدا بوو.[4]

حەمیدی کوڕی هیلال دەڵێت: ئەبووریفاعە کاتێک لە نوێژ تەواو دەبوو و نزاکانی دەکرد، ئەو نزایەی دەکرد و دەیوت: خوایە تا کاتێک ژیان خێری تیایە بۆم بمژیەنە، ئەگەریش مردنم هات بە مردنێکی پاک و پوخت بممرێنە بەجۆرێک هەر برایەکی موسڵمانم مەرگم ببیستێت لەبەر پاکیەکەی ئاوات بەو مەرگەم بخوازێت، مردنم بە کوژران بێت لە رێی تۆدا.[5]

ئەبووریفاعە لەو سوپایەدا شەو لەگەڵ سریەی بەنی حەنیفەدا بوو، ئەبووقەتادەی عەدوی پێی وت: لەو سریەیەدا هیچ برا و برازایەکت نیە، ئەبووریفاعەش وتی: تازە من بڕیارم داوەو سوورم لەگەڵیان بم، ئەوەبوو سریەکە گەمارۆی قەڵایەکیان دابوو کە دوژمنانی تێدابوو، ئەمەش لە درەنگانی شەودا بوو، درەنگانی شەو خەوی لێکەوت و هاوڕێکانی چوون

---

[1] مصنف ابن أبي شيبة، الرقم ٣٤٨٤٣، الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص ٦٩.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ١٣٩.

[3] المستدرك على الصحيحين، الرقم ٥٨٢٤.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ١٣٩.

[5] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص ٦٩.

و ئەویـان بیـر چـوو، دوژمنیـش لـە دوورەوە لـە قەڵاکـەوە ئەبووریفاعەیـان بینی، دابەزین بۆی و شمشێرەکەیان هەڵگرت و سـەریان بڕی، هاوڕێکانیشی ڕاچڵەکین و وتیان خۆ ئێمە ئەبووریفاعەمان بیر چووە، گەڕانەوە بۆ ئەو شوێنە، بینییان دوژمن چییان لێکردووە، ئەوەبوو دوژمنیان ڕاوەدوو نا، عەبدورەحمانی کوڕی سەمورە دەیوت هەستی بە شەهیدی نەکرد تا شەهیدی هاتەڕێی.[1]

دەوترێت گۆڕی هەریەک لە ئەبووریفاعە و ئەسوەدی کوڕی کلثوم لە ناوچەی بەیهەقە.[2]

## ٤٩٦. تەمیمی کوڕی ئەسید(رضي الله عنه)

ناوی تەمیمی کوڕی ئەسید یان کوڕی ئەسەدی کوڕی عەبدولعوززای کوڕی جەعوونەی خوزاعیە،[3] تەمیم لە پێش فەتحی مەککەدا موسڵمان بووە.[4]

تەمیمی خوزاعی دەڵێت: لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا پێغەمبەر(ﷺ) چوویە مەککە سەیری کرد بە دەوری کەعبەدا سێ سەد و ئەوەندە بت هەبوون و قایم و قوڵ کرابوون، پێغەمبەریش(ﷺ) بە دارێکی ناو دەستی ئاماژەی دەکرد بۆ بتەکان و دەیفەرموو(**جاء الحق و زهق الباطل إن الباطل كان زهوقا**)، هەرکات ئاماژەی بە ڕووی بتێک بکردایە بتەکە بە پشتدا دەکەوت، ئەگەریش ئاماژەی بە پشتی بتێک بکردایە بتەکە بە ڕوودا دەکەوت، ئینجا تەمیم لە بارەی ئەو بتانەوە شیعرێکی هۆنیەوە.[5]

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص ٦٩.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ١٣٩.
[3] أسد الغابة، ج١، ص ٣١٧.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١ص٣٦٧.
[5] أسد الغابة، ج١،ص ٣١٨.

## ٤٩٧. تەمیمی کوڕی یەعار(ﷺ)

ناوی تەمیمی کوڕی یەعاری کوڕی قەیسی کوڕی عەدی کوڕی ئومەییەیە،[١] لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان،[٢] دایکی ناوی زوغەیبەی کچی رافیعە کە پووری سەعدی کوڕی موعاذ و ئەسعەدی کوڕی زورارەیە.[٣]

ئەم هاوەڵەش لە غەزای بەدر[٤] و ئوحودیشدا بەشداری کرد، دوای خۆیشی هیچ نەوەیەکی جێنەهێشت.[٥]

## ٤٩٨. تەمیمی کوڕی ئەوس(ﷺ)

ناوی تەمیمی کوڕی ئەوسی کوڕی خاریجەیە،[٦] کونیەکەی ئەبوو روقییە بووە،[٧] چونکە کچێکی هەبوو بە ناوی روقییە و تەنها ئەو کچەشی هەبوو.[٨]

رایەک دەڵێت: برای ئەبووهیندی داری بوو،[٩] بەڵام ئیبن عەبدولبەر بەرپەرچی ئەو رایە دەداتەوەو دەڵێت: ئامۆزای تەمیم بووە نەک برای.[١٠]

ئیبن سەعد بە تەمیمی داری ناوی هێناوەو نەعیمی کوڕی ئەوسی بە برای داناوە.[١١]

تەمیمی داری ناسرابوو بە پەرستشی زۆر و زۆر قورئان خوێندن.[١٢]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٧٢.
[٢] أسد الغابة، ج١، ص ٣٢٥.
[٣] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥٣٨.
[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٧٢.
[٥] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥٣٨.
[٦] أسد الغابة، ج١، ص ٣١٩، سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٤٤٢.
[٧] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص ٤٠٨.
[٨] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ١٩٣، أسد الغابة، ج١، ص ٣١٩.
[٩] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٤٤٢.
[١٠] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٤، ص ١٧٧٣.
[١١] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص ٤٠٨.
[١٢] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٤٤٢.

ئەم هاوەڵە پێشتر مەسیحی بوو، راهیبێک بوو لە فەلەستین،[1] بەڵام لەساڵی نۆیەمی کۆچیدا هاتە مەدینەو لە خزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ) موسڵمان بوو،[2] لەوێیش مایەوەو لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) بەشداری غەزا بوو.[3]

زیادی کوڕی ئەبووهیند دەڵێت: ئێمە شەش کەس بووین هاتین بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، تەمیمی کوڕی ئەوس و نوعەیمی برای یەزیدی کوڕی قەیس و ئەبووهیندی کوڕی عەبدوڵا و طەییبی کوڕی عەبدوڵای برای کە پێغەمبەر(ﷺ) ناوی نا عەبدورەحمان، لەگەڵ فاکیهی کوڕی نوعمان، هاتین و داوامان کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) زەویەکی شاممان بۆ ببڕێتەوە، ئەوکات پێغەمبەر(ﷺ) لە مەککە بوو، پێغەمبەریش(ﷺ) لە وەڵامدا فەرمووی: کوێتان پێ خۆشە-کام زەویەتان دەوێت بیڵێن- چووینە ئەولاوەو کەوتینە راوێژ، تەمیمی داری وتی: داوای بەیتولموقەددەس دەکەین، وتیان ناگونجێت، بۆیە وتیان داوای بەیت جبرین دەکەین، وتیان ئەویش ناگونجێت، بۆیە بڕیاریان دا داوای گوندی عەینوون بکەن،[4] کە چوونەوە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، فەرمووی: ئەی تەمیم ئەگەریش دەتەوێت من پێت دەڵێم، ئەگەریش دەتەوێت هەواڵت پێ دەدەم چیتان وت؟ تەمیم وتی: بەڵکو تۆ پێمان بڵێ ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) تا باوەڕمان زیاد بکات، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (تۆ شتێکت ویست و ئەوەش شتێکی تری دەوێت، راکەشی چاک بوو)، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا(ﷺ) نامەیەکی لە پارچە پێستێکدا بۆ نووسی، ئەویش ئەو نووسینەی بردەوە ماڵەوەو لە سووچێکەوە هەڵیگرت، هەریەک لە عەبباسی کوڕی عەبدولموطەلیب و جەهمی کوڕی قەیس و شورەحبیلی

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٦٨.

[2] أسد الغابة، ج١، ص ٣١٩.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٦٨.

[4] المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٨٦٢٧، الآحاد و المثاني لابن أبي عاصم، الرقم ٢٢٤٠، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٦٥٥.

کوڕی حەسەنە شاهیدی ئەو نووسینە بوون.[1]

جارێک پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی کرد، کە لە نوێژەکەی تەواو بوو، لەسەر مینبەرەکەی دانیشت و پێدەکەنی، فەرمووی: با هەرکەس لە شوێن نوێژەکەی خۆی بێت-دابنیشێت- پاشان فەرمووی: (ئایا دەزانن بۆچی کۆمکردوونەتەوە؟) وتیان خواو پێغەمبەرەکەی زاناترن، فەرمووی: (سوێند بەخوا بۆ موژدەدان یان بۆ ترساندن کۆم نەکردوونەتەوە، بەڵکو کۆمکردوونەتەوە چونکە تەمیمی داری کە کەسێکی نەصرانی بوو هاتووەو بەیعەتی داوەو موسڵمان بووەو شتێکی بۆ گێڕاومەتەوە کە هاوشێوەی ئەوەیە من لەسەر مەسیحی دەججال هەواڵم پێ دەدان، ئەو بۆی گێڕامەوە سواری بەلەمێک بووە لەگەڵ سی کەس لە لەخم و جوذام، مانگێک شەپۆل لەناو دەریادا یاری پێ دەکردن-دەیهێنان و دەیبردن- دواتر شەپۆلی دەریا فڕێی دانە دوورگەیەک لە دەریاکەدا تا خۆر ئاوابوو لەوێ بوون و لە نزیکی کەشتیەکەوە دانیشتن، چوونە دوورگەکەوە گیانداریکیان تووش بوو کە مووی رەق و تووکن بوو، مووی زۆر بوو، لەبەر زۆری مووەکانی بەرو دوایان لەیەک جیانەدەکردەوە، وتیان هاوار بۆ تۆ ئەوە تۆ کێیت؟ وتی: من جەساسەم، وتیان جەساسە چیە؟ وتی: ئەی خەڵکینە بڕۆن بۆ لای ئەو کابرایە لە دێرە، باس و هەواڵتان لای ئەوە.. خێرا چووین تا چووینە دێرەکە، گەورەترین مرۆڤی تێدابوو کە دیبوومان، زۆر کەتە و چوارشانە بوو، دەستەکانی لەگەڵ گەردنی کۆکردبوونەوە، نێوان ئەژنۆی بۆ قولەپێی بە ئاسن داپۆشرابوو، وتمان: ماڵوێران تۆ کێیت؟ وتی: هەواڵی منتان دەست دەکەوێ، ئێوە پێم بڵێن کێن؟ وتمان: ئێمە کەسانێکی عەرەبین سواری کەشتیەک بووین و کەش و هەوا نالەبار بوو تا شەپۆلی دەریا یاری پێ کردین و فڕێی داینە ئەم دوورگەی تۆوە، لە نزیکی کەشتیەکەوە دانیشتین و هاتینە ناو دوورگەکەوە، بە گیاندارێک گەیشتین کە مووی رەق

[1] الآحاد و المثاني لابن أبي عاصم، الرقم ٢٢٤٠، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٦٥٥.

و تووکن بوو و مووی هێنده زۆر بوو نەماندەزانی بەرو دوای کامەیە، وتمان: ماڵوێران تۆ کێیت؟ وتی: جەساسە، وتمان: جەساسە چیە؟ وتی: بچن بۆ لای ئەو کابرایە لە دێرەکەیە هەواڵتان لای ئەوە، ئێمەش خێرا هاتین بۆ لای تۆ و زۆر لەو گیاندارە ترساین و ترسمان هەبوو شەیتانێ بێت، ئەویش وتی: سەبارەت بە باخە دارخورماکە هەواڵم پێ بدەن؟ وتمان: لە بارەی چی شتێکیەوە هەواڵت پێ بدەین؟ وتی: سەبارەت بە دارخورماکانی ئایا بەرهەمدارن؟ وتمان: بەڵێ، وتی: خەریکە لە بەرهەم بکەون، وتی: سەبارەت بە دەریاچەی طەبەریە هەواڵم پێ بدەن، وتمان: هەواڵی چی شتێکیت دەوێت؟ وتی: ئایا ئاوی تێدایە؟ وتمان: ئاوی زۆر زۆرە، وتی: خەریکە ئاوەکەی بڕوات و نەمێنێت، وتی: سەبارەت بە کانی زوغەر هەواڵم پێ بدەن؟ وتمان: هەواڵی چی شتێکی بدەین پێت؟ وتی: ئایا ئاوی ماوە و خەڵکەکەی بە ئاوەکەی کشتوکاڵ دەکەن؟ وتمان: ئاوی زۆرەو خەڵکەکەشی بە ئاوەکەی کشتوکاڵ دەکەن، وتی: سەبارەت بە پێغەمبەری نەخوێندەواران هەواڵم پێ بدەن چی کرد؟ وتمان: لە مەککە دەرچوو و لە یەثریب نیشتەجێ بوو، وتی: ئایا عەرەب لەگەڵی جەنگان؟ وتمان: بەڵێ، وتی: ئەو چی کرد بەرامبەریان؟ ئێمەش پێمان وت: زاڵبووە بەسەریاندا و عەرەب گوێڕایەڵی بون، وتی: جا ئەوە روویداوە؟ وتمان: بەڵێ، وتی: وا چاکە بۆیان گوێڕایەڵی بن، منیش هەواڵی خۆمتان پێ دەدەم، من مەسیحم و خەریکە مۆڵەتی دەرچوونم پێ بدرێت، دەربچم و بە زەویدا بگەڕێم و لە ماوەی چل شەودا چی گوند هەیە دابەزمە ناوی جگە لە مەککەو طەیبە، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) بە گۆچانەکەی دای بە مینبەرەکەدا و فەرمووی: (ئەمە طەیبەیە، ئەمە طەیبەیە، ئەمە طەیبەیە) -واتە مەدینە-، ئەرێ مەگەر پێشتر ئەوەم بۆ باس نەکردن؟ خەڵکەکەش وتیان با، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: من بە بەسەرهاتەکەی تەمیم سەرسام بووم، هاوشێوەی ئەوەبوو کە من

پێشتر بۆم باسکردن.[1]

جارێک کەسێک لە بەنی سەهم لەگەڵ تەمیمی داری و عەدی کوڕی بەددائیدا چوویە دەرەوەو کابرای سەهمی لە خاکێک مرد کە موسڵمانی تێدا نەبوو، کاتێک گەڕانەوە بە شمەکەکانیەوە قاپێکی ئەویان ونکرد کە لە زیو بوو و بە زێڕ نەخشێنرابوو، پێغەمبەر(ﷺ) هەریەک لە تەمیمی داری و عەددی سوێند دا، دواتر ئەو قاپە لە مەککە دۆزرایەوە، وتیان ئەوەمان لە تەمیم و عەددی کڕیوە، دوو کەس لە خزمانی مردووەکە هەستان و سوێندیان خوارد شایەتی ئێمە شیاوترە لە شایەتی ئەو دوانە، ئەو قاپەش هی هاوڕێکەیانە-واتە کابرای سەهمی- ئەوەبوو ئەم ئایەتە لەو بارەیەوە دابەزی:

(یا ایها الذین امنوا شهادة بینکم اذا حضر احدکم الموت حین الوصیة اثنان ذوا عدل منکم او اخران من غیرکم ان انتم ضربتم في الارض فاصابتکم مصیبة الموت تحبسونهما من بعد الصلاة فیقسمان بالله ان ارتبتم لا نشتري به ثمنا ولو کان ذا قربی ولا نکتم شهادة الله انا اذا لمن الاثمین).[2]

تەمیمی داری یەکێک بوو لەو کەسانەی لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) قورئانیان کۆکردەوە.[3]

تەمیمی داری کۆیلەیەکی هەبوو کە ناوی فەتح بوو، جارێک پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری لە تەمیم کرد ناوی ئەو کۆیلەی چیە؟ ئەویش وتی: ناوی فەتحە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بەڵکو ناوی سیراجە.[4]

تەمیمی داری دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (الدین النصیحة)، ئایین

---

[1] صحيح مسلم - كتاب الفتن وأشراط الساعة - باب في خروج الدجال ومكثه في الأرض ونزول عيسى وقتله إياه، الرقم ٢٩٤٢.

[2] صحيح البخاري - كتاب الوصايا - باب قول الله تعالى يا أيها الذين آمنوا شهادة بينكم إذا حضر أحدكم الموت، الرقم ٢٧٨٠.

[3] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٤٤٥.

[4] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٢، ص ٦٨٣.

ئامۆژگاریـە، وتمـان: بـۆ کـێ؟ فەرمـووی: (لله ولکتابه ولرسوله ولأئمة المسلمين وعامتهم)،[1] (بـۆ خـوا و کتێبەکـەی و پێغەمبەرەکـەی و پێشـەوایانی موسـڵمانان و عامـەی موسـڵمانان).

تەمیمـی داری دەڵێت: پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمـووی: (أول ما يحاسب به العبد يوم القيامة صلاتهُ فَإِن كانَ أَتَمَّها كُتِبَتْ لهُ تامَّةً وإنْ لمْ يَكُنْ أَتَمَّها قالَ الله لِمَلائِكَتِهِ: انْظُروا هَلْ تَجِدُونَ لِعَبْدِي مِنْ تَطَوُّعٍ فَتُكَمِّلونَ بِها فَرِيضَتَهُ؟ ثُمَّ الزَّكاةُ كذلِكَ ثُمَّ تُؤْخَذُ الأَعْمالُ على حَسَبِ ذلِكَ)،[2] (یەکـەم شـت لـە ڕۆژی دواییدا بەنـدەی لەسـەر موحاسـەبە دەکرێت نوێژەکەیەتـی، ئەگـەر تـەواوی نوێژەکانـی کردبێـت هەمـووی بـۆ نووسـراوە، ئەگەریش هەمووی نەکردبێت ئـەوا خـوا بـە فریشـتەکانی دەفەرموێت سـەیر بکەن بزانن ئایا نوێژی سـوننەت لای بەندەکەم بەدی دەکەن تا بەو سـوننەتانە فەرزەکانـی تـەواو بکـەن؟ دواتر لەسـەر زەکات موحاسـەبە دەکرێت، بەوجۆرە لەسـەر کارەکان موحاسـەبە دەکرێت.

تەمیمـی داری هـەژدە فەرمـوودەی لـە پێغەمبـەری خـواوە(ﷺ) گێڕاوەتـەوە.[3]

تەمیمـی داری جلێکـی کڕیبـوو بـە هـەزار-درهـەم- کـە لـەو شـەوەی هیـوای هەبـوو شـەوی قـەدر بێـت دەیپۆشـی.[4]

تەمیمـی کـوڕی ئـەوس شـەونوێژی زۆر بـوو، شـەوێک شـەونوێژی دەکـرد تـا بەیانـی ئـەم ئایەتـەی دووبـارە دەکـردەوە (ام حسب الذين اجترحوا السيئات ان نجعلهم كالذين امنوا وعملوا الصالحات سواء محياهم ومماتهم ساء ما يحكمون)،[5] ئینجـا لـە نوێژەکەشـیدا دەگریـا.[6]

---

[1] صحيح مسلم - كتاب الإيمان - باب بيان أنه لا يدخل الجنة إلا المؤمنون، الرقم ٥٥.
[2] سنن ابن ماجه - أبواب إقامة الصلاة والسنة فيها - باب ما جاء في أول ما يحاسب به العبد الصلاة، الرقم ١٤٩٠، صححه الألباني في صحيح و ضعيف الجامع الصغير و زيادته، الرقم ٤٣٣٩.
[3] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٤٤٨.
[4] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٤٤٧.
[5] الجاثية: ٢١.
[6] أسد الغابة، ج١، ص ٣١٩.

جارێک کابرایەک هات بۆ لای تەمیمی داری و داوای لێکرد فەرموودەی بۆ بگێڕێتەوە، ئینجا پێی وت: چەند جوزئت خوێندووە؟ تەمیم وتی: لەوانەیە تۆ لەوانە بیت کە هەموو قورئان بە شەو دەخوێنێت و دواتر بەیانی کە هەستا دەڵێت: ئەمشەو هەموو قورئانم خوێند، دەی سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر شەوێ سێ رکات نوێژی سوننەت بکەم لام خۆشەویستترە لەوەی شەوێ هەموو قورئان بخوێنم و بەیانی باسی بکەم بۆ خەڵک، کابرا بەوە تووڕە بوو و وتی: بەخوا ئێوە ئەی گرۆی هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) هەرکامتان لە ژیان ماون هەقە بێدەنگ بن و ئەوەی پرسیارتان لێ دەکات تووڕەی نەکەن، تەمیم کە کابرای بینی تووڕە بوو، نەرمی نواند و وتی: برازا قسەت بۆ بکەم؟ ئەگەر من باوەڕدارێکی بەهێز بم و تۆیش باوەڕدارێکی لاواز بیت بەهێزی من بدەیت بەسەر لاوازی خۆتدا و بتەوێت وەک من بکەیت ناتوانیت و پەکت دەکەوێت، یان تۆ باوەڕدارێکی بەهێز بیت و من باوەڕدارێکی لاواز بم کاتێک بەهێزی تۆ دەدەم بەسەر لاوازی خۆمدا بەرگەی ناگرم و دەکەوم، بۆیە لە توانای خۆتەوە بنەوە ئایینداریەکەت و لە ئاییندارێتەوە بۆ دەروونت لێنەوە تا بارت لەسەر پەرستشی راوەستێ کە بەرگەی بگریت.[1]

تەمیم لە مەدینە مایەوەو پاش ئەوەی عوثمانی کوڕی عەففان شەهید کرا ئیتر تەمیم گەڕایەوە بۆ شام.[2]

جارێک تەمیم دوای نوێژی عەسر نوێژی دەکرد، عومەر بە دارەکەی دەستی دای بەسەر سەریدا، تەمیم وتی: ئەی عومەر لەسەر نوێژێک لێم دەدەیت کە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) کردوومە؟ عومەریش وتی: ئەی تەمیم هەموو خەڵک ئەوە نازانن کە تۆ دەیزانیت.[3]

---

(1) سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٤٤٦.

(2) الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص ٤٠٨.

(3) سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٤٤٨.

لە گێڕانەوەیەکی لاوازدا هاتووە کە جارێک لە ناوچەی حەڕرە ئاگری کەوتەوە، عومەر هات بۆ لای تەمیمی داری و وتی: بڕۆ ئەو ئاگرە بوەستێنە؟ ئەویش وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران مەگەر من کێم؟ من چیم؟ بەڵام عومەر وازی لێ نەهێنا تا بردی، بە دەستەکانی ئاگرەکەی دەردەکرد تا ئاگرەکەی بردە ناو دۆڵەکەوە، عومەر بە تەمیمی دەوت: ئەوەی دیویەتی وەک ئەوە نیە کە نەیدیوە.[1]

تەمیمی کوڕی ئەوس دواتر لە فەلەستین نیشتەجێ بوو و پێغەمبەریش(ﷺ) گوندی عەینوونی بۆ بڕیەوە، دواتریش لە شام کۆچی دوایی کرد و لە بەیت جبرین لە خاکی فەلەستین ئەسپەردە کرا.[2]

ذەهەبی رایەکی هێناوە کە دەڵێت: لە ساڵی چلی کۆچیدا تەمیمی داری کۆچی دوایی کردووە.[3]

## ٤٩٩. تەمیمی مەولای بەنی غەنەم(رضي الله عنه)

ئەم هاوەڵەش لە غەزای بەدر و[4] ئوحودیشدا بەشدار بوو.[5]

## ٥٠٠. تەمیمی مەولای خراش(رضي الله عنه)

تەمیمی مەولای خراشی کوڕی صممەی ئەنصاری یەکێکە لە هاوەڵان کە پێغەمبەر(ﷺ) لەکاتی برایەتی خستنە نێوان کۆچەران و پشتیوانان برایەتی خستە نێوان تەمیم و خەبابی مەولای عوتبەی کوڕی غەزوانەوە،[6] تەمیم

---

[1] دلائل النبوة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٥٢٠، دلائل النبوة للبيهقي، الرقم ٢٣٢٥، البداية والنهاية لابن كثير، ج٦، ص ١٥٣.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٦٨.

[3] سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٤٤٨.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٧٣.

[5] أسد الغابة، ج١، ص ٣٢٤.

[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٧٣.

هاودەم بە مەولاکەی لە غەزای بەدردا بەشداری کرد،[1] هەروەها لە غەزای ئوحودیشدا بەشداری کرد، دوای خۆیشی هیچ نەوەیەکی جێنەهێشت.[2]

## ٥٠١. تەماضوری کچی ئەصبەغ(رضي الله عنها)

ناوی تەماضوری کچی ئەصبەغی کوڕی عەمری کەلبیە، هاوسەری عەبدورەحمانی کوڕی عەوفەو کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) عەبدورەحمانی نارد بۆ ئەوێ فەرمووی: ئەگەر وەڵامی بانگەوازەکەیان دایەوە ئەوە تەماضوری کچی ئەصبەغی پاشایان بەهاوسەر بگرە، ئەوەبوو عەبدورەحمان بەهاوسەری گرت و کوڕێکی لێی بوو، دوای وەفاتی عەبدورەحمان شووی کرد بە زوبەیری کوڕی عەووام.[3]

## ٥٠٢. تەمیمەی کچی ئەبی سوفیان(رضي الله عنها)

ناوی تەمیمەی کچی ئەبی سوفیانی کوڕی قەیسە، لە پشتیوانانەو چوویە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و بەیعەتی پێدا.[4]

## ٥٠٣. تومیلە(رضي الله عنها)

ناوی تومیلەی کچی ئەسلەمەو فەرموودەیەکی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە، تومیلە دەڵێت: ئێمە لە شوێنی خۆمان نوێژمان دەکرد کە عەببادی کوڕی بیشر هات و وتی: پێغەمبەر(ﷺ) روویکردە بەیتولحەرام، ئەوەبوو پیاوان هاتنە شوێنی ژنەکان و ژنەکان چوونە شوێنی پیاوەکان و دوو سوجدەکەی تریان رووەو کەعبە تەواو کرد.[5]

---

(١) أسد الغابة، ج١، ص ٣٢٢.

(٢) الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥٧٠.

(٣) الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٤٣.

(٤) الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٤٥.

(٥) المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٢٠٣٧٤، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٦٩١٨.

## ٥٠٤. تەوئەم ئەبوودوخان(ﷺ)

ناوی تەوئەمەو کونیەکەی ئەبوودوخانە کوڕێکی هەبوو کە فەرموودەیەکی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە.[1]

## ٥٠٥. تەیهان(ﷺ)

ناوی تەیهانە و لە پشتیوانانە،[2] بە بەڵگەی گێڕانەوەی فەرموودەیەک کە سەبارەت بە غەزای خەیبەر گێڕاویەتیەوە دەردەکەوێت لە غەزای خەیبەردا بەشدار بووە.[3]



[1] أسد الغابة، ج١، ص ٣٢٦.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٨٢.

[3] أسد الغابة، ج١، ص ٣٢٦.

## ٥٠٦. ثابتی حەجبی(رضي الله عنه)

هیچ وردەکاریەک لەسەر ژیانی نەهاتووە، تەنها ئەوەندەیە لە فەرموودەیەکدا ناوی هاتووە.[١]

## ٥٠٧. ثابتی کوڕی حارث(رضي الله عنه)

ناوی ثابتی کوڕی حارثەیە، لە پشتیوانانە، ثابت لە غەزای بەدردا بەشدار بوو،[٢]چەند فەرموودەیەکی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە،[٣] دواتر چوویە میصر و لەوێ نیشتەجێ بوو.[٤]

## ٥٠٨. ثابتی کوڕی خالید(رضي الله عنه)

ناوی ثابتی کوڕی خالیدی کوڕی نوعمانە، لە پشتیوانانە لە بەنی نەجار،[٥] دوو کچی هەبوو بە ناوەکانی دوبییە کە بە ئوم سماک ناسرابوو و لە هاوەڵان بوو و بەیعەتی دابوو بە پێغەمبەری خوا(ﷺ)،[٦] روقییەش کە بەیعەتی دا بە پێغەمبەری خوا(ﷺ).[٧]

ژنەکەی ثابتی کوڕی خالید ناوی ئیدامی کچی عومەر بوو.[٨]

ثابتی کوڕی خالید لە غەزای بەدر[٩] و ئوحودیشدا بەشداری کرد.[١٠]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٩٩.
[٢] أسد الغابة، ج١، ص ٣٢٨.
[٣] المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٣٥٤، الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٢، ص ١١٤.
[٤] أسد الغابة، ج١، ص ٣٢٨.
[٥] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ١٩٨،
[٦] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٤٥٣.
[٧] أسد الغابة، ج٧، ص ١٢٥.
[٨] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٤٨٦.
[٩] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٨٥.
[١٠] أسد الغابة، ج١، ص ٣٢٩.

سەبارەت بە مردنی دوو را هەیە، رایەک دەڵێت: لە رۆژی بیئر مەعوونە شەهید بووە، رایەکی تریش دەڵێت: بەڵکو لە جەنگی یەمامەدا شەهید بوو، واتە لە دوای وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) و لە سەردەمی خیلافەتی ئەبووبەکری صدیقدا.[١]

## ٥٠٩. ثابتی کوڕی خەنساء(ﷺ)

ناوی ثابتی کوڕی خەنسائە، ئەم هاوەڵە لە پشتیوانانە لە بەنی نەجار، لە غەزای بەدردا بەشدار بوو.[٢]

## ٥١٠. ثابتی کوڕی دەحداح(ﷺ)

ناوی ثابتی کوڕی دەحداحی کوڕی نوعەیمی کوڕی غەنمە، کونیەکەی ئەبوودەحداح بوو،[٣] پێش موسڵمان بوونی ژنێکی هەبوو بە ناوی ئومەیمەی کچی بیشر کە لە دەستی ثابت رایکرد و شووی کرد بە سەهلی کوڕی حونەیف.[٤]

ثابت کچێکی هەبوو بە ناوی سەلما،[٥] بەڵام لە فەرموودەیەکدا کە واسعی کوڕی حەببان هێناویەتی دەڵێت: ثابتی کوڕی دەحداح کە مرد هیچ میراتگرێکی پاش خۆی نەبوو جگە لە ئەبولوبابەی خوشکەزای، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) میراتیەکەی دا بە ئەبوولوبابەی خوشکەزای ثابت.[٦]

ثابتی کوڕی دەحداح لە غەزای ئوحوددا بەشدار بوو، کاتێک دەنگۆی ئەوە بڵاوبوویەوە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) کۆچی دوایی کردووە ثابت هاواری دەکرد ئەی گرۆی پشتیوانان گوێم لێ بگرن، من کوڕی دەحداحەم،

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٨٥.
[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٨٦.
[٣] أسد الغابة، ج١، ص ٣٢٩، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٨٦.
[٤] أسد الغابة، ج٧، ص ٢٩.
[٥] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ٣٧٢.
[٦] مصنف ابن أبي شيبة، الرقم ٣٠٥٠٩، مصنف عبدالرزاق الصنعاني، الرقم ١٨٤٣٤.

ئەگەر موحەممەد کوژرابێ ئەوا خوا زیندووەو نامرێت، دەی بۆ بەرگری ئایینەکەتان بجەنگن، چونکە بە دڵنیاییەوە خوا سەرخەرتانە، ئەوەبوو دەستەیەک لە پشتیوانان هاتن بۆ لای، ئەویش بەو دستەیەوە هەڵمەتی دەبرد، تاقمێکی بەهێزی دوژمن کە خالیدی کوڕی وەلید و عەمری کوڕی عاص و عیکرمەی کوڕی ئەبووجەهل و ضیراری کوڕی خەطابی تێدا بوو بەرەو رووی هاتن، تیربارانیان دەکرد، لەو کاتەدا خالید بە رمێک هەڵیکوتایە سەر ثابت و لێیدا و کوشتی، ئەو پشتیوانانەی تریش کە لەگەڵیدا بوون کوژران، دەوترێت ئەوە کۆتا دەستەی موسڵمانان بوون کە لە ئوحوددا شەهید بوون.[1]

بۆچوونێکی تر دەڵێت: بەڵکو بریندار بوو و دواتر چاک بوویەوە، بەڵام برینێکی هەر مابوو تا دواجار لە کاتی گەڕانەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لە حودەیبیە لێی قورس کردەوەو لەجێدا خستی و کوشتی.[2]

ئیبن ئەثیر دەڵێت: راستر ئەوەیە دەحداح لە ئوحوددا نەکوژراوە، چونکە فەرموودەیەک لە جابری کوڕی سەمورەوە هاتووە کە دەڵێت: نوێژی مردوومان لەسەر ئیبن دەحداح کرد کە یەکێک بوو لە هاوەڵان، ئینجا لەگەڵ پێغەمبەری خوا(ﷺ) گەڕاینەوە.[3]

## ٥١١. ثابتی کوڕی رەبیع(رضي الله عنه)

ناوی ثابتی کوڕی رەبیعەو لە پشتیوانانە، لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) وەفاتی کرد.[4]

کاتێک ثابت لە سەرەمەرگدا بوو پێغەمبەر(ﷺ) چوو بۆ سەردانی، پێغەمبەر(ﷺ) ثابتی بانگ دەکرد، بەڵام ثابت وەڵامی نەدەدایەوە،

[1] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٢٠٣، أسد الغابة، ج١، ص ٣٣٠.
[2] أسد الغابة، ج١، ص ٣٣٠.
[3] أسد الغابة، ج١، ص ٣٣٠.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٨٧.

پێغەمبەر(ﷺ) دەستی کرد بە گریان و فەرمووی: (ئەگەر دەنگی منی ببیستایە بە دڵنیاییەوە وەڵامی دەدامەوە)، کاتێک وەفاتی کرد ئافرەتانی دەوری دەستیان کرد بە گریان، ئوسامەی کوڕی زەید ڕێگری لێ دەکردن لەو گریانە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (وازیان لێ بهێنە تا لە نێویاندایە با بگرین، بەڵام کە واجب بوو (خرایە ناو گۆڕ) ئیتر دەنگی گریان نەبیستم).[1]

ئەم بەسەرهاتە لە کتێبەکانی فەرموودەدا هاتووە بێ ئەوەی ناوی ثابت بهێنرێت، بەڵام مەبەست هەر بەم هاوەڵەیە لەبەرئەوەی گێڕانەوەکە هەمان گێڕانەوەیەو ئاماژەش بەوە کراوە یەکێک لە پشتیوانان بووە، دیارە ثابتی کوڕی ڕەبیعیش لە پشتیوانان بوو.

لە موسنەدی ئەحمەدی کوڕی حەنبەلدا لە جابری کوڕی عەتیک لە مامیەوە هاتووە دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) چوومە سەر تەرمی مردوویەکی پشتیوانان و کەس و کارەکەی دەگریان، منیش وتم: لەپاڵ پێغەمبەری خوادا(ﷺ) دەگرین؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (**دعهن يبكين ما دام عندهن، فإذا وجب فلا يبكين**)، (وازیان لێ بهێنە تا لایانە با بگرین، کاتێک واجب بوو ئیتر نەگرین)، جەبر دەڵێت: کە ئەم فەرموودەم گێڕایەوە بۆ عومەری کوڕی عەبدولعەزیز پێی وتم: چی واجب بوو؟ -مەبەست بە واجب بوو چیە؟- وتم: یانی کاتێک خرایە ناو گۆڕەکەی.[2]

## ٥١٢. ثابتی کوڕی ڕەبیعە(ﷺ)

ناوی ثابتی کوڕی ڕەبیعەیە، لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان، مووسای کوڕی عوقبە ئاماژەی پێ داوە یەکێک بوو لە بەشدار بوانی بەدر، بەڵام گومان هەیە لە بەشداربوونەکەی.[3]

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص ٣٣١.

[2] مسند أحمد بن حنبل - مسند الأنصار(ﷺ) - حديث جابر بن عتيك(ﷺ)، الرقم ٢٤٢٤٨.

[3] أسد الغابة، ج١، ص ٣٣١.

## ٥١٣. ثابتی کوڕی ڕوەیفع(ﷺ)

ناوی ثابتی کوڕی ڕوەیفعەو لە پشتیوانانە،[١] بەڵام ئیبن ئەثیر بە کوڕی روفەیع ناوی دێنێت،[٢] ڕایەک دەڵێت: لەو هاوەڵانەیە کە دواتر لە شام نیشتەجێ بوو، ڕایەکی تر دەڵێت: بەڵکو لە میصر نیشتەجێ بوو،[٣] ئیبن ئەثیر دەڵێت: لە بەصرە نیشتەجێ بوو و دواتر چوو بۆ میصر.[٤]

ثابتی کوڕی ڕوەیفع فەرموودەیەکی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە.[٥]

## ٥١٤. ثابتی کوڕی ڕیفاعە(ﷺ)

ناوی ثابتی کوڕی ڕیفاعەیەو لە پشتیوانانە، گێڕانەوەیەکی لەبارەوە هاتووە کە سەعیدی کوڕی قەتادەی مامی ثابت بووە هات بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)ثابت هەتیوەو لە ماڵەکەی مندایە، سەبارەت بە سامانی ئەو چەندی حەڵاڵە بۆ من؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (أن تأكل بالمعروف من غير أن تقي مالك بماله)،[٦] (ئەوەندەی بە دروستی لە سامانی بخۆیت بێ ئەوەی لەبەر خەرجکردنی سامانی ئەو دەست بگریت بە سامانی خۆتەوە).

## ٥١٥. ثابتی کوڕی زەید(ﷺ)

ناوی ثابتی کوڕی زەیدی کوڕی قەیس کوڕی زەیدە، لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان، لە غەزای ئوحوددا بەشدار بوو.[٧]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٨٧.

[٢] أسد الغابة، ج١، ص ٣٣١.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٨٧.

[٤] أسد الغابة، ج١، ص ٣٣١.

[٥] معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٢٧٠، المطالب العالية لابن حجر، الرقم ٢٠٩٣.

[٦] جامع البيان للطبري، دار الفكر(بيروت-١٤٠٥هـ)، ج٤، ص ٢٥٩، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٢٧١.

[٧] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٨٨.

## ٥١٦. ثابتی کوڕی زەید(ﷺ)

ناوی ثابتی کوڕی زەیدی کوڕی مالیکە، لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان لە ئەشهەلیەکان،[1] برایەکی هەبوو بە ناوی سەعدی کوڕی زەید[2] کە یەکێک بوو لە بەشداربوانی بەدر،[3] کونیەی ثابت ئەبوو زەیدە،[4] لە غەزای ئوحوددا بەشدار بوو.[5]

## ٥١٧. ثابتی کوڕی سوفیان(ﷺ)

ناوی ثابتی کوڕی سوفیانی کوڕی عەدی کوڕی ئیمرئولقەیسە، لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان، دوو کوڕی هەبوو بە ناوی سەماک و حارث.[6]

ثابت هاودەم بە حارثی کوڕی لە غەزای ئوحوددا بەشداری کرد و تیایدا حارثی کوڕی شەهید بوو.[7]

## ٥١٨. ثابتی کوڕی صامت(ﷺ)

ناوی ثابتی کوڕی صامتی کوڕی عەدی کوڕی کەعبە، لە پشتیوانانە لە ئەشهەلیەکان، کوڕێکی هەبوو بە ناوی عەبدورەحمان کە فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە، سەبارەت بە هاوەڵبوونی گومانێک هاتووە کە دەڵێت: ثابت لە سەردەمی نەفامیدا مردووە،[8] بەڵام لەو فەرموودەوە کە

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص ٣٣٢.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٨٨.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٣، ص ٦١
[4] أسد الغابة، ج١، ص ٣٣٢.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٨٨.
[6] أسد الغابة، ج١، ص ٣٣٢، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٨٩.
[7] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٨٩.
[8] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٨٩.

عەبدورەحمانی کوڕی گێڕاویەتیەوە دەردەکەوێت هاوەڵ بووە.

ثابت دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ)لە مزگەوتی بەنی عەبدولئەشهەل نوێژی کرد و بەرگێکی بە خۆیەوە پێچابوو و دەستی لەسەری دادەنا تا لە سەرمای زەوی بیپارێزێت.[١]

## ٥١٩. ثابتی کوڕی صوهەیب(رضي الله عنه)

ناوی ثابتی کوڕی صوهەیبی کوڕی کورزی ساعیدیە، ئەم هاوەڵەش یەکێک بووە لە بەشدار بوانی ئوحود.[٢]

## ٥٢٠. ثابتی کوڕی ضحاك(رضي الله عنه)

ناوی ثابتی کوڕی ضحاکی کوڕی خەلیفەی کوڕی ثەعلەبەی کوڕی عەدیە، لە پشتیوانانە لە ئەشهەلیەکان، یەکێک بوو لە بەشداربوانی بەیعەتی ریضوان.[٣]

دەوترێت کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد تەمەنی ثابت هەشت ساڵان بووە، سەبارەت بە کاتی مردنی خۆیشی دەوترێت لە ساڵی چل و پێنجی کۆچیدا وەفاتی کردووە، رایەکی تریش دەڵێت: بەڵکو لە سەردەمی عەبدوڵای کوڕی زوبەیردا وەفاتی کردووە.[٤]

## ٥٢١. ثابتی کوڕی ضحاك(رضي الله عنه)

ناوی ثابتی کوڕی ضحاکی کوڕی ئومەییەیە، ئەم هاوەڵەش لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان، گەیشتوەتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەڵام فەرموودەی لێوە نەگێڕدراوەتەوە.[٥]

---

[١] المعجم الكبير للطبراني – باب الثاء – من اسمه ثابت – ثابت بن الصامت الأنصاري، الرقم ١٣٤٤.

[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٩٠.

[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٩١.

[٤] أسد الغابة، ج١، ص ٣٣٦.

[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٩٠.

## ٥٢٢. ثابتی کوڕی ئەثلە(ﷺ)

ناوی ثابتی کوڕی ئەثلەیەو لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان، لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)لە غەزای خەیبەردا بەشدار بوو و تیایدا کوژراوە.[1]

## ٥٢٣. ثابتی کوڕی جذع(ﷺ)

ناوی ثابتی کوڕی جذعی کوڕی زەیدە، لە پشتیوانانە لە سولەمیەکان، لە بەیعەتی عەقەبەو غەزای طائیفیشدا بەشدار بوو و لەوێ شەهید بوو.[2]

## ٥٢٤. ثابتی کوڕی عەتیک(ﷺ)

ناوی ثابتی کوڕی عەتیکی کوڕی نوعمانی کوڕی عەمرە، ئەم هاوەڵەش لە پشتیوانانە،[3] ژنەکەی ناوی موعاذەی کچی ئەنەسی کوڕی قەیس بوو، کچێکی هەبوو بە ناوی کەبشە کە بە ئوم سەعد ناسرابوو و موسڵمان بوو و بەیعەتی دابوو بە پێغەمبەر(ﷺ).[4]

ثابتی کوڕی عەتیک دوای سەردەمی پێغەمبەریش(ﷺ) ژیاو بەشدار بووە لە جەنگی جسردا کە لە ساڵی پانزەی کۆچیدا روویداو تیایدا کوژرا.[5]

## ٥٢٥. ثابتی کوڕی عەدی(ﷺ)

ناوی ثابتی کوڕی عەدی کوڕی مالیکی کوڕی حەرامە، لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان، دایکی ناوی ئوم عوثمانی کچی موعاذ بوو کە لە خەزرەجیەکان

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص ٣٢٧.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٨٤.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٩٢.

[4] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٤٥٢.

[5] البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص ٥٠.

بوو، سێ برایشی هەبوو بە ناوەکانی حارث و عەبدورەحمان و سەهل.[١]
هەریەک لە ثابت و سێ براکەی تریشی لە جەنگی ئوحوددا بەشدار بوون.[٢]
ثابتی کوڕی عەتیک دوای وەفاتی پێغەمبەریش(ﷺ) ژیا و لە جەنگی جسردا بەشداری کردو تیایدا کوژرا.[٣]

## ٥٢٦. ثابتی کوڕی عەمر(رضي الله عنه)

ناوی ثابتی کوڕی عەمری کوڕی زەیدی کوڕی عەددیە، لە پشتیوانانە، بەڵام رایەک دەڵێت: هەر بە بنەڕەت لە پشتیوانان بووە، رایەکی تریش دەڵێت: بەڵکو هاوپەیمانی پشتیوانان بوو،[٤] ثابتی لە بەدر و ئوحودیشدا بەشداری کردو لە ئوحوددا شەهید بوو.[٥]

## ٥٢٧. ثابتی کوڕی عوبەید(رضي الله عنه)

ناوی ثابتی کوڕی عوبەیدەو لە پشتیوانانە، لە غەزای بەدردا بەشدار بوو، دوای وەفاتی پێغەمبەریش(ﷺ) ژیاو لە جەنگی صفینیشدا بەشداری کردو لەو جەنگەشدا کوژرا.[٦]
سەبارەت بەوەی ئایا ثابتی کوڕی عوبەید لە جەنگی صفیندا کام بەرەی گرتووە، ئیبن ئەثیر دەڵێت: ثابتی کوڕی عوبەیدە لە سوپای ئەمیری باوەڕداران عەلی کوڕی ئەبووطالیبدا بوو.[٧]

---
[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٩٢.
[٢] أسد الغابة، ج١، ص ٣٣٧.
[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٩٢.
[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٩٣.
[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٩٣.
[٦] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٩٢.
[٧] أسد الغابة، ج١، ص ٣٣٧.

## ٥٢٨. ثابتی کوڕی قەیس(رضي الله عنه)

ناوی ثابتی کوڕی قەیسی کوڕی خەطیمی کوڕی عەددیە،[1] لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان.[2]

کاتێک قەیسی باوکی چوو بۆ مەککە، پێغەمبەر(ﷺ) پێشنیازی موسڵمانبوونی بۆ کرد، بەڵام ئەو داوای کرد پەلە نەکات تا پێغەمبەر(ﷺ) بچێتە مەدینە ئەوکات موسڵمان دەبێت، بەڵام پێش چوونی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ مەدینە قەیس لە جەنگێکی نێوان ئەوس و خەزرەجیەکاندا کوژرا،[3] دواتر کە ثابت موسڵمان بوو خەزرەجیەکان چەکەکەیان برد بۆ لای ثابت، ئەویش پێی وتن ئەگەر ئیسلام نەبوایە بە دڵنیاییەوە لەو کارەی کردتان پەشیمان دەبوون،[4] -وەک ئەوەی بڵێت لەبەر ئیسلام نەبوایە تۆڵەی باوکمم دەکردەوە-.

ژنەکەی ثابت ناوی ئوم حەبیبی کچی قەیس بوو.[5]

ثابت سێ کوڕی هەبوو بە ناوەکانی عومەر و موحەممەد و یەزید، هەر سێیان لە جەنگی (الحرة) کوژران.[6]

دایکی ناوی حەوائی کچی یەزید بوو کە هەر زوو موسڵمان بوو و ئیمانەکەی لە قەیسی مێردی دەشاردەوە.[7]

ثابتی کوڕی قەیس یەکێک بوو لە بەشداربوانی ئوحود و هێندە گەرموگوڕ جەنگا کە لە دوانزە شوێنەوە بریندار بوو، پێغەمبەر(ﷺ) لەو جەنگەدا بە ثابتی کوڕی قەیسی دەفەرموو (لە پێشەوە ئەی حاسر، لە دواوە ئەی حاسر)، حاسریش بە شمشێرەکەی بەملاولادا دەجەنگا.[8]

---

[1] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٢٠٦، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٩٣.

[2] أسد الغابة، ج١، ص ٣٣٩.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٩٣.

[4] أسد الغابة، ج١، ص ٣٣٩.

[5] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٥، ص ٢٥٩.

[6] أسد الغابة، ج١، ص ٣٣٩، سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٣١٣.

[7] أسد الغابة، ج٧، ص ٨٣.

[8] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٩٤.

ثابتـی کـوڕی قەیـس دوای جەنگـی ئوحودیـش لـە جەنگەکانـی تـردا لەگـەڵ پێغەمبـەری خـوادا(ﷺ) بەشـداری کـرد و تـا دوای وەفاتـی پێغەمبەریـش(ﷺ) ژیـا.[1]

لـە سـەردەمی خیلافەتـی عوثمانـی کـوڕی عەففانـدا لـە عێـراق بـوو، کاتێـک خەڵکـی کووفـە سـکاڵایان کـرد لـە ئەمیرەکەیـان کـە سـەعیدی کـوڕی عـاص بـوو، خەلیفـە داوای کـرد سـەعید بچێـت بـۆ لای، سـەعید کـە ویسـتی بچێـت بـۆ لای خەلیفـە عوثمـان، لـە شـوێنی خۆیـدا ثابتـی کـوڕی قەیسـی دانـا.[2]

دواتریـش لـە سـەردەمی خیلافەتـی عەلـی کـوڕی ئەبووطالیبـدا خەلیفـە ثابتـی کـوڕی قەیسـی کـرد بـە بەرپرسـی مەدائیـن، ئەویـش بـەردەوام ئەرکـی بەرپرسـیارێتی مەدائینی لـە ئەسـتۆ بـوو تـا موغیرەی والـی موعاویـەی کـوڕی ئەبووسـوفیان هـات بـۆ ئـەوێ و ثابتـی لابـرد.[3]

ثابـت هاوەڵـی نزیـک و پاڵپشـتی ئەمیـری بـاوەرداران عەلـی کـوڕی ئەبووطالیـب بـوو، لـە ریـزی سـوپاکەیدا لـە جەنگەکانـی جەمـەل و صفیـن و نەهرەوانیشـدا بەشـداری کـرد.[4]

ثابتـی کـوڕی قەیـس لـە سـەردەمی موعاویـەی کـوڕی ئەبوسـوفیاندا وەفاتـی کـرد.[5]

## ٥٢٩. ثابتـی کـوڕی قەیسـی کـوڕی شەمماس(رضي الله عنه)

نـاوی ثابتـی کـوڕی قەیسـی کـوڕی شەمماسـی کـوڕی زوهەیـرە، کونیەکـەی ئەبـوو موحەممـەد بـوو چونکـە کوڕێکـی هەبـوو بـە نـاوی موحەممەد، دەشـوترێت بەڵکـو کونیەکـەی ئەبوعەبدورەحمـان بـوو، ثابـت هاوەڵـی دیـاری نـاو پشـتیوانان

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٩٤.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٩٤.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٩٤.
[4] أسد الغابة، ج١، ص ٣٣٩.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٩٤.

و وتاربێژیان بوو، هەروەک وتاربێژی خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) بوو.[1]

قەیسی کوڕی شەمماسیش یەکێک بوو لە هاوەڵان و ثابتی کوڕی فەرموودەی لێوەگێراوەتەوە.[2]

ئەم هاوەڵەش سێ منداڵی هەبوو بە ناوەکانی موحەممەد و یەحیا و عەبدوڵا کە هەرسێیان لە جەنگی الحرة کوژران.[3]

ثابتی کوڕی قەیس کچێکیشی هەبوو بە ناوی زەینەب کە بەیعەتی دابوو بە پێغەمبەری خوا(ﷺ).[4]

ثابت خوشکێکی هەبوو بە ناوی زەینەب کە لە سەری باوکیەوە خوشک و برا بوون و ئەو خوشکەشی هاوەڵ بوو،[5] خوشکێکی تریشی ناوی ئوم ثابت بوو کە ئەویش هاوەڵ بوو.[6]

کاتێک حەنظەلەی کوڕی ئەبووعامر شەهید بوو، جەمیلەی ژنی بە بێوەژنی مایەوە، دواتر شووی کرد بە ثابتی کوڕی قەیسی کوڕی شەمماس.[7]

ثابتی کوڕی قەیس ژنێکی تری هەبوو بە ناوی حەبیبەی کچی سەهل کە پێغەمبەر(ﷺ) ویستی بەهاوسەری بگرێت، بەڵام بە هاوسەری نەگرت، ئەوەبوو ثابت بەهاوسەری گرت.[8]

لە کاتی برایەتی خستنە نێوان کۆچەران و پشتیواناندا پێغەمبەر(ﷺ) برایەتی خستە نێوان عامری کوڕی ئەبولبکیر و ثابتی کوڕی قەیسی کوڕی شەمماسەوە.[9]

---

(1) أسد الغابة، ج١، ص ٣٣٩.

(2) سير أعلام النبلاء، ج١، ص ١٨٧.

(3) أسد الغابة، ج١، ص ٣٤٠.

(4) أسد الغابة، ج٧، ص ١٢٧.

(5) الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٣٦٠.

(6) الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٣٦١.

(7) أسد الغابة، ج٧، ص ٥٨.

(8) الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٤٤٥.

(9) الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٣٨٩.

ثابت لە غەزای ئوحود و غەزاکانی دواتریشدا بەشداری کرد و تا دوای وەفاتی پێغەمبەریش(ﷺ) ژیا.[١]

هەروەها ثابتی کوڕی قەیس نووسەری پێغەمبەر(ﷺ) بوو، وەک لە نووسینی بەڵێنی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ وەفدی ثومالە و حەدان ثابتی کوڕی قەیس بەڵێنەکەی نووسی و هەریەک لە سەعدی کوڕی-عوبادە-یان لە گێڕانەوەیەکی تردا-کوڕی موعاذ- و موحەممەدی کوڕی مەسلەمە شایەت بوون،[٢] لە نووسینی بەڵێنێکی تری پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بۆ هۆزی ئەسلەم دووبارە ثابتی کوڕی قەیس نووسەر بوو و هەریەک لە ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەراح و عومەری کوڕی خەططاب شاهید بوون.[٣]

کاتێ وەفدی تەمیم هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) ئەقرەعیش لەگەڵ وەفدەکەدا بوو، کە گەیشتنە مەدینە ئەقرەع هاواری دەکرد ئەی موحەممەد وەسف و سەنام جوانە و سەرکۆنەو لەدژ خوێندنیشم زۆر خراپە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ذلکم الله سبحانه)، لە گێڕانەوەی تردا هاتووە کە هەموو وەفدەکە پێکەوە هاواریان دەکرد و ئەوەیان دەوت، پێغەمبەریش(ﷺ) هاتە دەرەوە بۆ لایان و فەرمووی: (ذلکم الله فما تریدون). ئەوانیش وتیان ئێمە خەڵکێکین لە بەنو تەمیم بە شاعیرو وتاربێژمانەوە هاتوین تا لە بەرامبەرت شیعر بڵێین و فەخر بنوێنین، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ما بالشعر بعثنا ولا بالفخار أمرنا ولکن هاتوا)، (ئێمە بە شیعر نەنێردراوین و فەرمانمان پێ نەکراوە فەخر بکەین بەڵام ئادەی)، ئەقرەعیش بە یەکێک لە گەنجەکانی وت: فلانە کەس هەستە و باسی فەزڵی خۆت و هۆزەکەت بکە، ئەویش وتارێکی دا و وتی: سوپاس بۆ خوایەک کە ئێمەی کردۆتە چاکترین دروستکراوی و سامانی پێ بەخشیوین تا چیمان بوێت پێی بکەین، جا ئێمە چاکترین کەسانی

[١] أسد الغابة، ج١، ص ٣٣٩.

[٢] الطبقات الکبری لابن سعد، ج١، ص ٢٨٦، البدایة والنهایة لابن کثیر، ج٥، ص ٣٤١.

[٣] الطبقات الکبری لابن سعد، ج١، ص ٣٥٤.

سەرزەوین، لە هەموان زۆرترین و زیاترین چەکیشمان هەیە، هەرکەس نکوڵی ئەو قسەمان دەکات با هەستێت و قسەیەکی باشتر لەوەی ئێمەو کارێکی باشتر لە کاری ئێمە نیشان بدات، پێغەمبەریش(ﷺ) بە ثابیتی کوڕی قەیسی ئەنصاری فەرموو وتاربێژی فەرموو: هەستەو وەڵامی بدەرەوە، ئەویش هەستاو لە وەڵامیدا وتی: سوپاس بۆ خوا، سوپاسی دەکەم و پشتی پێ دەبەستم و بڕوام پێی هەیە و پشتم بەو بەستووەو شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێ نیە جگە لە خوای تاک وتەنهای بێ هاوەڵ، شایەتی دەدەم موحەممەد بەندەو نێردراوی خوایە، کۆچەرانی ئامۆزای خۆی بانگ کرد کە چاکترین و دیارترینی کەسان بوون و ئەوانیش چوون بەدەم داواکەیەوە، سوپاس بۆ خوا کە ئێمەشی کردە پشتیوان و وەزیرانی پێغەمبەرەکەی و مایەی شکۆمەندی بۆ ئایینەکەی، ئێمە لەگەڵ خەڵک دەجەنگین تا کاتێ شایەتی دەدەن هیچ پەرستراوێ نیە جگە لە خوا، هەرکەس ئەوەی وت: گیان وماڵی لێمان حەرام دەبێت، هەرکەسیش وانەکات لەگەڵی دەجەنگین و لەبەرخوا لامان سووک و بێ بایەخ دەبێت، ئەمە دەڵێم و داوای لێخۆشبوون لای خوا دەکەم بۆ هەموو باوەڕداران چ پیاوان و چ ئافرەتانیان.[1]

حەبیبەی کچی سەهلی ئەنصاری کە خێزانی ثابتی کوڕی قەیس بوو، رۆژێک چوویە بەردەم ماڵی پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) نە من و نە ثابتی کوڕی قەیس، دواتر کە ثابت هات، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: ئەوەی حەبیبەی کچی سەهلە و چەندە خوا بیەوێت قسەی کردووە، حەبیبە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) چی پێداوم، هەمووی لەلام ماوە، ئەویش بە ثابتی فەرموو: لێی وەربگرەوە، ئەویش وەریگرتەوە، حەبیبەش چوویەوە ناو کەسوکاری و لەوێ مایەوە.[2]

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص ٢٩٤، أسد الغابة، ج١، ص١٦٤-١٦٥، البداية والنهاية لابن كثير، ج٥، ص ٤٢.

[2] مسند أحمد بن حنبل - من مسند القبائل - حديث حبيبة بنت سهل(ﷺ)، الرقم ٢٨٠٨٧.

جارێک پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی ثابتی کوڕی قەیسی پرسی و فەرمووی: (کێ هەواڵیم بۆ وەردەگرێت)، پیاوێک وتی: من ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەواڵی وەردەگرم بۆت، ئەوەبوو چوویە ماڵی ثابت سەیری کرد ثابت بە بێتاقەتی و کزۆڵی لە ماڵەوە دانیشتووە، وتی: ئەوە چیتە بۆ وایت؟ ثابت وتی: من لە خزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ) دەنگم بەسەر دەنگی پێغەمبەردا(ﷺ) بەرز دەکردەوە، هەرکەسیش وابکات کارە چاکەکانی پووچەڵ دەبنەوەو شوێنی دۆزەخە، کابرا گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەر(ﷺ) کابرای ناردەوە بۆ لای ثابت و فەرمووی: (اذْهَبْ إِلَيْهِ فَقُلْ لَهُ إِنَّكَ لسْتَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ وَلَكِنْ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ)، (بڕۆ بۆ لای و پێی بڵێ تۆ لە ئەهلی دۆزەخیەکان نیت، بەڵکو لە ئەهلی بەهەشتیەکانیت).[1]

ئەم رووداوەش ئەو کاتە بوو کە خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند(یا أیها الذین آمنوا لا ترفعوا أصواتكم فوق صوت النبي ولا تجهروا له بالقول كجهر بعضكم لبعض أن تحبط أعمالكم وأنتم لا تشعرون)، ئەوەبوو ثابت لە ترسی ئەوەی بەر ئەو ئایەتە نەکەوێت وایکرد.[2]

ئەنەسی کوڕی مالیک دەڵێت: دەمانبینی ثابتی کوڕی قەیس لەنێوماندا دەهات و دەچوو و ئێمەش دەمانزانی لە ئەهلی بەهەشتە.[3]

ئەبووهورەیرە دەگێڕێتەوە پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو (نِعم الرجل أبو بكر، نِعم الرجل عمر، نِعم الرجل أبو عبيدة بن الجراح، نِعم الرجل أسيد بن حضير، نِعم الرجل ثابت بن قيس، نِعم الرجل معاذ بن جبل، نِعم الرجل معاذ بن عمرو بن الجموح)،[4] (ئەبووبەکر پیاوێکی باشە، عومەر پیاوێکی باشە، ئەبووعوبەیدەی کوڕی جەراح پیاوێکی

---

[1] صحيح البخاري - كتاب المناقب - باب علامات النبوة في الإسلام، الرقم ٣٦١٣.

[2] السنن الكبرى للنسائي - كتاب المناقب - ثابت بن قيس بن شماس(ﷺ)، الرقم ٨١٧٠.

[3] السنن الكبرى للنسائي - كتاب المناقب - ثابت بن قيس بن شماس(ﷺ)، الرقم ٨١٧٠.

[4] مسند أحمد بن حنبل - مسند أبي هريرة(ﷺ)، الرقم ٩٥٥٦، جامع الترمذي - أبواب المناقب عن رسول الله(ﷺ) - باب مناقب معاذ بن جبل وزيد بن ثابت وأبي وأبي عبيدة بن الجراح(ﷺ)، الرقم ٣٧٩٥ و حسنه، قال شعيب الارناؤوط اسناده قوي، صححه الألباني في السلسلة الصحيحة، الرقم ٨٧٥.

باشـە، ئوسـەیدی کوڕی حوضەیر پیاوێکی باشـە، ثابتی کوڕی قەیس پیاوێکی باشـە، موعـاذی کوڕی جەبەل پیاوێکی باشـە، موعـاذی کوڕی عەمری کوڕی جەمووح پیاوێکی باشـە).

کاتێـک موسـەیلەمە هـات بـۆ لای پێغەمبـەر(ﷺ) و مەرجـی ئـەوەی دانـا پێغەمبـەر(ﷺ) دوای خـۆی پێغەمبەرایەتـی بـدات بـە موسـەیلەمەو پێغەمبـەری خوا(ﷺ) رازی نەبوو، لەو ماوەدا ثابتی کوڕی قەیس لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بوو، ثابت لەگەڵ پێغەمبـەر(ﷺ) چوو بۆ لای موسـەیلەمەو دارودەستەکەی، پارچەیـەک لـە گـەڵای خورمـا بەدەسـت پێغەمبـەرەوە(ﷺ) بـوو، کـە گەیشـتنە لای موسـەیلەمە پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمـووی: (ئەگـەر داوای ئـەو پارچەشـم لـێ بکەیت پێت نابەخشـم.....، پاشـان فەرمووی: ئـەوە ثابتـە لـە بری من وەڵامت دەداتـەوە).[1]

ثابت لـە سـەردەمی خیلافەتی ئەبووبەکری صدیقدا لـە جەنگی یەمامـەدا دژ بـە هەڵگەڕاوەکان بەشداری کردو تیایدا شـەهید بوو.[2]

لە رۆژی یەمامەدا ئاڵای پشتیوانان لە دەستی ثابتی کوڕی قەیسدا بوو.[3]

ثابـت لـە رۆژی یەمامـەدا کاتێـک دەیبینـی موسـڵمانان کەمتەرخەمیەکیـان هەبوایـە هـاواری دەکـرد خوایـە لای تـۆ خـۆم دوور دەگـرم لـەوەی ئەوانـە دەیکەن-واتـە مەبەستی بێباوەڕەکان بوو- خوایە لای تۆ خۆم دوور دەگرم لـەوەی ئەمانە دەیکەن-واتـە موسڵمانان- ئینجا بـە سـەختی جەنگا تـا شـەهید بـوو.[4]

بەسـەرهاتێک سـەبارەت بـە ڕووداوی دوای کوژرانـی هاتـووە کـە دەڵێـت: کاتێـک ثابتـی کـوڕی قەیسـی کـوڕی شـەمماس کـوژرا قەڵغانێکـی گرانبەهـای لەبـەر بـوو، کەسـێک لـە موسـڵمانان هـات و بـردی بـۆ خـۆی، دواتـر ثابـت

[1] البداية والنهاية لابن كثير، ج٥، ص ٤٩، تأريخ الإسلام للذهبي، ج٢، ص ٥٨٤.
[2] أسد الغابة، ج١، ص ٣٣٩.
[3] البداية والنهاية لابن كثير، ج٦، ص ٣٢٤.
[4] أسد الغابة، ج١، ص ٣٤٠.

چووه خەوی موسڵمانێک و پێی وت: وەسیەتێکت بۆ دەکەم تکام وایە نەڵێیت خەوەو پشتگوێیی بخەیت، من کە دوێنێ کوژرام کەسێک لە موسڵمانان هات و قەڵغانەکەی بردم وماڵیشی لەوپەڕی شارەوەیە و لەوێ بەوجۆرە شاردوویەتیەوە، بڕۆ بۆ لای خالید و داوای لێ بکە تا کەسێک بنێرێت ئەو قەڵغانەم وەربگرێتەوە، کە چوویتەوە مەدینە بیبە بۆ لای خەلیفەی پێغەمبەر(ﷺ) و پێی بڵێ من فلانە قەرز و فلانە قەرزم لەسەرە و فلانە کۆیلەشم با ئازاد بێت، ئەوەبوو کابرا چوو و وایکرد و خەلیفەش وەسیەتەکەی بەجێگەیاند، ئەوەش تاکە وەسیەتی پاش مەرگە کە جێبەجێ کرابێت.[1]

## ٥٣٠. ثابتی کوڕی موخەللەد(رضي الله عنه)

ناوی ثابتی کوڕی موخەللەدی کوڕی زەیدە، لە پشتیوانانە لە خەطمیهکان، لە جەنگی (الحرة) دا کوژرا.[2]

فەرموودەیەکی لێوە گێڕاوەتەوە کە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی (من ستر مسلما ستره الله في الدنيا والآخرة)،[3] (هەرکەس عەیبەی موسڵمانێک دابپۆشێت ئەوا خوای گەورە لە دنیا و ئاخیرەتیشدا پەردەپۆشی بۆ ئەویش دەکات).

ئیبن حەجەر دەڵێت: قسە لەسەر ئەو سەنەدە هەیە، چونکە وەک دیارە ئەو فەرموودە لە مەسلەمەی کوڕی موخەللەدەوە هاتووە،[4] هەروەک ئەبوونوعەیمی ئەصبەهانیش لە کتێبەکەیدا (معرفة الصحابة) هەمان ئەم قسەی کردووەو پێی وایە ئەو فەرموودەیە هی مەسلەمەی کوڕی موخەللەدە.

---

[1] أسد الغابة، ج١، ص ٣٤٠، البداية والنهاية لابن كثير، ج٦، ص ٣٣٥.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٩٦.

[3] أسد الغابة، ج١، ص ٣٤١.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٩٦.

## ٥٣١. ثابتی کوڕی نوعمان(رضي الله عنه)

ناوی ثابتی کوڕی نوعمانی کوڕی ئومەییەیە، لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان، کونیەکەی ئەبوحەببەیە، لە فەتحی میصردا بەشدار بوو.[١]

## ٥٣٢. ثابتی کوڕی نوعمانی کوڕی زەید(رضي الله عنه)

ناوی ثابتی کوڕی نوعمانی کوڕی زەیدە، لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان.[٢]

## ٥٣٣. ثابتی کوڕی نوعمانی ئەوسی(رضي الله عنه)

ناوی ثابتی کوڕی نوعمانی کوڕی حارثی کوڕی عەبدریزاحە، لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان،[٣] لە جەنگی ئوحود و جەنگەکانی تریشدا بەشداری کرد، دوای وەفاتی پێغەمبەریش(ﷺ) ژیا و لە جەنگی جسر ئەبی عوبەیددا بەشداری کردو تیایدا شەهید بوو.[٤]

## ٥٣٤. ثابتی کوڕی هەززال(رضي الله عنه)

ناوی ثابتی کوڕی هەززالی کوڕی عەمری کوڕی عومەری کوڕی قربوسە، ئەم هاوەڵەش لە پشتیوانانە، لە غەزای بەدر[٥]و هەموو غەزاکانی دواتریشدا بەشداری کرد، دوای وەفاتی پێغەمبەریش(ﷺ) ژیاو دواتر لە جەنگی یەمامە دژ بە هەڵگەراوەکان بەشداری کردو تیایدا شەهید بوو.[٦]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٩٦.
[٢] أسد الغابة، ج١، ص ٣٤٣-٣٤٤.
[٣] أسد الغابة، ج١، ص ٣٤٣.
[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٩٧.
[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٩٧.
[٦] أسد الغابة، ج١، ص ٣٤٤.

## ٥٣٥. ثابتی کوڕی وەدیعە(ﷺ)

ناوی ثابتی کوڕی وەدیعەی کوڕی خذامە، باوکی یەکێک بوو لە دووڕووەکانی ناو مەدینە، ئیبن حەجەر دەڵێت: ئەم هاوەڵە جیایە لە ثابتی کوڕی یەزید چونکە ئەمەیان باوکی ناوی وەدیعەیە، بەڵام ئەوەی تریان ناوی دایکی وەدیعەیە.[1]

## ٥٣٦. ثابتی کوڕی یەسار(ﷺ)

ناوی ثابتی کوڕی یەسارە، دەوترێت ئەم ئایەتە سەبارەت بە ئەو دابەزیوە (و إذا طلقتم النساء فبلغن أجلهن فأمسكوهن بمعروف).[2]

## ٥٣٧. ثابتی مەولای ئەخنەس(ﷺ)

ئەم هاوەڵە لە بەشداربوانی بەدر بووە، یەکێک بوو لە کۆچەران،[3] دوای وەفاتی پێغەمبەریش(ﷺ) ژیا و لە فەتحی میصردا بەشدار بوو، هیچ فەرموودەیەکی لێوە نەگێردراوەتەوە.[4]

## ٥٣٨. ثابتی کوڕی ئەقرەم(ﷺ)

ناوی ثابتی کوڕی ئەقرەمی کوڕی ثەعلەبەی کوڕی عەدی بەلویە و هاوپەیمانی پشتیوانانە،[5] لە بەشداربوانی بەدرە.[6]

لە غەزای موئتەشدا لەگەڵ جەعفەری کوڕی ئەبووطالیبدا بەشداری

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٩٧.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٩٩.

[3] أسد الغابة، ج١، ص ٣٢٧.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٩٩.

[5] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ١٩٩.

[6] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٨٣.

کرد،[١] پاش ئەوەی ئیبن ڕەواحە شەهید بوو خێرا ثابتی کوڕی ئەقرەم ئاڵاکەی گرت و نەیهێشت بکەوێتە زەوی و دایە دەست خالیدی کوڕی وەلید.[٢]

ئیبن عەبدولبەر دەڵێت: ثابتی کوڕی ئەقرەم لە غەزای بەدر و هەموو غەزاکانی تریشدا بەشداری کردووە.[٣]

ئەبووهورەیرە دەڵێت: لە موئتەدا بەشدار بووم، ثابتی کوڕی ئەقرەم پێی وتم: تۆ لە جەنگی بەدردا لەگەڵماندا نەبوویت، ئێمە لە بەدردا بە زۆری ژمارەمان سەرنەکەوتین.[٤]

کاتێک لە غەزای موئتەدا ثابت ئاڵاکەی هەڵگرتەوە هاواری دەکرد ئەی پشتیوانان، پاشان وتی: هۆ موسڵمانان لەسەر کەسێک ڕێککەون، ئەوانیش وتیان تۆ، ئەویش وتی: نا من نایکەم، ئەوەبوو لەسەر خالیدی کوڕی وەلید ڕێککەوتن،[٥] ئینجا سەیری خالیدی کوڕی وەلیدی کرد و وتی: ئەی ئەبوو سولەیمان ئاڵاکە بگرە، ئەویش وتی: من هەڵیناگرم تۆ شیاوتریت بەوە چونکە تەمەنت زیاترە و لە بەدریشدا بەشدار بویت، ثابت وتی: ئەی پیاو ئاڵاکە بگرە، سوێند بەخوا ئەم ئاڵایەم بە نیازی دانەدەستی تۆ هەڵگرتووە، ئینجا هاواری کرد ئەی موسڵمانان ڕازین لەسەر خالید؟ هەموو وتیان بەڵێ.[٦]

ثابتی کوڕی ئەقرەم لە سەردەمی خیلافەتی ئەبووبەکری صدیقدا بە دەستی طولەیحەی کوڕی خوەیلیدی ئەسەدی کوژرا، دواتریش کە طولەیحە موسڵمان بوو عومەری کوڕی خەططاب پێی دەوت: چۆن تۆم لا خۆشەویست بێت لەکاتێکدا پیاوچاکانی وەک عکاشەی کوڕی میحصەن و ثابتی کوڕی

---

(١) أسد الغابة، ج١، ص ٣٢٧.

(٢) الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٨٣.

(٣) الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ١٩٩.

(٤) الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٨٣.

(٥) البداية والنهاية لابن كثير، ج٤، ص ٢٤٥.

(٦) الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٤، ص ٢٥٣.

ئەقرەمت کوشت، طولەیحەش دەیوت خوای گەورە بە دەستی من ئەوانی ڕێزدار کرد و بە دەستی ئەوان منی سەرشۆڕ و ڕسوا نەکرد.[1]

کاتێک خالیدی کوڕی وەلید چوو بۆ جەنگی هەڵگەڕاوەکان ثابتی کوڕی ئەقرەم و عەککاشەی کوڕی میحصەنیشی لەگەڵدا بوو، لە هەر شوێنێ لە کاتی بانگدا دەنگی بانگی ببیستایە هێرشی نەدەکردە سەر خەڵکی ئەو شوێنە، بەڵام لە هەر شوێنێ کاتی بانگ بوایە و دەنگی بانگ نەبیسترایە هێرشی دەبردە سەریان، کاتێک گەیشتە لای طولەیحەی ئەسەدی، خالید هەریەک لە ثابت و عککاشەی نارد تا هەواڵی بۆ بهێنن، لە ڕێدا گەیشتن بە طولەیحەو سەلەمەی برای، طولەیحە هێرشی بردە سەر عککاشەو سەلەمەش هێرشی برد بۆ ثابت، هێندەی نەبرد سەلەمە ثابتی کوشت، طولەیحە هاواری برد بۆ سەلەمە تا یارمەتی بدات لە کوشتنی عککاشەدا، پێکەوە ئەویشیان کوشت، کاتێک موسڵمانان گەیشتن و ثابتیان بە کوژراوی بینی ترس دایگرتن و لەسەریان سەخت بوو،[2] خالید فەرمانی کرد گۆڕ هەڵکەنرا بۆ هەردووکیان و بە جل و خوێنەکەیانەوە خرانە ناو گۆڕ.[3]

ثابتی کوڕی ئەقرەم لە ساڵی یانزەی کۆچی و لە جەنگی دژ بە هەڵگەڕاوەکاندا شەهید بوو، یان دەوترێت لە ساڵی دوانزەی کۆچیدا بووە.[4]

رایەکیش دەڵێت: لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) ثابتی کوڕی ئەقرەم کوژراوە، بەپێی ئەو گێڕانەوەی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) سریەیەکی نارد کە ئەمیرەکەیان ثابتی کوڕی ئەقرەم بوو و تیایدا ثابت پێکرا، ئیبن حەجەر دەڵێت: دەکرێت وا لێکدانەوەی بۆ بکرێت کە لەو سریەدا پێکرابێ و بریندار بووبێ نەک مردبێت.[5]

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٨٣.
[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٩٢.
[3] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥٦٧.
[4] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ١٩٩، البداية والنهاية لابن كثير، ج٦، ص ٣٣٤.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٨٣.

ئیبن سەعد دەڵێت: ثابتی کوڕی ئەقرەم دوای خۆی هیچ وەچەیەکی جێ نەهێشت.[1]

## ٥٣٩. ثابتی کوڕی ئیثله(ﷺ)

ناوی ثابتی کوڕی ئیثلەیەو لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان، لە غەزای خەیبەردا بەشداری کرد و تیایدا شەهید بوو.[2]

## ٥٤٠. ثەروانی کوڕی فەزارە(ﷺ)

ناوی ثەروانی کوڕی فەزارەی کوڕی عەبدیەغووثی کوڕی زوهەیرە، وەک وەفد هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ).[3]

## ٥٤١. ثەعلەبەی کوڕی حاطبی کوڕی عەمر(ﷺ)

ناوی ثەعلەبەی کوڕی حاطبی کوڕی عەمری کوڕی عوبەیدە، لە پشتیوانانە لە ئەوسیەکان،[4] دایکی ناوی ئومامەی کچی صامتە.[5]

هەروەها ثەعلەبەی کوڕی حاطب برایەکی هەبوو بە ناوی حارث.[6]

کاتێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) برایەتی خستە نێوان کۆچەری و پشتیوانەکان، برایەتی خستە نێوان معتبی کوڕی حەمراء و ثەعلەبەی کوڕی حاطبهوە.[7]

ثەعلەبە لە غەزای بەدر و ئوحوددا بەشدار بوو و تیایدا شەهید بوو.[8]

ثەعلەبە هەریەک لەم منداڵانەشی هەبوو: (عوبەیدوڵا، عەبدوڵا، عومەیر،

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٤٦٦.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٣٨٣.

[3] – أسد الغابة، ج١، ص ٣٤٨، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٠٠.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٠٠.

[5] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٤٦٠.

[6] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٤٦١.

[7] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٢٦٤.

[8] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٠٠.

ریفاعـه، عەبدورەحمـان، عیـاض، عومەیـره).[1]

## ٥٤٢. ثەعلەبەی کوڕی حاطب

دەوترێت یەکێک بووە لەوانـەی مزگەوتـی (ضرار)یـان دروست کردووە،[2] فەرموودەیەکـی لاوازی لەبـارەوە هاتـووە، ئەویـش ئەوەیـە کـە لـە ئەبـوو ئومامـەی باهیلیـەوە هاتـووەو دەڵێـت: ثەعلەبـەی کـوڕی حاطبـي ئەنصـاری هـات بـۆ لای پێغەمبـەر(ﷺ) و وتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) لای خـوا نـزام بـۆ بکـە سـامانێکم پـێ ببەخشـێت، پێغەمبەریـش(ﷺ) فەرمـووی: (هـاوار بـۆت ئـەی ثەعلەبـە کەمێکت پـێ ببەخشـرێ و لەسـەری سوپاسـگوزار بیـت باشترە لـە زۆرێک کـە بەرگـەی نەگریت و دەرەقەتـی نەیەیـت)، بـەڵام ثەعلەبـە جارێکـی تـر لێـی دووبـارە کردەوە، پێغەمبەریش(ﷺ) پێـی فەرمـوو (ئایـا رازی نیـت بـەوەی وەک پێغەمبـەری خـوا بیـت؟ سوێند بـەوەی گیانـی منـی بەدەستە ئەگـەر بمەوێـت شـاخەکان وەک زێـڕ و زیـو لەگەڵـم رێ بکـەن ئـەوا دەکرێـت) ثەعلەبـە وتـی: سوێند بـەوەی تـۆی بـە حـەق ناردووە ئەگـەر نـزام بـۆ بکەیـت و خـوا سـامانم پـێ ببەخشـێت-دەوڵەمەندم بکـات- هەرچـی مافێـک هەیـە دەیدەم، پێغەمبەریـش(ﷺ) نـزای بـۆ کـرد و فەرمـووی: (خوایـە سـامان ببەخشـە بـە ثەعلەبـە)، ئەوەبـوو ثەعلەبـە بڕێ مـەڕو ماڵاتـی گرتەبـەر و بەرەبـەرە زیادیـان کـرد، ئیتـر وای لـێ هـات لـە مەدینـەدا سـەخت بـوو رایانگرێـت، بۆیـە دەچـووە دەرەوەی مەدینـەو چـوو لـە دۆڵێـک لـە دەرەوەی مەدینـە دانیشـت، ئیتـر وای لێهـات تەنهـا نوێـژی نیوەرۆ و عەسـری بـە جەماعـەت دەکـرد و فریـای ئەوانـی تـر نەدەکـەوت، دواتـر مەڕەکانـی زیادیـان کـرد تـا وای لێهـات جگـە لـە نوێـژی هەینـی وازی هێنـا لـە نوێـژەکان، بـەردەوام مەڕەکانیشـی زیادیـان دەکـرد، وای لێهـات هەینیـان کاروانیەکانـی دەبینـی و لـەوان هەواڵـی وەردەگـرت،

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٤٦٠.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٠٠.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەرێ ثەعلەبە چی کرد؟) وتیان ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) برێ مەڕو ماڵاتی زۆری هەبوو و لە مەدینە جێی نەدەبوویەوە، ئیتر بۆیان باس کرد چی کردووەو چی بەسەرهاتووە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەی هاوار بۆ ثەعلەبە)، سێ جار ئەوەی فەرموو، ئەوەبوو خوای گەورە ئایەتی دابەزاند(خذ من أموالهم صدقة...)، بەوە فەرزی زەکات دابەزی، پێغەمبەریش(ﷺ) دوو کەسی دانا بۆ کۆکردنەوەی زەکات، کەسێک لە جوهەینەو کەسێکیش لە بەنی سولەیم، بۆیشی نووسین کە چۆن زەکات کۆبکەنەوە لە موسڵمانان، بەو دوانەی فەرموو (بڕۆن بۆ لای ثەعلەبەو فڵانە کەس لە بەنی سولەیم و زەکاتیان لێ وەربگرن)، ئەو دوانەش چوون بۆ لای ثەعلەبەو داوایان لێکرد زەکات بدات، ئینجا نامەکەی پێغەمبەری خوایان(ﷺ) خوێندەوە بۆی، ئەویش وتی: ئەوە سەرانەیە، ئەمە خوشکی سەرانەیە، نازانم ئەمە چیە، بڕۆن تا تەواو دەبن لە ئیشەکەتان ئینجا بگەڕێنەوە بۆ لای من، ئەوانیش چون بۆ لای کابرای سولەمی و پاش ئەوەی زەکاتەکەیان لێ وەرگرت گەڕانەوە بۆ لای ثەعلەبە، ئەویش وتی: ئادەی نامەکەم بدەنێ با سەیری بکەم، کە سەیری کرد وتی: ئەمە بێت و خوشکی سەرانەیە، بڕۆن بزانم چۆن دەبێت، ئەو دوانەش گەڕانەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) ئەو دوانەی بینی پێش ئەوەی بیاندوێنێ فەرمووی: (هاوار بۆ ثەعلەبە)، نزای بەرەکەتیشی کرد بۆ کابرای سولەمی، دوو هاوەڵەکە هەواڵیان پێدا کە ثەعلەبە چی کردووە و کابرای سولەمیش چۆن چاکی ناو سامانەکەی داناوە بۆ زەکات، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند(ومنهم من عاهد الله لئن آتانا من فضله لنصدقن و لنكونن من الصالحين....بما كانوا يكذبون)، یەکێک لە کەسە نزیکەکانی ثەعلەبە لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو، کە ئەوەی بیست چوو بۆ لای ثەعلەبە و وتی: قوڕت بەسەر ثەعلەبە خوای گەورە ئایەتی وای لەسەر دابەزاندویت، خێرا ثەعلەبەش

چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و داوای لێکرد زەکاتەکەی لێ وەربگرێت، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (خوا رێی نەداوم صەدەقەکەت لێ وەربگرم)، ئەعلەبە خۆڵی دەکرد بەسەریدا و پێغەمبەریش(ﷺ) پێی دەفەرموو (ئەوە کاری خۆت بوو، من فەرمانم پێ کردیت و تۆیش گوێڕایەڵیت نەکردم)، ئیتر بە ناچاری گەڕایەوە ماڵەوە، دواتریش کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) وەفاتی کرد و ئەبووبەکر بوو بە خەلیفە ئامادە نەبوو زەکاتی لێ وەربگرێت، کە ئەبووبەکر مرد عومەریش زەکاتی لێ وەرنەگرت، دواتریش کە عوثمانی کوڕی عەففان بوو بە خەلیفە زەکاتی لێ وەرنەگرت.[1]

لەبەرئەوەی فەرموودەکە لای هەریەک لە ئیبن حەجەر و زانای فەرموودەناسی عێراقی و ئەلبانیش بە زۆر لاواز هاتووە، بۆیە بە چەند خاڵێک ئەگەری ناراستی ئەم گێڕانەوەیە دەخەینەڕوو:

یەکەم: زەکات کە لە ئیسلامدا فەرز کراو لە کەس قبووڵ نەدەکرا زەکات نەدات، ئیتر چۆن ئەمە بەرامبەر بەم هاوەڵە کرا؟ خەلیفە ئەبووبەکر دژ بەوانە جەنگا کە زەکاتیان نەدەدا و جیهادی دژیان راگەیاند، جا ئێستا کەسێک خۆی هاتبێت تکای کردبێت لە پێغەمبەر(ﷺ) و خەلیفەش تا زەکات بدات ئەوان قبووڵی نەکەن و سزایشی نەدەن؟!! زەکات نەدان لە ئیسلامدا تاوانێکی شەخصی وا نیە کە تەنها لەنێوان بەندەو خودادا بێت و سزاکەی بەس لای خوا بێت، بەڵکو سزای دنیاییشی لەسەرە وەک چۆن خەلیفەی یەکەمی موسڵمانان ئەبووبەکری صدیق لە یەک تاکە کەسی قبووڵ نەکرد جیاوازی بکات لەنێوان نوێژ و زەکات و هەرکام لەوانەی بە پایەی ئیسلام دانا و سزایشی بۆ زەکات نەدان دانا.

دووەم: بۆ ئەو هاوەڵانەی لە ساتی سەختیدا لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) نەچوون واتە لە جەنگی حونەین خوای گەورە لێخۆشبوونی خۆی نیشاندا، هەروەها

[1] شعب الإيمان للبيهقي، الرقم ٤١٧٣، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٣١٠، ضعفه ابن حجر العسقلاني و الحافظ العراقي، كما أشار به الألباني و ضعفه في سلسلة الأحاديث الضعيفة، الرقم ٤٠٨١.

لەو بێباوەڕانە خۆش بوو کە دەستیان چووبووە خوێنی موسڵمانان و دواتر موسڵمان بوون، ئێستا چۆن بە ئەنجامدانی تاوانێک و بەدوایدا تەوبەکردن تەوبەی بەندەیەک وەرناگیرێت؟ خوای گەورە دەفەرموێت (إن الله يغفر الذنوب جميعا)، ئەی چۆن لێخۆشبوونی نەبێت بۆ کەسێک کە ساتێکیش ئامادە نەبووە بێباکی خۆی لە ئیسلام نیشان بدات.

## ٥٤٣. ثەعلەبەی کوڕی حەکەم(ﭬ)

ناوی ثەعلەبەی کوڕی حەکەمی کوڕی عورفوطەی کینانیە،[١] نیشتەجێی بەصرە بوو، دواتر چوو بۆ کووفە و لەوێ نیشتەجێ بوو.[٢]

ثەعلەبە دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بووین، خەڵکی ویستیان مەڕو ماڵاتێک تالان بکەن، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگری کرد و ڕێی نەدا.[٣]

ئەمەش لە جەنگی حونەیندا و دەڵێت: بیستم هاوارکەرەکەی پێغەمبەر(ﷺ) هاواری دەکرد کەس تالانی نەکات.[٤]

ثەعلەبەی کوڕی حەکەم دەڵێت: من لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) هێشتا مێردمنداڵ بووم.[٥]

ئەم هاوەڵە لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ)لە غەزای حونەیندا بەشداری کرد.[٦]

## ٥٤٤. ثەعلەبەی کوڕی خیدام(ﭬ)

ثەعلەبەی کوڕی خیدام یەکێک بوو لە هاوەڵە پشتیوانەکان، یەکێک بوو لەوانەی کە لە غەزای تەبووکدا دواکەوتن.[٧]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٠١.
[٢] أسد الغابة، ج١، ص ٣٥٢.
[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٠١.
[٤] صحيح ابن حبان - كتاب الغصب - ذكر الزجر عن النهبة للأشياء التي لا يملكها المرء، الرقم ٥١٦٩.
[٥] أسد الغابة، ج١، ص ٣٥٢.
[٦] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٦، ص ٣٣.
[٧] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٤٠٢.

سەبارەت بە ناو و ژمارەی ئەو کەسانەی لە غەزای تەبووکدا دواکەوتن راجیایی هەیە، رایەک دەڵێت: دە کەس بون، بۆچوونێک دەڵێت: حەوت کەس بوون و چوار کەسیان خۆیان بەستبوویەوە بە پایەکانی مزگەوتی پێغەمبەرەوە(ﷺ) تا ئەو کاتەی خوا لێیان خۆش دەبێت، بۆچوونێک ناوی سێ کەس دێنێت،[1] رایەکیش ناوی شەش کەس دێنێت کە بریتین لە (ئەوسی کوڕی خیذام، ئەبوولبابە، ثەعلەبەی کوڕی وەدیعە، کەعبی کوڕی مالیک، مرارەی کوڕی رەبیع، هیلالی کوڕی ئومەییە).[2]

## ٥٤٥. ثەعلەبەی کوڕی زەید(ﷺ)

ناوی ثەعلەبەی کوڕی زەیدە، لە پشتیوانانە لە بەنی عەمری کوڕی عەوف.[3]

## ٥٤٦. ثەعلەبەی کوڕی زەید(ﷺ)

ناوی ثەعلەبەی کوڕی زەیدی کوڕی حارثی کوڕی حەرامە، لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان،[4] کوڕێکی هەبوو بە ناوی ثابت کە ئەویش هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوو.[5]

ژنەکەی ثەعلەبە ناوی ئوممو ئوناسی کچی سەعد بوو.[6]

ثەعلەبەی کوڕی زەید یەکێک بوو لە بەشداربوانی بەدر، هەروەها لە غەزای طائیفیشدا بەشداری کردو تیایدا شەهید بوو.[7]

---

[1] صحيح البخاري - كتاب المغازي - باب حديث كعب بن مالك وقول الله عز وجل وعلى الثلاثة الذين خلفوا، الرقم ٤٤١٨.

[2] أسد الغابة، ج١، ص٢١٧، الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٥٢.

[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٠٢.

[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٠٢.

[5] أسد الغابة، ج١، ص ٣٢٨.

[6] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥٦٩.

[7] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٠٢.

## ٥٤٧. ثەعلەبەی کوڕی ساعیدە(ڕەزی اللە عنه)

ناوی ثەعلەبەی کوڕی ساعیدەی کوڕی مالیکە، یەکێک بوو لە بەشداربوانی ئوحود و تیایدا شەهید بوو.[١]

## ٥٤٨. ثەعلەبەی کوڕی سەعد(ڕەزی اللە عنه)

ناوی ثەعلەبەی کوڕی سەعدی کوڕی مالیکی کوڕی خالیدە، لە پشتیوانانە لە خەزرەجیەکان.[٢]

برایەکی هەبوو بە ناوی سەهلی کوڕی سەعد کە لە هاوەڵانی دیارو نزیکی پێغەمبەر(صلی اللە علیه وسلم) بوو.[٣]

خوشکێکیشی هەبوو بە ناوی عومەیرە کە ئەویش لە هاوەڵان بوو.[٤]

ثەعلەبەی کوڕی سەعد لە غەزای بەدر و ئوحوددا بەشداری کردو لە ئوحوددا شەهید بوو.[٥]

## ٥٤٩. ثەعلەبەی کوڕی سەعیە(ڕەزی اللە عنه)

ناوی ثەعلەبەی کوڕی سەعیەیەو سەرەتا جوولەکە بوو و دواتر موسڵمان بوو.[٦]

لەگەڵ دوو کەسی تری جوولەکەی بەنی قورەیضە موسڵمان بوو، ئەو دوانەش بریتی بوون لە ئەسەدی کوڕی عوبەید و ئەسەدی کوڕی سەعیە.[٧]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٠٣.

[٢] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٢٠٨.

[٣] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٢، ص ٦٦٤.

[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٨، ص ٣٧.

[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٠٣.

[٦] أسد الغابة، ج١، ص ٣٥٥.

[٧] الإصابة في معرفة الصحابة، ج١، ص٥١.

کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) هێرشی برد بۆ بەنی قورەیضە و گەمارۆی دان ودواتر ناچار بوون خۆیان بدەن بە دەست بڕیاری سەعدی کوڕی موعاذەوە، شەوێ پێش ئەوە ئەسەد موسڵمان بوو، لەگەڵیشیدا ئەو دوانەش موسڵمان بوون.[1]

ئیبنولهیبان کە جوولەکەیەکی شام بوو چەند ساڵێ بەر لە ئیسلام هات بۆ مەدینە، لەوێ وەسفی تەواوی کۆتا پێغەمبەری بۆ کردن، لەسەرەمەرگیدا پێی وتن: من لەبەر هاتنی ئەو پێغەمبەرە هاتوم بۆ ئێرە، ئەم قسەی ئەم جوولەکە خواناسە لە شەوی فەتحی بەنی قورەیضەدا بوو بە خێر بۆ ئەم سێ کەسە و ئەوانیش ئەم قسەیان بەبیری ئەوانی تر هێنایەوە، بەڵام ئەوان سوودیان لێ نەبینی.[2]

ئەم سێ کەسە داوایان کرد لە بەنی قورەیضە تا لەخوا بترسن و باوەڕ بهێنن بە پێغەمبەرایەتی موحەممەد(ﷺ)، بەڵام ئەوان رازی نەبوون، بۆیە ئەم سیانە دابەزینە خوارەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمانبونی خۆیان راگەیاند، جولەکەکانیش وتیان موحەممەد تەنها کەسە زۆر خراپەکانی ئێمەی بۆ چووە، مەبەستیان ئەم سیانە و عەبدوڵای کوڕی سەلام بوو کە موسڵمان بووبوون.[3]

## ٥٥٠. ثەعلەبەی کوڕی سەلام(رضي الله عنه)

ناوی ثەعلەبەی کوڕی سەلامەو برای عەبدوڵای کوڕی سەلامە، واتە لە جوولەکەکان بوو، رایەک هەیە ئەویش یەکێک بووە لەوانەی لەسەر موسڵمان بوونەکەیان ئایەتی خوا دابەزی (من أهل الكتاب أمة قائمة...).[4]

---

[1] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص٧٩.
[2] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج١، ص١٦٠.
[3] الإصابة في معرفة الصحابة، ج١، ص٥١.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٠٤.

## ٥٥١. ثەعلەبەی کوڕی سومید(رضي الله عنه)

ناوی ثەعلەبەی کوڕی سوەیدە، ئەم هاوەڵەش لە پشتیوانانەو برای ئەوسی کوڕی سوەیدە.[1]

## ٥٥٢. ثەعلەبەی کوڕی عەمر(رضي الله عنه)

ناوی ثەعلەبەی کوڕی عەمری جذامیەو یەکێکە لەوانەی کە لەلایەن زەیدی کوڕی حارثەوە بەدیل گیران و دواتر پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد بە ئازادکردنیان.[2]

## ٥٥٣. ثەعلەبەی کوڕی عەمری کوڕی میحصەن(رضي الله عنه)

ناوی ثەعلەبەی کوڕی عەمری کوڕی میحصەنە، دەوترێت کونیەکەی ئەبوعەمرە بووە،[3] ئەم هاوەڵەش لە پشتیوانانە لە بەنی نەجار،[4] دایکی ناوی کەبشەی کچی ثابتی کوڕی مونذیرە کە خوشکی حەسسانی کوڕی ثابت بوو، واتە حەسسانی کوڕی ثابت خاڵۆی ثەعلەبە بوو.[5]

ژنەکەی ثەعلەبە ناوی کەبشەی کچی مالیک بوو.[6]

کچێکی هەبوو بە ناوی ئوممو ثابت کە بەیعەتی دا بە پێغەمبەر(ﷺ).[7]

ثەعلەبەی کوڕی عەمری کوڕی میحصەن لە غەزای بەدر و ئوحود و خەندەق و هەموو غەزاکانی دواتریشدا بەشداری کرد،[8] لە جەنگی (جسر

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٠٤.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٠٦.
[3] معجم الصحابة لابن قانع، ج١، ص ١٢٢.
[4] أسد الغابة، ج١، ص ٣٥٩.
[5] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥٠٨.
[6] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٨، ص ٤١٨.
[7] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٨، ص ١٧٨.
[8] أسد الغابة، ج١، ص ٣٦٠.

أبو عبيد) لـه سـەردەمی خیلافەتی عومـەری کوڕی خەططابدا بەشداری کرد و تیایدا شـەهید بوو، واقیدیش دەڵێت: لـە خیلافەتی عوثمانی کوڕی عەففاندا وەفاتی کرد.[1]

## ٥٥٤. ثەعلەبەی کوڕی عەنمە(رضي الله عنه)

ناوی ثەعلەبەی کوڕی عەنمەی کوڕی عـەدی کوڕی نابی کوڕی عەمرە، لە پشتیوانانە لـە خەزرەجیەکان.[2]

ثەعلەبە لـە هـەردوو بەیعەتی یەکـەم و دووەمـی عەقەبـەدا بەشـداری کرد، دواتریش کـە هاتـەوە مەدینـە یەکێک بـوو لەوانـەی دەچـوون بتەکانـی بەنـی سـەلەمەیان دەشـکاند تـا هۆزەکـەی خۆیـان لـە بێتوانایـی بتـەکان ئـاگادار بکەنـەوە و پێیـان بڵێـن ئـەو بتانـە شـیاوی پەرسـتن نیـن.[3]

هەریـەک لـە موعـاذی کوڕی جەبەل و ثەعلەبـەی کوڕی عەنمەو عەبدوڵای کوڕی ئەنیس پێکەوە دەچوون بتەکانی بەنـی سـەلەمەیان دەشکاند.[4]

ثەعلەبـەی کوڕی عەنمـە لـە غـەزای بـەدر و خەندەقیشـدا بەشدار بوو و لـە خەندەقدا شـەهید بوو، شەهیدبوونەکەشی بە دەستی هوبەیرەی کوڕی ئەبی وەهب بوو، رایەکی تریش دەڵێت: لـە غـەزای خەیبـەردا شـەهید بوو.

ثەعلەبـە سـەبارەت بـە مانـگ پرسـیاری کـرد چـۆن سـەرەتای مانـگ بـە بچووکی دەردەکەوێت و دواتر بەرەبەرە گـەورە دەردەکەوێت، ئەوەبوو ئـەم ئایەتـە دابـەزی (يسألونك عن الأهلة....).[5]

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٠٦.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٠٦.
[3] أسد الغابة، ج١، ص ٣٦٠.
[4] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٣، ص ٥٨٣.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٠٦.

## ٥٥٥. ثەعلەبەی کوڕی قەیظی(رضي الله عنه)

ناوی ثەعلەبەی کوڕی قەیظی کوڕی صەخری کوڕی سەلەمەیە، لە پشتیوانانە، رایەک هەیە دەڵێت: بەشداربووی غەزای بەدر بووەو تا سەردەمی خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبووطالیب ماوە و لە جەنگی صفیندا بەشداری کردووە.[1]

## ٥٥٦. ثەعلەبەی کوڕی ومدیعە(رضي الله عنه)

ناوی ثەعلەبەی کوڕی وەدیعەیە و یەکێکە لە هاوەڵە پشتیوانیەکان، یەکێک بوو لەوانەی لە غەزای تەبووک دواکەوتن و دواتریش خۆیان بەستەوە بە پایەکانی مزگەوتەکەی پێغەمبەری خواوە(ﷺ).[2]

سەبارەت بە ناو و ژمارەی ئەو کەسانەی لە غەزای تەبووکدا دواکەوتن راجیایی هەیە، رایەک دەڵێت: دە کەس بون، بۆچوونێک دەڵێت: حەوت کەس بوون و چوار کەسیان خۆیان بەستبوویەوە بە پایەکانی مزگەوتی پێغەمبەرەوە(ﷺ) تا ئەو کاتەی خوا لێیان خۆش دەبێت، بۆچوونێک ناوی سێ کەس دێنێت،[3]رایەکیش ناوی شەش کەس دێنێت کە بریتین لە (ئەوسی کوڕی خیذام، ئەبوولبابە، ثەعلەبەی کوڕی وەدیعە، کەعبی کوڕی مالیک، مرارەی کوڕی رەبیع، هیلالی کوڕی ئومەییە).[4]

زۆرجار بە جیا لە سەرچاوەکاندا ناوی یەکێک لەو شەش هاوەڵە دێت کە خۆی بەستوەتەوە بە پایەکانی مزگەوتەوە تا تەوبەیەک بێت لەو کارەی و خوای گەورە لێی خۆش بێت، بەڵام لەو شەش کەسە ئەوانەی خۆیان

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٠٧.

[2] أسد الغابة، ج١، ص ٣٦٢.

[3] صحيح البخاري - كتاب المغازي - باب حديث كعب بن مالك وقول الله عز وجل وعلى الثلاثة الذين خلفوا، الرقم ٤٤١٨.

[4] أسد الغابة، ج١، ص٢١٧.

بەستەوە بە پایەکانی مزگەوتی پێغەمبەری خواوە(ﷺ) سێ کەس بوون و بریتی بوون لە ئەوس و ئەبوو لبابە و ثەعلەبە.[1]

سەبارەت بەو کەسانەی کە نەچون بۆ غەزای تەبووک ئیبن کەثیر دەڵێت: ئەوانەی نەچوون بۆ غەزای تەبووک چوار بەش بوون، بەشێک فەرمانیان پێکرابوو لەلایەن پێغەمبەرەوە(ﷺ) تا نەچن و پاداشتیان بۆ هەیە وەک عەلی کوڕی ئەبووطالیب و موحەممەدی کوڕی مەسلەمەو ئیبن ئوم کلثوم، دەستەیەکی تر بیانوویان هەبوو لەبەرئەوەی لاواز و نەخۆش بوون، دەستەیەکیش ئەوانە بوون کە لە خەفەتی نەچوونەکەیان دەگریان، ئەمانە تاوانبارەکان بوون و بریتی بوون لە ئەبوولوبابەو هاوەڵەکانی، دەستەی چوارەمیش سەرکۆنەکراوان بوون کە بریتی بوون لە دووروووەکان.[2]

## ٥٥٧. ثەعلەبەی کوڕی ئەبوویەلتەعە(ﷺ)

ناوی ثەعلەبەی کوڕی ئەبوو بەلتەعەیە و برای حاطبی کوڕی ئەبووبەلتەعەیە، لای ئەبووعیسای ترمذی لە ریزی هاوەڵاندا ناوی هاتووە.[3]

## ٥٥٨. ثەعلەبەی ئەنصاری(ﷺ)

ناوی ثەعلەبەیەو لە پشتیوانانە، کوڕێکی هەبوو بە ناوی عەبدوڕەحمان، ئەم هاوەڵە پاش فەتحی میصر لە میصر نیشتەجێ بوو.[4]

## ٥٥٩. ثەقافی کوڕی عەمر(ﷺ)

ناوی ثەقافی کوڕی عەمری عدوانیە، لە دەستەی یەکەمی کۆچەرانە، بەڵام فەرموودەی لێوە نەگێڕدراوەتەوە.[5]

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص١٥٢.
[2] البداية والنهاية لابن كثير، ج٥، ص٢٧.
[3] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٠٠.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٠٩.
[5] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤١٠.

## ٥٦٠. ئەقبی کوڕی فەروە(ﷺ)

ناوی ئەقبی کوڕی فەروەی کوڕی بەدییە، لە پشتیوانانە لە بەنی ساعیدە، زیاتر بە ئەحرەش ناسراوە، لە غەزای ئوحوددا بەشدار بوو و تیایدا شەهید بووە،[١] پێغەمبەری خوایش(ﷺ) شایەتی داوە بۆ شەهید بوونی.[٢]

ئەم هاوەڵە شارەزایی زۆری هەبوو بە ڕەچەڵەکی پشتیوانان.[٣]

## ٥٦١. ئەقفی کوڕی عەمر(ﷺ)

ناوی ئەقفی کوڕی عەمری کوڕی سمیطە لەبنی غەنم، برایەکی هەبوو بە ناوی میدلاج،[٤] برایەکی تریشی هەبوو بە ناوی کەثیر و برایەکی تری ناوی مالیک بوو.[٥]

ئەقفی کوڕی عەمر بەشداربوویەکی غەزای بەدر بوو، هاودەم بە خۆی میدلاجی برایشی بەشداربوو، لە غەزای خەیبەریشدا بەشداری کردو تیایدا شەهید بوو، شەهیدبوونیشی لەسەر دەستی ئوسەیدی کوڕی رزامی جوولەکە بوو.[٦]

## ٥٦٢. ثەوب(ﷺ)

کوڕێکی هەبوو بە ناوی ئەبوو موسلیمی خەولانی کە کەسایەتیەکی خواناسی دانیشتووی شام بوو و باوکی ئەبوومسلیمیش (ثەوب) هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوو.[٧]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤١٠.
[٢] أسد الغابة، ج١، ص ٣٦٢.
[٣] أسد الغابة، ج١، ص ٣٦٢.
[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤١٠.
[٥] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٣، ص ١٣٠٩.
[٦] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤١٠.
[٧] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤١٤.

## ٥٦٣. ثەوبان(رضي الله عنه)

ناوی ثەوبانە، باپیری عومەری کوڕی حەکەمە، فەرموودەیەکی لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە.[١]

## ٥٦٤. ثەوبانی مەولای پێغەمبەر(ﷺ)

ناوی ثەوبانی کوڕی بوجدود یان کوڕی جحدرە، کونیەکەی ئەبوو عەبدوڵایەو خەڵکی یەمەن بووە لە حیمیەریەکان، یان دەوترێت لە ناوچەی سرات بووە کە لەنێوان مەککەو یەمەندایە.[٢]

سەرەتا کەسێکی ئازاد بوو، دواتر لە جەنگێکدا بە کۆیلە گیرا و پێغەمبەر(ﷺ) ئەوی کڕی.[٣]

پێغەمبەر(ﷺ) ئەوی بە کۆیلەیی کڕی و دواتر ئازادی کرد،[٤] ئینجا پێی فەرموو (ئەگەر دەتەوێت بگەڕێرەوە بۆ ناو ئەوانەی کە تۆ لەوانیت-واتە کەسوکارت- ئەگەریش دەتەوێت لە ئێمەی ئەهلوبەیت بە) ثەوبانیش لای پێغەمبەر(ﷺ) مایەوەو لە سەفەرو ماڵ و شوێنانی لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بوو و تا مردن خزمەتی پێغەمبەری خوای(ﷺ) کرد،[٥] دوای وەفاتی پێغەمبەریش(ﷺ) چوو بۆ ناوچەی رەملە،[٦] لەوێشەوە چوو بۆ میصر، دواتریش چوو بۆ حیمص و لەوێ مایەوە[٧] تا لەوێ لە ساڵی پەنجاو چواری کۆچی وەفاتی کرد.[٨]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤١٤.

[٢] أسد الغابة، ج١، ص ٣٦٧.

[٣] الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٢١٨.

[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤١٣.

[٥] أسد الغابة، ج١، ص ٣٦٧.

[٦] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤١٣.

[٧] أسد الغابة، ج١، ص ٣٦٧.

[٨] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٧، ص ٤٠٠.

ثەوبـان دەڵێـت: جارێـک لـە خزمـەت پێغەمبـەر(ﷺ) بـووم کـە حیبرێکـی جوولەکـە هـات بـۆ لای پێغەمبـەر(ﷺ) و وتـی: سـەلامت لـێ بێـت ئـەی موحەممـەد، منیش پاڵێکم پێوەنا و خەریک بوو بکەوێت، وتی: بۆ وادەکەیت؟ وتـم: بۆچی ناڵێیت ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)؟ ئەویش وتی: ئێمە بەو نـاوەی خۆیـەوە بانگـی دەکەیـن کـە کەسوکارەکەی ناویـان نـاوە، پێغەمبەریـش(ﷺ) فەرمووی: (نـاوم موحەممـەدە و کەسـوکارم ئـەو ناوەیـان لـێ نـاوم)، کابـرای جوولەکـە وتـی: هاتـوم پرسـیارت لـێ بکـەم، پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمـووی: (ئەگـەر هەواڵـت پێبدەم-قسـەت بـۆ بکـەم- هیـچ سـوودێکی دەبێـت بـۆت؟) ئەویـش وتـی: بـە هـەردوو گوێـم گوێـت لـێ رادەگـرم...[1]

مەعدانـی کـوڕی ئەبـوو طەلحـەی یەعمـەری دەڵێـت: جارێـک گەیشـتم بـە ثەوبانـی مـەولای پێغەمبـەر(ﷺ) و وتـم: کارێکـم فێـر بکـە کـە خـوا بـەو کارە بمخاتـە بەهەشـتەوە؟ یـان خۆشەویسـترین کار لای خـوا چیـە پێـم بڵـێ؟ ثەوبانیـش بێدەنـگ بـوو، تـا سـێ جـار لێـی دووبـارە کـردەوە، دواتـر ثەوبـان وتـی: مـن ئـەو پرسـیارەم کـرد لـە پێغەمبـەر(ﷺ) و ئەویـش فەرمـووی: (**عليك بكثرة السجود لله فإنك لا تسجد لله سجدة إلا رفعك الله بها درجة وحط عنك بها خطيئة**)،[2](سـوجدەی زۆر ببـە بـۆ خـوا، چونکـە هـەر سـوجدەیەک ببەیـت بـۆ خـوا ئـەوا خـوا بـەو سـوجدەیە پلەیـەک بـەرزت دەکاتـەوەو تاوانێکـت لەسـەر دەسـڕێتەوە).

ثەوبـان خـۆی هەمـوو کاروبـاری خـۆی رادەپەڕانـدو داوای یارمەتـی لـە کـەس نەدەکـرد چونکـە لەسـەر ئـەوە بەڵێنـی دابـوو بـە پێغەمبـەر(ﷺ)، جارێـک پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمـووی: (کـێ کەفیلیـم بـۆ دەکات داوای هیـچ لـە هیـچ کـەس نـەکات تـا مـن کەفیلـی بەهەشـتی بـۆ بکـەم؟) منیـش وتـم: مـن ئـەی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ)، ئیتـر هیچـکات داوای هیچـی لـە خەڵـک نەدەکـرد،[3] جـار هەبـوو

[1] صحيح مسلم، الرقم ٤٩٩و اللفظ له، صحيح ابن خزيمة، الرقم ٢٣٢، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٨٧٩٢، صحيح ابن حبان، الرقم ٧٥٢٩، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٤٠٠.

[2] صحيح مسلم - كتاب الصلاة - باب فضل السجود والحث عليه، الرقم ٤٨٨.

[3] سنن أبي داود - كتاب الزكاة - باب كراهية المسألة، الرقم ١٦٤٣، صححه الألباني في صحيح و ضعيف

قامچیەکەی لێ دەکەوت یان داردەستەکەی لێ دەکەوت بە کەسی نەدەوت بیدەنەوە دەستم، بەڵکو خۆی لەسەر وڵاخەکەی دادەبەزی و هەڵیدەگرتەوە.[1]

کاتێک ثەوبان لە حیمص بوو نەخۆش کەوت، ئەوکاتیش والی حیمص عەبدوڵای کوڕی قرط بوو، پیاوێک هات بۆ لای ثەوبان و سەردانی کرد، ثەوبان پێی وت: ئایا دەزانیت بنووسیت؟ کابرا وتی: بەڵێ، ثەوبان وتی: دەی نامەیەکم بۆ بنووسە، ئەوەبوو نامەیەکی نووسی بۆ ئەمیر عەبدوڵای کوڕی قرط کە تیایدا هاتبوو:

لە ثەوبانی مەولای پێغەمبەری خواوە(ﷺ)،

پاشان: ئەگەر مووسا و عیسا-پێغەمبەر- مەولایەکیان هەبوایەو مەولاکەیان لای تۆ بوونایە ئەوا سەردانیت دەکرد.

ئەوەبوو کە نامەکە هێنرا بۆ عەبدوڵا و خوێندیەوە، خێرا هەستاو بە دڵەخورپێ و دڵگرانیەوە راپەڕی، خەڵکی وتیان ئەوە ئەمیر بۆ وای لێهات دەبێت چی روویدابێت؟ ئەمیر چوو بۆ لای ثەوبان و سەردانی کرد و ماوەیەک لەلای دانیشت و دواتر هەستا، ثەوبانیش عەباکەی ئەمیری گرت و وتی: دانیشە تا فەرموودەیەکت بۆ بگێڕمەوە کە لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیستووە، گوێم لێبوو دەیفەرموو (ليدخلن الجنة من أمتي سبعون ألفا لا حساب عليهم ولا عذاب مع كل ألف سبعون ألفا)،[2] (بەدڵنیاییەوە حەفتا هەزار کەس لە ئوممەتم بەبێ موحاسەبەو لێپێچینەوە دەچنە ناو بەهەشت و هیچ سزایەکیان لەسەر نیە، لەگەڵ هەر هەزارێک لەوانەش حەفتا هەزاری تریش دەچنە بەهەشتەوە).

هەروەها ثەوبان فەرموودەیەکی تریش لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی (من فارق الروح الجسد وهو بريء من ثلاث دخل الجنة من الكبر والغلول

سنن أبي داود، الرقم ١٦٤٣.

[1] جامع معمر بن راشد، الرقم ٦١٣.

[2] مسند أحمد بن حنبل - مسند الأنصار(ﷺ) - ومن حديث ثوبان(ﷺ)، الرقم ٢٢٨٥٣، صححه الألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة، الرقم ٢١٧٩.

والدين)،[1] (هەرکەس گیانی لە جەستەی جیابێتەوە و دوور بێت لە سێ شت ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە، لە خۆبەزلزانین و فڕوفێڵ-غەشکردن- و قەرزاری)

## ٥٦٥. ثەوبانی ئەنصاری(رضي الله عنه)

لە پشتیوانانەو کوڕێکی هەبوو بە ناوی عەبدورەحمان، فەرموودەی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) گێڕاوەتەوە،[2]کونیەکەی ئەبوعەبدوڕەحمانە.[3]

ثەوبان دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (من رأيتموه ينشد شعرا في المسجد فقولوا فض الله فاك (ثلاث مرات) ومن رأيتموه ينشد ضالة في المسجد فقولوا لا وجدتها (ثلاث مرات) ومن رأيتموه يبيع أو يبتاع في المسجد فقولوا لا أربح الله تجارتك)،[4] (هەرکەستان بینی لە مزگەوت شیعری دەهۆنیەوە بڵێن خوا زمانت لەگۆ بخات، هەرکەستان بینی لە مزگەوت بانگەوازی بۆ ونبووەکەی دەکرد، بڵێن هەر نەیدۆزیتەوە، سێ جار ئەوەی فەرموو، هەرکەستان بینی لە مزگەوت کڕین و فرۆش دەکات بڵێن خوا خێر نەخاتە بازرگانیەکەتەوە).

## ٥٦٦. ثەوری کوڕی عزرە(رضي الله عنه)

ناوی ثەوری کوڕی عزرەی کوڕی عەبدوڵای کوڕی سەلەمەی قوشەیریە، وەک وەفد هاتوەتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ).[5]

## ٥٦٧. ثەوری کوڕی میعەن(رضي الله عنه)

ناوی ثەوری کوڕی میعەنی کوڕی ئەخنەسی کوڕی حەبیبی سولەمیە،

---

[1] سنن ابن ماجه - أبواب الصدقات - باب التشديد في الدين، الرقم ٢٤١٢، صححه الألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة، الرقم ٢٧٨٥.

[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤١٣.

[3] أسد الغابة، ج١، ص ٣٦٨.

[4] المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٤٣٨، معرفة الصحابة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٣٢٣، ضعفه الألباني في سلسلة الأحاديث الضعيفة، الرقم ٢١٣١.

[5] أسد الغابة، ج١، ص ٣٦٩.

خۆی و باوکی و باپیریشی هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوون و بە بەنی میعەن ناسراون، ئیبن حەجەر پێی وایە خزمایەتیەک لە نێوان ئەم دوو هاوەڵەدا (ثەوری سولەمی و ثەوری کوڕی میعەن) هەیە.[١]

## ٥٦٨. ثەوری سولەمی(رضي الله عنه)

ناوی ثەورەو لە سولەمیەکانە، کوڕێکی هەبوو بە ناوی یەزید کە ئەویش کوڕێکی هەبوو بە ناوی میعەن، هەرسێیان -واتە باپیرەو کوڕو باوک- هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوون و بەیعەتیان داوە بە پێغەمبەر(ﷺ).[٢]

## ٥٦٩. ثوبەیتە(رضي الله عنها)

ناوی ثوبەیتەی کچی ڕەبیعە، لە پشتیوانانەو چووەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و بەیعەتی پێداوە، هاوسەری ئەوسی کوڕی قەیظیە و سێ منداڵی لێی بوو.[٣]

## ٥٧٠. ثوبەیتەی ئەنصاری(رضي الله عنها)

ناوی ثوبەیتەی کچی سلیطی کوڕی قەیسە، لە پشتیوانانەو چووەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و بەیعەتی پێداوە.[٤]

## ٥٧١. ثوبەیتەی کچی نوعمان(رضي الله عنها)

ناوی ثوبەیتەی کچی نوعمانی کوڕی عەمرە، لە پشتیوانانەو چووەتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و بەیعەتی پێداوە.[٥]

---

[١] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤١٥.
[٢] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤١٥.
[٣] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٤٧.
[٤] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٤٧.
[٥] الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٤٧.

## ٥٧٢. ثومامەی کوڕی عەددی(ﷺ)

ناوی ثومامـەی کوڕی عـەددی قورەیشیە، لـە دەسـتـەی یـەکـەمـی کۆچـەرانـە، لـە غـەزای بـەدردا بەشدار بـوو، دوای وەفـاتـی پێغەمبـەر(ﷺ) ژیـا و ماوەیـەکـی خیلافەتی راشیدین بەرپرسـی صەنعاء بـوو، تـا کـاتـی شـەهیدبوونی عوثمانـی کوڕی عەففانیش بەرپرسـی صەنعـاء بوو، کاتێک ئەو هەواڵەیان پێدا زۆر گریا، دواتر کە هاتـەوە سـەر خۆ وتـی: ئیتـر خیلافەتی پێغەمبەرایەتی داماڵرا.[1]

## ٥٧٣. ثومامەی کوڕی ئەبو ثومامە(ﷺ)

ناوی ثومامـەی کـوڕی ئەبـوو ثومامـە بەکـری جذامیـە، لـە بەکـری کـوڕی سـوادەی جذامیـەوە لـە مەولایەکیانـەوە هاتـووە پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) نـزای کـرد بـۆ ثومامـەی باپیـرەی.[2]

## ٥٧٤. ثومامەی کوڕی ئوثال(ﷺ)

ناوی ثومامـەی کـوڕی ئوثالـی کـوڕی نوعمانـی کـوڕی مەسـلەمەی حەنەفیـەو[3] کونیەکـەی ئەبـوو ثومامـەی یەمامیـە،[4] گـەورەی هۆزەکـەی خـۆی بـوو.[5]

ثومامـە دژایەتیەکـی زۆری پێغەمبـەری خـوای(ﷺ) دەکـرد و دەیویسـت بیکوژێـت، بـەڵام نەیدەتوانـی،[6] ئەوەبـوو جارێـک پێغەمبـەر(ﷺ) دای بـە لای ثومامـەدا، لەوکاتـەدا ثومامـە ویسـتی پێغەمبـەر(ﷺ) بکوژێت، بـەڵام مامـی رێی

---

[1] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤١٢.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤١٢.
[3] أسد الغابة، ج١، ص ٣٦٣.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤١٠.
[5] صحيح مسلم - كتاب الجهاد والسير - باب ربط الأسير وحبسه وجواز المن عليه، الرقم ١٧٦٤.
[6] أسد الغابة، ج١، ص ٣٦٤.

نـەدا ئـەوە بـکات،[1] ثومامـە بـە بێباوەڕی بـەرەو عومـرە چـوو، سـوارەکانی پێغەمبـەر(ﷺ) ئەویـان گـرت و هێنایـان بـۆ لای پێغەمبـەر(ﷺ).[2]

ئەبووهورەیـرە دەڵێت: پێغەمبـەر(ﷺ) دەسـتەیەکی سـوارەی رووەو نەجد نـارد، کەسـێکیان لـە بەنـی حەنیفـە هێنـا کـە پێـی دەوتـرا ثومامـەی کـوڕی ئوثـال، ثومامەیـان بەسـتەوە بـە پایەیەکـی مزگەوتـەوە، پێغەمبـەر(ﷺ) هـات و فەرمـووی: ثومامـە ئـازاد بکـەن، ثومامـەش چوویـە نـاو باخێکـی نزیـک لـە مزگـەوت و خـۆی شـۆرد و دواتـر هاتـەوە مزگـەوت و وتـی: (أشهد أن لا إله إلا الله و أن محمدا رسول الله).[3]

کاتێک پێغەمبـەر(ﷺ) ثومامـەی بینی بەسترابوویەوە بـە پایـەی مزگەوتەوە، پێی فەرموو چیت لایـە ئـەی ثومامە؟-یانی قسـەت چیە؟- ئەویش وتـی: ئـەی موحەممـەد قسـەی چاکم لایـە، ئەگـەر بمکوژیت خـاوەن خوێنێکت کوشـتووە، ئەگەریش چاکە بنوێنیت بەرامبـەر سوپاسـکەرێک چاکە دەنوێنیت، ئەگەریش پارەو سـامانت دەوێت داوای بکە تا چەندت دەوێت پێت بدرێت، پێغەمبەر(ﷺ) وازی لـێ هێنـا تـا بەیانی، هەمـان شتی لـێ دووبـارە کردەوە، ثومامـەش وتـی: هەمـان شـتم لایـە کـە پێـم وتیت، پێغەمبەریش(ﷺ) جێی هێشـت تـا بەیانی، بۆ رۆژی سـێیەم پێغەمبـەر(ﷺ) هەمـان شـتی لـێ دووبـارە کـردەوە، ثومامـەش هەمـان وەڵامـی دایـەوە، پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمـووی: ثومامـە ئـازاد بکـەن، ئەویـش چـوو بـۆ باخـە خورمایەکـی نزیـک مزگـەوت و خـۆی شـۆرد و هاتـەوە نـاو مزگـەوت و وتـی: (أشهد أن لا إله إلا الله و أن محمدا رسول الله)، ئـەی موحەممـەد سـوێند بەخـوا لـەم سـەر رووی زەویـەدا کـەس نەبـوو هێندەی تـۆ رقـم لێـی بێت، بـەڵام ئێسـتا دەموچـاوی تـۆ شـیرینترین و خۆشەویسـترین دەموچـاوە، سـوێند بەخـوا هیـچ ئایینێـک نەبـوو هێنـدەی ئایینەکـەی تـۆ لام بێـزراو بێـت،

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٥، ص ٥٥٠.

[2] أسد الغابة، ج١، ص ٣٦٤.

[3] صحيح البخاري - كتاب المغازي - باب وفد بني حنيفة وحديث ثمامة بن أثال، الرقم ٤٣٧٢.

ئێستا ئایینەکەی تۆ خۆشەویستترین ئایینە، سوێند بەخوا هیچ شارێک نەبوو هێندەی شارەکەی تۆ لام بێزراو بێت، بەڵام ئێستا شارەکەی تۆ لام خۆشەویستترین شارە، دەستە سوارەکەی تۆ منیان بردو منیش لەو کاتەدا نیازم هەبوو عومرە بکەم، جا بۆچوونی جەنابت چۆنە؟ پێغەمبەریش(ﷺ) مزگێنی پێدا و فەرمانی پێکرد عومرە بکات، کاتێک ثومامە چوویە مەککە کەسێک پێی وت: ئەرێ لێت شێواوە؟ وتی: نا بەڵکو موسڵمان بوم لەگەڵ پێغەمبەری خوام(ﷺ)، سوێند بەخوا لە یەمامەوە دەنکە گەنمێکتان بۆ نایەت تا پێغەمبەر(ﷺ) مۆڵەتی ئەوە نەدات،[1] ئیتر ثومامە گەڕایەوە بۆ یەمامەو رێی نەدەدا هیچ دانەوێڵەیەک بچێت بۆ مەککە، قورەیش حاڵیان سەخت بوو، نامەیان نووسی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و داوایان لێکرد رەحمی هەبێت بۆ خزمانی و نامە بنێرێت بۆ ثومامە تا رێ بدات خواردن بنێردرێت بۆیان، پێغەمبەریش(ﷺ) پەیامی نارد بۆ ثومامە تا دانەوێڵە بنێرێت بۆ مەککە.[2]

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە کاتێک ثومامە خۆی شۆرد جلەکانیشی پاک کردەوە.[3]

موسڵمانبوونەکەی ثومامە زۆر لە دڵەوە بوو و کاتێکیش خەڵکی یەمامە لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە و موسەیلەمەی درۆزن لە یەمامە دەرکەوت و بانگەوازی دەکرد ثومامە دژایەتی پەیامەکەی موسەیلەمەی دەکرد و خەڵکی لە درۆی موسەیلەمە ئاگادار دەکردەوە،[4] ثومامە دەیوت ئەی خەڵکینە وریابن بەرامبەر بە موسەیلەمە چونکە لە یەک کاتدا دوو پێغەمبەر بۆ یەک کار کۆ نابنەوە، موحەممەد پێغەمبەری خوایەو دوای ئەویش هیچ پێغەمبەرێک نیە، هیچ پێغەمبەرێک نایەت هاوبەشی پێغەمبەرایەتی موحەممەد بێت، پاشان ئەم ئایەتانەی دەخوێندەوە بۆیان (حم تنزيل الكتاب من الله العزيز العليم غافر الذنب

[1] صحيح البخاري – كتاب المغازي – باب وفد بني حنيفة وحديث ثمامة بن أثال، الرقم ٤٣٧٢.
[2] أسد الغابة، ج١، ص ٣٦٤.
[3] أسد الغابة، ج١، ص ٣٦٤.
[4] أسد الغابة، ج١، ص ٣٦٥.

قابل التوب شديد العقاب ذي الطول لا إله إلا هو إليه المصير)، وتی: ئەمە پەیامی خوایە، ئایا ئەوە وەک قسەکەی موسەیلەمەیە، کاتێک خالیدی کوڕی وەلید هاتە یەمامە سوپاسی ئەو کارەی ثومامەی کرد و راستی ئیمانداری ئەوی بۆ دووپات بوویەوە.[1]

ثومامە هاودەم بەوانەی گوێڕایەڵی بوون لەسەر ئیسلام مانەوەو هۆزەکەی خۆیان بەجێهێشت و خۆیان گەیاند بە عەلائی حەضرەمی و دژ بە هەڵگەڕاوەکانی ناو بەحرەین جیهادیان کرد،[2] کاتێک عەلائی حەضرەمی گەیشتە بەحرەین، ثومامە بە سوپایەکی گەورەوە بەرەو لای چوو و خەڵکێکی زۆری تریش چوونە ناو ئەو سوپایە،[3] کاتێک سەرکەوتن ثومامە جل وبەرگێکی گەورەکەیانی کڕی، خەڵکی لە بەنی قەیس بینییان ثومامە ئەو بەرگەی کردوەتەبەر، وایانزانی ئەو بکوژی خاوەن بەرگەکە بووە، بۆیە ثومامەیان کوشت.[4]



[1] الطبقات الكبرى لابن سعد، ج٥، ص ٥٥٠.
[2] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤١١.
[3] البداية والنهاية لابن كثير، ج٦، ص ٣٢٨.
[4] الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤١١.

# پێڕست

## پێڕست

پێڕست

پێرست